

تصوير ابو عبدالرحمن الكردي
مختصر
صحيح مسلم
للإمام زكي الدين عبدالعظيم عبدالقوي المنذري
المتوفى ٦٥٦ هـ
به كوردى كردن و ڕونكردنه‌وه‌ى
نورى فارس حمه‌خان
سه‌رپه‌رشتى چاپ
مه‌لا مه‌حموودى گه‌لاڵه‌يى
دار المعرفة
بيروت - لبنان



# مُختَصَر صَحِيح مُسلِم

للإمام زكي الدين عبد العظيم بن عبد القوي المنذري

المتوفى ٦٥٦ هـ


به كوردی كردن و ڕونكردنه‌وه‌ی

**نوری فارس حمه‌خان**

سه‌رپه‌رشتی چاپ

**مه‌لا مه‌حموودی گه‌لاڵه‌یی**


**( به‌رگی چواره‌م )**




📖 ناوی کتێب ﴿ **مختصر صحيح مسلم** ﴾

📖 وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان.

📖 تیراژ: (٣٠٠٠) دانــە.

📖 ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٦٢٧)ی ساڵی (٢٠١١)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

📖 ساڵی چاپ: ٢٠١١ز - ١٤٣٢ ك.

📖 تایپ: (نیان حسین)

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٣٩- نامەی پۆشاكو خشڵو ئارایشت

## كِتَابُ اللِّبَاسِ وَالزِّينَةِ

{بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٨٠، لە ژمارە: ١٨٩١وە هەتا ژمارە: ١٩١٣ = ژمارە: ٥٧٨٧ هەتا ژمارە: ٥٩٥٣. هەروا بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٢٩ هەتا زنجیرە: ٥١، لە لاپەڕە: ٢٤٤ هەتا لاپەڕە: ٣١٤، لە ژمارە: ٢٧٦٢ هەتا ژمارە: ٢٩٣٤ + ریاض/٢، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٧٧٩ هەتا زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٨١٣}.

**١٠٢٦) كەسێ بەشی بەدوا ڕۆژەوە نەبێ لە جیهانا ئاوریشم لەبەردەكا، بەڵام كڕینو فرۆشتنو سوود لێ وەرگرتنی تری دروستە.** (٥٣٥٦ - ٥٣٩٥)

**بابٌ: إنّمَا يَلْبَسُ الحَرِيرَ فِى الدُّنْيَا مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِى الآخِرَةِ وَإباحَةُ الإنْتِفاعِ بِهِ وَبِثَمَنِهِ**

١٣٣٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: رَأَى عُمَرُ بن الخطاب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عُطَارِدًا التَّمِيمِىَّ يُقِيمُ بِالسُّوقِ حُلَّةً سِيَرَاءَ، وَكَانَ رَجُلاً يَغْشَى الْمُلُوكَ وَيُصِيبُ مِنْهُمْ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى رَأَيْتُ عُطَارِدًا يُقِيمُ فِى السُّوقِ حُلَّةً سِيَرَاءَ، فَلَوِ اشْتَرَيْتَهَا فَلَبِسْتَهَا لِوُفُودِ الْعَرَبِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ، وَأَظُنُّهُ قَالَ: وَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّمَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ فِى الدُّنْيَا مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِى الآخِرَةِ»، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أُتِىَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِحُلَلٍ سِيَرَاءَ، فَبَعَثَ إِلَى عُمَرَ بِحُلَّةٍ، وَبَعَثَ إِلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ بِحُلَّةٍ، وَأَعْطَى عَلِىَّ بْنَ أَبِى طَالِبٍ حُلَّةً، وَقَالَ: «شَقِّقْهَا خُمُرًا بَيْنَ نِسَائِكَ»، قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ بِحُلَّتِهِ يَحْمِلُهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَعَثْتَ إِلَىَّ بِهَذِهِ، وَقَدْ قُلْتَ بِالأَمْسِ فِى حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ، فَقَالَ: «إِنِّى لَمْ أَبْعَثْ بِهَا إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا، وَلَكِنِّى بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ لِتُصِيبَ بِهَا»، وَأَمَّا أُسَامَةُ فَرَاحَ فِى حُلَّتِهِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَظَرًا عَرَفَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ أَنْكَرَ مَا صَنَعَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَنْظُرُ إِلَىَّ، فَأَنْتَ بَعَثْتَ إِلَىَّ بِهَا، فَقَالَ: «إِنِّى لَمْ أَبْعَثْ إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا، وَلَكِنِّى بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ لِتُشَقِّقَهَا خُمُرًا بَيْنَ نِسَائِكَ». {الحديث: ٥٣٧٠ = ٥٣٦١ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٤٧، رقم: ٤٧٠ = ٨٨٦، ٩٤٨، ٢١٠٤ فتح البارى}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) لە بازاڕی مەدینە، عوطاریدی تەمیمی بینی قاتێکی ئاورێشمی خەت خەتی خستبووە سەر سەوا، عوطارید پیاوێ بوو هاموشۆی پادشایانی دەکردو شتیان پێدەدا، عومەر عەرزی حەزرەت دەکا: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگا ئەم دەستە جلەی عوطاریدت دەکڕی بۆ ڕۆژی هەینی لەبەرت دەکرد، هەروەها کاتێ وەفدی عەرەبەکان دێن بۆ خزمەتت لەبەری بکە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: (ئەم جۆرە جلە لەبەرئەوەی کە ئاورێشمی پەتییە، ئەو پیاوانە لەبەری دەکەن کە بەشیان بەنازو بەهرەی ئەو جیهانەوە نییە). لەپاشا چەند قاتێ، لەو جۆرە بەرگە ئاوریشمینە هێنران بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەشی کردن بەسەر هاوەڵانیدا، قاتێکی لێیان نارد بۆ عومەرو قاتێکی تری لێیان نارد بۆ ئوسامەی کوڕی زەیدو قاتێکی لێیاندا بە عەلی کوڕی ئەبو طالیبو پێی فەرموو: (لەت لەتی بکە بۆ لەچکەو سەرپۆش بۆ ژنەکانت). فەرمووی: جا عومەر قاتەکەی خۆی هەڵگرتو هێنای بۆلای پێغەمبەرو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ ئەمەت بۆمن ناردووە، کەچی دوێنێ لەبارەی قاتەکەی عەطاریدەوە واوات فەرموو، بفەرموو ئەمەم تێ بگەیەنە؟ ئەویش فەرمووی: (خۆ من ئێستا ئەم قاتەم بۆ ئەوە بۆت نەناردووە کە خۆت لەبەری بکەی، بەڵکوو دەتوانی بە شێوەیەکی تر سوودی لێ وەربگری). بەڵام ئوسامە خۆی قاتەکەی لەبەرکرد بوو، کەچوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر بەخێسە تەماشای ئوسامەی کرد، ئوسامە هەستی کرد، کە پێغەمبەر کارەکەی ئەوی بەدڵ نییە، لەبەرئەوە عەرزی کرد: (قوربان! بۆوا خێسە لە قاتەکەم دەکەی؟ خۆ تۆ خۆت ناردووتە بۆم؟). فەرمووی: (بەڵام خۆ من بۆ ئەوە بۆتم نەناردووە کە خۆت لەبەری بکەی، بەڵکوو بۆیە بۆتم ناردووە کە پارچە پارچەی بکەی بۆ لەچكو سەرپۆش بۆ ئافرەتەکانتان). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٧٧٧}.

**١٠٢٧) كەسێ لەجیهانا ئاورێشم لەبەربکا لە قیامەتا لەبەری ناکا.** (٥٣٥٦ - ٥٣٩٥)

**بابٌ: مَنْ لَبِسَ الحَرِيرَ فِى الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِى الآخِرَةِ**

١٣٣٦- عَنْ خَلِيفَةَ بْنِ كَعْبٍ أَبِى ذُبْيَانَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ يَخْطُبُ يَقُولُ: أَلاَ لاَ تُلْبِسُوا نِسَاءَكُمُ الْحَرِيرَ، فَإِنِّى سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لاَ تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ، فَإِنَّهُ مَنْ لَبِسَهُ فِى الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِى الآخِرَةِ». {الحديث: ٥٣٧٧ = ٥٣٦٨ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٩٦ = ٥٨٣٤، ٥٨٢٨، ٥٨٢٩، ٥٨٣٠، ٥٨٣٥}:

خەلیفەی کوڕی کەعب، کە ناسراوە بە ئەبو زوبیان فەرمووی: بیستم لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، وتاری دەدا، دەیفەرموو: ئاگاداربن، ئاورێشم لەبەر ئافرەتانتان مەکەن، چونکە من بۆ خۆم لە عومەری کوڕی خەطابم بیست دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئاورێشم لەبەر مەکەن، چونکە هەرکەسێ لەم جیهانەدا ئاورێشم لەبەر بکەن، لەوجیهانا لەبەری ناکەن). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٢ چ/٤}.

**١٠٢٨) لەخواترسان کەوای ئاورێشم لەبەر ناکەن.** (٥٣٥٦ - ٥٣٩٥)

**باب: لاَ يَنْبَغِى لِلمتقين لُبْسُ فَرُّوجِ الحَرِيرِ**

١٣٣٧- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: أُهْدِىَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَرُّوجُ حَرِيرٍ، فَلَبِسَهُ، ثُمَّ صَلَّى فِيهِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَنَزَعَهُ نَزْعًا شَدِيدًا كَالْكَارِهِ لَهُ، ثُمَّ قَالَ: «لاَ يَنْبَغِى هَذَا لِلْمُتَّقِينَ». {الحديث: ٥٣٩٤ = ٥٣٨٥ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٢٥٢، رقم: ٢٣٩ = ٣٧٥، ٥٨٠}:

عوقبەی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کەوایەکی چاکداری ئاورێشمیان بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەری کردو نوێژی پێوە کردو لەپاشا کەسلاوی دایەوەو رووی لەڕووگە وەرچەرخان، بە توونـدی کەواکەی لەبەرخۆی داکەندو فڕەیدا، وەك یەکێ پێی ناخۆش بێ‌و حەزی لێی نەبێ، ئەوجا فەرمووی: (ئەمە بۆ پیاوی لەخواترس دەست نادا!). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٠٦، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٣٩٩ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٠٢٩) ڕێگری لە پۆشینی ئاورێشم بە ئەندازەی دوو پەنجە نەبێ
## بَابٌ: النَّهْيُ عَنْ لَبْسِ الْحَرِيرِ إِلاَّ قَدْرَ إِصْبَعَيْنِ

١٣٣٨- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَنَحْنُ بِ(أَذْرَبِيجَانَ): يَا عُتْبَةَ بْنَ فَرْقَدٍ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ كَدِّكَ، وَلاَ مِنْ كَدِّ أَبِيكَ وَلاَ مِنْ كَدِّ أُمِّكَ، فَأَشْبِعِ الْمُسْلِمِينَ فِي رِحَالِهِمْ، مِمَّا تَشْبَعُ مِنْهُ فِي رَحْلِكَ وَإِيَّاكُمْ وَالتَّنَعُّمَ وَزِيَّ أَهْلِ الشِّرْكِ وَلَبُوسَ الْحَرِيرِ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ لَبُوسِ الْحَرِيرِ. قَالَ: «إِلاَّ هَكَذَا». وَرَفَعَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِصْبَعَيْهِ الْوُسْطَى وَالسَّبَّابَةَ وَضَمَّهُمَا قَالَ زُهَيْرٌ: قَالَ عَاصِمٌ: هَذَا فِي الْكِتَابِ. قَالَ: وَرَفَعَ زُهَيْرٌ إِصْبَعَيْهِ». {الحديث: ٥٣٧٨ = ٥٣٦٩ فم. بخاري. لباس: ٥٨٣٠. أبو داود. لباس: ٤٠٤٢. ترمذي. لباس: ١٧٢١}:

ئەبو عوثمان فەرمووی: لە ئازربایجان بووین، عومەری کوڕی خەتاب، کە فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوو، ئەم نامەیەی نووسی بۆمان، ئاراستەی فەرماندەکەمانی کرد، کە عوتبەی کوڕی فەرقەد بوو، ئەویش خویندیەوە بەسەرمانا، فەرمووی: ئەی عوتبەی کوڕی فەرقەد! ئەو ماڵو سامانەی کە لەلای تۆیە، کە لە گەنجینەی بەیتولمال دایە، ئەوە بەرهەمی رەنجە شانی موسوڵمانانە، ئەوە نەبەرهەمی رەنجە شانی تۆیەو نە بە کەلەپوورو میرات لەبەرهەمی رەنجە شانی باوکو دایکتەوە بۆت ماوەتەوە کەواتە بەتێرو تەسەلی تۆیش وەك هەموو موسوڵمانێکی تر، وەکوو یەك لێی بخۆن، نەکەن سەر بکەنە ناز پەروەریو ژیانی رابواردن، یا جلو بەرگی تایبەت بە بێباوەڕان لەبەر بکەن، یا پۆشاکی ئاورێشم بپۆشن، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگری لە پۆشینی پۆشاکی ئاورێشم دەکرد، دەیفەرموو: (مەگەر ئا ئەوەندە).

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو پەنجەی خۆی بەرزەوە کرد، تا ئاماژەکەی خۆی پێ روون بکاتەوە، کە پەنجەی ناوەڕاستو پەنجەی شایەتمانی بوو، لەهەمان کاتدا دوو پەنجەکەی نووساندبوو بەیەکەوە. زوهەیر (کە کەسی دووەمە لە رشتەی ئەم فەرموودەیەدا) فەرمووی: مامۆستاکەی من کە عاصیمی ئەحوەلە فەرمووی:ئەمە لەنامەکەدا بوو. فەرمووی: زوهەیریش دوو پەنجەی خۆیی هەڵبڕی).

**روونكردنەوە:**

عوتبەی كوڕی فەرقەدی ئەل-سولەمی، هاوەڵێكی ناوداری پێغەمبەرە، ئامادەی ئازادكردنی قەڵای خەیبەر بووە، یەكێ بوو لە فەرمانندە ناودارەكانی ئیمامی عومەر، بە فەرمانی عومەر لەگەڵ عیاضی كوڕی غنم دا، لە بیستو هەشتی كۆچیدا موصوڵیان ئازاد كرد. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرووتی دەست دەهێنێ بەسەر پشتو بەسەر سكیدا، ئیتر بە فەرمانی خودا هەتا مردن لەشی بۆنێكی خۆشی لێ دەهات، لەبۆنی میسكو عەنبەر خۆشتر. لەپاش خەباتو تێكۆشانێكی زۆری بێ وچان، چوو لە كووفە دانیشت، لەوێ ژیا تا لەوێ گیانی پاكی سپارد.

١٣٣٩- عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابَ خَطَبَ بِالْجَابِيَةِ فَقَالَ: نَهَى نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ إِلاَّ مَوْضِعَ إِصْبَعَيْنِ أَوْ ثَلاَثٍ أَوْ أَرْبَعٍ. {الحديث: ٥٣٨٤ = ٥٣٧٥ فم}:

سووەیدی كوڕی غەفلە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە جابییە، كە گوندێكە لە گوندەكانی ناوچەكانی دیمەشق، عومەری كوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) وتارێكی دا، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نەداوە كە ئاورێشم لەبەربكرێ، مەگەر بۆ نەخش، بەقەد جێگەی دوو سێ پەنجە، یا سێ چوار پەنجە!). {تجرید/٥، ژمارە: ١٨٩٥ = ٥٨٢٩ فتح الباری}.

## ١٠٣٠) رێگری لە پۆشینی كەوای دیباج (ئاورێشم)

## باب: النَّهى عَنْ لَبْسِ قَبَاءِ الدِّيباج

١٣٤٠- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَبِسَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمًا قَبَاءً مِنْ دِيبَاجٍ أُهْدِىَ لَهُ ثُمَّ أَوْشَكَ أَنْ نَزَعَهُ، فَأَرْسَلَ بِهِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَقِيلَ لَهُ: قَدْ أَوْشَكَ مَا نَزَعْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: «نَهَانِى عَنْهُ جِبْرِيلُ عليه السلام»، فَجَاءَهُ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَبْكِى، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَرِهْتَ أَمْرًا وَأَعْطَيْتَنِيهِ فَمَا لِى؟ فَقَالَ: «إِنِّى لَمْ أُعْطِكَهُ لِتَلْبَسَهُ، إِنَّمَا أَعْطَيْتُكَهُ تَبِيعُهُ»، فَبَاعَهُ بِأَلْفَى دِرْهَمٍ. {الحديث: ٥٣٨٦ = ٥٣٧٧ فم}.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کەوایەکی دێباجیان بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەریکرد، جا بەزوویی لەبەرخۆی دایکەندو ناردی بۆ عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خودای لێ بێ)، کە عەرزی حەزرەتیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! چ زوو ئەم کەوایەت لەبەرخۆت داکەند، ئەوە بۆ؟! فەرمووی: کاتێ لەبەریم کرد، جوبرائیل تەشریفی هات، نەهی لێ کردم کە لەبەری بکەم، جا عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) کە بەم حاڵەی زانی، بەگریان هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! لەبەرچی شتێ کە خۆت خۆشت نایەت لێی، وەك ئەم کەوایە بێ، کەچی دەیدەی بەمن، گوایە من چیمە؟! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دڵی دایەوەو هۆی ئەوەی بۆی ڕوونکردەوەو پێی فەرموو: (خۆ من بۆئەوە ئەم کەوایەم نەداوە بەتۆ کە خۆت لەبەری بکەی، بەڵکوو بۆ ئەوە داومە پێت کە بیفرۆشیتو لەبەهاکەی کەڵك وەربگریت!). پێشەوا عومەریش (ڕەزای خودای لێ بێ) فرۆشتی بەدوو هەزار درەم، کە دەکاتە دوو سەد دیناری زێڕ زیاتر.

### ١٠٣١) موڵەتدان بە پۆشینی ئاورێشم بۆ نەخۆشیو شتی وا
### بَابٌ: الرُّخْصَةُ فِي لِبَاسِ الْحَرِيرِ لِلْعِلَّةِ

١٣٤١- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ فِي الْقُمُصِ الْحَرِيرِ فِي السَّفَرِ مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا أَوْ وَجَعٍ كَانَ بِهِمَا. وفي رواية: انهم شَكَوا إلى رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) القَمْل. {الحديث: ٥٣٩٦، ٥٤٠٠ = ٥٣٨٧، ٥٣٩١ فم. تجريد/٣/٣٢٣، رقم: ١١٩٩ = ٢٩١٩، ٢٩٢٠، ٢٩٢١، ٢٩٢٢، ٥٨٣٩. أبو داود. لباس: ٤٠٥٦. نسائى. زينة: ٥٣٢٥. ابن ماجة. لباس: ٥٣٩٢. تحفة الأشراف: ١١٦٩} :

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو بە زوبەیری کوڕی عەوامدا، کە ئاورێشم لەبەربکەن، چونکە ئالۆشو خورووکەیێ لە لەشیانا هەبوو. لە گێڕانەوەی ژمارە

(٥٤٠٠)دا، لـە شـەرحی صـەحیحی موسـلیما، تـەرقیمی مامۆسـتا/خـەلیل مـەئموون شـیحا، دەفـەرموێ: عبـدوڕەحمانی کـوڕی عـەوف‌و زوبـەیری کـوڕی عـەوام، لـە غەزایەکا، لەدەستی ئەسپێ سکالآیان لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کـرد، ئـەویش ڕێگـەی پێیانـدا، کـە کراسـی ئاورێشم لەبـەر بکـەن). {تـاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٩، ٢٧٧٠ ج/٤}.

## ١٠٣٢) دروستە کە ئۆیەو قەیتانی قەراخی قۆڵو دەمی گیرفان‌و چاك‌و دامەنی جل‌و بەرگ‌و یەخەی لە ئاورێشم بێ

## بَابٌ: الرخصة فِي لِينَةِ الثَّوْبِ مِنَ الديباج

١٣٤٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مَوْلَى أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِى بَكْرٍ، وَكَانَ خَالَ وَلَدِ عَطَاءٍ قَالَ: أَرْسَلَتْنِى أَسْمَاءُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) فَقَالَتْ : بَلَغَنِى أَنَّكَ تُحَرِّمُ أَشْيَاءَ ثَلاَثَةً: الْعَلَمَ فِى الثَّوْبِ، وَمِيثَرَةَ الأُرْجُوَانِ وَصَوْمَ رَجَبٍ كُلِّهِ، فَقَالَ لِى عَبْدُ اللَّهِ: أَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنْ رَجَبٍ فَكَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ الأَبَدَ وَأَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنَ الْعَلَمِ فِى الثَّوْبِ، فَإِنِّى سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «إِنَّمَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ»، فَخِفْتُ أَنْ يَكُونَ الْعَلَمُ مِنْهُ، وَأَمَّا مِيثَرَةُ الأُرْجُوَانِ فَهَذِهِ مِيثَرَةُ عَبْدِ اللَّهِ فَإِذَا هِىَ أُرْجُوَانٌ. فَرَجَعْتُ إِلَى أَسْمَاءَ فَخَبَّرْتُهَا، فَقَالَتْ : هَذِهِ جُبَّةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَأَخْرَجَتْ إِلَىَّ جُبَّةَ طَيَالَسَةٍ كِسْرَوَانِيَّةً لَهَا لِبْنَةُ دِيبَاجٍ وَفَرْجَيْهَا مَكْفُوفَيْنِ بِالدِّيبَاجِ، فَقَالَتْ : هَذِهِ كَانَتْ عِنْدَ عَائِشَةَ حَتَّى قُبِضَتْ، فَلَمَّا قُبِضَتْ قَبَضْتُهَا، وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَلْبَسُهَا، فَنَحْنُ نَغْسِلُهَا لِلْمَرْضَى يُسْتَشْفَى بِهَا. {الحديث: ٥٣٧٦ = ٥٣٦٧ فم}:

عەبدوڵلای کوڕی کیسان، کە بەندەی ئازادکراوی ئەسمای کچی ئەبوبەکر بـوو، (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) کە خاڵی منالەکانی عەطای کوڕی ئـەبو ڕەبـاح بـوو، فـەرمووی: ئـەسماء نـاردمی بـۆلای عەبـدوڵلای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خـودا لەهەموویان بێ) کە بەناوی ئەوەوە پێی بڵێم: بـەمن گەیشتۆتەوە کەتۆ ئـەم سێ شتە بە حەرام‌و نادروست دەزانی:

١- نەخشی ناو تەختی جلو بەرگ، کە لە ئاورێشم بێو.

٢- پۆپەشمینی ئەرخەوانی سەر نەرمە زینو.

٣- گرتنی رۆژووی مانگی رەجەب بەتەواوی. جا عەبدوڵڵا لەوەڵاما فەرمووی پێم: لەبابەت گرتنی رۆژووی مانگی ڕەجەبەوە کە گشتی بگری، من شتی وام نەگوتووە، چونکە من خۆم ساڵ دوازدە مانگە، جەژنەکانی لێ دەرچێ، بەرۆژوو دەبم، بابەتی ئەوەیش کە باست کرد، سەبارەت بە نەخشی جلو بەرگ کە لە ئاورێشم بێ، بۆیە من خۆمی لێ دەپارێزم، چونکە من لە عومەری کوڕی خەطابم بیست (رەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (کەسێ ئاورێشم لەبەر دەکا، کە بەشی بەڕەحمەتی خوداوە نەبێ) جا لەم روانگەیەوە، مەترسی ئەوەم هەیە کە نەخشی ئاوریشمیش بەر ئەم هەڕەشەیە بکەوێ، دەنا من نەخشی ئاسایی تر بەخراپ نازانم، سەبارەت بە پۆپەشمینی ئەرخەوانی سەر نەرمە زینیش ئەوەتا هینەکەی سەر زینەکەی خۆم رەنگەکەی ئەرخەوانیو پەمەییە، بەڵام ئاوریشم نییە.

جاکاتێ ئەم وەڵامانەم بردەوە بۆ ئەسماء، فەرمووی: (ئادەی کەنیشکە! جبەکەی پێغەمبەر خۆیم بۆ بهێنە).

جا جبەیەکی هێنا، لە قوماشێکی ئەستوور بوو، وەك طەیلەسان، کەناسراوە بە کیسراوی، کە نیسبەتە بۆلای کیسرای پادشای ئێران، یەخەکەیو هەردوو سەر دەستەکەیو هەردوو چمکەکەی بە ئۆیەو قەیتانی ئاورێشم نەخشابوونو قەیتانی دێباجیان تێ گیرابوو. ئەسماء فەرمووی: ئەم جبەیە هەتا عائیشەی خۆشکم مابوو، لەلای ئەو بوو، کە ئەو مرد، من وەریم گرت، وە ئەم جبەیە جاران پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) لەبەری دەکرد، بۆیە ئێمە دەیشۆرین بۆ نەخۆشو ئاوەکەی بۆ مووفەڕك دەدەینێ، یا لێی دەپرژێنین، تا پێی چاك ببێتەوە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٧}.

**ڕوونكردنەوە:**

١- ئەم فەرموودەیە یەكێكە لەو كۆمەڵە فەرموودەیە كە بەڵگەیە لەسەرئەوە، كە دروستە موسوڵمان خۆی موفەڕكاوی بكا، بە ئاسارو شوێنەوارو پاشماوەی پیاو چاكان. {بڕوانە: ژمارە: ١٣٣٣}.

## ١٠٣٣) لەتكردنی جلی ئاورێشمو كردنی بە لەچكی ژنان. (٥٣٥٦ - ٥٣٩٥)

## بَابٌ: قَطْعُ ثَوْبِ الْحَرِيرِ خُمُراً لِلنِّسَاءِ

١٣٤٣- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أُكَيْدِرَ دُومَةَ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَوْبَ حَرِيرٍ، فَأَعْطَاهُ عَلِيًّا كرم الله وجهه، فَقَالَ: «شَقِّقْهُ خُمُرًا بَيْنَ الْفَوَاطِمِ». {الحديث: ٥٣٨٩ = ٥٣٨٠ فم}:

عەلی كوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوكەیدیری پادشای دوومەتولجەندەل، پارچەیێ جلی ئاورێشمی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بەخشی بە عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) پێی فەرموو: (دابەشی بكە لەبەینی فاطیمەكاندا، كە بیكەن بە لەچك بۆ خۆیان). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٤}.

**ڕوونكردنەوە:**

مەبەست لە فاطیمەكان ئەم سێ كەسەیە: ١- فاطیمەی كچی پێغەمبەر، كە هاوسەری عەلی بوو. ٢- فاطیمەی كچی ئەسەد، دایكی ئیمامی عەلی.

٣- فاطیمەی كچی حەمزەی كوڕی عەبدولموطەلیب، كە ئامۆزای پێغەمبەرو عەلی بوو، چونكە حەمزە مامیانە.

## ١٠٣٤) جڵەوگیری لە پۆشینی بەرگی ناسراو بە قەسسیو لە جلوبەرگی ڕەنگكراو بە عەسفەرانو لە ئەنگوستیلەی زێڕ. (٥٤٠١ - ٥٤٠٦)

## بَابٌ: النَّهْيِ عَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ وَالْمُعَصْفَرِ وَتَخَتُّمِ الذَّهَبِ

١٣٤٤- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ وَالْمُعَصْفَرِ، وَعَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ وَعَنْ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ فِي الرُّكُوعِ. {الحديث: ٥٤٠٤ = ٥٣٩٥ فم}.

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەکرد لەم شتانە. لەپۆشینی جلو بەرگی ئاورێشم، کە لەگوندی قەسسی میصری دەهێنریو، لەجلو بەرگی بە عەسفەران ڕەنگکراوو، لە ئەنگوستیلەی زێڕ لەدەست کردنو، لە خوێندنی قورئان لەناو چەمینەوەو کوڕنووشدا، واتە: لەناو روکوعو سوجوددا). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٨٠٠، ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

عەصفەران گیایەکی ڕەنگ زەردە، جیایە لە زافەران، جلو بەرگی پێ زەرد دەکرێ، کەوڵیشی پێ خۆشە دەکرێ وەك جەوت.

١٣٤٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العاص (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: رَأى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلَيَّ ثَوْبَيْنِ مُعَصْفَرَيْنِ فَقَالَ لي: «إن هذه من ثياب الكفار فلا تَلْبَسْها». قُلْتُ: أغْسِلُهُا؟، قَالَ: «بَلْ أحْرِقْهُمَا». {الحديث: ٥٤٠٣ = ٥٣٩٤ فم}:

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دوو جلکی عەصفەراناوی لەبەرما دی... فەرمووی پێم: (ئەمە جلو بەرگی کافرانە، لەبەری مەکە). گوتم: ئەی بۆچی نەیشۆرم؟ فەرمووی: (نەء، بیانسووتێنە). {تاج/٣/٢٦١، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٨٠١}.

## ١٠٣٥) جڵەوگیری لەوە کە بە زافەران خۆی پێ بۆنخۆش بکرێ، یا جلو بەرگی پێ ڕەنگ بکرێ. (٥٤٧٣ - ٥٤٧٤)

## بَابٌ: فِي النَّهْيِ عَنِ التَّزَعْفُرِ

١٣٤٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ. {الحديث: ٥٤٧٤ = ٥٤٦٤ فم. تجريد/٥/١٩٠، رقم: ١٨٩٨ = ٥٨٤٦ فتح الباري. أبو داود. ترجل: ٤١٧٩. نسائي. مناسك الحج: ٢٧٠٥. تحفة الأشراف: ٩٩٢}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پیاوی نەئەدا، کە بە زافەران خۆی بۆنخۆش بکا، یا جلو لەشی خۆی پێ ڕەنگ بکا، بەڵام

بۆ ژن هەردوو لایان دروستە). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٨٩٩} + {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٢٨٧٥}.

## ١٠٣٦) بۆیەکردنی قژو مووی ریش و گۆڕینی رەنگی مووی سپی لەبەر پیریی. (٥٤٧٥ - ٥٤٧٧)

## بَابٌ: فِي صَبْغِ الشَّعْرِ وَتَغْيِيرِ الشَّيْبِ

١٣٤٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: أُتِيَ بِأَبِي قُحَافَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ، وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَالثَّغَامَةِ بَيَاضًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «غَيِّرُوا هَذَا بِشَيْءٍ، وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ». {الحديث: ٥٤٧٥ = ٥٤٦٦ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: رۆژی ئازادکردنی مەککە، کە ئەبو قوحافەی باوکی ئەبوبەکری صەدیقیان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەروریشی وەك قارچك پاك سپی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم سپێتییە بە شتێ رەنگ بکەن و بیگۆڕن بەرەنگێ تر، بەلام بەرەنگی رەش رەشی مەکەن!). {تاج/٣/٢٨٩، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٢٨٧٣} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٩٤، ژمارە: ١٦٣٧}.

**روونکردنەوە:**

١- ثوغامە رووەکێکی کێویلەیە، گوڵێکی سپی و بەرێکی سپی دەگرێ، رەنگی خۆی وەك رەنگی خوێ و مووی سپی وایە، بەلام لە کوردەواری خۆمانا واباوە دەڵێن: ریشی پاك سپییە دەڵێی قارچکە.

٢- ئەمرۆ لەم سەردەمەی ئێمەدا، سەروریش بۆیاخ کردن، چ بۆ ژن، چ بۆ پیاو بووە بەباو، جا بۆیە حەز دەکەم کە بڕیارەکەی روون بکەمەوە:

یەکەم: بۆژن ئەگەر بەنیازی پاك بێ، بۆ جوانی بێ، بەمەرجێ بۆ تەفرەدانی خوازبێنیکار نەبێ، بۆ منال و گەنج و پیر بەهەموو رەنگێ دروستە، گەرچی هەندێ فەرموویانە: بەرەش بۆ ژنیش نادروست و حەرامە، بەلام گوتەی متمانە داری

ئەوەیە، کە بۆژن بەرەشیش دروستە چونکە لە ئاساری زۆری دروستدا، لە هاوەڵانو پەیرەوان (تابعین)ەوە هاتووە کە بەرەش سەرو ریشی خۆیان بۆیاخ کردووە {بروانە: **فتح اللهم** شرح صحيح مسلم}.

**دووەم: بۆ پیاو**، بۆ پیاو، بەهەموو رەنگێ دروستە جگە لەرەش، بەمەرجێ بۆ **مەبەستی خراپ** نەبێ، وەك فێڵو تەفرەدانو لاسکایی ژنان، ئەگەر بە مەبەستی وا ناشیرین بوو ئەوە حەرامە، بەکۆی را. بەرەش حەرامە، مەگەر بۆ کاتی غەزا، ئەگەر بۆ مەبەستێکی جەنگی رەوا بوو ئەوا دروستە بۆیاخی سەرو ریش ئەگەر بۆ جوانی بوو ئەوا راجیاییەکی زۆری واتیا، بەڵام وەك گوتمان زۆر لە پێشینان شتی وایان کردووە، لەبەرئەوە دروستە تەقلیدی ئەوان بکرێ. بەڵام بەهەرحاڵ بۆ پیاو هەتا دەتوانرێ دووربێ لە بۆیاخی رەشی سەروریش.

### ١٠٣٧) پێچەوانەی جوولەکەو گاور لە رەنگکردنو بۆیاخکردنی مووی سەروریشدا.
### (٥٤٧٥) - بَابٌ: فِي مُخَالَفَةِ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى فِي الصَّبْغِ

١٣٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لاَ يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ». {الحديث: ٥٤٧٧ = ٥٤٦٧ فم. تجريد/ ٥، رقم: ١٩٠٥ = ٥٨٩٩، ٣٤٦٢ = ١٣٨٠ تجريد + رياض/ ٤، لاپەڕە: ٧٩، زنجيرە: ٢٩٣، ژمارە: ٣/ ١٦٣٦}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (جوولەکەو گاور مووی سەرو ریشی خۆیان بۆیە ناکەن، کەواتە: بە پێچەوانەی ئەوانەوە ئێوە بۆیەیان بکەن). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٢٨٧٢، ج/٤}.

### ١٠٣٨) بەرگی حیبەرە، کەجۆرە جلێکە لەکەتان، یا لە لۆکە دروست دەکرێ. (٥٤٠٧ - ٥٤٠٨) - بَابٌ: فِي لِبَاسِ الْحِبَرَةِ

١٣٤٩- عَنْ قَتَادَةُ قَالَ: قُلْنَا لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَيُّ اللِّبَاسِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ أَوْ أَعْجَبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: الْحِبَرَةُ.

{الحديث: ٥٤٠٨ = ٥٣٩٨ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٨٤، رقم: ١٨٩٢ = ٥٨١٣، ٥٨١٢ فتح الباري. ترمذي. لباس: ١٧٨٢. نسائي. زينة: ٥٣٣٠. تحفة الأشراف: ١٣٥٣}:

قەتادە فەرمووی: عەرزی ئەنەسی کوڕی مالیکمان کرد: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەگشت جل‌و بەرگێ زیاتر حەزی لەچی جل‌و بەرگێ بوو؟ یاچی بەرگێکی زۆر بەدڵ بوو؟ فەرمووی: حیبەرە). {تاج/٣، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٧٨٠، چ/٤}.

## ١٠٣٩) پۆشینی بەرکۆشی نەخشاو بە کورتانی وشتر. (٥٤٠٩ - ٥٤١٥)
## باب: في لبس المرط المرحل

١٣٥٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ : خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ غَدَاةٍ وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مُرَحَّلٌ مِنْ شَعَرٍ أَسْوَدَ. {الحديث: ٥٤١٢ = ٥٤٠٣ فم}:

دایکی باوەڕداران عائیشەی کچی ئەبوبەکری صەدیق، کە لەهەردوو جیهانا هاوسەری پێغەمبەرە (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو لەهەموو هاوسەرو هاوەڵەکانی بێت)، فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی چووە دەرەوە، شاڵێنەیەکی پێچابوو بە بەرکۆشی خۆیەوە، بەوێنەی کۆپانی وشتر نەخشابوو، لەمووی ڕەش دروست کرابوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٢٧٨٥، چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەم پێیە بێ، تەنیا ڕەسم‌و وێنەی گیاندار نادروستە. {بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ٣١٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩٢٢ هەتا زنجیرە: ٥١}.

## ١٠٤٠) پۆشینی بەرکۆشی ئەستوورو جلی پینەکراو. (٥٤٠٩ - ٥٤١٥)
## في لبس الإزار الغلظ والثوب الملبد

١٣٥١- عَنْ أَبِى بُرْدَةَ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) فَأَخْرَجَتْ إِلَيْنَا إِزَارًا غَلِيظًا مِمَّا يُصْنَعُ بِالْيَمَنِ، وَكِسَاءً مِنَ الَّتِى يُسَمُّونَهَا الْمُلَبَّدَةَ، قَالَ: فَأَقْسَمَتْ بِاللَّهِ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُبِضَ فِى هَذَيْنِ الثَّوْبَيْنِ. {الحديث: ٥٤٠٩ =

٥٤٠٠فم. تجريد/٣، لاپەڕە: ٣٨٦، رقم: ١٢٦٠ = ٣١٠٨، ٥٨١٨. أبو داود. لباس: ٤٠٣٦. ترمذي. لباس: ١٧٣٣. ابن ماجة. لباس: ٣٥٥١، تحفة فەرمووى: الأشراف/١٧٦٩٣}:

ئەبو بوردە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ دێنی عائیشە بۆ ماڵەوە، پۆشاکێکی ئەستووری پیناوی بۆمان دەرهێنا، لەو جۆرە بەرکۆش‌و ئیزارانە بوو کە لەیەمەن دروست دەکرێن، لەگەڵ جلێکی تری پینە پیناویدا، ئەنجا عائیشە سوێندی بۆمان خوارد بەخودا: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی گیانکێشانیدا ئەم دوو جلکەی لەبەردا بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٢٧٨٦، ج/٤}.

## ١٠٤١) باسی قاڵی‌و مافوور. (٥٤١٦ - ٥٤١٨)

## بَابٌ: فِي الأَنْمَاطِ

١٣٥٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجْتُ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَتَّخَذْتَ أَنْمَاطًا؟». قُلْتُ: وَأَنَّى لَنَا أَنْمَاطٌ؟ قَالَ: «أَمَا إِنَّهَا سَتَكُونُ»، قَالَ جَابِرٌ: وَعِنْدَ امْرَأَتِي نَمَطٌ فَأَنَا أَقُولُ: نَحِّيهِ عَنِّي، وَتَقُولُ: قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّهَا سَتَكُونُ». {الحديث: ٥٤١٦ = ٥٤٠٧فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ١٢٥، رقم: ١٤٤٢ = ٣٦٣١، ٥١٦١. أبو داود. لباس: ٤١٤٥. ترمذي. أدب: ٢٧٧٤. تحفة الأشراف/ ٣٠٢٩}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ژنم هێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: مافوورت هەیە؟ گوتم: مافوورم لەکوێ بوو؟ فەرمووی: (دەسا مافوور لەمەولا پەیدا دەبێ!). جابیر فەرمووی: ئێستاکە ژنەکەم مافوورێکی هەیە، کەپێی دەڵێم: لەمنی دوور بخەرەوە، ئەم قاڵیچانەی بۆمن رامەخەو لایبە، دەڵێ: ئەی ئەوەنەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی لەپەیدابوونی قاڵی دەداو دەیفەرموو: (رۆژێ دەبێ قاڵیتان دەبێ). ئیتر منیش دەنگم نەدەکرد!). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٢٩٠٧}.

**١٠٤٢) پێخەفو رایەخ بەپێی پێداویستی کاری پەسەندە. (٥٤١٩)**
**بَابٌ: إتِّخاذُ مَا يَحْتَاجُ إلَيْهِ مِنَ الفُرُش**

١٣٥٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ لَهُ: «فِرَاشٌ لِلرَّجُلِ، وَفِرَاشٌ لامْرَأَتِهِ، وَالثَّالِثُ لِلضَّيْفِ، وَالرَّابِعُ لِلشَّيْطَانِ». {الحديث: ٥٤١٩ = ٥٤١٠ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (نوێنی یەکەم بۆ پیاو خۆیو نوێنی دووەم بۆ ژنەکەیو، نوێنی سێیەم بۆ میوانو، نوێنی چوارەم بۆ شەیتان). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٢٩٠٦، ج/٤}.

**روونکردنەوە:**

نوێنو رایەخ بەپێی پێویست ئەگەر سەد دەستەی نوێنیش بێ دروستەو ناپەسەند نییە، مەبەستی سەرەکی لەم بابەتە ئەوەیە کە بەپێی پێویست بێو بۆ پێویستی بێو بۆ شانازیو فیزو دەعیەو بەخۆوە نازین نەبێ، وەك نوێنی زۆر لە تەکیەو خانەقاو ئوتێلو دیوەخانەکانی گەورە پیاوان!!

**١٠٤٣) رایەخی چەرمینی ناواخن ریشوو. (٥٤٠٩ - ٥٤١٥)**
**بَابٌ: فِرَاشُ الأدَمِ حَشْوُهُ لِيفٌ**

١٣٥٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: إِنَّمَا كَانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الَّذِى يَنَامُ عَلَيْهِ أَدَمًا حَشْوُهُ لِيفٌ. {الحديث: ٥٤١٤ = ٥٤٠٥ فم}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رایەخەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەسەری دەخەوت، دۆشەکێ بوو، بەرگەکەی چەرم بوو، ناواخنەکەی ریشووی دارخورما بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٢٩٠٢}.

**١٠٤٤) خۆ شەتەکدانو خۆشەتەکدان بە چیچکانەوە. (٥٤٦٦ - ٥٤٧٢)**
**بَابٌ: فِي إشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ وَالإحْتِبَاءِ**

١٣٥٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَهَى أَنْ يَأْكُلَ الرَّجُلَ بِشِمَالِهِ، أَوْ يَمْشِيَ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ وَأَنْ يَشْتَمِلَ الصَّمَّاءَ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ فِي ثَوْبٍ

وَاحِدٍ كَاشِفًا عَـنْ فَرْجِـهِ. {الحديث: ٥٤١٦ = ٥٤٥٦ فـم. تجريـد/١، رقـم: ٢٣٢ = ٣٦٧، ١٩٩١، ٢١٤٤، ٢١٤٧، ٥٨٢٠، ٥٨٢٢، ٦٢٨٤}.

**جـابير** (رەزای خودای لێ بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **جڵەوگیری دەکـرد** لەوە: کە مرۆڤ بەدەستی چەپی شت بخوا، یا شت بخواتـەوە، یا بـەتاکێ پێڵاوەوە بڕوا، یا بە پارچە جلێ خۆی واشەتەك بدا، کە نەتوانێ دەستی لێوە دەربهێنێ، یـان بە چیچکانەوە جلکێ بئاڵێنێ بەخۆیەوە بەڵام هیچی نـەدا بەشەرمگای خۆیدا). {تاج/٣، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ٢٨٥٦}.

**١٠٤٥) ڕاکشان لەسەر گازەرەی پشتو لاق نانە سەر لاق.** (٥٤٦٦ - ٥٤٧٢)

**بَابٌ: النهي عَنِ الإستِلْقَاءِ وَ وَضْعِ إِحْدَى الرِّجْلَيْنِ عَلَى الأُخْرَى**

١٣٥٦- عَنْ جَابِرِ بْـنِ عَبْـدِ اللَّـهِ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمـا): أَنَّ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لاَ يَسْتَلْقِيَنَّ أَحَدُكُمْ ثُمَّ يَضَعُ إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى». {الحديث: ٥٤٧٠ = ٥٤٦٠}:

**جابیری کوڕی عەبـدوڵڵا** (رەزای خودایان لێ بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (کەستان لەسەر پشت ڕامەکشێنو لاق بنێنە بان لاق).**

**١٠٤٦) لەسەر پشت ڕاکشانو لاقنانە سەر لاق ڕەوایە.** (٥٤٦٦ - ٥٤٧٢)

**بَابٌ: إِبَاحَةَ الإستِلْقَاءِ وَ وَضْعُ إِحْدَى الرَّجُلَيْنِ عَلَى الأُخْرَى**

١٣٥٧- عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ أَنَّـهُ: رَأَى رَسُولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) مُسْتَلْقِيًا فِي الْمَسْجِدِ، وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى. {الحديث: ٥٤٧١ = ٥٤٦١ فـم. تجريد/١، رقم: ٢٩٠ = ٤٧٥، ٥٩٦٩، ٦٢٨٧}:

**عەببادی کوڕی تـەمیم فـەرمووی: مامـەم عەبـدوڵڵای کـوڕی زەیـدی ئەنصاری** (رەزای خـودای لێ بـێ) **فـەرمووی: بەچـاوی خـۆم پێغەمبــەرم دی** (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) **لـەناو مزگـەوتا، لەسـەر پشـت ڕاکشـابوو، لاقـی نـابووە سـەر لاقـی).** {تـاج/١، زنجیـرە: ١١٨، ژمارە: ٧١٧، چ/٤}.

**١٠٤٧) بەرزكردنەوەی دەرپێو شەرواڵ تا ئاستی نیوەی لاق.** (٥٤٢٠ - ٥٤٣١)

**بَابٌ: فِي رَفْعِ الإِزَارِ إِلى أَنْصَافِ السَّاقَيْنِ**

١٣٥٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: مَرَرْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَفِي إِزَارِي اسْتِرْخَاءٌ، فَقَالَ: «يَا عَبْدَ اللَّهِ ارْفَعْ إِزَارَكَ»، فَرَفَعْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: «زِدْ»، فَزِدْتُ، فَمَا زِلْتُ أَتَحَرَّاهَا بَعْدُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: إِلَى أَيْنَ؟ فَقَالَ: أَنْصَافِ السَّاقَيْنِ. {الحديث: ٥٤٢٩ = ٥٤٢٠ فم} :

**ئیبنو عومەر (رەزای خودای گەورەیان لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **جلەکەم هەنێ شۆڕ بوو، فەرمووی: (ئەی عەبدوڵلا! جلەکەت هەڵکێشە، منیش کەمێك هەڵم کێشا، فەرمووی: (زیاتریش). منیش زیاترم کرد، ئیتر هەرچاوەڕوان بووم کە بزانم تاکوێ هەڵی بکێشم، تا پیاوێ لەیارانی، فەرمووی: (قوربان! هەتا کوێ؟ فەرمووی: (هەتا نیوەی هەردوو لاق).**

{ریاض/٢/٢٨٨، زنجیرە: ١١٩، ژمارە: ٨٠٠}.

**١٤٠٨) خوا بەچاوی سۆزو میهرەبانی تەماشای کەسانێ ناکا کەجلی خۆیان بۆ فیزو دەعیە بەسەر زەویدا رادەکێشن.** (٥٤٢٠ - ٥٤٣١)

**بَابٌ: لَا يَنْظُرُ اللّهُ إِلى مَنْ يَجُرُّ إِزَارَهُ بَطَراً**

١٣٥٩- عَنْ مُحَمَّدِ ابْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، وَرَأَى رَجُلاً يَجُرُّ إِزَارَهُ فَجَعَلَ يَضْرِبُ الأَرْضَ بِرِجْلِهِ، وَهُوَ أَمِيرٌ عَلَى الْبَحْرَيْنِ، وَهُوَ يَقُولُ: جَاءَ الأَمِيرُ جَاءَ الأَمِيرُ! قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى مَنْ يَجُرُّ إِزَارَهُ بَطَرًا». {الحديث: ٥٤٣٠ = ٥٤٢١ فم} :

**موحەممەدی کوڕی زیاد فەرمووی: بیستم لە ئەبو هورەیرە کە فەرمانڕەوای سەر بەحرین بوو، لەسەردەمی ئیمامی عومەردا** (رەزای خودایان لێ بێ) **لەکاتێکا، کە پیاوێکی بینی جلەکەیی بەسەر زەویدا کێش دەکردو پێی دەماڵی بەزەویداو دەیگوت: وامیر هات، وامیر هات، بیستم لە ئەبو هورەیرە لەوکاتەدا دەیفەرموو: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (هەرکەسێ جلو بەرگی خۆی بۆ هەواو**

فیزو دەعیە بەسەر زەویدا بەكێش بكا، خودای گەورە بەچاوی سۆزو میهرەبانی تەماشای ئەو كەسە ناكا). {ریاض/٢/٢٨٨، زنجیرە: ١١٩، ژمارە: ٧٩٩} + {تاج/٣، زنجیرە: ٣٨، ژمارە: ٢٨٣٤}.

**١٠٤٩) سێ جۆرە كەس لەڕۆژی قیامەتدا، خودا لەرووی نازەوە نەقسەیان لەگەڵ دەكاو نە بەچاوی سۆز تەماشایان دەكات.** (٢٨٩ - ٢٩٥)

**بابٌ: ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ**

١٣٦٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ»، قَالَ: فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثَ مِرَاتٍ، قَالَ: أَبُو ذَرٍّ: خَابُوا وَخَسِرُوا، مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الْمُسْبِلُ إزاره، وَالْمَنَّانُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ».
{الحديث: ٢٨٩ = ٣٠٥ فم. بخاري. مساقاة: ٢٢٤٠، ٧٠٠٨}:

ئەبو زەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕۆژی دوا رۆژدا، ئەم سێ جۆرە كەسە، خودا لەرووی نازەوە نەقسەیان لەگەڵ دەكاو نە بەچاوی سۆزو میهرەبانی تەماشایان دەكاو نە تاریفیان دەكا، سەرەڕای ئەوەیش سزایەكی پڕ ئێش و ئازاریان بۆ هەیە). جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ پشتگیری فەرمایشتەكەی خۆی، ئەم ئایەتەی سێ جار لەسەریەك خوێندەوە، كە دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ وَلاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ - سورة آل عمران/ ٧٧}. {تجرید/٣/١٢٧، ژمارە: ١٠٣٦}.

ئەبو زەڕ فەرمووی: رەنجەڕۆو زیانەومەند بوون ئەوانە كێن؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (یەكەم تاقم: كەسێ بۆ فیزو دەعیە داوێنی جلی خۆی دەخشێنێ لە رێگەوبان، دووەم تاقم: منەتكەرێ كە هەرچی چاكەیێ دەكا، دەیداتەوە بەچاودا،

سێیەم تاقم: کەسێ شتومەکی فرۆتەنی بەسوێندی درۆ ساخ دەکاتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٨، ژمارە: ٢٨٣٥} + {ریاض/٢، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٩٤}.

**١٠٥٠) کەسێ جلو بەرگی خۆی بۆ فیزو دەعیە بەکێش بکا.** (٥٤٢٠ - ٥٤٣١)

**بَابٌ: مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ مِنَ الْخُيَلاَءِ**

١٣٦١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الَّذِي يَجُرُّ ثِيَابَهُ مِنَ الْخُيَلاَءِ لاَ يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث: ٥٤٢٢ = ٥٤١٣ فم}:

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (کەسێ بۆ فیزو دەعیە جلو بەرگی خۆی بەکێش بکا، لەڕۆژی قیامەتا خودا بەچاوی مەرحەمەتو سۆزو میهرەبانی تەماشای ناکا). {ریاض/٢/٢٨٠، زنجیرە: ١١٩، ژمارە: ٧٩٢}.

**١٠٥١) جارێ پیاوێ دەنازی بەخۆیەوەو بە دەعیەو فیزەوە دەڕۆی، لەناکاو رۆچوو بەناخی زەویدا.** (٥٤٣٢ - ٥٤٣٦)

**بَابٌ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَتَبَخْتَرُ قَدْ أَعْجَبَتْهُ نَفْسُهُ خُسِفَ بِهِ**

١٣٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي قَدْ أَعْجَبَتْهُ جُمَّتُهُ وَبُرْدَاهُ إِذْ خُسِفَ بِهِ الأَرْضُ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فِي الأَرْضِ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ». {الحديث: ٥٤٣٢ = ٥٤٢٣ فم. بخاری. لباس: ٥٧٨٩}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** جارێ کابرایێ لە پێشینان دەنازێ بەخۆیەوەو بە کاکۆڵو جلەکانیەوەو فیزی پێوە دەکردن، لەپڕ لەوکاتەدا رۆچوو بەناخی زەویدا، ئیتر هەتا رۆژی قیامەت هەڵ دەستێ ئەو کابرایە هەر قوڵتە قوڵت دادەچێ بەناخی زەویداو هەر ناگاتە بنی، تا تۆزێ ستار بگرێ).

## ١٠٥٢) فریشتە ناچنە ماڵێ سەگو وێنەی تیابێ. (٥٤٧٨ - ٥٥١١)

## باب: لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةٌ

١٣٦٣- عَنْ مَيْمُونَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَصْبَحَ يَوْمًا وَاجِمًا، فَقَالَتْ مَيْمُونَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدِ اسْتَنْكَرْتُ هَيْئَتَكَ مُنْذُ الْيَوْمِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَلاَمْ كَانَ وَعَدَنِى أَنْ يَلْقَانِى فَلَمْ يَلْقَنِى أَمَ وَاللَّهِ مَا أَخْلَفَنِى». قَالَ: فَظَلَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَهُ ذَلِكَ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ وَقَعَ فِى نَفْسِهِ جِرْوُ كَلْبٍ تَحْتَ فُسْطَاطٍ لَنَا فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِهِ مَاءً فَنَضَحَ مَكَانَهُ، فَلَمَّا أَمْسَى لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَلاَمْ فَقَالَ لَهُ: «قَدْ كُنْتَ وَعَدْتَنِى أَنْ تَلْقَانِى الْبَارِحَةَ»، قَالَ: أَجَلْ، وَلَكِنَّا لاَ نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةٌ، فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَئِذٍ فَأَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ حَتَّى إِنَّهُ يَأْمُرُ بِقَتْلِ كَلْبِ الْحَائِطِ الصَّغِيرِ، وَيَتْرُكُ كَلْبَ الْحَائِطِ الْكَبِيرِ. {الحديث: ٥٤٨٠ = ٥٤٧٠ فم}:

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەسەر هەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێت) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کش‌و مات بوو، وەك بیر لەشتێ بکاتەوە، منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! دەتبینم ئەمڕۆ شێوەت ئاسایی نییە، خێرە وا ڕاماوی؟ فەرمووی: (جوبرائیل (سڵاوی خودای لێ بێ) بەڵێنی داوە پێم کەبێت بۆ دێنیم، کەچی وانەهات، ئەدیی سوێندم بەخودای گەورە جوبرائیل قەت نەبووە لەگەڵ من بێ بەڵێن دەرچێ).

ئیتر ئەو ڕۆژە پێغەمبەر لەسەر ئەو حاڵە مایەوە، هەتا لەپڕێکا، لەژێر دەوارێکی خۆمانا، تووتەڵە سەگێکی چاو پێ کەوت، فەرمانی کرد، فڕەیان دایە دەرەوە، ئەوجا بەدەستی خۆی ئاوی پرژان لە جێگەکەی، کاتی ئێوارە جوبرائیل سەردانی پێغەمبەر دەکاو پێی دەفەرموێ: (تۆ دوێنێ بەڵێنت دا بەمن کە دێنیم بکەی، خێربوو وا دواکەوتیت؟). جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ وابوو، بەڵام ئێمەی فریشتە ناچینە ناو ماڵێ کە سەگ، یا وێنەی تیابێ). ئیتر هەر ئەو ڕۆژە بۆ بەیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دا بەکوشتنی سەگ،

تەنانەت فەرمانی دا کە سەگی باخی بچووك بکوژرێ، بەڵام سەگی پاسی باخی گەورە نەکوژرێ، چونکە باخی بچووك بەبێ سەگیش دەپارێزرێ بە پێچەوانەی باخی گەورەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٩} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٠٥، ژمارە: ١٦٨٥} + {زنجیرە: ٣٠٥، ژمارە: ١٦٨٦}.

١٣٦٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ تَمَاثِيلُ أَوْ تَصَاوِيرُ». {الحديث: ٥٥١١ = ٥٥٠١ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (فریشتە ناچنە ناوماڵێ کە پەیکەرو وێنەی تیادابێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٢٩٠٨} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٠٥، ژمارە: ١٦٨٤}.

### ١٠٥٣) فریشتە ناچنە ناو ماڵێ کە وێنەی تیابێ، مەگەر وێنەکە نەخشێ بێ بەجل و بەرگەوە بێ. (٥٤٧٨ - ٥٥١١)

### باب: لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ إِلاَّ رَقْمًا فِى ثَوْبٍ

١٣٦٥- عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ عَنْ أَبِى طَلْحَةَ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ»، قَالَ بُسْرٌ: ثُمَّ اشْتَكَى زَيْدٌ بَعْدُ فَعُدْنَاهُ، فَإِذَا عَلَى بَابِهِ سِتْرٌ فِيهِ صُورَةٌ، قَالَ: فَقُلْتُ لِعُبَيْدِ اللَّهِ الْخَوْلاَنِىِّ رَبِيبِ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَلَمْ يُخْبِرْنَا زَيْدٌ عَنِ الصُّوَرِ يَوْمَ الأَوَّلِ؟ ... فَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَلَمْ تَسْمَعْهُ حِينَ قَالَ: «إِلاَّ رَقْمًا فِى ثَوْبٍ». {الحديث: ٥٤٨٤ = ٥٤٧٤ فم}:

بوسری کوڕی سەعید، لەزەیدی کوڕی خالیدەوە لە ئەبو طەلحەی هاوەڵی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (فریشتە ناچنە ناو ماڵێ کە وێنەی تیابێ). بوسر فەرمووی: لەپاشا زەید نەخۆش کەوت، ئێمەش چووین بۆ سەردانی، کە تەماشامان کرد پەردەیێ گیراوەتەوە بە دەرگاکەیەوە، وێنەی پێوە بوو، منیش گوتم بە عوبەیدوڵڵای زڕ کوڕی مەیموونەی

خێزانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەی ئەو ڕۆژە زەید خۆی باسی خراپی وێنەی بۆ نەکردین، کەواتە ئەم وێنانە چییە بەم پەردەیەوە؟ عوبەیدوڵڵا فەرمووی: ئەی گوێت لێ نەبوو، کە لەکۆتایی فەرموودەکەدا فەرمووی: (مەگەر نەخشێ کە بەجلو بەرگەوە بێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٨}.

**ڕوونکردنەوە:**

١. بابەتێکی جوانم سەبارەت بەوێنە نووسیوە، لە تاجدا، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٣١٢، ژمارە: ٢٩٢٢، چاپی چوارەم. هەروا بڕوانە: تجرید/٣، لاپەڕە: ٣٠، ژمارە: ٩٥٥، چ/١.

٢. هەروا بابەتێکی کورتو پوختم، سەبارەت بەڕاگرتنی سەگ نووسیوە، لە تەجریدی بوخاریدا، بەرگی/٥، لاپەڕە: ١٢١، ژمارە: ١٨٢٩ = ٥٤٨٠ فەتحولباری هەتا لاپەڕە: ١٢٣. تەماشاکردنی ئەم دوو بابەتە لە سوودو بەهرەو پاداش خاڵی نابێ.

### ١٠٥٤) پەردەیێ وێنەی پێوەبێ ناباشە، پارچە پارچە بکرێو بکرێ بەپشتی. (٥٤٧٨ - ٥٥١١)

### بَابٌ: كَرَاهِيَةُ السِّتْرِ فِيهِ التَّمَاثِيلُ وَقَطْعُهُ وَسَائِدَ

١٣٦٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ سَتَرْتُ سَهْوَةً لِي بِقِرَامٍ فِيهِ تَمَاثِيلُ، فَلَمَّا رَآهُ هَتَكَهُ، وَتَلَوَّنَ وَجْهُهُ، وَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ أَشَدُّ النَّاسِ عَذَابًا عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللَّهِ تَعَالَى»، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقَطَعْنَاهُ فَجَعَلْنَا مِنْهُ وِسَادَةً أَوْ وِسَادَتَيْنِ. {الحديث: ٥٤٩٤ = ٥٤٨٦ فم. بخاری. لباس: ٥٩٥٤. نسائی. زينة: ٥٣٧١}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، کولێنێکم هەبوو، پەردەیەکم پیادابوو، پەردەکە وێنەی پێوە بوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی بینی، دڕیو ڕەنگی گۆڕاو رووی گرژبوو. فەرمووی: (ئەی

عائیشه! ئەوانەی کە لەقیامەتا، سزاو ئێش‌و ئازاریان لەهەموو کەس سەختترە، ئەو کەسانەن کە دەیانەوێ، لاسکایی خودا بکەنەوەو لەشێوەی دروستکراوەکانی خودا دروست بکەن!).

عائیشە فەرمووی: ئیتر پەردەکەمان دادڕی‌و سەرینێ، دوو سەرینمان لێی دروست کرد. {تاج/٣، زنجیره: ٥٠، ژماره: ٢٩١٥}.

١٣٦٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ سَفَرٍ وَقَدْ سَتَّرْتُ عَلَى بَابِي دُرْنُوكًا فِيهِ الْخَيْلُ ذَوَاتُ الأَجْنِحَةِ، فَأَمَرَنِي، فَنَزَعْتُهُ. {الحديث: ٥٤٨٩ = ٥٤٧٩ فم}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەرێ گەڕایەوە، قاڵیچەیەکم کردبوو بە پەردەو دابووم بەسەر دەرگاکەمدا، قاڵیچەکە وێنەی ماینی باڵداری پێوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێم کرد لە دەرگاکەم کردەوە). {تاج/٣، زنجیره: ٥٠، ژماره: ٢٩١٦، چ/٤}.

## ١٠٥٥) قاڵیچەیێ وێنەی پێوە بێ، بکرێ بە دۆشەکەڵەو مەندەر
## بَابٌ: النُّمْرُقَةُ فِيهَا تَصَاوِيرُ اتِّخَاذُهَا مَرَافِقَ

١٣٦٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّهَا اشْتَرَتْ نُمْرُقَةً فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَلَمَّا رَآهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَامَ عَلَى الْبَابِ وَلَمْ يَدْخُلْ فَعَرَفْتُ - أَوْ فَعُرِفَتْ - فِي وَجْهِهِ الْكَرَاهِيَةُ، فَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، فَمَاذَا أَذْنَبْتُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا بَالُ هَذِهِ النُّمْرُقَةِ»؟ قَالَتْ: اشْتَرَيْتُهَا لَكَ تَقْعُدُ عَلَيْهَا وَتَوَسَّدُهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ، وَيُقَالَ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ»، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ الْبَيْتَ الَّذِي فِيهِ الصُّوَرُ لاَ تَدْخُلُهُ الْمَلاَئِكَةُ »، وفي رواية: فَأَخَذْتُهُ فَجَعَلْتُهُ مِرْفَقَتَيْنِ، فَكَانَ يَرْتَفِقُ بِهِمَا فِي الْبَيْتِ. {الحديث: ٥٥٠٠ = ٥٤٩٠ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٥٥ = ٢١٠٥، ٣٢٢٤، ٥١٨١، ٥٩٥٧، ٥٩٦١، ٧٥٥٧}:

عائیشە دایکی باوەڕداران (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قاڵیچەیەکم کڕی، وێنەی پێوە بوو، کاتێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلام، قاڵیچەکەی بینی ڕاخراوە، ئیتر نەهاتە ژوورەوە، لەبەر دەرگاکە ڕاوەستا، هەستم کرد کە زیزیو زویری بە ڕوویەوە دیارە، لەبەرئەوە عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! چی گوناهێکم کردووە کەتۆ والێم زوویری تەوبەی لێ دەکەم لەسەر دەستی خوداو لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەیدا؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم قاڵیچەیە چییە؟) عەرزیم کرد: کڕیومە بۆ تۆ هەتا لەسەری دابنیشیو شانی لەسەر دادەیت! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕاستیدا خاوەنانی ئەم وێنانە لەڕۆژی قیامەتدا سزا دەدرێن، پێیان دەگوترێ، لەسەر شێوەی تەعجیزو دەسەوسانکردن پێیان دەگوترێ: ئەم دروستکراوانەی خۆتان زیندوو بکەنەوە!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (هەر ماڵێ وێنەی تیادابێ، فریشتەی ڕەحمەت ناچنە ناوی).

لە گێڕانەوەیەکدا، عائیشە دەفەرموێ: (منیش هێنامو کردم بەدوو پشتی، پێغەمبەر لەماڵەوە شانی دائەدا لەسەریان).

## ١٠٥٦) سزای وێنەگران لەڕۆژی دوا ڕۆژا
## بَابٌ: عَذَابُ الْمُصَوِّرِينَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

١٣٦٩- عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِى الْحَسَنِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّى رَجُلٌ أُصَوِّرُ هَذِهِ الصُّوَرَ فَأَفْتِنِى فِيهَا، فَقَالَ لَهُ: ادْنُ مِنِّى، فَدَنَا مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: ادْنُ مِنِّى، فَدَنَا حَتَّى وَضَعَ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ، وَقَالَ: أُنَبِّئُكَ بِمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «كُلُّ مُصَوِّرٍ فِى النَّارِ، يَجْعَلُ لَهُ بِكُلِّ صُورَةٍ صَوَّرَهَا نَفْسًا فَتُعَذِّبُهُ فِى جَهَنَّمَ»، وَقَالَ: إِنْ كُنْتَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً فَاصْنَعِ الشَّجَرَ وَمَا لاَ نَفْسَ لَهُ. {الحديث: ٥٥٠٦ = ٥٤٩٦. تجريد/٣، لاپەڕە: ٦٤، رقم: ٩٩٤ = ٢٢٢٥، ٥٩٦٣، ٧٠٤٢}:

سەعیدی كوڕی ئەبولحەسەن (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ هاتە خزمەتی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) عەرزیكرد: قوربان! من وێنە كێشم، ئەم وێنانە دەكێشم، ئایا تۆ ڕەوایان دەبینی؟ ئەویش پێی فەرموو: لێم وەرە پێشەوە، پیاوەكەش چووە پێشەوە بۆلای، فەرمووی: وەرە پێشتریش، پیاوەكەش چووە پێشتر، ئینجا ئیبنو عەبباس دەستی دانا لەسەر سەریو فەرمووی: چیم بیستووە ئەوەت پێ دەڵێم: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەموو وێنەگرێ لە ئاگری دۆزەخدا دەبێ، هەریەكێ لەو وێنانەی كە لە جیهاندا دروستی كردوون، دەیكەن بەكەسێو دەیكەن بە كوڵكیەوە، لەناو دۆزەخدا ئەشكەنجەو ئازاری دەدا).

ئیبنو عەبباس پێی فەرموو: خۆ ئەگەر هەرچارت نییەو ئەم ئیشە هەردەكەیت، بۆ دابینكردنی گوزەرانت، ئەوا وێنەی دارو درەختو ئەم بابەتانە بگرە، كەبێ گیانو گیانیان لەبەردا نییە). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٧، چ/٤} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٠٥، ژمارە: ١٦٨٠}.

## ١٠٥٧) هەڕەشەی سەخت لە وێنەكێشان
## بَابٌ: التشديدُ علَى المُصَوِّرِين

١٣٧٠- عَنْ أَبِى زُرْعَةَ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِى هُرَيْرَةَ فِى دَارِ مَرْوَانَ فَرَأَى فِيهَا تَصَاوِيرَ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ خَلْقًا كَخَلْقِى فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا شَعِيرَةً». {الحديث: ٥٥٠٩ = ٥٥٠٠ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٩٨، رقم: ١٩١٣ = ٥٩٥٣، ٧٥٥٩ فتح الباری}:

ئەبو زورعە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) چووم بۆ ماڵی مەڕوانی كوڕی حەكەم، كاتێ فەرمانڕەوای مەدینە بوو، ئەبو هورەیرە لەوێ چەند وێنەیەكی نەخشاوی بەدیوارێكەوە بینی، فەرمووی: بیستم لەحەزرەت

(درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: دەبێ کێ لەو کەسە ستەمکارتر بێ کەدەچێ دروستکراوێ دروست دەکا، وەك دروستکراوانی من، ئەگەر ئەوان راست ئەکەن‌و درۆ ناکەن فەرموون با مێرووچەیێ دروست بکەن، یا گەردیلەیێ دروست بکەن، یا دەنکە جۆیێ دروست بکەن). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٤، چ/٤} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٠٥، ژمارە: ١٦٨٣}.

## ١٠٥٨) رێگری لە ئەنگوستیلەی زێڕو خواردنەوە بە قاپی زیوین‌و لەبەرکردنی ئاورێشم‌و دیباج. (٥٣٥٦ - ٥٣٩٥)

## بَابٌ: النهى عَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ والشُّرْبِ بِالفِضَّةِ ولُبْسِ الحَرِيرِ وَالدِّيباجِ

١٣٧١- عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ، أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجَنَائِزَ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ أَوِ الْمُقْسِمِ، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِى، وَإِفْشَاءِ السَّلاَمِ، وَنَهَانَا عَنْ خَوَاتِيمَ أَوْ تَخَتُّمٍ بِالذَّهَبِ، وَعَنْ شُرْبٍ بِالْفِضَّةِ، وَعَنِ الْمَيَاثِرِ، وَعَنِ الْقَسِّىِّ وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالإِسْتَبْرَقِ، وَالدِّيبَاجِ. {الحديث: ٥٣٥٦ = ٥٣٤٧ فم. تجريد/٢/٢٢، رقم: ٦٠٠ = ١٢٣٩، ٢٤٤٥، ٥١٧٥، ٥٦٣٥، ٥٦٥٠، ٥٨٣٨، ٥٨٤٩، ٥٨٦٣، ٦٢٢٢، ٦٦٥٤. ترمذی. لباس: ١٧٦٠. نسائی. جنائز: ١٩٣٨. تحفة الأشراف: ١٩١٦}:

بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێکردووین بەحەوت شت، وە جڵەوگیری لێکردووین لەحەوت شت، فەرمانی پێکردووین بەم حەوت شتە:

١ - بەسەردانی نەخۆش‌و.

٢ - بەشوێنکەوتنی تەرم بۆسەر گۆڕستان بۆ سپاردنی بەخاك‌و.

٣ - بەنزا بۆ پژمیو، کە پژمیو دەپژمێ، پێی بڵێین (يَرْحَمُكَ اللّهُ: خودا ڕەحمەت پێ بکا)و.

٤ - بە بەجێهێنانی سوێندو.

٥ - بە یاریدەو کۆمەکی ستەمبارو.

٦ - بەچوون بۆسەر دەعوەت‌و.

٧- به پەخشی سلاو.

وه جلەوگیریشی لێ کردووین لەم حەوت شته:

١/ له ئەنگوستیلەی زێڕو.

٢/ له خواردنو خواردنەوه له حاجەتی زیوداو.

٣/ لەسەر زینی ئاورێشمو.

٤/ له کالاو مشکیو هەوری تێکەڵ له ئاورێشمو لەشتی ترو.

٥/ له پۆشینی ئاورێشمو.

٦/ له ئیستەبرەق (ئاورێشمی ئەستوور)و.

٧/ له دیباج (جۆره ئاورێشمێکه). {تاج/٣، زنجیره: ٣٣، ژماره: ٢٨٠٠، چ/٤}.

## ١٠٥٩) فڕێدانی ئەنگوستیلەی زێڕ. (٥٤٣٧ - ٥٤٦٠)

## بابٌ: فِي طَرْحِ خَاتمِ الذَّهَبِ

١٣٧٢- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ فِي يَدِ رَجُلٍ فَنَزَعَهُ فَطَرَحَهُ، وَقَالَ: «يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ إِلَى جَمْرَةٍ مِنْ نَارٍ فَيَجْعَلُهَا فِي يَدِهِ»، فَقِيلَ لِلرَّجُلِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): خُذْ خَاتَمَكَ انْتَفِعْ بِهِ، قَالَ: لاَ وَاللَّهِ لاَ آخُذُهُ أَبَدًا وَقَدْ طَرَحَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث: ٥٤٣٩ = ٥٤٢٩ فم}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەستی پیاوێکا ئەنگوستیلەیەکی زێڕی دی، ئەنگوستیلەکەی له پەنجەی داکەندو تووڕی داو فەرمووی: (ئەوه بۆ هەندێ کەس لەئێوه دەچێ پەلاماری سکڵێ ئاگری سوور دەداو خودسەر دەیکاته دەستی! لەپاشا که پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی برد خەڵکەکه به پیاوەکەیان گوت: ئەنگوستیلەکەت هەڵبگرەوه، به کەڵکی شتێکت دێ، فەرمووی: نا، بەخودا بِبڕای ببڕای شتی واناکەم، شتێ که پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تووڕی بداو من بچم هەڵی بگرمەوه شتی وا نەبووەو نەدەبێ). {تاج/٣، زنجیره: ٣٥، ژماره: ٢٨٠٩، چ/٤}.

١٣٧٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ عُمَرْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) اصْطَنَعَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ فَكَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّهِ إِذَا لَبِسَهُ، فَصَنَعَ النَّاسُ، ثُمَّ إِنَّهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَنَزَعَهُ، فَقَالَ: «إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتِمَ، وَأَجْعَلُ فَصَّهُ مِنْ دَاخِلٍ»، فَرَمَى بِهِ، ثُمَّ قَالَ: «وَاللَّهِ لاَ أَلْبَسُهُ أَبَدًا»، فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ. {الحديث: ٥٤٤٠ = ٥٤٣٠ فم. بخاري. أيمان ونذور: ٦٦٥١. نسائى. زينة: ٥٣٠٥. تحفة الأشراف: ٨٢٨١}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی زێڕی بۆ خۆی دروست کرد، کە لەپەنجەی دەکرد، نقێمەکەی دەکردە بەری لەپی، ئیتر خەڵکیش چاویان لەوکردو گەلێ کەسی تریش ئەنگوستیلەی زێڕیان دابەدروستکردن جا پێغەمبەر (د.خ) سەرکەوتە سەر دوانگەو ئەنگوستیلەکەی لە پەنجەی داکەندو، لەپاش سوپاس‌و ستایشکردنی خودای گەورە فەرمووی: (هەرچەندە من خۆم ئەم ئەنگوستیلەیەم دروست کردبوو لەزێڕ بۆ خۆم‌و لەکاتی لەدەستکردندا، نقێمەکەیم دەکردە بەری دەستم بەڵام ئەوا فرێی دەدەم) وە ئەموستیلەکەی فرێداو فەرمووی: (سوێندم بەخودا ئیتر قەت ئەموستێلەی زێڕ لەدەست ناکەم).

ئەنجا هاوەڵانیش هەرکەسە لەلای خۆیەوە ئەنگوستێلە زێڕەکەی خۆیی فرێدا. {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨٠٩، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٠٦٠) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی زیوی لەدەستدا بوو، نەخشی نقێمەکەی ئەم وشە پیرۆزە بوو (محمد رَسُولَ اللَّهِ) جێنشینەکانی لەپاش خۆی هەمان ئەنگوستیلەیان لەدەست کرد

**باب: لَبْسُ النَّبِى (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَاتماً مِنْ وَرِقٍ نَقْشُهُ (محمد رَسُولَ اللَّه) ولبس الخُلَفاءِ مَنْ بَعْدِهِ**

١٣٧٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ، فَكَانَ فِي يَدِهِ، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ)، ثُـمَّ كَانَ فِي يَدِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، حَتَّى وَقَعَ مِنْهُ فِي

بئْرِ أَرِيسٍ، نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. {الحديث: ٥٤٤٣ = ٥٤٣٣ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٩٣، رقم: ١٩٠٢ = ٥٨٧٧، ٥٨٧٣. تحفة الأشراف: ٧٩٤٢}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی لەزیو دروست کرد، دەیکردە دەستی، هەتا خۆی مابوو، لەدەستی خۆیدا بوو، کەخۆی مرد، لەدەستی یەکەم جێنشینیدا بوو، کە ئەبوبەکری صەدیق بوو، کە ئەویش مرد، لەدەستی عومەری کوڕی خەطابدا بوو، کە جێنشینیی دووەمی بوو، کە ئەویش مرد، لەدەستی عوثمانی کوڕی عەففاندا بوو، کە جێنشینی سێیەم بوو، لەدەستی عوسماندا بوو، هەتا شەش ساڵ لە جێنشینییەکەی ڕۆیشت، ئەوسا کەوتە ناو بیری ئەریسەوە، ئیتر ڕەشەڕا هات، نەخشەکەی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) بوو. {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨١٣، ٢٨١٤، ٢٨١٥، ٢٨١٦}.

١٣٧٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ وَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، وَقَالَ: لِلنَّاسِ: «إِنِّي اتَّخَذْتُ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، وَنَقَشْتُ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. فَلاَ يَنْقُشْ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِهِ». {الحديث: ٥٤٤٥ = ٥٤٣٥ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٩٢، رقم: ١٩٠٢ = ٥٨٧٧، ٦٥ فتح الباری}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی زیوینی دروست کردو وشەی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)ی لێ نەخشاند، ئەوجا فەرمووی: (من ئەموستیلەیەکی زیوینم لەلای وەستا بۆ خۆم دروست کردووە، بەفەرمانی خۆم وەستاکە مۆری (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)ی لێ هەڵکەندووە، بەڵام نابێ کەسی تر چاو لەمن بکاو ئەم مۆرە لە ئەموستیلەی خۆی هەڵبکەنێ، تاکێشەی لەیەکچوونو ئیلتیباس دروست نەبێو کەسانێ بەناوی منەوە نامە نەنووسن بۆ خەڵکانی تر). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨١٣}.

١٣٧٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى كِسْرَى وَقَيْصَرَ وَالنَّجَاشِيِّ، فَقِيلَ: إِنَّهُمْ لاَ يَقْبَلُونَ كِتَابًا إِلاَّ بِخَاتِمٍ، فَصَاغَ رَسُولُ اللَّهِ

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) خَاتَمًا حَلَقَةً فِضَّةً، وَنَقَشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. {الحديث: ٥٤٤٩ = ٥٤٣٩ فم}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی نامە بنێرێ بۆ کیسراو بۆ قەیسەرو بۆ نەجاشی، کە یەکەم پادشای وڵاتی فارس بوو، دووەم پادشای وڵاتی رۆم بوو، سێیەم پادشای وڵاتی حەبەشە بوو، کە خۆیان‌و گەلەکانیان بانگ بکا بۆ قەبووڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، عەرزیان کرد: هەرنامەیێ مۆر نەکرابێ‌و مۆری خاوەنەکەیی پێوە نەبێ، ئەمانە وەری ناگرن، جا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای وەستا ئەنگوستیلەیەکی دارِشت، ئەڵقەکەی زیو بوو، وە مۆری (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه: موحەممەد پێغەمبەری خودایە)ی لێ نەخشاند). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨١٢، چ/٤}.

## ١٠٦١) ئەنگوستیلەی زیو، نقێمەکەی بەردی ئەقیقی حەبەشی بێ، ئەنگوستیلە بکرێتە دەستی راست. (٥٤٣٧ - ٥٤٦٠)

## باب: فِي خَاتِمُ الورق فصُّه حَبَشِيٌّ والتَخَتم بِالْيَمِين

١٣٧٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لَبِسَ خَاتَمَ فِضَّةٍ فِي يَمِينِهِ فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ كَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ. {الحديث: ٥٤٥٤ = ٥٤٤٤ فم. أبو داود. خاتم: ٤٢١٩. نسائي. زينة: ٥٢٣١، ٥٣٠٣}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی زیوینی دەکردە دەستی راستی، نقێمەکەی لەبەردی حەبەشە بوو، نقێمەکەی دەکردە بەری لەپی). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨١٦}.

## ١٠٦٢) ئەنگوستیلە بکرێتە پەنجە تووتەی دەستی چەپ

## باب: فِي لَبْسِ الخَاتِمُ فِي الْخِنْصَرِ مِنْ اليَدِ الْيُسْرَى

١٣٧٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ خَاتِمُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي هَذِهِ، وَأَشَارَ إِلَى الْخِنْصَرِ مِنْ يَدِهِ الْيُسْرَى. {الحديث: ٥٤٥٦ = ٥٤٤٦ فم. بخاري. لباس: ٥٨٧٤}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم ئەنگوستەیدا بوو، واتە: لە پەنجە تووتەی دەستی چەپیدا بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨١٧، چ/٤}.

**١٠٦٣) رێگە نەدراوە کە ئەموستیلە بکرێتە پەنجەی ناوەڕاستو پەنجەی شایەتمان کەوا لەپاڵیدا.** (٥٤٣٧ - ٥٤٦٠)

**باب: فِي النَّهْيِ عَنِ التَّخَتُّمِ فِي الوُسْطَى وَالتَّتِي تَلِيهَا**

١٣٧٩- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ أَتَخَتَّمَ فِي إِصْبَعِي هَذِهِ أَوْ هَذِهِ، قَالَ: فَأَوْمَأَ إِلَى الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِيهَا. {الحديث: ٥٤٦٠ = ٥٤٥٠ فم. بخاري. لباس: ٥٨٣٨ز أبو داود. خاتم: ٤٢٢٥. ترمذي. لباس: ١٧٨٦. نسائي. زينة: ٥٣٩١. ابن ماجه. لباس: ٣٦٤٨. تحفة الأشراف: ١٠٣١٨}:

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی پێم نەدا کە ئەموستیلە بکەمە ئەم دوو پەنجەیەم: ئەمەو ئەمە، واتە: قامکی ناوەڕاستو پەنجەی دۆشاو مژە کەوا لەپاڵیا). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨١٩، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**روونکردنەوە:**

١- ئەموستیلەی زێڕ بۆ نێرینە نادروستەو حەرامە.

٢- ئەموستیلەی زیو سوننەتە بۆ پیاو، وا سوننەتە سەنگەکەی نەگاتە مسقاڵێ، کاتێ دەیکاتە پەنجەی بیسمیللا بکا. زاناکان دەفەرموون: (التسمية على كل حال) واتە: حاڵێ ذی بال.

٣- سوننەتە بۆ پیاو بۆ ژن ئەنگوستیلە بکاتە پەنجە تووتەی دەستی چەپی، یا بیکاتە پەنجە تووتەی دەستی راستی.

٤- بۆ پیاو ناباشە ئەموستیلە بکاتە پەنجەی ناوەڕاست، یا بیکاتە پەنجەی شایەتمانی، بەڵام کەراهەتی تەنزیهییە، نەوەك کەراهەتی تەحریمی.

٥ - بۆ پیاو (بێجگە لەزێڕ) لەهەموو کانزایەکی تر ئەموستیلە دروستە، وەك: ستیلو ئەڵماسو شەوەو ئاسنو مسو وەرشاوو پلاتینو پۆڵاو زەردو زیوو برنجەو مەفرەقو کریستاڵو عاجو شتی تری وا، گەرچی باشتر وایە کەزیو بێ.

٦ - دروستە پیاو چەند ئەموستیلەیێ لەدەست بکا، یا بیکاتە پەنجەکانی هەردوو دەستی، جگە لە پەنجەی ناوەڕاستو پەنجەی دۆشاو مژە، بەڵام وا باشە زیادە ڕەوی نەبێ.

٧ - بۆ مێیینە ئەموستیلە لەزێڕو لەزیوو لەهەموو کانزایەکی تر دروستە، وە دروستە کە بیشیکاتە گشت پەنجەکانی، چی هی دەستی، چی هی پێی، دروستە بیکاتە هەر بیست پەنجەکانی.

٨ - دروستە زەنگیانەو موورو شتی وا، بهۆنرێتەوەو بکرێ بە ئەنوستیلەو بکرێتە پەنجە، بەمەرجێ بۆ پیاو نەبێ بەلاسکایی ژنانو زیان نەدا لە مرووەتی. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە:٤٧، لاپەڕە: ٢٩٨، ژمارە: ٢٨٩١ + ٢٨٩٢ + ٢٨٩٣ + ٢٨٩٤ + ٢٨٩٦}.

٩ - سوننەتە نقێمی ئەنگوستیلە بکرێتە بەری دەست، بۆ پیاوو بۆ ژن، چونکە پەیڕەویی پێغەمبەری واتیادا، بەڵام دروستە نقێم بکرێتە پشتی دەستیش، بەبێ کەراهەتو ناباشی.

١٠ - سوننەتە بۆ پیاوو بۆ ژن ناوی خۆی بکا بە مۆرو نەخشی ئەنگوستیلەکەیو لەکاتی نامە نووسینو شتی وادا بەوە مۆری بکا، یا کتێبو شتی خۆیی پێ دیاریو نیشانە بکات.

١١ - دروستە لەسەر شێوەی پەسەند، کە ئەم جۆرە رستانە، یا واتاکەی یان، بەکوردی، یا بە فارسی، یا بەزمانێ تر، بکرێن بە نەخشی ئەموستیلە، وەك: (الحمد الله) و (اللهُ المَلِكُ) و (بالله) و (بسم الله) و (العزة للهِ) و (حسبی الله). {فتح الباری/لباس}.

١٢ - واباشە هەر ئەموستیلەیێ، ناوی خودا، یا ناوی پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران، یا ئایەتێ، یا هەر شتێکی تری پیرۆزی لێ هەڵ کەنرابێ، لەکاتی تارات گرتندا دابکەنرێ، لەکاتی بێنوێژییو لەشپیسیدا لەدەست نەکرێ. {فتح الباری. رقم: ٥٨٧٧}.

١٣ - دروسته بۆ پیاوو بۆ ژن چەند ئەموستیلەیێ لەدەست بکا، وەزیاتر لەیەك ئەموستیلەیش بکاتە یەك پەنجەی، هەرکەسەیان بەپێی مەرجی خۆی.

١٤ - دروسته ئەمانە بکرێن بە نقێمی ئەنگوستیلە:

١ - هەموو بەردە بەنرخەکان، وەك شەوەو ئاقیقو پیرۆزەو لاجیوەو دو شیلانو مرواریو مەرجانو مەڕ مەڕو مووروووە شینە.

٢ - هەموو جۆرە مووروو کانزایەکی تر دروسته بکرێن بە نقێم.

**تێبینی:**

ئەم بڕیارانەم لە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیمو فەتحولباریو فەتحولمولوعین، باسی هەینیو موغنی موحتاج باسی هەینیو چەندین سەرچاوەی تر وەرگرتووە، هیچیانم لەخۆمەوە نەگوتووە، گەرچی لەزۆر لەم بڕیارانەدا راجیایی زۆر هەیە، بەڵام ئەمەی من نووسیومە جێگەی متمانەیە.

دروسته کڕینو فرۆشتنو سەوداو مامەڵە بە ئەموستیلەوە بکرێ، با زێڕیش بێ، ئەڵقەیش هەر دادەنرێ بە ئەموستیلە، دروسته زەڕەنگەرو ئەمانە ئەموستیلە، لەهەموو جۆرێ دروست بکەنو بیفرۆشن، شتی وا کارێ حەلاڵو پەسەندە. باوی جوانی ناو کۆمەڵ، کە لەشەرعا پێی دەگوترێ عورفی دروست، لەبابەتی ئەموستیلەدا رۆڵێکی کاریگەری هەیە بۆ چۆنێتی بڕیارەکەی!.

**١٠٦٤) باسی پێڵاوو زۆرکردنی پێڵاو.** (٥٤٦١)

**بابٌ: ماجاءَ فِي الإنْتِعَالِ وَالإسْتِكْثَارِ مِنَ النِّعَالِ**

١٣٨٠- عَنْ جَابِرِ بْن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ فِي غَزْوَةٍ غَزَوْنَاهَا: «اسْتَكْثِرُوا مِنَ النِّعَالِ، فَإِنَّ الرَّجُلَ لاَ يَزَالُ رَاكِبًا مَا انْتَعَلَ». {الحديث: ٥٤٦١ = ٥٤٥١ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە غەزایەکا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (پێڵاو زۆرکەن، چونکە

پیاو ئەگەر پێڵاوی لەپێدابێ بەسوارە حلێب دەکرێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٢٨٢٢، چ/٤}.

**١٠٦٥) کاتێ مرۆڤ پێڵاو لەپێ دەکا، بەپێی ڕاست دەست پێ بکا، کاتێ پێڵاو دادەکەنێ بەپێی چەپ دەست پێ بکا.** (٥٤٦٢ - ٥٤٦٥)

**بابٌ: إِذَا انْتَعَلَ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُمْنَى، وَإِذَا خَلَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ**

١٣٨١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُمْنَى، وَإِذَا خَلَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، وَلْيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا». {الحديث: ٥٤٦٢ = ٥٤٥٢ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٩٢، رقم: ١٩٠٠ = ٥٨٥٥ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٤٣٧٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کە پێڵاو لەپێ دەکەن لەپێشا بیکەنە پێی ڕاستتان، لەکاتی پێڵاو داکەندنیشدا، لەپێشدا پێی چەپ داکەنن، بەشێوەی گشتیش یا هەردوو تاکی پێڵاو لەپێ بکەن، یان هەردوو تاکەکەی لەپێ داکەنن، لەبەر ناچاری نەبێ بەیەك تاك پێڵاوەوە مەڕۆن). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٢٨٢٣، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**١٠٦٦) ڕێگری کراوە لەڕۆیشتن بەتاکێ پێڵاوەوە.** (٥٤٦٢ - ٥٤٦٥)

**باب: النَّهي عَنْ المشي في نعلٍ واحدةٍ**

١٣٨١ب- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « لا يمش أحدُكُمْ في نعلٍ واحدةٍ، لِيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا». {الحديث: ٥٤٦٣ = ٥٤٥٣ فم. تجريد/٥، رقم: ١٩٠١ = ٥٨٥٦ فتح الباري. أبو داود. لباس: ٤١٣٦. ترمذي. لباس: ١٧٧٤. تحفة الأشراف: ١٣٨٠٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەشێوەی گشتی، لەبەر ناچاری نەبێ، بەیەك تاك پێڵاوەوە مەڕۆن، یاهەردوو تاکەکەیان پێکەوە لەپێ بکەن‌و پێیانەوە بڕۆن، یا هەردوو تاکەکان پێکەوە دابکەنن‌و ئەوسا بڕۆن). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٢٨٢٣}.

### ١٠٦٧) قوچکە تاش ناپەسەندە. (٥٥٢٤ - ٥٥٢٧)

### بابٌ: النَّهْيُ عَنِ الْقَزَعِ

١٣٨٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنِ الْقَزَعِ، قَالَ: قُلْتُ لِنَافِعٍ: وَمَا الْقَزَعُ؟ قَالَ: يُحْلَقُ بَعْضُ رَأْسِ الصَّبِيِّ وَيُتْرَكُ بَعْضٌ. {الحديث: ٥٥٢٤ = ٥٥١٥ فم. تجريد/٥/١٩٦، رقم: ١٩٠٨ = ٥٩٢٠، ٥٩٢١ فتح الباري}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی دەکرد لە قۆچکە تاش. راوی دەفەرموێ: عەرزی نافیعم کرد، کە ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە: قۆچکە تاش چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەتانێ کەسەری منالێ هەندێکی بتاشرێو هەندێکی نەتاشرێو قژەکەی بهێڵرێتەوە، وەك ئەوە: لەپێشە سەریو لەلاجانەکانی دەتاشرێو ئەوی تری ناتاشرێ دەکرێ بە گودیلە. {تاج/٣، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢٨٦٨ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٩٥، ژمارە: ١٦٣٨، ١٦٣٩}.

### ١٠٦٨) جلەوگیریی لە قژدانە دەم قژ (زلفە قیرینە). (٥٥٣٠ - ٥٥٤٦)

### بابٌ: النَّهْيُ عَنْ وَصْلِ الشَّعْرِ لِلْمَرْأَةِ

١٣٨٣- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ لِي ابْنَةً عُرَيِّسًا، أَصَابَتْهَا حَصْبَةٌ فَتَمَرَّقَ شَعْرُهَا أَفَأَصِلُهُ؟ فَقَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ». {الحديث: ٥٥٣٠ = ٥٥٢١ فم. بخاري. لباس: ٥٩٣٥، ٥٩٣٦، ٥٩٤١. نسائي. زينة: ٥٢٥٠، ٥١٠٩. ابن ماجة. نكاح: ١٩٨٨. تحفة الأشراف: ١٥٧٤٧}:

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ژنێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کچێکم هەیە دەچێ بە بووکی، ئاوڵەی گرتووە قژە سەرەکەی رووتاوەتەوە، مێردەکەی دەیەوێ بیگوێزێتەوە، جا ئایا رێگەم دەدەی کە قژی تر بدەمە دەم قژەکەی بۆ کاتی گواستنەوەکەی؟ فەرمووی: (نەء، نابێ، لەعنەتو نەفرەتی خودا لەو ژنەبێ

کەقژ دەداتە دەم قژی تر بۆ ژنێکی ترو لەو ژنەیش بێ کە دەیەوێ قژی تر بداتە دەم قژی خۆی). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٩٦، ژمارە: ١٦٤٢}.

**١٠٦٩) هەڕەشەکردنو سەرکۆنە کردنی ژن لەسەرئەوە کەشتی تر ببەستێ بەسەریەوە.** (٥٥٣٠ - ٥٥٤٦)

**باب: في الزَّجْرِ أنْ تصِلَ الْمَرْأةُ بِرأسِها شيْئًا**

١٣٨٤- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: زَجَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنْ تَصِلَ الْمَرْأَةُ بِرَأْسِهَا شَيْئًا. {الحديث: ٥٥٤٢ = ٥٥٣٣ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڕەشە دەکا لەو ژنە کەشت دەلکێنێ بەسەری خۆیەوە، لەباتی قژ).

١٣٨٥- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِى سُفْيَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) عَامَ حَجَّ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: وَتَنَاوَلَ قُصَّةً مِنْ شَعَرٍ كَانَتْ فِى يَدِ حَرَسِيّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذِهِ، وَيَقُولُ: «إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَ هَذِهِ نِسَاؤُهُمْ». {الحديث: ٥٥٤٣ = ٥٥٣٤ فم. بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٤٦٨، ٥٩٣٢. أبو داود. ترجل: ٤١٦٧. ترمذى. أدب: ٢٧٨١. نسائى. زينة: ٥٢٦٠. تحفة/ ١١٤٠٧}:

حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەوساڵە کە موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خودای گەورە لەهەموویان بێ) حەجی کرد، لەسەر دوانگەکەی مزگەوتەکەی پێغەمبەر لەمەدینە، گوڵێ مووی لە پاسەوانێ وەرگرتو گرتی بەدەستیەوەو گوێم لێ بوو وتارێکی خوێندەوەو لەڕووی بێزاریو گلەییەوە فەرمووی: زاناکانتان لەکوێن، چۆن شتی وا نارەوا روودەداو ئەوان دەنگ ناکەنو بێزاری لێ دەرنابڕن، من بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیستووە (درودی خوای لەسەر بێ) کەڕێگەی شتی وای نەداوەو دەیفەرموو (درودی خودای لەسەر بێ): (نەوەی ئیسرائیل ئەوکاتە سەریان تیاچوو کە ژنەکانیان فێری ئەم جۆرە شتانە بوون). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٩٦، ژمارە: ١٦٤٣}.

**روونکردنەوە:**

١ - قژدانە دەم قژ لەم کاتانەدا نادروستەو حەرامە:

أ/ قژە لکاوەکە هی ئادەمیزاد بێ، چی هی پیاوبێ، چی هی ژن بێ، چی هی زیندوو بێ، چی هی مردوو بێ.

ب/ مووە، یا خورییە لکاوەکە هی ئاژەڵێکی مردارەوەبوو بێو سەرنەبڕابێو لەپاش مردارەوە بوون لێی کرابێتەوە.

ج/موو وخوریو تووکی گیانداری بێ کە گۆشتی نەخورێ، ئیتر لەپێش مردارەوە بوونیدا، یا لەپاش مردارەوە بوونی ئەو کوڵكو مووەی لێ کرابێتەوە جیاوازی نییە چونکە پیسەو حەرامە.

٢ - مووی پاك، کەهی مرۆڤ نەبێ، قسەی دروست ئەوەیە کە دروستە، بەتایبەتی ئەگەر مێرد رەزای لەسەر بێ، هەروا خوری.

٣ - بەهەموو شتێکی تری پاك دروستە، وەك خەیاتەی ئاورێشمو هەندێ گیای تایبەت، کە بۆ جوانیو رازانەوە بێو بۆ تەفرەو هەڵخەڵەتان نەبێ، تەنانەت لەهەندێ کاتا کارێکی باشە، کەببێ بەهۆی شاردنەوەی نەنگ، وەك کەچەڵیو صەلعو سەر رووتاوەیی، کە دادەنرێن بەدوو عەیبو نەنگی کۆمەڵایەتیو مرۆڤ بەسروشت حەزناکا کە خەڵك بەو نەنگە بزانێو دروستە کە بیانشارێتەوە.

٤ - بێگومان، ئەوەی کە لەم سەردەمەدا، پێی دەگوترێ (زرع الشعر: چاندنی موو) بۆسەر یابۆ ڕیش یا برۆ کارێ رەوایەو دروستەو بەشێکە لە (عملیه التجمیل = نەشتەرگەری جوانکاری) وە ئەمە لەم بابەتە نییە.

٥ - بەکۆی دەنگی زانایان، لەهەموو بارو دۆخێکا، دروست نییە بۆ ژن، کە مووی خۆیی (مەحرەم)ی خۆی بۆ پەیوەندیکردن بەمووی خۆیەوە، یا بۆ چاندن بەکار بهێنێ، چی هی دایكو خوشكو کچی بێ، وە چی هی باوكو کوڕو برای بێ، چونکە خۆشی وەرگرتن لەلایەنی مێردەوە لەشتی وا کارێ زۆر ناڕەوایەو ئەوپەڕی نامەردیو بەرەڵاییە.

٦- دروسته بۆ ژنو بۆ پیاوو بۆ کوڕو بۆ کچ، بۆ گەورەو بۆ بچووك، مووی سەرو ریشو سمێڵو ئەبرۆو بنباڵو بەر، بەپێی شەرع رێك بخا، ئایا بەتاشین بێ، یا بەکورتکردنەوە بێ، یا بە لابردنو هەڵکەندن بێ، وە هەروەها هەرموویێ بۆ ژن، یا بۆ پیاو کێشەیەکی جەستەیی، یا کۆمەڵایەتی، یا ئازاری دروست بکا چارەسەرکردنی دروستە، وەك مووی لووتو مووی گوێو مووی پووزو لاقو باڵو باسكو سینگ، بەتایبەتی بۆژنی مێردار، وەك مووی دەوری کۆمو مووی پێشی ئافرەت، ئیتر بەتاشین بێ، یا بەدەرمان بێ، یا بە هەڵکەندن بێ، یا بەهەڵپاچین بێ. بەڵام سەرتاشین بۆ ژن کەراهەتی هەیە، مەگەر لەبەر نەخۆشیو کاری پێویست بێ (مغنی محتاج/٤. ص٢٩٧ خاتمەی باسی عقیقە).

مووی ئەو شوێنانە کە دروستە کەسانی تریش تەماشایان بکەن وەك مووی سەرو ریشو سمێڵو برۆو گوێچکەو لووت بۆ پیاو، دروستە کەخۆی لایبەرێ، یا کەسێ تر لایبەرێ، بەڵام ئەو شوێنانەی کە دروست نییە کەسێ تر تەماشای بکا دەبێ خۆی لایبەرێ، یا هاوسەری، یا کەسێکی خۆیی کەبۆی دروست بێ تەماشای ئەو شوێنە بکا، واباشە ئەگەر خۆی کردی لەپێشا بەدەستی راستی مووی ئەو شوێنانە لابەرێ کە بەدەستی راست دەکرێ، ئەوجا دەستی چەپی بەکاربێنێ بۆ شوێنەکانی تری. {بڕوانە: فتح الباری. فەرموودەی ژمارە: ٥٨٨٩ = لباس. باب: قصُ الشارب} + {تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٢٨٨٦، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

٧- هەندێ لەزانایان بە پێچەوانەی جەماوەری زانایانەوە دەڵێن: قژدانە دەم قژو لکانی قژ بەسەرو بە قژەوە، لەسەر شێوەی بارۆکەو هەر شێوەیەکی تریش بێ، بەبێ قەیدو مەرج دروستە، بەقژی مرۆڤ، بەهی گیانداری تر، بە ئاورێشمو بەگیا، بۆ هەموو کەسێ دروستە، ئەم زاتانەیش وەك ئیبنو عەبباسو ئوم سەلەمەو عائیشە کە هەردوکیان هاوسەری پێغەمبەرن!!



## ١٠٧٠) نەفرەت لەژنی خاڵکوتو لەژنی ددان ڕن
## بَابٌ: فِي لَعَنَ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ

١٣٨٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بِنْ مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالنَّامِصَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ. قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ: لَهَا أُمُّ يَعْقُوبَ وَكَانَتْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَأَتَتْهُ، فَقَالَتْ: مَا حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكَ أَنَّكَ لَعَنْتَ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَمَا لِيَ لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ؟! فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ لَوْحَيِ الْمُصْحَفِ فَمَا وَجَدْتُهُ، فَقَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا)، فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: فَإِنِّي أَرَى شَيْئًا مِنْ هَذَا عَلَى امْرَأَتِكَ الآنَ! قَالَ: اذْهَبِي فَانْظُرِي، قَالَ: فَدَخَلَتْ عَلَى امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ فَلَمْ تَرَ شَيْئًا، فَجَاءَتْ إِلَيْهِ فَقَالَتْ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا، فَقَالَ: أَمَا لَوْ كَانَ ذَلِكِ لَمْ نُجَامِعْهَا. {الحديث: ٥٥٣٨ = ٥٥٢٩ فم. بخاري. تفسير: ٤٨٨٦، ٤٨٨٧، ٥٩٣٩، ٥٩٤٣، ٥٩٤٤، ٥٩٤٨. أبو داود. ترجُّل: ٤١٦٩. ترمذي. أدب: ٢٧٨٢. نسائي. زينة: ٥١١٤، ٥٢٦٧. تحفة الأشراف/ ٩٤٥٠}:

عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەعنەتو نەفرینی خودای گەورە لەژنی خاڵكوت بێو، لەو ژنانەیش بێ كە بەئارەزووی خۆیان خاڵیان بۆ دەكوتنو، لەژنانی دەموچاو هەڵگرو، لەو ژنانەیش بێ كە دەموچاوی خۆیان هەڵدەگرنو لەو ژنانەیش بێ كە بەبڕبەندو زبرەو شتی وا ددانی خۆیان باریكو تەنكو شاش دەكەن، بۆ جوانی، چونكە ئەمانە بەم دەستكاریو دەست تێوەردانەی خۆیان، دەستكاری ئیشی خودا دەكەنو، نەخشو نیگارو ڕەنگو ڕێسی خودا تێك دەدەنو دەگۆڕن. جا كاتێ ئەم قسەیەی ئیبنو مەسعوود گەیشتەوە بەدایكی یەعقوب، كە ژنێكی قورئان خوێن بوو، ناسراو بوو بە ئوم یەعقوب، وە لە خێڵی بەنی ئەسەد بوو، چوو بۆلایو لەم لایەنەوە قسەی لەگەڵدا كرد، ئیبنو مەسعوود لەوەڵاما فەرمووی: (كەسانێ كە پێغەمبەری خودا خۆی لەعنەتو نەفرینیان لێ بكا، من چۆن لەعنەتو نەفرینیان لێ ناكەم؟! وە سەرەڕای ئەوەیش ئەمە لەنامەی

خودادا هەیە، جا ژنەکە فەرمووی: من سەرجەم قورئانم خوێندۆتەوە شتی وام تیادا نەدیوە، فەرمووی: ئەگەر بتخوێندبایە دەیتدی، ئەدی ئەوە نییە کە خودای گەورە لە قورئانا دەفەرموێ:

{وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا}. واتە ئەوەی کە پێغەمبەر دەیدا بەئێوە لە ماڵو لە بڕیارو حوکمی شەرعیو روون کردنەوەی شەرعی خودا، وەری بگرنو ئەوەیش کە نەهی لە کردنی دەکا مەیکەنو وازی لێ بهێنن — ٧/٥٩).

ژنەکەش کە هیچی بۆ نەمایەوە گوتی: لەو باوەڕەدام کە ئێستا ژنەکەی خۆت، لەماڵەوە هەندێ شت لەم شتانە دەکا. عەبدوڵلاش فەرمووی: دەبچۆ تەماشای بکە، ئەویش چوو بۆلای ژنەکەی ئیبنو مەسعوودو تەماشای کردو هیچی نەدی لەوەی کە گوتیو هاتەوە گوتی: هیچم نەبینی!

عەبدوڵلایش فەرمووی: دیارە ئەگەر شتی وا بکا لەگەڵ مندا گوزەران ناکات). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٢٨٨٣}.

**روونکردنەوە:**

هەرکارێکی خراپ، کە موسوڵمان دەیکا، کە خوا، لە قورئانا، یا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە سوننەتدا، لەعنەتی لێ دەکا، گریمان ئەگەر کفر نەبێ، گوناهی گەورەیە، واتە: کە بیرەیە.

**روونکردنەوە:**

١- خاڵ کوتان حەرامو نادروستە چی بۆ پیاو، چی بۆ ژن، چی بۆ گەورە، چی بۆ پچووك، خاڵ کوتو خاڵ بۆ کوتراو، ئەگەر بەڕەزای خۆی بوو، وە رەسیدە بوو، هەردوولا گوناهبارنو گوناهی گەورە (کەبیرە)یان کردووە.

٢- لای شافیعییەکان جێگەکەی پیسە، ئەگەر دەتوانرا لاببرێ، ئەگەر نەدەتوانرا، یا دەبوو بەهۆی ناشیرینی، چاو پۆشی لێ دەکرێ. لای حەنەفییەکان دەفەرموون: جێگەی خاڵ غوسڵی دەردەچێو دەستنوێژی دادەمەزرێ، بالایش نەبرێ دروستە.

٣- مەبەست لەم دەموچاو هەلگرتنە ئەوەیە، کەژن، یا پیاو مووی دەموچاوی ئاسایی بێ، کەچی دەچێ زیاد لەپێویست بە کشتەكو بە مووکێشو بە مێوو شتی تری وەهایی، مووی خۆی هەڵ دەگرێو خۆی لووسو پووس دەکاو برۆی خۆی دەسکاری دەکاو تەواو باریکی دەکا.

نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەلام ئەگەر ژن ریشی بۆ دەرچوو، یا سمێڵی بۆ ڕوا، یا مووی زیاد بە بەرچەناگەیەوە بوو، ئەوە واباشە کە ئەو مووە لابەرێ، وە دەموچاوی خۆی ئاسایی بکا). {بڕوانە: ژمارە: ١٣٨٥، بڕگەی ژمارە: ٦ لەپێشەوە}.

٤- ددان شاشکردنیش هەروەها، ئەگینا ڕێکخستنی ددانی ناڕێكو لابردنی کەلێنی نێوانی ددانەکان لەلای پزیشك، ئەوە کاری دروستەو بەر ئەم بابەتە ناکەوێ.

### ١٠٧١) کەسێ بەدرۆ بەشتێکەوە بنازێ کە پێی نەدرابێ. (٥٥٤٨ - ٥٥٥٠)
### بابٌ: في المتشبّع بما لم يُعْطَ

١٣٨٧- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَتْ: إِنَّ لِي ضَرَّةً فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ أَتَشَبَّعَ مِنْ مَالِ زَوْجِي بِمَا لَمْ يُعْطِنِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلاَبِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ». {الحديث: ٥٥٤٨ = ٥٥٣٩ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٧٨ = ٥٢١٩ فتح الباري}:

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ژنێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من هەوێبارم، ئەگەر بەڕواڵەت خۆم هەڵکێشمو خۆم وانیشان بدەم کە مێردەکەم تێرو پڕم دەکاو ئەوەو ئەوەم لەگەڵ دەکا، لەراستیشدا شتەکە وانەبێ ئەوە چۆنە؟ ئایا گوناهم دەگا یانا؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوەی لافو گەزافی وا لێبداو بەشتێکەوە بنازێ کەنەیبێ، ئەوە گورگە لەپێستی مەڕداو ساختەکارە لە بەرگی پیاو چاکا). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢١٧٦ چ/٤}.

**روونکردنەوە:**

مـرۆڤ لـەناو کۆمـەڵا چـاو تێربـێ‌و کـەموکوڕی خـۆی بپۆشـێ‌و بـۆ ئـەوەی نەکورووزێتەوەو خەڵك بەئاتاجی نەزانێ‌و بە بەشی خودا ساچاوبێ، لەبارو دۆخـی ئاوادا، ئەگەر خۆشی بە بووەو دەوڵەمەند بزانێ، هەتا چاوی لەدەستی کەس نـەبێ، ئەوە بەر ئەم هەڕەشەیە ناکەوێ، بەڵکوو ئەوە کارێ زۆر پەسەندە.

## ١٠٧٢) ژنانی نیوە پۆشتەو نیوە رووت. (٥٥٤٧)

## بابٌ: فِي النِّسَاءِ الكَاسِيَاتِ العَارِيَاتِ

١٣٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ، مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ، رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَـذَا». {الحديث: ٥٥٤٧ = ٥٥٣٨}:

ئەبو هـورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (دوو تاقم هەن دۆزەخین، من نەمدیون، چونکە لەپاش مـن لـەناو گـەلی ئیسلامی مندا پەیدا دەبـن، تاقمـەی یەکـەمیان جۆرە قەمچییەکی ریشووداریان واپـێ، وەك کلکـی گـا وایـە، لـیس‌و تێلاّیـان واپـێ، لـە خـەڵکی پـێ دەدەن‌و دەبـن بـە کوتـەك‌و داردەسـتی دەسـتی فەرمانـدارو دەسـتەلاّتدارە زۆردارو سـتەمکارەکان! وەك ئـەوە بەزۆری دار دەیانەوێ گومانبار پێ لەتاوان بنێت!

تاقمەکەی تر ژنگـەلێکن نیـوەی لەشیان پۆشـتەیەو نیوەکـەی تـری رووتـە، بـۆ جوانی وادەکەن! هەم خەڵکی تر لەخشتە دەبەن‌و هەم خۆیان لەخشتە چوون، قژی سەریان بە بارۆکەو شتی وا، وەك دووگی لاری وشتر ئاوا زل‌و قەبە دەکەن، یا قژیان هـەڵ دەدەنـەوەو بەسـەریانەوە کۆمـەڵی دەکـەن، ئـەم ژنانـە نەڕێگـەیان دەکەوێتـە بەهەشت‌و نە بۆن‌و بەرامە خۆشەکەی بەهەشت دەچێ بەسەریاندا، لەگـەڵ ئـەوەی کە بۆن‌و بەرامەی بەهەشت ئەوەندەو ئەوەندە ساڵە ڕێ دەڕوات). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٢٨٩٥ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٩٢، ژمارە: ١٦٣٣}.

**روونكردنەوە:**

له فەتحولمولهیمدا دەفەرموێ: (لەم فەرموودەیەدا موعجیزەیەكی گەورە هەیە، لەهەندێ ریوایاتی تری ئەم فەرموودەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەكا، كە كەسانێ بە ئوتومبیلو ماشێن دەچن بۆ مزگەوت، ئوتومبێلەكانیان لەبەردەم مزگەوتا دادەنێن، ژنەكانیان نیوە پۆشتەو نیوە رووتن، سەریان وەك دووگی وشتر خڕ هەڵ دەدەن، لەعنەت لەو ژنانە بكەن، ئەوانە لەعنەت لێكراون).

ئەمە پوختەی فەرمایشتی فەتحولمولهیمە لەم شوێنەدا، منیش عەرزتان دەكەم من بەچاوی خۆم زۆرم لەم جۆرە پیاوو ژنانە دیوە، هەر مزگەوتێ دەچی بۆ جەماعەت یا بۆ جومعە ئەمە حاڵیەتی، خەڵكێكی زۆر بەسواری ماشێن دێن بۆ نوێژ، ماشێنەكانیان لەبەردەم مزگەوت دادەنێنو ژنەكانیان لە ماڵەوە مۆدەن، سەر رووت، قول رووت، باڵ رووت، قۆڵ رووت، لەباشترین حاڵا، كراسێكی تەنكی نیو قۆڵی كورتی تاسەر ئەژنۆیان والەبەردا، دەڵێی پەشتە ماڵی حەمامەǃǃ (وەرگێڕ: نوری فارس).

### ١٠٧٣) پچڕاندنی ملیوانكەی گەردنی ئاژەڵ. (٥٥١٥)
### بابٌ: قَطْعُ الْقَلاَئِدِ مِنْ أَعْنَاقِ الدَّوَابِّ

١٣٨٩- عَنْ أَبِي بَشِيرٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) أَخْبَـرَهُ أَنَّـهُ كَانَ مَـعَ رَسُـولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، قَالَ: فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَسُولاً، (قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: وَالنَّاسُ فِي مَبِيتِهِمْ: «لاَ يَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلاَدَةٌ مِنْ وَتَرٍ - أَوْ قِلاَدَةٌ - إِلاَّ قُطِعَتْ » قَالَ مَالِكٌ: أُرَى ذَلِكَ مِنَ الْعَيْنِ. {الحديث: ٥٥١٥ = ٥٥٠٥ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢٣٠ = ٣٠٠٥ فتح الباري. أبو داود جهاد: ٢٥٥٢. تحفة الأشراف: ١١٨٦٢}:

ئەبو بەشیری ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێكا لەگەڵ پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) خەڵكەكە شوێنی شەویان گرتبوو، كەمێ بڵاو بووبوونەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رابەرێكی نارد بۆلایان، كە پێیان رابگەیەنێ: (كە هەر

وشترێ ملیوانکەی ژێی کەوانی لەمل دایە، یاخود هەر ملیوانکەیەکی دیکەی لەگەردندایە، بیپچڕێننەوەو لەملی دابکەنن).

(مەبەست ئەوەیە نەبادا، بگیرێ لەشتێو توندبێ لەملیو بیخنکێنێ، یا مەبەست ئەمەیە کە مالیکی مامۆستای مامۆستاکەی ئیمامی موسلیم (رەحمەت لەهەموویان بێ) دەفەرموێ: وادەزانم: مەبەست لەم نەهیە، ئەو جۆرە ملیوانکانەیە، کە خاوەنەکەی بە نیازی چاوەزار کردوویەتیە ملی وشترەکەی.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو بەشیری ئەنصاری هاوەڵی پێغەمبەرە، ئامادەی غەزای ئوحودو غەزای خەندەق بووە، تەمەنی درێژ بووە، لەپاش ڕووداوی ئەلحەررە مردووە. {بڕوانە: تەجرید/۳، ژمارە: ۱۲/۳}.

## ۱۰۷٤) باسی بۆڵو زەنگ، فریشتە هاوڕێتی کاروانێ ناکەن کە سەگو زەنگی تیابێ. (٥٥١٢ - ٥٥١٤)

## باب: فِي الأَجْرَاسِ وَأَنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَصْحَبُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ أَوْ جَرَسٌ

١٣٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ وَلاَ جَرَسٌ». {الحديث: ٥٥١٢ = ٥٥٠٢ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (فریشتە هاوڕێتیی ئەو کاروانیو کۆمەڵانە ناکەن، کە سەگ یا زەنگیان پێ بێ). {تاج/۳، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ۲۸۸۸} + {ریاض/٤، زنجیرە: ۳۰۷، ژمارە: ۱٦۹۰}.

١٣٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «الْجَرَسُ مَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ». {الحديث: ٥٥١٤ = ٥٥٠٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زەنگ بلوێری شەیتانە!). {تاج/۳، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ۲۸۹۰}. {ریاض/٤، زنجیرە: ۳۰۷، ژمارە: ۱٦۹۱}.

**روونكردنەوە:**

ئەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

١- هۆی ئەوە کە فریشتە پارێز دەکەن لەزەنگ، ئەوەیە چونکە لە ناقووسی گاورەکان دەچێ، یا لەبەرئەوەیە کە دەکرێتە ملو کێشەیە بۆ ئاژەڵەکە دروست دەکا، یا لەبەرئەوەیە کە دەنگی تیژە کار لە ئارامیی مرۆڤ دەکاو قەڵسی دەکا.

٢- زەنگ حەرام نییە، بەڵکوو کەراهەتی تەنزیهی هەیە.

٣- مەبەست لەفریشتە لەم جۆرە جێگایانەدا فریشتەی رەحمەتو میهرەبانییە، مەبەست فریشتە پارێزگارەکان نییە، کە ناسراون بە (الحفظة) چونکە سەرژمێریی کردەوەکانی دەکەنو دەیان نووسن لە تۆمارەکانیانا، بۆ لێپرسینەوەی رۆژی دوایی.

١٣٩٢- عَنْ جَابِرِ بْنُ عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنِ الضَّرْبِ فِي الْوَجْهِ، وَعَنِ الْوَسْمِ فِي الْوَجْهِ. {الحديث: ٥٥١٦ = ٥٥٠٦ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٣٧ = ٥٥٤١ فتح الباری}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەدەغەیکردووە کەبدری لە رووخساری گیاندار، یا روخساری گیاندار داخ بکرێ بۆ نیشانەکردن). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ٢٩٩٨}.

١٣٩٣- عَنْ نَاعِمًا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) يَقُولُ: وَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حِمَارًا مَوْسُومَ الْوَجْهِ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ، قَالَ: فَوَاللَّهِ لاَ أَسِمُهُ إِلاَّ فِي أَقْصَى شَيْءٍ مِنَ الْوَجْهِ، فَأَمَرَ بِحِمَارٍ لَهُ، فَكُوِيَ فِي جَاعِرَتَيْهِ، فَهُوَ أَوَّلُ مَنْ كَوَى الْجَاعِرَتَيْنِ. {الحديث: ٥٥١٩ = ٥٥٠٩ فم}:

ناعیمی کوڕی ئوجەیلی میصری، کە تابیعییە، کەپێی دەگوترێ: ئەبو عەبدوڵڵا، کە بەندەی ئازادکراوی ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەرە، دەفەرموێ: بیستم لە ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێدرێژێکی دی، دەموچاوی داخ کرابوو، بۆ نیشانەکردن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی پێ ناپەسەند بوو، ئیبنو عەبباس فەرمووی: دەی سوێندم بەخودا،

دەبێ من لەدوورترین شوێن لەدەموچاوەوە، کە دەست بدات بۆ داخکردن، ولاخی خۆم داخ بکەم، جا ئیبنو عەبباس فەرمانی کرد، گوێدرێژێکی هەبوو، هەردوو کولۆتیان بۆ نیشانە داخ کرد.

ئیبنو عەبباس یەکەم کەس بوو کەهەردوو کولۆت داخ بکا بۆ نیشانە.

**روونکردنەوە:**

لەبەرئەوەی کە ئەم جۆرە بابەتە، رۆژانە روو دەدەنو موسوڵمانان، سوود لە بڕیارەکانیان وەردەگرن، دەڵێم: ئەوەوی دەفەرموێ:

١- داخکردنی مرۆڤ بە مەبەستی نیشانە کردنی نادروستە.

٢- داخکردنی دەموچاوی ئاژەڵو ولاخو گیانداری تر، هەندێ دەفەرموون: حەرامە، چونکە پێغەمبەر نەفرەتو نەفرینی کردووە لەبکەرەکەی، هەندێ تر دەفەرموون: ناباشە، واتە: مەکرووهە.

٣- داخکردنی شوێنەکانی تری جەستەی ئاژەڵو ولاخ، بەبێ راجیایی دروستە. بەڵام نیشانەکردنی ولاخو ئاژەڵ بەرەنگو شتی وا، یا بە هەڵپاچینی موو وخوریو یاڵو شتی وا دروستە.

## ١٠٧٥) داخکردنی گوێچکەی بزنو مەڕ بۆ نیشانەکردن. (٥٥٢٠ - ٥٥٢٣)
## بَابٌ: وَسْمُ الغَنَمِ فِي آذَانِهَا

١٣٩٤- عَنْ أَنَسْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِرْبَدًا وَهُوَ يَسِمُ غَنَمًا. (قَالَ: أَحْسِبُهُ قَالَ) فِى آذَانِهَا. {الحديث: ٥٥٢٢ = ٥٥١٢ فم. بخاري. صيدو ذبائح: ٥٥٤٢}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پەچەیەکی حوشتردا بوو، خەریکبوو رانی بە ئەڵقە داخ داخ دەکرد، فەرموودە گێڕەوە دەفەرموێ: وا دەزانم فەرمووی: (پێغەمبەر لە پەچەکەدا بەئەڵقە داخ مەڕو بزنی نیشانە دەکرد، گوێچکەی داخ دەکردن).

## ١٠٧٦) داخكردنی وشتر. (٥٥٢٠ - ٥٥٢٣)

## باب: فِي وَسْمِ الظَّهْرِ

١٣٩٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا وَلَدَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ قَالَتْ لِي: يَا أَنَسُ: انْظُرْ هَذَا الْغُلاَمَ فَلاَ يُصِيبَنَّ شَيْئًا حَتَّى تَغْدُوَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُحَنِّكُهُ، قَالَ: فَغَدَوْتُ فَإِذَا هُوَ فِى الْحَائِطِ وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ جَوْنِيَّةٌ وَهُوَ يَسِمُ الظَّهْرَ الَّذِى قَدِمَ عَلَيْهِ فِى الْفَتْحِ. {الحديث: ٥٥٢٠ = ٥٥١٠ فم. تجريد/٢، رقم: ٦٢٥ = ١٣٠١، ٥٤٧٠، ٥٨٢٤}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکی منالّی ئەبو تەلحە نەخۆش بوو، کە ئەبو تەلحە لەمال دەرچوو، کوڕە نەخۆشەکەی کە دایك برای من بوو مرد، کە ئەبو تەلحە دێتەوە بەدایکی کوڕە مردووەکە دەڵێ: کوڕەکەم چۆنە؟ ئوم سولەیمیش کە هەم دایکی منو هەم دایکی منالە مردووەکە بوو، پێی دەفەرموێت: لەگشت کاتێ خامۆشترە، زۆر بێدەنگە، تەرمی منالە مردووەکەش لە قوژبنێکی مالەکەدا دادەنێت، ئینجا شێو دادەنێ بۆ ئەبو تەلحەو شێودەکا، شەویش خۆی نەختێك بۆی دەڕازێنێتەوەو لەگەڵیا دروست دەبێت، کە ڕۆژ دەبێتەوە ئەبو تەلحە خۆی دەشۆرێتو کاتێك دەیەوێت لەماڵ دەرچێت، ژنەکەی پێی دەڵێت: منالەکە مردووە، دەی بیسپێرن بە خاكو بڕۆن بینێژن! جا ئەو بەیانییە ئەبو تەلحە نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ لەگەڵ پێغەمبەردا دەکاتو، سەر گوزەشتەی خۆیو ژنەکەیو منالەکەیانی عەرزدەکاتو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: (ئایا ئەم شەو پێکەوە دروست بوون؟) دەڵێ: بەڵێ. دەفەرموێ: (خودا پیرۆزی بکا لێتان!).

دوایی ئوم سولەیم کوڕێکی بوو، ئەبو تەلحە کە زڕبابم بوو پێی فەرمووم: ئادەی ئەنەس! براکەت هەڵبگرەو بیبە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەچەند دەنکێ خورماشی لەگەڵدا نارد، کە منالەکەم برد بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هیچت هێناوە لەگەڵی، کە مەلاشووی منالەکەی پێ شیرین بکەم؟) گوتم: بەڵێ چەند قلێ خورمام هێناوە، جا خورماکەی وەرگرتو لەدەمیدا جوویی‌و دوایی لەدەمی خۆی دەریهێناو خورما جووراوەکەی نایە

ناودەمی مناڵەکەو مەلاشووی پێ هەنوو، وەناوی نا: عەبدوڵلا). ئیبنو عویەینە دەیفەرموو: پیاوێکی ئەنصاری دەیگوت: بەچاوی خۆم نۆ منالی ئەم عەبدوڵلایەی کە دایك برای ئیمامی ئەنەس بوو دیوە، وە هەرنۆیان قورئان خوێن بوون لە بەرەکەتی دووعاکەی پێغەمبەرەوە کە بەدایك و باوکی فەرموو بوو، خودا بەرەکەت بخاتە ئەم شەوەتانەوە!). {بڕوانە: ژمارە: ١٤٠١ لەدواوە}.

ئەمە پوختەی ئەم چیرۆکەیە لە (مختصر صحیح البخاری)دا، بۆ روونکردنەوەی گێڕانەوەکەی ئێرە راگوێزم کرد، لێرە ئەم پترییەی هەیە، بەسەر باسەکەوە، کە لەئاخری فەرموودەکەدا دەفەرموێ: (ئوم سولەیمی دایکم کە منالەکەی بوو، فەرمووی پێم: ئەی ئەنەس! ئاگات لێ بێ پێش ئەوەی کە ئەم منالە گۆش بکرێ، یا شتێ بچێتە دیوی دەروونی، بەیانی زوو بیبە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا، هەتا بەشیرینی مەلاشووی چەور بکاو ناوی بنێ، ئەنەس دەفەرموێ: منیش وامکرد، دایکم چی فەرموو، جێبەجێم کرد، کە منالەکەم برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو پەچەیەکا بوو، لەناو باخە خورمایەکا، عابایەکی خەتداری رەشباوی جەونییانەی لەبەردا بوو، ئەڵقە داخێکی بەدەستەوە بوو، ئەو حوشترانەی بە ئەڵقە داخەکە نیشانە دەکرد، کەهی زەکات بوون، لەسەردەمی ئازادکردن (فەتح)ی مەککەدا هێنرابوون بۆی!. {تاج/٥، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ٥٤٠٥}.

## (پوختەی فەرموودەکانی ئەم نامەیە)

١- ئاورێشم بۆ پیاو دروست نییە، تەنانەت نابێ بیکا بە پەردەی پەنجەرەو سەرزین و کفن و قەمچی و بەنی هۆنینەوەی تەزبیح و بەرماڵ و کلاش.

٢- دروستە بۆ پیاو مامەڵەو سەودای ئاورێشم بکاو بیکڕێ و بیفرۆشێ، یا کرمی ئاوریشم بەخێو بکاو لیکەکەی بکا بە ئاورێشم و بیڕێسێ و بیچنێ و هەموو پارچەیەکی لێ دروست بکا، چونکە ئەوەی کە بۆ پیاو حەرامە تەنیا لەبەر

کردنەکەیەتی، زێڕیش وەك ئاورێشم وایە بۆ پیاو لەهەموو روویەکەوە، وە پیاو دەتوانێ لەبەر ناچاری ئاورێشم بپۆشی، یا سوود لە زێڕ وەربگرێ، وەك کیفی ددان.

٣- ئاورێشمو زێڕ بەرەهایی، بەبێ قەیدو مەرج بۆ ژن دروستە.

٤- قژو موو بۆیەکردن، بڕیاری تایبەتی هەیە.

٥- هەموو جۆرە رایەخو پێخەفێ دروستە، بەمەرجێ هی پیاو ئاورێشم نەبێ، بەمەرجێ بۆ فیزو دەعیە نەبن.

٦- خۆپاراستن لە وێنەو پەیکەر، مەگەر لەبەر ناچاری.

٧- باسی ئەموستیلە بەتێرو تەسەلی.

٨- پێڵاو تازۆربێ کەمە، بەتایبەت بۆ رێبوار.

٩- بارۆکەو قژ خستنە سەر قژو خاڵکوتانو ددان شاشکردنو موو هەلگرتنو ریشتاشینی ژنو بۆیەکردنی قژو مووی سەرو ریش، چ بۆ پیاو چ بۆ ژن، ئەمانە هەموو، بڕیارەکەیان دەخولێتەوە لەنێوانی ئەم دوو مەبەستەدا:

١/ ئەگەر بۆ چارەسەری کێشەیەکی جەستەیی، یان دەروونی، یان کۆمەلایەتی بێ، ئەوە دروستە لەلای زۆرینەی زانایان، تەنانەت هەندێ کات سوننەتیشن.

٢/ بەلام ئەگەر بۆ بەرەلایی‌و تەفرە دانی خەلكو دەسکاریی کاری خودابێو هیچ مەبەستێکی رەوای شەرعی نەبێ، ئەوە بەپێی شوێن یا حەرامە، یا مەکرووهە.

١٠- ئاژەڵ داخکردن بۆ نیشانە، بەمەرجی خۆی دروستە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٠- نامەی ئەدەبو ویڵ

## كِتَابُ الْأَدَبْ

{بڕوانە: تاجول ئوصول بەكوردی، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ٤٢٥ چاپی چوارەم، زنجیرە: ٢٦ هەتا زنجیرە: ٨٦، لاپەڕە: ٥٢١ لەژمارە: ٥٢٥٨وە هەتا ژمارە: ٥٤٨٠}.

**١٠٧٧) باسی فەرمایشتی پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ): (ناوی من بكەن بەناو بۆ خۆتان، بەڵام كەسناوەكەم - كە ئەبولقاسمە - مەكەن بە كەسناو بۆ خۆتان). (٥٥٥١ - ٥٥٦٣)**

**باب: قَوْلُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلاَ تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي)**

١٣٩٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَادَى رَجُلٌ رَجُلاً بِالْبَقِيعِ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ، إِنَّمَا دَعَوْتُ فُلاَنًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلاَ تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي». {الحديث: ٥٥٥١ = ٥٥٤٢ فم. تجريد = مختصر صحيح البخاری/٣ بالكوردی رقم: ١٢٦٢ = ٣١١٥، ٣١١٤، ٣٥٣٨، ٦١٨٦، ٦١٨٧، ٦١٨٩، ٦١٩٦}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە بەقیع، كە گۆڕستانێكە وا لەپاڵ مزگەوتەكەی پێغەمبەرا كەوا لەشاری مەدینە، پیاوێ بانگی پیاوێكی تری كرد، گوتی: ئەی ئەبولقاسم! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوڕی لێ دایەوە، وایزانی كە بانگی ئەو دەكا، پیاوەكە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەگەڵ تۆم نەبوو، بانگی ئەو پیاوەی ترم كرد، بانگی تۆم نەكرد، بەویش هەر دەڵێن: ئەبولقاسم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ناوی من بكەن بەناوی خۆتانو بەناو بۆ كەسوكاروماڵو منداڵتان، بەڵام كەسناوەكەم كە ئەبولقاسمە، مەكەن بەكەسناو بۆ خۆتان). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٥٣٩٥ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئـەوەوی دەفـەرموێ: قـازی دەفـەرموێ: جـەماوەری زانایـان دەفـەرموون، ئـەم بڕیارە تایبەت بووە بەسەردەمی ژیانی پێغەمبەرەوە لەدوا فـەوتی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ هەموو کەسێ دروستە کەخۆی ناوبنێ ئەبولقاسم، بۆ خـەڵکی تـریش دروسـتە پێـی بڵێن ئەبولقاسـم، ئـیتر ئـەو کەسـە نـاوی موحەممـەدو ئەحمـەد بـێ، یاناوێ تری هەبێ، جیاوازی نییە.

### ١٠٧٨) کردنی ناوی موحەممەد بەناو بۆ خۆ. (٥٥٥١ - ٥٥٥٣)
### باب: التسمية بِمُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٣٩٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُـلاَمٌ فَسَمَّاهُ مُحَمَّدًا، فَقَالَ لَهُ قَوْمُهُ: لاَ نَدَعُكَ تُسَمِّي بِاسْمِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَـانْطَلَقَ بِابْنِهِ حَامِلَهُ عَلَى ظَهْرِهِ، فَأَتَى بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ وُلِـدَ لِي غُلاَمٌ فَسَمَّيْتُهُ مُحَمَّدًا فَقَالَ لِي قَوْمِي: لاَ نَـدَعُكَ تُسَـمِّي بِاسْمِ رَسُولِ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَـالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ): «تَسَـمَّوْا بِاسْـمِي وَلاَ تَكْتَنُـوا بِكُنْيَتِي، فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ أَقْسِمُ بَيْنَكُمْ». {الحديث: ٥٥٥٣ = ٥٥٤٤ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢٦٢ = ٣١١٥، ٣١١٤، ٣٥٣٨، ٦١٨٦، ٦١٨٧، ٦١٨٩، ٦١٩٦. تحفـة الأشـراف: ٢٢٤٤}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: پیـاوێ لەئێمـە (واتـە: لـە ئەنصارەکان: لە یاریدەدەرەکان) کوڕێکی بوو، ناوی نـا موحەممـەد، خزمـانی پێیـان فەرموو: ناهێڵین منالەکەت ناوبنێی موحەممەدو ناوەکەی پێغەمبەر بکەی بـەناوی منالەکەت، جا ئەویش منالەکەی بە کۆڵ برد بۆلای پێغەمبەرو عـەرزی کـرد: ئـەی پێغەمبەری خودا! ئەم کوڕەم بووە، ناوم ناوە موحەممەد، بـەلام خزمـانی ئەنصارم پێم دەڵێن: ناهێڵین ناوی پێغەمبەری خودا، بکەیت بـەناو بـۆ منالەکـەت جا چارم چـییەو فـەرمانی تـۆ لـەم بارەیـەوە بەچـییە؟ پێغەمبـەریش (درودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی: (ناوی من بکەن بەناو بۆ خۆتـان، بـەلام کەسناوەکەم —کـە ئەبولقاسمـە-

مەکەن بەکەس ناو بۆخۆتان لەڕاستی دا من قاسمم واتە: بەشکەرم — ئەو بەشەی کەخودا دەیدا بەهەرکەسێ لەئێوە، بەپێی دابەشکردنی خودا خۆی، دابەشی دەکەم لەنێوانتانا، بەشی گەورەو بەشی پچووك، کەمو زۆر بەدەستی من نییە، بەڵکوو بەدەستی خودا خۆیەتی). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٥٣٩٦ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**١٠٧٩) عەبدوڵڵاو عەبدوڕەحمان: خۆشەویسترین ناون لەلای خودای گەورە.** (٥٥٥١ - ٥٥٦٣)

**بَابٌ: أَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى: عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ**

١٣٩٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللَّهِ: عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ». {الحديث: ٥٥٥٢ = ٥٥٤٣ فم}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (خۆشەویسترین ناوی ئێوە لەلای خودای گەورە: ناوی عەبدوڵلاو، ناوی عەبدوڕەحمانە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ٤ = ٥٣٩٢}.

**١٠٨٠) منالّ ناوبنرێ عەبدوڕەحمان.** (٥٥٥١ - ٥٥٦٣)

**بابٌ: تَسْمِيَةُ الْمَوْلُودِ: عَبْدَ الرَّحْمَنِ**

١٣٩٩- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ: الْقَاسِمَ، فَقُلْنَا: لاَ نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلاَ نُنْعِمُكَ عَيْنًا، فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «أَسْمِ ابْنَكَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ». {الحديث: ٥٥٦٠ = ٥٥٥١ فم. بخاری. أدب: ٦١٨٦، ٦١٨٩. تحفة الأشراف: ٣٠٣٤}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەئێمە (واتە: لە ئەنصارەکان: لە یاریدەدەرەکان) کوڕێکی دەبێ، ناوی نا قاسم، یاران پێیان فەرموو: نە پێت دەڵێین ئەبولقاسمو باوکی قاسمو نە بەم کەسناوە چاوو دڵت رۆشن دەکەینەوە (چونکە ئەبولقاسم: باوکی قاسم، کەسناوی پێغەمبەرەو هەر قابیل بەخۆیەتی!).

پیاوەکەیش رۆیشت بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەم باسەی بۆی باس کرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (کوڕەکەت ناوبنێ عەبدوڕەحمان!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ٥٣٩٦ چ/٤}.

**١٠٨١) منداڵ ناوبنرێ عەبدوڵلا، دەستپیاهێنانیو نزاکردن بۆی. (٥٥٧٧ - ٥٥٨٦)**

**باب: تسمية المَوْلُود: عبدالله، وَمَسْحُهُ وَالصَّلاَةُ عَلَيْه**

١٤٠٠- عَنْ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ وَفَاطِمَةُ بِنْتُ الْمُنْذِرِ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّهُمَا قَالَا: خَرَجَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِى بَكْرٍ حِينَ هَاجَرَتْ وَهِىَ حُبْلَى بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، فَقَدِمَتْ قُبَاءً فَنُفِسَتْ بِعَبْدِ اللَّهِ بِقُبَاءٍ، ثُمَّ خَرَجَتْ حِينَ نُفِسَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِيُحَنِّكَهُ، فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْهَا فَوَضَعَهُ فِى حَجْرِهِ، ثُمَّ دَعَا بِتَمْرَةٍ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَكَثْنَا سَاعَةً نَلْتَمِسُهَا قَبْلَ أَنْ نَجِدَهَا، فَمَضَغَهَا ثُمَّ بَصَقَهَا فِى فِيهِ، فَإِنَّ أَوَّلَ شَىْءٍ دَخَلَ بَطْنَهُ لَرِيقُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، ثُمَّ قَالَتْ أَسْمَاءُ: ثُمَّ مَسَحَهُ وَصَلَّى عَلَيْهِ وَسَمَّاهُ عَبْدَ اللَّهِ، ثُمَّ جَاءَ وَهُوَ ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ أَوْ ثَمَانٍ لِيُبَايِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَأَمَرَهُ بِذَلِكَ الزُّبَيْرُ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حِينَ رَآهُ مُقْبِلاً إِلَيْهِ ثُمَّ بَايَعَهُ. {الحديث: ٥٥٨١ = ٥٥٧٢ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٢٣ = ٥٤٦٩ + تجريد/٤، رقم: ١٥١٨ = ٣٩٠٣، ٥٤٦٩}:

عوروەی کوڕی زوبەیرو فاطیمەی کچی مونذیری کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) فەرموویان: کاتێ ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق، کە هاوسەری زوبەیری کوڕی عەوام بوو، ویستی کۆچ بکا بۆ مەدینە، دووگیان بوو بە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر، کە دەگاتە قوباء ژانی منداڵبوون دەیگرێو لەوێ عەبدوڵلای دەبێ، جا درێژەی بە سەفەری کۆچ داو دەچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ مەدینە هەتا مەلاشووی شیرین بکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منداڵەکەی لێ وەردەگرێ، وە لەکۆشی خۆیدا دایدەنێ، ئەوجا داوای دەنکێ خورمای کرد، عوروە فەرمووی: عائیشەی پوورم فەرمووی: خورما نەبوو، ماوەیێ بۆیگەڕاین هەتا

پەیدامانکرد، جا پێغەمبەر دەنکە خورماکەی نایە ناودەمی خۆیو تەواو جویی، ئەوجا بەتەڕایی دەمیەوە تفانیە ناودەمی عەبدوڵلاوە، تەڕایی دەمی پێغەمبەر بوو، ئەوجا بەدەنکێ خورما مەلاشووی هەنوو، وە دەمی شیرین کرد. ئەوجا ئەسماء فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر دەستی پیاداهێنا بۆ پیرۆزیو دووعاو نزای باشی بۆیکردو نزای پیرۆزیو پێتو فەڕی بۆیکردو ناوی نا عەبدوڵلا.

لەپاشا عەبدوڵلا کە گەیشتە تەمەنی حەوت هەشت ساڵان، زوبەیری باوکی بردی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا پەیمانو بەیعەت بدا بە پێغەمبەری خودا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەبینی عەبدوڵلا هات بۆ خزمەتی بۆ پەیمان وەرگرتن، زەردە خەنەیەکی کردو پەیمانی لێ وەرگرت!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ٥٤٠٥}. {بڕوانە: ژمارە هەشت کە لەپێشەوە لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبە پیرۆزەدا رۆیشت}.

١٤٠١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ ابْنٌ لأَبِي طَلْحَةَ يَشْتَكِي، فَخَرَجَ أَبو طَلْحَةَ، فَقُبِضَ الصَّبِيُّ، فَلَمَّا رَجَعَ أَبو طَلْحَةَ، قَالَ: مَا فَعَلَ ابْنِي؟ قَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: هُوَ أَسْكَنُ مِمَّا كَانَ، فَقَرَّبَتْ إِلَيْهِ الْعَشَاءَ، فَتَعَشَّى، ثُمَّ أَصَابَ مِنْهَا، فَلَمَّا فَرَغَ، قَالَتْ: وَارُوا الصَّبِيَّ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَبو طَلْحَةَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: «أَعْرَسْتُمُ اللَّيْلَةَ»؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمَا»، فَوَلَدَتْ غُلاَمًا، فَقَالَ لِي أَبو طَلْحَةَ: احْمِلْهُ حَتَّى تَأْتِيَ بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَأَتَى بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَبَعَثَتْ مَعَهُ بِتَمَرَاتٍ، فَأَخَذَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: «أَمَعَهُ شَيْءٌ»؟ قَالُوا: نَعَمْ تَمَرَاتٌ، فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَمَضَغَهَا ثُمَّ أَخَذَهَا مِنْ فِيهِ فَجَعَلَهَا فِي فِي الصَّبِيِّ، ثُمَّ حَنَّكَهُ وَسَمَّاهُ: عَبْدَ اللَّهِ. {الحديث: ٥٥٧٨ = ٥٥٦٩ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٢٣ = ٥٤٧٠ فتح الباري. تحفة الأشراف: ٣٢٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەم فەرموودەیە بەتەواوی لە ژمارە: (١٣٩٥)دا رابورد).

## ١٠٨٢) ناونان بەناوی پێغەمبەران‌و پیاو چاکانەوە. (٥٥٥١ - ٥٥٦٣)

## باب: في التسمية بأسماءِ الأنبياءِ وَالصَّالحِينَ

١٤٠٢- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا قَدِمْتُ نَجْرَانَ سَأَلُونِي فَقَالُوا: إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ (يَا أُخْتَ هَارُونَ) وَمُوسَى قَبْلَ عِيسَى بِكَذَا وَكَذَا، فَلَمَّا قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: «إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَمُّونَ بِأَنْبِيَائِهِمْ وَالصَّالِحِينَ قَبْلَهُمْ». {الحديث: ٥٥٦٣ = ٥٥٥٤ فم}:

موغیرەی کوڕی شوعبە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منی نارد بۆ وڵاتی نەجرانی یەمەن، لەوێ مەسیحییەکان لەم ئایەتە رەخنەیان دەگرت‌و دەیانگوت بەمن: ئێوە لە قورئانی خۆتاندا ئەم ئایەتە دەخوێنن، کە دەڵێ: (أُخْتَ هَارُونَ: ئەی مەریەم! ئەی خوشکی هاروون!) وە بەپێی ئەمەبێ دەبێ مەریەم خوشکی هاروونی برای مووسابێ، وەلحاڵ مووساو عیسای کوڕی مەریەم، سەردەمیان زۆر زۆر لەیەکتری دوورە! منیش وەرامی ئەم رەخنەیەم نەزانی، هەتا گەڕامەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە ئەمەم عەرزیکرد، فەرمووی: (دەبوو بتگوتبایە پێیان: کە ئەوان مەبەستیان ئەوە بوو: کە مەریەم ئەوەندە باش‌و پاک‌و پاکیزەو خواناس بوو، دەتگوت خوشکی راستی هاروونی برای مووسایەو وێنەی ئەوە، وە لەناو هۆزی مەریەمدا ئەم جۆرە بانگ کردنە باو بووە، ئێستایش ئەم جۆرە ناو بردنە باوو عادەتە، دەڵێن: ئەی رۆڵەکانی خالیدو صەلاحەددین، ئەی کوڕانی ئیسرائیل، ئەی برایانی خانی، ئەی خوشکانی رابیعەی عەدەوییە. لەهەمان کاتیشدا، باوێکی جوان بووە لەناو ئەواندا، کە بەناوی پێغەمبەران‌و پیاو چاکانی پێشینەی خۆیانەوە، خۆیان ناو ناوە، وە لەسەردەمی مەریەمدا، پیاوێکی زۆر باش‌و خواناس هەبووە، ناوی هاروون بووە، وە مەریەمیان بەوەوە چواندووە، کەپێیان گوتووە: ئەی خوشکی هاروونی پیاو چاک). {تاج/٤، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٣٩٨٣ ج/٤}.

## ١٠٨٣) منالّی تازه بووی ساوا ناوبنرێ ئیبراهیم. (٥٥٧٧ - ٥٥٨٦)
## بابٌ: تَسْمِيَةُ الْمَوْلُودِ بِإِبْرَاهِيمَ

١٤٠٣- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: وُلِدَ لِي غُلاَمٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمَّاهُ: إِبْرَاهِيمَ، وَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ. {الحديث: ٥٥٨٠ = ٥٥٧١ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٢٢ = ٥٤٦٧، ٢٢٢، ٦٠٠٢، ٦٣٥٥}:

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکم لەدایك بوو، هەڵم گرتو بردم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی نا ئیبراهیم، بەدەنکێ خورما مەلاشووی شیرین کرد، لەسەر ئەم شێوەیە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەنکە خورماکەی تەواو جوی، ئەوجا ماجوومی خورماکەی تفاندە ناو دەمی منالّەکە، لەپێشا ناوی نا، ئەوسا مەلاشووی شیرین کرد، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای پیرۆزیو پیتو فەڕی بۆ منالّەکە کردو ئەوسا دایەوە دەستم. فەرمووی: ئەو کوڕە نۆبەرەی منالّەکانم بوو). ئەمە دەقی گێڕانەوەی تەجریدی بوخارییە. {تاج/٣، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٢٦٠٨، ج/٤}.

## ١٠٨٤) منالّی ساوا ناوبنرێ ئەلمونذیر. (٥٥٧٧ - ٥٥٨٦)
## بابٌ: تَسْمِيَةُ الْمَوْلُودِ: الْمُنْذِرُ

١٤٠٤- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: أُتِيَ بِالْمُنْذِرِ بْنِ أَبِي أُسَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم) إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ وُلِدَ، فَوَضَعَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى فَخِذِهِ، وَأَبُو أُسَيْدٍ جَالِسٌ، فَلَهِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِشَيْءٍ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَأَمَرَ أَبُو أُسَيْدٍ بِابْنِهِ، فَاحْتُمِلَ مِنْ عَلَى فَخِذِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَقْلَبُوهُ، فَاسْتَفَاقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: «أَيْنَ الصَّبِيُّ»؟ فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أَقْلَبْنَاهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: «مَا اسْمُهُ»؟ قَالَ: فُلاَنٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «لاَ، وَلَكِنِ اسْمُهُ الْمُنْذِرُ»، فَسَمَّاهُ يَوْمَئِذٍ: الْمُنْذِرَ. {الحديث: ٥٥٨٦ = ٥٥٧٧ فم. بخاري. أدب: ٦١٩١. تحفة الأشراف}.

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەبو ئوسەید خۆی لەخزمەت پێغەمبەردا دانیشتبوو، مونذیری کوڕی تازە لەدایك بوو بوو، هێنایان بۆ خزمەتی

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا پیرۆزی بکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داینا لەسەر رانی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێ لەبەردەستیدا بوو خەریکی کردو ئاگای لەمناڵەکە نەما، ئەبو ئوسەید گوتی بە کەسێ کە مناڵەکە لەسەر رانی پێغەمبەر لاببا، بۆ بارسووکی، ئەویش وایکردو مناڵەکەیان بردەوە بۆ ماڵەوە، لەپاش کەمێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەئاگا هاتەوە، روانی مناڵەکە لەسەر رانی نەماوە، فەرمووی: (ئەوە مناڵەکە کوا؟ چی لێ هات؟). ئەبو ئوسەید عەرزیکرد: ناردمانەوە بۆ ماڵەوە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ناوی چییە؟) ئەبو ئوسەید ناوێکی پێ گوت کە بەدڵی نەبوو، لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوەکەی گۆڕی‌و ناوی نا مونذیرو فەرمووی: (نا ئەو ناوەم بەدڵ نییە، بەڵام واناوم نا مونذیر). ئیتر لەو رۆژەوە ناوە کۆنەکەیان واز لێهێناو ناویان نا مونذیر.

**روونکردنەوە:**

١- ئەبو ئوسەیدی ساعدی، ناوی مالیکی کوڕی رەبیعەیە، خەزرەجییە، ئەنصارییە، ئامادەی غەزای بەدرو غەزاکانی پاش بەدر بووە، لەرۆژی ئازادکردنی مەککەدا ئاڵای ئێڵی بەنی ساعیدە بەو بووە، واقیدی دەفەرموێ: پیاوێکی کورتەباڵای سەرو ریش سپی بووە مووی پڕو زۆر بووە، لە کۆتایی تەمەنیدا نابینا بووە، ساڵی شەستی کۆچی لەتەمەنی حەفتاو هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، دواترین کەس بووە لەبەدرییەکان کە مردووە، لەمەدینە مردووە. {بڕوانە: تەجرید = مختصر صحیح البخاری/٥، ژمارە: ١٧٨٨ هەتا کۆتایی}.

٢- ئەم فەرموودەیە موتتەفەقو عەلەیهییە، بوخاریش وەك موسلیم گێڕاویەتەوە لەسەهلەوە، بەهەمان لەفظو گوتە، لەگەڵ جیاوازییەکی زۆر کەمی شەکلیدا.

### ١٠٨٥) گۆڕینی ناو بەناوێ باشتر. (٥٥٦٩ - ٥٥٧٤)

### بَابٌ: تَغْيِيرُ الإِسْمِ إِلَى أَحْسَنَ مِنْهُ

١٤٠٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ ابْنَةً لِعُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) كَانَتْ يُقَالُ لَهَا عَاصِيَةُ، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَمِيلَةَ. {الحديث: ٥٥٧٠ = ٥٥٦١ فم}.

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: کچێکی عومەری کوڕی خەطاب** (رەزای خودایان لێ بێ) **ناوی عاصیە بوو، عاصیە بە عەرەبی واتە: ژنی یاخی، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ناوەکەی گۆڕی، لەبەر خراپیو ناشیرینی، بەناوێ جوانو ناوی نا: (جەمیلە = جوانە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٥٤٠٨}.**

## ١٠٨٦) گۆڕینی ناوی بەررە بە جووەیرییە. (٥٥٦٩ - ٥٥٧٤)
## بَابٌ: تَسْمِيَةُ بَرَّةَ جُوَيْرِيَةَ

**١٤٠٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَتْ جُوَيْرِيَةُ اسْمُهَا بَرَّةَ، فَحَوَّلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْمَهَا جُوَيْرِيَةَ، وَكَانَ يَكْرَهُ أَنْ يُقَالَ: خَرَجَ مِنْ عِنْدِ بَرَّةَ. {الحديث: ٥٥٧١ = ٥٥٦٢ فم}:**

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: دایکی بڕواداران جووەیرییەی کچی حاریث، لەپێش ئەوەدا کە شووبکا بە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ناوی بەررە بوو، (واتە: چاكو باش) پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کەمارەی کرد بۆ خۆی، ناوەکەی گۆڕیو ناوی نا جووەیرییە، (واتە: کچۆڵە) چونکە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پێی ناخۆش بوو بگوترێ: پێغەمبەر لەلای بەررەوە دەرچووە دەرێ. چونکە ئەم گوتەیە بۆنی ئەوەی لێ دێ کە چاکەی بەجێ هێشتبێ! {تاج/٥، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٥٤١٠}.**

## ١٠٨٧) گۆڕینی ناوی بەررە بە زەینەب. (٥٥٦٩ - ٥٥٧٤)
## بَابٌ: تَسْمِيَةُ بَرَّةَ زَيْنَبَ

**١٤٠٧- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ قَالَ: سَمَّيْتُ ابْنَتِي بَرَّةَ، فَقَالَتْ لِي زَيْنَبُ بِنْتُ أَبِي سَلَمَةَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ هَذَا الاِسْمِ، وَسُمِّيتُ بَرَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمُ اللَّهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْبِرِّ مِنْكُمْ»، فَقَالُوا: بِمَ نُسَمِّيهَا؟ قَالَ: «سَمُّوهَا زَيْنَبَ». {الحديث: ٥٥٧٤ = ٥٥٦٥ فم}:**

موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی عەطاء (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: كچێكم بوو ناوم نا بەررە (واتە: باش: چاك: خاس) زەینەبی كچی ئەبو سەلەمە (ڕەزای خودایان لێ بێ) پێی فەرمووم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم ناوەی یاساخ كردووە، منیش كاتی خۆی ناوم بەرە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆتان بەپاك و پاكیزە دامەنێن و تەزكییەی خۆتان مەكەن، هەر خودا بۆ خۆی باش دەزانێ كە كێتان باشە، یا خراپە).

جا دەڵێن: قوربان! ئەی ناوی بنێین چی؟ فەرمووی: ناوی بنێن زەینەب (واتە: نەرمۆڵ: نەرمین) ئیتر ناویان نام زەینەب. {تاج/٥، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٥٤٠٩، چ/٤} + {بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٥٤٢١ هەتا كۆتایی + ژمارە: ٥٤٧١} + {تەجرید/٥، ژمارە: ١٩٥٩ = ٦١٩٢ = لاپەڕە: ٢٢٤}.

## ١٠٨٨) بەداری مێو مەڵێن كەرم. (٥٨٢٨ - ٥٨٣٤)
## بابٌ: فِي تَسْمِيَةِ العِنَبِ: الكَرْمَ

١٤٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ لِلْعِنَبِ الْكَرْمَ، فَإِنَّ الْكَرْمَ الرَّجُلُ الْمُسْلِمُ». {الحديث: ٥٨٢٨ = ٥٨٢٣ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەترێ و داری مێو مەڵێن: (كەرم) چونكە مرۆی موسوڵمان شایستەی ئەم ناوە جوانەیە، نەوەك ترێ و بەری داری مێو كەمەی و بادەی لێ دروست دەكرێ).
{تاج/٥، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٥٤٧٠، ٥٤٧١ چ/٤}.

بۆئەوەی تەواو لەمەبەستی ئەم فەرموودەیە تێ بگەین بفەرموو بڕوانە: تاجی بەكوردی، بەرگی پێنجەم لاپەڕە (٥١٢) لەزنجیرە: ٨٣دا، ڕوونكردنەوەكە هەتا كۆتایی.

١٤٠٩- عَنْ وَائِلِ بن حجر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لاَ تَقُولُوا الْكَرْمُ، وَلَكِنْ قُولُوا الْعِنَبُ وَالْحَبَلَةُ». {الحديث: ٥٨٣٣ = ٥٨٢٧ فم}:

وائیلی كوڕی حوجر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەترێو داری مێو مەڵێن: كەرم، وەك ئەرەق خۆرەكانی سەردەمی نەزانی ئاوایان دەگوت، بەڵام بڵێن: ترێو داری مێو).

**روونكردنەوە:**

بەپێی شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم، ئەم جۆرە ناونانە، كەراهەتو ناباشییان هەیە.

**١٠٨٩) با مرۆڤ بەم جۆرە ناوانە ناونەنرێ: ئەفلەحو رەباحو یەسارو نافیع.**

**(٥٥٦٤ - ٥٥٦٨)**

**باب: النهيُ أنْ يُسَمَّى بِأَفْلَحَ وَرَبَاحٍ وَيَسَارٍ وَنَافِعٍ**

١٤١٠- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ نُسَمِّيَ رَقِيقَنَا بِأَرْبَعَةِ أَسْمَاءٍ: أَفْلَحَ وَرَبَاحٍ وَيَسَارٍ وَنَافِعٍ. {الحديث: ٥٥٦٤ = ٥٥٥٥ فم}:

سەموورەی كوڕی جوندوب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نەدەداین كە خوڵامو كۆیلەكانمان ناوبنێین بەم چوار ناوە: بە ئەفلەحو بەرەباحو بە یەسارو بەنافیع). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٥٤٠١}.

١٤١١- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَحَبُّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَرْبَعٌ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ، وَلاَ تُسَمِّيَنَّ غُلاَمَكَ يَسَارًا وَلاَ رَبَاحًا وَلاَ نَجِيحًا وَلاَ أَفْلَحَ، فَإِنَّكَ تَقُولُ أَثَمَّ هُوَ؟ فَلاَ يَكُونُ، فَيَقُولُ: لاَ، إِنَّمَا هُنَّ أَرْبَعٌ فَلاَ تَزِيدُنَّ عَلَيَّ. {الحديث: ٥٥٦٦ = ٥٥٥٧ فم. أبو داود. أدب: ٤٩٥٨، ٤٩٥٩. ترمذي. أدب: ٢٨٣٤. ابن ماجة. أدب: ٣٧٢٩. تحفة الأشراف: ٤٦١٢}:

سەموورەی كوڕی جوندوب (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆشەویسترین گوتە، لەلای خودای گەورە، ئەم چوار وشەیە:

(سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ: پاكیو پیرۆزی، لەراستیدا هەر بۆخودایە، سوپاسو ستایش هەر شایستەی خودایە، هەر خودا خودایەو بەس، خودا لەهەموو كەسو لەهەموو شتێ گەورەترە). بەهەركامێ لەم چوار وشەیە دەست پێ بكەی قەیدی نییە بۆ تۆ، كوڕی خۆشت ناومەنێ یەسار، یا رەباح، یا نەجیح، یا ئەفلەح، چونكە وادەبێ، تۆ دەپرسیتو دەڵێیت: ئەرێ هین لەوێیە؟ جا ئەگەر لەوێ نەبوو دەڵێن: ئەو لێرە نییە). قسە بێژ دەفەرموێ: ئەم ناوانە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی لێ كردوون، تەنیا چوار ناونو بەس، بەدەم منەوە زیاتریان مەكەن!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٥٤٠١، چ/٤}.

**روونكردنەوە:**

١- ئەوەی كە دەفەرموێ: (بەهەر كامێ لەم چوار وشەیە دەست پێ بكەی قەیدی نییە بۆ تۆ) مەبەست ئەوەیە بە:

١/ (سُبْحَانَ الله) دەست پێ بكەی، وەك ئێستای خۆی دەبێ، ئاوا: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ.

٢/ بە (الْحَمْدُ لِلَّهِ) دەست پێ بكەی دەبێ، ئاوا: (الْحَمْدُ لِلَّهِ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ).

٣/ بە (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) دەست پێ بكەی هەر دەبێ، ئاوایە: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ).

٤/ بە (اللَّهُ أَكْبَرُ) دەست پێ بكەی هەر دەبێ، ئاوا: (اللَّهُ أَكْبَرُ وَسُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ).

ئەوەیشی كە دەفەرموێ: (ئەرێ هین لەوێیە) ئەم چوار ناوە، واتایان ئاوایە: (یەسار = ئاسان)، (رەباح = قازانج)، (نەجیح = سەركەوتوو = دەرچوو)، (ئەفلەح = رزگار). جا لەكاتی پرسیاردا، ئەگەر كەسێ لەكەسێ بپرسێ: ئەرێ كاك ئاسان لەوێیە؟) تۆیش بڵێی ئاسان لێرە نییە، نۆقڵانەی باش نییە.

بەپێی شەرحەكان ئەم جۆرە ناوانە كەراهەتی تەنزیهییە.

## ١٠٩٠) ئاخر بڕیار، مۆڵەت دراوە بەم ناوانە. (٥٥٦٤ - ٥٥٦٨)
## باب: الرخصة في ذلك

١٤١٢- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: أَرَادَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنْ يَنْهَى عَنْ أَنْ يُسَمَّى بِيَعْلَى وَبِبَرَكَةَ وَبِأَفْلَحَ وَبِيَسَارٍ وَبِنَافِعٍ، وَبِنَحْوِ ذَلِكَ، ثُمَّ رَأَيْتُهُ سَكَتَ بَعْدُ عَنْهَا، فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا، ثُمَّ قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَلَمْ يَنْهَ عَنْ ذَلِكَ، ثُمَّ أَرَادَ عُمَرُ أَنْ يَنْهَى عَنْ ذَلِكَ ثُمَّ تَرَكَهُ. {الحديث: ٥٥٦٨ = ٥٥٥٩ فم}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ویستی كەناوی یەعلاو بەرەكەتو ئەفلەحو یەسارو نافیعو ئەم جۆرە ناوانە یاساخ بكا، بەڵام وەك سەنجمدا لەپاشا لێیان بێ دەنگ بوو، هەتا گیانی پاكی سپارد هیچی وای لەبارەیانەوە نەفەرموو. عومەریش (رەزای خودای لێ بێ) ویستی كە ئەم جۆرە ناوانە قەدەغە بكا، بەڵام لەپاشدا ئەویش وازی لەوەهێنا). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٥٤٠٢}.

## ١٠٩١) ناوهێنانی بەندەو كەنیزو سەروەرو ئاغا. (٥٨٣٥ - ٥٨٣٨)
## باب: تسمية العبد والأمة والمولى والسيد

١٤١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: اسْقِ رَبَّكَ، أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّئْ رَبَّكَ، وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: رَبِّي، وَلْيَقُلْ: سَيِّدِي مَوْلاَيَ، وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي، أَمَتِي، وَلْيَقُلْ: فَتَايَ، فَتَاتِي، غُلاَمِي». {الحديث: ٥٨٣٨ = ٥٨٣١ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٩١ = ٢٥٥٢ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٤٧١٨}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەكاتی قسەكردنو گوفتوگۆدا، بەكارەكەرو خزمەتكارەكانتان مەڵێن: ئاو بدە بەخاوەنەكەت، یا نان بدە بە خاوەنەكەت، یا ئاوی دەسنوێژ بكە بە دەستی خاوەنەكەتا، هەروا بەیەكتریش مەڵێن: (رَبِّي: خاوەنم!) بەڵام بڵێن: (سَيِّدِي: گەورەم، مَوْلاَيَ: سەروەرم) وەیا مەڵێن: (عَبْدِي: عەبدەكەم:: بەندەكەم، فَتَاتِي: كارەكەرەكەم: نۆكەرەكەی من، كەنیشكەكەی من. غُلاَمِي: خولامەكەم). {تاج/٥، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٥٤٦٤ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

### ١٠٩٢) بەکارهێنانی کەسناو (کونیه) بۆ منداڵ. (٥٥٧٧ - ٥٥٨٦)
### بابٌ: تَكْنِيَةُ الصَّغِيرِ

١٤١٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقًا، وَكَانَ لِي أَخٌ يُقَالُ لَهُ: أَبُو عُمَيْرٍ (قَالَ: أَحْسِبُهُ قَالَ) كَانَ فَطِيمًا، قَالَ: فَكَانَ إِذَا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَآهُ قَالَ: «أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ»؟ قَالَ: فَكَانَ يَلْعَبُ بِهِ. {الحديث: ٥٥٨٧ = ٥٥٧٨فم. تجريد/٥، رقم: ١٩٥٢ = ٦١٢٩، ٦٢٠٣. أبو داود. أدب: ٤٩٦٤. ترمذي. أدب: ٢٨٣١. تحفة الأشراف: ٥١٤}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەڕاستی پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) خاوەنی رەفتاری شیرین و بەرزبوو، خۆی لەئێمە جیا نەدەکردەوە، تەواو تێکەڵاوی دەکردین، تەنانەت برایەکی بچکۆلەم هەبوو، کەسناوی ئەبو عومەیر بوو، لەشیر بڕابۆوە، پێیان دەگوت: باوکی عومەیر، چۆلەکەیەکی هەبوو، یاری پێ دەکرد، رۆژێ کێشکەکە مرد، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ ماڵمان، تەماشای کرد ئەبو عومەیر خەمبارە، فەرمووی: (ئەوە چییەتی بۆچی وا خەفەتبارە؟) عەرزیان کرد: مەلیچکەکەی مردووە! فەرمووی: (ئەی باوکی عومەیر، مەلیچکەکەت چی بەسەرهات!). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٤٨٦٠، ج/٤ = چاپی چوارەم}. ئەمەی نووسیمان گێڕانەوەی تاجە، بۆ زیادە زانیاری بڕوانە تەجرید بەرگی پێنجەم فەرموودەی ژمارە: ١٩٥٢ = ٦١٢٩ فەتحولباری.

### ١٠٩٣) پیاو بەپیاوێ تر بڵێ: ئەی کوڕی بچکۆلەم. (٥٥٩١ - ٥٥٩٩)
### بابٌ: قَوْلُ الرَّجُلِ لِلرَّجُلِ: يَا بُنَيَّ

١٤١٥- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: مَا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَدٌ عَنِ الدَّجَّالِ أَكْثَرَ مِمَّا سَأَلْتُهُ عَنْهُ فَقَالَ: لِي « أَيْ بُنَيَّ وَمَا يُنْصِبُكَ مِنْهُ إِنَّهُ لَنْ يَضُرَّكَ ». قَالَ: قُلْتُ إِنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّ مَعَهُ أَنْهَارَ الْمَاءِ وَجِبَالَ الْخُبْزِ. قَالَ: « هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ ». {الحديث: ٥٥٨٩ = ٥٥٨٠ فم. بخاري. فتن: ٧١٢٢}:

موغیرەی کوڕی شوعبە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کەس ئەوەندەی من لەبابەت جەجاڵەوە پرسیاری زۆری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەدەکرد، جارێکیان پێی

فەرمووم: (ڕۆڵەکەم! کوڕە شیرینەکەم! چییە وا ئەوەندە لێی خەجڵی، زیانی بۆ تۆ نابێ، ئیتر بۆ ئەوەندە پەرێشانی کردوویت؟).

گوتم: بۆیە ئەوەندە دەترسم چونکە دەڵێن: کێوی گەورە گەورەی نان‌و چەندین چەم‌و ڕوباری ئاوی لەگەڵە!

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (با ئەوانەیشی لەگەڵ بێ، ئەو لەلای خودا سووك‌و ترۆیە‌و ڕادەی ناگەوێ کەبەهۆی ئەم جۆرە چاو بەست‌و چاوو ڕاوەوە سەر لە موسوڵمانی پاك بشێوێنێ، بەڵکوو ئەوە دەبێ بەهۆی بەهێزبوونی باوەڕی باوەڕدارو دەبێ بەهۆی ڕاستکردنەوەی بەڵگەی ڕۆشن لەسەر ناموسوڵمانان‌و ناپاکان، کە فەرمایشتی خوداو پێغەمبەری خودا ڕاستە‌و دێتە جێ‌و ڕەتبوونەوەی نییە!). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٥٦١٥}.

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەستی سەرەکی لەم سەرباسە ئەوەیە، کە مرۆڤ لەکاتی گوفتوگۆو شتی وادا، سوننەتە کە زمانی شیرین بێ‌و لەڕووی خۆشەویستییەوە بەکەسێ کە لەخۆی منداڵتربێ، بڵێ: ڕۆڵەکەم، کچەکەم، کوڕەکەم، یا لەتەمەنی خۆیدا بێ، پێی بڵێ: براکەم، خوشکەکەم، یا پێی بڵێ: کاکە، مامە، دادە، باجی، دایکەکەم، پووری، میمی، خاڵۆ، مامۆستا، یا شێخ، کاك حاجی، ئەمانە هیچی بەدرۆ دانانرێ، بەڵکوو پەسەندو باشە‌و دەبێ بەهۆی پەخشی دۆستی‌و خۆشەویستی‌و ڕێزی یەکتری‌و باوێکی کۆمەڵایەتی پەسەندەو شەرع بەگەندی دەکا!!

**١٠٩٤) خوێڕی ترین ناو لەلای خودا ناوی ئەو کەسەیە خۆی ناوبنێ شاهن شاه.**

**(٥٥٧٥ - ٥٥٧٦)**

**بابٌ: أَخْنَعَ اسْمٍ عِنْدَ اللَّهِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الأَمْلاَكِ**

١٤١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ أَخْنَعَ اسْمٍ عِنْدَ اللَّهِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الأَمْلاَكِ»، (وَفِي رِوَايَتِهِ): «لاَ مَالِكَ إِلاَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ»، قَالَ سُفْيَانُ يعني ابن عيينة: مِثْلُ شَاهَانْ شَاهْ. وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: سَأَلْتُ أَبَا

عَمْرٍو عَنْ (أَخْنَعَ) فَقَالَ: أَوْضَعَ. {الحديث: ٥٥٧٥ = ٥٥٦٦ فم. تجريد/٥، رقم: ١٩٦١ = ٦٢٠٥، ٦٢٠٦}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (خوێڕیترین ناو لەلای خودای گەورە، ناوی ئەو پیاوەیە کە خۆی ناوبنێ (مَلِكُ الأَمْلاَكِ: شاهەنشاه). لەگێڕانەوەیەکا، کە ژمارەکەی (٥٥٧٦)ە، لە صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ** (دروودی خودای لەسەر بێ): **(لەڕۆژی ژینەوەدا، خودای گەورە لەهەموو کەسێ زیاتر رقی لەو پیاوەیە کە ناونرابێ (شای شایان: مەلیکو ئەملاك: شاهنشاه) خودای گەورە لەهەموو کەسێ زیاتر رقی لەو پیاوەیە، کە ناوبنرێ: (شای شایان: مەلیکول ئەملاك: شاهنشاه) خودای گەورە لەهەموو ناوێ زیاتر رقی لەخاوەنی ئەم ناوەیە، ئەم ناوە لەلای خودا لەهەموو ناوێ چەپەڵترە، شای راستەقینە، کە هەرخۆی شای گشت شایان بێ تەنیا خودای گەورەیەو بەس). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٥٣٩٩، ٥٤٠٠} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٢٠، ژمارە: ١٧٢٤}.**

**هەر لەم گێڕانەوەیەدا دەفەرموێ: سوفیان (ناسراو بە ئیبنو عویەینە) دەفەرموێ: واتای مەلیکول ئەملاك، وەك شاهانشاه. ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، دەفەرموێ: لەبارەی واتای وشەی (ئەخنەع)ی ناو ئەم فەرموودەیەوە، لەئەبو عەمرم پرسی، فەرمووی واتە: خوێڕیو نارەسەنترین.**

## ١٠٩٥) **مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان پێنجن.** (٥٦١٥ - ٥٦١٦)

## **بابٌ: حَقّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ**

١٤١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «خَمْسٌ تَجِبُ لِلْمُسْلِمِ عَلَى أَخِيهِ: رَدُّ السَّلاَمِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ». {الحديث: ٥٦١٥ = ٥٦٠٦ فم. تجريد/٢، رقم: ٦٠٠ = ١٢٣٩، ٢٤٤٥، ٥١٧٥، ٥٦٣٥، ٥٦٥٠، ٥٨٦٣، ٦٢٢٢، ٦٦٥٤}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (مافی موسوڵمان لەسەر برای موسوڵمانی خۆی پێنجن: وەڵامدانەوەی سڵاوو**

نزاكردن بۆ پژمیوو چوون بۆسەر دەعوەتو سەردانی نەخۆشو شوێنەکەوتنی تەرم). {ریاض/١، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٣٨، ٢٣٩ + ریاض/٢، زنجیرە: ١٤٤، ژمارە: ٨٩٤}.

١٤١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ»، قِيلَ: مَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَسَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ». {الحديث: ٥٦١٦ = ٥٦٠٧ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەیاسای شەرعی خودا موسوڵمان شەش مافی تایبەتی لەسەر موسوڵمان هەیە:

یەکەم: کاتێ تووشی دەبیو بەیەکتری دەگەن سلاو رۆژ باشی لێ بکا.

دووەم: ئەگەر خوڵکی کرد بۆسەر شایی‌و نان خواردن‌و شتی وا، بابچێ بۆسەر بانگهێشتنەکەی.

سێیەم: کاتێ داوای ئامۆژگاری‌و راوێژی لێ کردیت، ئامۆژگاری باشی بکەو بەشێوەی گشتی هەرچیت بۆ خۆت پێ خۆشە، بۆ ئەویش ئەوەت پێ خۆش بێ‌و هانی بدە لەسەری.

چوارەم: کاتێ دەپژمێ‌و سوپاسی خوای کردو گوتی: (الحمد لله: سوپاس بۆ خودا) تۆیش نزای باشی بۆ بکەو پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ: خودا رەحمت پێ بکا).

پێنجەم: ئەگەر نەخۆش کەوت سەری لێ بدەو لەکاتی ناساخیدا هەواڵپرسی لێ بکە.

شەشەم: کاتێ دەمرێ شوێن تەرمەکەی بکەوەو ئەگەر لەگەڵیا هەتا سەر گۆڕستان بچی‌و ئامادەی ناشتنی بیت زۆر چاکە). {ریاض/١، لاپەڕە: ٢١٢، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٣٨. چاپی دووەم}.

**روونکردنەوە:**

{بروانە: تاج/٥، زنجیرە: ٥٧، ٥٨، ٥٩، ٦٠، لەژمارە: ٥٣٧٧ هەتا ٥٣٨٩} بڕیارەکانی نزای پژمیو (لە فەتحولولهیم)دا هاتووە:

١ - سوننەتە پژمیو، لەپاش پژمە، سوپاسی خودا بكا، بەدەنگی بەرز.
٢ - سوننەتە ئامادەبوان، نزای باشی بۆ بكەن، باشتر وایە پێی بگوترێ: (يَرْحَمُكَ اللّهُ) ئەگەر یەك كەسیش پیی بڵێ دەبێ.
٣ - واباشە پژمیو لەكاتی پژمیندا، بەدەستە سرێ، یا بەشتێ، یا بەهەردوو ناولەپی، رووی خۆی داپۆشێ، تانەبێ بە ئازار بۆكەس.
٤ - بەپێی تەوانا دەنگی پژمەكەی نزم بێو پرژی نەچێ بەسەر كەسدا.
٥ - تا جارێ دوو جار نزا بۆ پژمیو سوننەتە، بەتایبەتی ئەگەر سوپاسی خودای كرد لەپاش پژمین.
٦ - بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٣٨١، چ/٤ كە ئەمە دەقەكەیەتی:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ كەسێ لەئێوە دەپژمێ، بابڵێ: (الحمد لله: سوپاس بۆ خودا) با برادەرو هاوڕێكەیشی پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللّه: خودا رەحمت پێ بكا) كەوای پێ گوتو ئەم نزایەی بۆیكرد، با پژمیوەكەیش ئەم نزایە بۆ ئەو بكاو پێی بڵێ: (يَهْدِيكُمُ اللّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ: خودا شارەزای رێگەی حەقتان بكاو كاروبارتان بسازێنێ). {بوخاری. كتاب الأدب. باب: إذا عطس كَيْفَ يُشَمّت. رقم: ٦٢٢٤} + {بڕوانە: ریاض/٢، زنجیرە: ١٤٢، ژمارە: ٨٨٣، ٨٧٨، ٨٨٠، ٨٨١، ٨٨٤}.

## ١٠٩٦) رێگری لە دانیشتنی سەر رێگەوبان، مافی رێگە رەچاو بكرێ. (٥٦١٢ - ٥٦١٤)

## بابٌ: النَّهْيُ عَنِ الجُلُوسِ فِي الطُّرُقَاتِ وَإِعْطَاءِ الطَّرِيقِ حَقَّهُ

١٤١٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ فِي الطُّرُقَاتِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَنَا بُدٌّ مِنْ مَجَالِسِنَا، نَتَحَدَّثُ فِيهَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَإِذَا أَبَيْتُمْ إِلاَّ الْمَجْلِسَ، فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ»، قَالُوا: وَمَا حَقُّهُ؟ قَالَ: «غَضُّ الْبَصَرِ، وَكَفُّ الأَذَى، وَرَدُّ السَّلاَمِ، وَالأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ». {الحديث: ٥٦١٣ = ٥٦٠٤ فم} :

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (نەکەن لەسەرە ڕێگە دابنیشن!) عەرزیانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چارمان نییە، نیشتگەو جێ دانیشتنی ترمان نییە، ئەی لەکوێ دوو قسە بۆ خۆمان بکەین! حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەوای لێ هات! کەوابوو مافی ڕێگەوبان بەجێ بهێنن). گوتیان: مافی ڕێگەو بان چییە؟

فەرمووی: (چاوی خۆتان لە تەماشای ناڕەوا بگرنو، ئازاری کەس مەدەنو مەبن بەباری ئازار بۆ هاتوچۆکەران، لەهەمان کاتدا وەلامی سلاو بدەنەوەو، فەرمان بە چاکە بکەنو، جلەوگیریی لە خراپەو کاری ناشایستە بکەن!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٥٣٦١ چ/٤}.

## ١٠٩٧) دەستووری سلاوکردن. (٥٦١١)

## باب: في تسليم الرَّاكِبُ علَى الْمَاشِي وَالْقَلِيلُ علَى الْكَثِير

١٤٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ». {الحديث: ٥٦١١ = ٥٦٠٢ فم. تجريد/٥، رقم: ١٩٦٤ = ٦٢٣١، ٦٢٣٢، ٦٢٣٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (با سوار سلاو لەپیادە بکاو، پیادە سلاو لەدانیشتوو بکاو، کەم سلاو لەزۆر بکا). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٣٣، ژمارە: ٨٥٧، چ/٢ = چاپی دووەم} + {تاج/٥، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٥٢٨٤ + لەزنجیرە: ٣١وە هەتا زنجیرە: ٣٩ چاپی چوارەم}.

## ١٠٩٨) داوای مۆڵەتو ڕێ پێدان بۆ ڕۆیشتنە ناو ماڵو کۆڕی دانیشتنو شتی واو سلاوکردن. (٥٥٩١ - ٥٥٩٩)

## بَابُ: الاسْتِئْذَانُ وَالسَّلاَمُ

١٤٢١- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: جَاءَ أَبُو مُوسَى إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، هَذَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ قَيْسٍ، فَلَمْ يَأْذَنْ لَهُ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ،

هَذَا أَبُو مُوسَى، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، هَذَا الأَشْعَرِيُّ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ: رُدُّوا عَلَيَّ، رُدُّوا عَلَيَّ، فَجَاءَ، فَقَالَ: يَا أَبَا مُوسَى مَا رَدَّكَ؟ كُنَّا فِي شُغْلٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «الاِسْتِئْذَانُ ثَلاَثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ وَإِلاَّ فَارْجِعْ»، قَالَ: لَتَأْتِيَنِّي عَلَى هَذَا بِبَيِّنَةٍ، وَإِلاَّ فَعَلْتُ وَفَعَلْتُ، فَذَهَبَ أَبُو مُوسَى، قَالَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): إِنْ وَجَدَ بَيِّنَةً تَجِدُوهُ عِنْدَ الْمِنْبَرِ عَشِيَّةً، وَإِنْ لَمْ يَجِدْ بَيِّنَةً فَلَمْ تَجِدُوهُ، فَلَمَّا أَنْ جَاءَ بِالْعَشِيِّ، وَجَدُوهُ، قَالَ: يَا أَبَا مُوسَى! مَا تَقُولُ؟ أَقَدْ وَجَدْتَ؟ قَالَ: نَعَمْ، أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ، قَالَ: عَدْلٌ، قَالَ: يَا أَبَا الطُّفَيْلِ مَا يَقُولُ هَذَا؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ ذَلِكَ، يَا ابْنَ الْخَطَّابِ! فَلاَ تَكُونَنَّ عَذَابًا عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّمَا سَمِعْتُ شَيْئًا فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَتَثَبَّتَ. {الحديث: ٥٥٩٨ = ٥٥٨٩ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٣٩ = ٢٠٦٢، ٦٢٤٥، ٧٢٥٣}:

ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری فەرمووی: باوکم فەرمووی: عومەر ناردبووی بەشوێنما، ڕۆیشتم بۆلای، کە گەیشتمە بەردەرگاکەی، سێجار لەسەر ئەم شێوەیەی دواوە سلاوم کرد بەلام کەسێ وەلامی نەدامەوە: جاری یەکەم گوتم: سلاوتان لێ بێ من عەبدوڵلای کوڕی قەیسم، ئایا مۆڵەت هەیە کە بێمە ژوورەوە، بەلام کەس وەلامی نەدامەوە، جاری دووەم گوتم: سلاوتان لێ بێ من ئەبو مووسام، مۆڵەت هەیە کەبێمە ژوورەوە، بەلام دیسان وەلام نەبوو، جاری سێیەم گوتم: سلاوتان لێ بێ من ئەل-ئەشعەریم، مۆڵەت هەیە کەبێم بۆ خزمەتتان، بەلام دیسان وەلام نەبوو. ئیتر منیش گەڕامەوەو عومەریش کەبەمە دەزانێ دەفەرمویّ: بیگێڕنەوە بۆلام، بیگێڕنەوە بۆلام، منیش کەچوومەوە، فەرمووی: ئەی ئەبو مووسا! بۆچی گەڕایتەوە؟ بۆ چاوەڕوانت نەکرد؟ ئێمە لەوکاتەدا کەتۆ داوای مۆڵەتت کرد، سەرقاڵی کارێ بووین!

منیش عەرزیم کرد: من هاتم بۆلاتو سێجار لەبەر دەرگاکەتدا سلاوم کردو داوای مۆڵەتم کرد، کەس وەلامی نەدامەوە، ئیتر منیش گەڕامەوە چونکە بۆ خۆم لەخودی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (داوای مۆڵەت پێدانی چوونە ژوورەوە، بۆ

مالێ، یا بۆ لای کەسێ، سێجارە، ئەگەر ڕێگەت پێ درا ئەوا باشە، دەنا بگەڕێرەوە بۆ شوێنی خۆت).

جا عومەر بەهەڕەشەوە فەرمووی: (بەخودا یا بەڵگە راست دەکەیتەوە لەسەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر کە دەیگێڕیتەوە، یا ئێشێکی واوات پێ دەگەیەنم!)، منیش ڕۆیشتم هەتا شایەتی تر پەیدا بکەم، لەسەر داواکەم.

ئیمامی عومەر دەفەرموێ: (ئەگەر شایەتی دەست کەوێ ئێوارێ دەیهێنێ بۆلای مینبەرەکەی مزگەوتەکەی پێغەمبەر، کە ئێمە لەوێ چاوەڕوانی کردنی نوێژی شێوان دەکەین، ئەگەر شایەتیشی دەست نەکەوێ ئەوا نایەت).

جا بۆ ئێوارێ دەڕوانن وا ئەبو مووسا هاتووەو لەوێیە، عومەر پێی دەفەرموێ: (ئەی ئەبو مووسا! هاچیت کرد، شایەتت دەست کەوت کە شایەتیت بۆبدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وایفەرمووە؟). دەڵێ: بەڵێ، دەفەرموێ: کێیە؟ دەڵێ: ئوبەیی کوڕی کەعب. عومەر دەفەرموێ: شایەتێ ڕاستو دروستو دادپەروەرە، قەبووڵە!

ئەوجا عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕووی قسەی کردە ئوبەیی کوڕی کەعبو پێی فەرموو: (ئەی ئەبو طوفەیل! ئەی باوکی طوفەیل، تۆ لەم بارەیەوە کە ئەبو مووسا دەیڵێ چی لێ دەزانی، ئایا شتی وا هەیە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتی وای فەرموو بێ؟).

ئوبەیی کوڕی کەعب، لە وەڵامی عومەردا فەرمووی: (بەڵێ، بەگوێی خۆم لەخودی خۆشەویستم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (داوای مۆڵەتپێدانی چوونە ژوورەوە، بۆ مالێ، یا بۆلای کەسێ، سێ جارە، ئەگەر ڕێگەت پێ درا ئەوا باشە، دەنا بگەڕێرەوە بۆ شوێنی خۆت!). ئەبو مووسا چی فەرموو بوو، ئوبەیی شایەتی لەسەر هەمان شتدا، ئەوجا لەڕووی دڵسۆزیو ئامۆژگاری باشەوە بە عومەری فەرموو: (ئەی عومەر! ئەی کوڕی خەطاب! نەکەی ببیت بەهۆی کێشەو ئازار بۆ هاوەڵانی موحەممەد، ئەمەی کەتۆ لەگەل ئەبو مووسادا کردووتە بۆنی ئەوەی لێ دێ!!).

عومەریش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (سوبحانەڵڵا! چەند سەیرە! من چۆن شتی وا دەکەم؟ من تەنیا مەبەستم ئەوە بوو، کە ئەم شتەی بیستم، بچمە بنج و بنەوانی و دڵنیابم لەڕاستی و دروستی شتەکەو بەس، دەنا خوا نەخواستە من چۆن بەخوت و خۆڕایی ئازاری هاوڕێ و هاوەڵانی پێغەمبەری ئازیز دەدەم (درووی خودا لەخۆی و رەزای خودا لەسەرجەم هاوەڵ و هاوڕێ و یارانی بێ). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٥٢٥٨ ج/٤}.

**١٠٩٩) نیشانەی مۆڵەت پێدان ئەوەبێ کە پەردەکە لادرابێ.** (٥٦٣١ - ٥٦٣٢)

**بابٌ: جَعْلُ الإِذْنِ رَفْعُ الحِجَابِ**

١٤٢٢- عَنْ ابْنَ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذْنُكَ عَلَيَّ أَنْ يُرْفَعَ الْحِجَابُ، وَأَنْ تَسْتَمِعَ سِوَادِي حَتَّى أَنْهَاكَ». {الحديث: ٥٦٣١ = ٥٦٢٢ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (نیشانەی ئەوە کەمن رێگەم پێ داوی کە بێیتە ماڵەوە بۆلای من، ئەوەبێ کە پەردەی ماڵەوەم لابرابێ و گوێت لەقسەو رازم بێ، ئەم بڕیارە لەنێوانمانا دامەزراوبێ، هەتا خۆم پێت دەڵێم: کە ئیتر بەبێ مۆڵەت وەرگرتن مەیێ). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٥٢٦٨ ج/٤}.

**١١٠٠) خاوەن ماڵ ئەگەر گوتی: ئەوە کێیە لەبەردەرگا باش نییە مۆڵەتخواز بڵێ: منم.** (٥٦٠٠ - ٥٦٠٢)

**بابٌ: كَرَاهَةُ أَنْ يَقُولَ (أَنَا) عند الإِسْتِئْذَانِ**

١٤٢٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: «مَنْ هَذَا»؟ فَقُلْتُ: أَنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَنَا أَنَا». (وفي رواية): كأنه كره ذلك. {الحديث: ٥٦٠٠ = ٥٥٩١ فم. تجريد/٥/٢٣٥، رقم: ١٩٦٩ = ٦٢٥٠ + ٩٦٣ = ٢١٢٧ فتح}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش مردنی عەبدوڵڵای باوکم، هەتا ڕاوێژی پێ بکەم، لەبارەی دانەوەی ئەو قەرزەی کەوا لەسەر باوکم، جا لەدەرگامدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژوورەوە فەرمووی: (ئەوە کێیە؟) منیش گوتم: منم. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە دەرەوەو وەك کەسێ وەڵامەکەی منی پێ ناخۆش بێ، لەبەرخۆیەوە دەیفەرموو: (منم منم!!). {ڕیاض/٢، لاپەڕە: ٢٢٩، زنجیرە: ١٤١، ژمارە: ٨٧٧/٤}.

## ١١٠١) پێشگیریکردن لەسەرەتاتکێ کردن لەکاتی مۆڵەت خواستندا.
(٥٦٠٣ - ٥٦٠٨)

## باب: النهي عَنِ الإطِّلاعِ عِنْدَ الإسْتِئْذَانِ

١٤٢٤- عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَخْبَرَهُ أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ فِي جُحْرٍ فِي بَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَمَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِدْرًى يَحُكُّ بِهِ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْظُرُنِي لَطَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنِكَ»، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّمَا جُعِلَ الإِذْنُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ». {الحديث: ٥٦٠٣ = ٥٥٩٥ فم. تجريد/٥/٢٣٣، رقم: ١٩٦٦ = ٦٢٤١، ٥٩٢٤، ٦٩٠١}:

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدی (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ لەدرزی دەرگاکەی ماڵی پێغەمبەرەوە، لەپاش داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوە، سەرەتاتکێی دەکردو تەماشای ناوەوەی دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شانەیەکی ئاسنینی بەدەستەوە بوو، سەری خۆیی پێ دادەهێنا، بەکابرای فەرموو: (ئەگەر دەمزانی کەتۆ تەماشای ناوەوە دەکەی لەدرزی دەرگاکەوە، ئەم شانەیەم دەکرد بەناو چاوتا، چونکە خودای گەورە لەبەر تەماشای چاو ڕێخوازی (استئذان)ی داناوە). {تاج/٤٢٩/٥، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٥٢٦٥ ج/٤ + ڕیاض/٢، لاپەڕە: ٣٢٦، زنجیرە: ١٤٠، ژمارە: ٨٧١/٢}.

**١١٠٢) کەسێ بەبێ ڕێگە پێدان تەماشای ناو ماڵی کەسێ تر بکا ئەوانیش چاوی قەلپووچ بکەن.** (٥٦٠٣ - ٥٦٠٨)

**باب: مَن اطَّلَعَ في بَيْتِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ فَفَقَؤُا عَيْنَهُ**

١٤٢٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لَوْ أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ، فَخَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ مَا كَانَ عَلَيْكَ مِنْ جُنَاحٍ». {الحديث: ٥٦٠٨ = ٥٥٩٩ فم. تجريد/٥/٣٣٦، رقم: ٢٠٧٨ = ٦٨٨٨، ٦٩٠٢}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست** (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەگەر کەسێ، بەبێ مۆڵەتو ڕێگە پێدانی خۆت، تەماشای ناو ماڵی تۆ بکا، بە پەلەپیتکە چەوێکی تێ بگریو چاوی قەلپووت بکەی گوناهت ناگا).
{تاج/٢٩/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٢٣٣٢ ج/٤}.

**١١٠٣) تەماشاکردنی کوتوپڕو چاو وەرچەرخان.** (٥٦٠٩ - ٥٦١٠)

**بابٌ: في نَظَرِ الْفُجَاءَةِ، وَصَرْفِ الْبَصَرِ عَنْهَا**

١٤٢٦- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ نَظَرِ الْفُجَاءَةِ؟ فَأَمَرَنِى أَنْ أَصْرِفَ بَصَرِى. {الحديث: ٥٦٠٩ = ٥٦٠٠ فم}:

**جەریری کوڕی عەبدوللا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لە پێغەمبەرم پرسی:** لەبارەی تەماشاکردنی کوتوپڕییەوە، کەوادەبێ، لەپڕێکا مرۆڤ چاوی دەکەوێ بە کەسێکی ناخۆیی (نامەحرەم) کە سەیرکردنی نادروستە، ئایا بڕیاری ئەوە چییە؟ فەرمووی: (ئەوە قەیدی نییەو دانانرێ بەگوناه، بەڵام یەکسەر چاوت وەرچەرخێنەو کۆتایی بەسەیرکردنی بهێنە!).

**١١٠٤) کەسێ دەچێتە ناو کۆڕی دانیشتن، سڵاو دەکاو دادەنیشێ.**
(٥٦٤٥ - ٥٦٤٦)

**بابٌ: مَنْ أَتَى مَجْلِساً سَلَّمَ وَجَلَسَ**

١٤٢٧- عَنْ أَبِى وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِى الْمَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ إِذْ أَقْبَلَ نَفَرٌ ثَلاَثَةٌ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى

رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَذَهَبَ وَاحِدٌ، قَالَ: فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلاَثَةِ؟ أَمَّا أَحَدُهُمْ، فَأَوَى إِلَى اللَّهِ فَآوَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَاسْتَحْيَى، فَاسْتَحْيَى اللَّهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَأَعْرَضَ فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ». {الحديث: ٥٦٤٥ = ٥٦٣٧ فم. تجريد/١، رقم: ٥٩ = ٦٦، ٤٧٤. ترمذي. لإستئذان: ٢٧٢٤. تحفة الأشراف: ١٥٥١٤}:

ئەبو واقیدی لەیثی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمزگەوت دانیشتبوون، خەریکی خواپەرستیو تاعەتی خودا بوون، لەوکاتەدا سێ کەس هاتن، دوانیان هاتنە بەرەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە یەکێکیان رۆیشت. فەرمووی: جا دوو کەسەکە لەدیار کۆڕەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) راوەستان، هەتا یەکێکیان کەلێنێکی لە ئەڵقەی کوڕەکەدا بەدی کرد تیادا دانیشت، وە ئەوی تریشیان جێگەی دەست نەکەوت بەڵام لەپشتیانەوە دانیشت، وە سێهەمیشیان هەڵی تۆڕاندو رۆیشت. جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئامۆژگاریو قسەی کۆڕی پەخشی زانستو یادی خوداکەی لێ بۆوە، فەرمووی: (با باسی حاڵی ئەم سێ کەسەتان بۆبکەم: یەکێکیان هانای بردە بەر خوداو خودا هانای داو جێگەی کردەوە لەناو ئەو کۆڕە پیرۆزەدا، یەکێکیشیان شەرمی کردو خودایش شەرمی لەوکرد، چونکە ئەو کۆڕە پیرۆزەی بەجێ نەهێڵا، خودایش لە پاداشتو پیتو فەڕی ئەو کۆڕە پیرۆزە بەشداریکرد، ئەوی تریشیان پشتی هەڵکردو بەکۆڕو مەجلیسی ئێمە رازی نەبوو، خودایش پشتی لەو هەڵکردو لێی تووڕە بوو!). {تاج/١/٧٠، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٩٩ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١١٠٥) کەسێ کەسێ هەڵبستێنێو خۆی لەجێگەکەی دابنیشێ ناباشە.

(٥٦٤٧ - ٥٦٥٢)

## باب: النهي أن يُقام الرَّجُلُ من مَجْلِسِهِ و يَجْلِسُ فيه

١٤٢٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَقْعَدِهِ ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا»، (وَفِي رِوَايَةٍ)

قُلْتُ: «فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَغَيْرِهَا». وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا قَامَ لَهُ رَجُلٌ عَنْ مَجْلِسِهِ لَمْ يَجْلِسْ فِيهِ. {الحديث: ٥٦٤٩ + الحديث: ٥٦٥٠ = ٥٦٤١ فم + ٥٦٤٢ فم. تجريد/٥/٢٣٦، رقم: ١٩٧٠ = ٦٢٦٩ + ٤٨٠. تجريد/٩١١ فتح الباري}:

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لیٚ بیٚ) **دەفەرمویٚ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بیٚ) **دەفەرمویٚ:** (نابیٚ کەسیٚ کەسێکی تر لەجێگەی خۆی هەڵبستێنیٚو خۆی تیا دانیشیٚ، بەلاّم لەکاتی پێویستدا تەکە تەکە بکەنو جێگەی یەکتری بکەنەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٥٣٦٢ چ/٤}.

لەگێڕانەوەیەکا: عەرزیمکرد: مەبەست لەم نەهیە کەوا لەم فەرمایشتەدا، جێگە دانیشتنی ناو ریزی نوێژی هەینییە لەڕۆژی هەینیدا؟ فەرمووی: (مەبەست دانیشتنی ڕۆژی هەینیو ڕۆژەکانی تریشە، هەروا مەبەست مزگەوتو شوێنەکانی تریشە).

یاسای **ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لیٚ بیٚ) وابوو، ئەگەر پیاویٚ جێگەکەی خۆی بۆی چۆڵ بکردایە تیادا دانەدەنیشت). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٢٩، ژمارە: ٨٢٥ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خودای لیٚ بیٚ) لەم شوێنەدا لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرمویٚ:

١- هەرکەسیٚ لەپێشا لەشوێنێکی رەوادا جێگەی خۆیگرت ئیتر خۆی بەو جێگەیە لەپێشترە هەتا کەسیٚ تر، کەسیٚ تر بۆی نییە کە لەوجێگەیە هەڵی بستێنیٚ. جا ئەو شوێنە لەناو مزگەوتابیٚ، یا لەشوێنیٚ تربیٚ، لەڕیزی نوێژدا بیٚ، یا لەڕیزی نوێژدا نەبیٚ.

٢- هەمان حوکمو بڕیاری هەیە، جێگە گشتییەکانی تر، وەك سەر شۆستەی جادەکانو شوێنە گشتییەکانی ناو بازاڕ.

٣- ئەگەر کەسیٚ بەرەزای خۆی جێگەی خۆی چۆڵ بکا بۆ کەسیٚ تر، ئەگەر دڵنیا بوو، لەوە کەبەدڵ پێی خۆشەو لەبەر شەرمو شتی وا نەبووە، ئەوە دروستە داواکەی قەبووڵ بکاو لەو جێگەیە دابنیشیٚ.

لە فەتحولولهیمدا دەفەرموێ: (سوننەتە بۆ دانیشتوو، کە لەم حاڵەتانەدا، جێگەی خۆی چۆڵ بکاو بیبەخشێ بەکەسێ تر.

١/ بۆ کەسێ لەخۆی گەورەتر بێ بەتەمەن.

٢/ هەروا بۆ کەسێ لەخۆی زاناتربێ لەبەر عیلمەکەی.

٣/یا لەبەر هەر هۆیەکی ڕەوای تر (وەك: فەقێ بۆ مامۆستای، سۆفی بۆ شێخی خۆی، شاگرد بۆ وەستای – وەرگێڕ).

**١١٠٦) کەسێ لەجێگەی خۆی هەڵسێو دوایی بگەڕێتەوە، خۆی بەجێگەی پێشووی خۆی لەپێشترە. (٥٦٥٣)**

**باب: إِذَا قَامَ مَجْلِسِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ**

١٤٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ». (وَفِي حَدِيثِ أَبِي عَوَانَةَ): «مَنْ قَامَ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ». {الحديث: ٥٦٥٣ = ٥٦٤٥ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ لەجێگەیێ هەڵسا، لەپاشا گەڕایەوە بۆی، خۆی لەپێشترە پێی هەتا یەکێکی تر). {تاج/٥/٤٦٣، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٥٣٦٣ چ/٤}.

**١١٠٧) نابێ دووکەس پێکەوە چپە بکەن، بەبێ کەسی سێیەم کە لەگەڵیانا بێ. (٥٦٥٨ - ٥٦٦٢)**

**باب: النهي عَنْ مُنَاجَاةِ الإِثْنَيْنِ دُونَ الثَّالِثِ**

١٤٣٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فَلاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، مِنْ أَجْلِ أَنْ يُحْزِنَهُ». {الحديث: ٥٦٦٠ = ٥٦٥٢ فم. تجريد/٥/٢٣٦، رقم: ١٩٧٢ = ٦٢٩٠. تحفة الأشراف: ٩٢٥٣}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ سێ کەس بوون، نابێ دوو کەستان بەبێ ئەوی ترتان سرتەو

چپە بکەنو دوو بەدوو بەبێ ئەوی ترتان قسەی پەنهانی بکەن، چاوەڕوانکەن ئەگەر قسەیەکی نهێنی خۆتان هەبوو مەیکەن، هەتا تێکەڵی خەڵکی تر دەبن، ئەوسا دوو بەدوو قسە نهێنییەکەی خۆتان بکەن، چونکە ئەگەر سێ کەس بنو دوانتان چپە چپ بکەنو لەوی ترتانی بشارنەوە، ئەوە شتێ وا دەبێ بەهۆی دڵتەنگی ئەوی ترتان). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨١، ژمارە: ١٥٩٨/١} . {تاج/٥، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٥٣٧٥ چ/٤} .

## ١١٠٨) سلاو لەمنالان. (٥٦٢٨ - ٥٦٣٠)

## باب: السَّلَامْ عَلَى الغلْمَان

١٤٣١- عَنْ سَيَّارٍ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ فَحَدَّثَ ثَابِتٌ: أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي مَعَ أَنَسٍ، فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَحَدَّثَ أَنَسٌ أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ. {الحديث: ٥٦٢٨ = ٥٦٢١ فم. تجريد/٥/٢٣٥، رقم: ١٩٦٨ = ٦٢٤٧} :

سەییار فەرمووی: جارێ لەخزمەت ثابیتی ئەل — بەنانیدا دەڕۆیشتم، دای بەلای کۆمەڵێ منالا سلاوی لێ کردنو ئەوجا ثابیت فەرمووی: جارێ لەخزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیکا دەڕۆیشتم، لەلای تاقمێ منالەوە رەت بوو، سلاوی لێ کردنو، فەرمووی: جارێ لەخزمەتی حەزرەتدا (درودی خودای لەسەر بێ) لەلای تاقمێ منالەوە رەت بوو سلاوی لێ کردن). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٥٢٨٦، چ/٤} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٦٠٤ + ریاض/٢، زنجیرە: ١٣٦، ژمارە: ٨٦٢ چاپی دووەم = چ/٢} .

**ڕوونکردنەوە:**

ثابیتی کوڕی ئەسلەمی ئەل-بەنانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) تابیعییەکی ناسراوە لەناو کۆمەڵەی فەرموودە زانەکاندا، کەسناو (کونیە)ی ئەبو موحەممەدی ئەلبەصرییە، یەکێ بوو لە فەقێو شاگردە ناودارو ناسراوەکانی ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك.

دەگێڕنەوە لە ثابیتەوە فەرموویەتی: چل ساڵ هاوەڵی‌و هاوڕێتی ئیمامی ئەنەسم کردووە، بوخاری لە ئیبنولمدینییەوە دەفەرموێ: (ثابیت نزیکەی دوو سەدو پەنجا فەرموودەی هەیە). پیاوێکی زۆر باش‌و خواناس بووە، جێگەی باوەڕو متمانەی فەرموودە زانە گەورەکانە. عەسقەلانی لە تەهذیب‌ولتەهذیبدا دەفەرموێ: شوعبە دەفەرموێ: (ثابیت هەموو شەوو رۆژێ خەتمەیەکی قورئانی دەکردو ساڵ دوازدە مانگە بەڕۆژوو بوو!!).

ئیبنو علیە دەفەرموێ: ساڵی (١٢٧)ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە، خوا پەرستترین کەسی سەردەمی خۆی بووە لەخەڵکی بەصرە (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

**١١٠٩) ئێوە لەپێشا سڵاو لەجوولەکەو گاور مەکەن.** (٥٦١٧ - ٥٦٢٧)

**بَابٌ: لاَ تَبْدَءُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى بِالسَّلاَمِ**

١٤٣٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لاَ تَبْدَءُوا الْيَهُودَ وَلاَ النَّصَارَى بِالسَّلاَمِ، وَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِى طَرِيقٍ فَاضْطَرُّوهُ إِلَى أَضْيَقِهِ». {الحديث: ٥٦٢٦ = ٥٦١٧ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئێوە لەپێشدا سڵاو لە جوولەکەو گاور مەکەن، ئەگەر لەڕێگەیش تووشی یەکێکیان بوون‌و ڕێگەکە تەنگەبەر بوو، ئەوا ناچاری بکەن کە ئەو بکەوێتە تەنگە بەرییەکەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٥٢٩٤ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە ڕوونکردنەوەیەکی باشی دەوێ، بەڵام من ئەم چەند خاڵە لەشەرحەکانەوە راگوێز دەکەم:

١- بەهیچ شێوەیێ مەبەست لەم فەرموودەیە ئازاردانی جەستەیی، یا دەروونی، یا سووکایەتی پێکردنی کۆمەڵایەتی نییە، چونکە شتی وا، وەك قازی عەیاض‌و

قورطوبی دەفەرموون: ئازاردانی بە بەلاشە، شتی وایش حەرامە لە ئایینی ئێمەدا.

٢- کورتو پوخت: (مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە: کە موسوڵمانان لە وڵاتی خۆیانا، خۆیان گەورەو سەروەربن‌و خلەو بلە نەبێ بە ئاغاو گەورەیان، دەنا بەهیچ شێوەیێ مەبەست ئەوە نییە کەتۆ لەهەموو ڕێگەو شەقامێکا کارێکی وا بکەی ئەوان ناچار بکەی لە تەنگەبەرو سەر شۆستەو قەراخ ڕێگەکانەوە بڕۆن!).

أ/ ئەوەتا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەفەرموێ: (بەلامەوە قەیدی نییە، ئەگەر لەپێشا سلاو لەخاوەن نامەکان بکرێ، چونکە خودای گەورە دەفەرموێ: {فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ}. {فەتحولباری ژمارە: ٦٢٥٤}.

ب/ لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: طەبەری لە تەریقی ئیبنو عویەینەوە فەرموودەیێ دەردەهێنێ، دەفەرموێ: يَجُوزُ إِبْتِدَاءُ الكَافِرِ بِالسَّلَامِ لِقَوْلِهِ تَعَالَى: {لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ}.

٣- چونکە لەشەرعی ئێمەی موسوڵماناندا، کۆمەڵێ بڕیارو ڕێنمایی هەیە، کە فەرمان دەکەن بە موسوڵمانان، کە بەشێوەی گشتی خێرخوابن‌و ڕەفتار بەرزبن‌و ڕێزی دروستکراوانی خودایان لەلابێ‌و هەموو خاوەن مافێ مافی خۆیی پێ بدەین، بەتایبەتی فەرمانکراوە بەچاکە کردن لەگەڵ ئەهلی ذیممەداو دروستە چاکوچۆنیان لێ بکرێ‌و هاموشۆیماڵیان بکرێ‌و لەخۆشی‌و ناخۆشیدا هاوبەشییان بکرێ‌و ڕێزی بیروباوەڕو جەژن‌و بۆنەو پەرستگاو نامەکانیان بگیرێ.

## ١١١٠) وەلامدانەوەی سلاوو ڕۆژ باشی خاوەن نامەکان. (٥٦١٧ - ٥٦٢٧)

## بَابٌ: الرَّدْ عَلَى أَهْلِ الكِتَابِ

١٤٣٣- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: سَلَّمَ نَاسٌ مِنْ يَهُودَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَقَالَ: «وَعَلَيْكُمْ»،

فَقَالَتْ عَائِشَةُ وَغَضِبَتْ: أَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: «بَلَى قَدْ سَمِعْتُ فَرَدَدْتُ عَلَيْهِمْ، وَإِنَّا نُجَابُ عَلَيْهِمْ، وَلاَ يُجَابُونَ عَلَيْنَا». {الحديث: ٥٦٢٥ = ٥٦١٦ فم. تجريد/٣/٣٢٨، رقم: ١٢٠٥ = ٦٠٢٤، ٦٠٣٠، ٦٢٥٦، ٦٣٩٥، ٦٤٠١، ٦٩٢٧}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ چەند کەسێکی جوولەکە سڵاویان لە پێغەمبەر کرد، گوتیان: (السَّامُ علیکم ئەی باوکی قاسم!) پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەسەر ئێوەیش)، عائیشەیش تووڕە بوو فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ وەڵامیان دەدەیتەوە، ئەی گوێت لێ نەبوو کە گوتیان چی؟ گوتیان: (السَّامُ عَلَيكُمْ: مردن بۆ ئێوە) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (با، باش ئاگام لێ بوو کەچییان گوت، منیش گوتم مردن بۆ ئێوەیش بێ، سەرەڕای ئەوەیش نزای ئێمە لەوان گیرا دەبێ، بەڵام نزای ئەوان لەئێمە گیرا نابێ، کەواتە: ئەوان زیانیان لەخۆیان داوە، نەوەك لەئێمە). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٥٢٩٧}.

## ١١١١) یاساخکردنی دەرچوونی ژنان لەپاش هاتنی باڵا پۆشی. (٥٦٣٣ – ٥٦٣٦)

## بَابٌ: مَنعَ النسَاء أَنْ يَخْرجن بَعْدَ نُزُول الحجَاب

١٤٣٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها): أَنَّ أَزْوَاجَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كُنَّ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ إِذَا تَبَرَّزْنَ إِلَى الْمَنَاصِعِ، وَهُوَ صَعِيدٌ أَفْيَحُ، وَكَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): احْجُبْ نِسَاءَكَ، فَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَفْعَلُ، فَخَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ زَوْجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي عِشَاءً، وَكَانَتِ امْرَأَةً طَوِيلَةً، فَنَادَاهَا عُمَرُ: أَلاَ قَدْ عَرَفْنَاكِ يَا سَوْدَةُ! حِرْصًا عَلَى أَنْ يُنْزَلَ الْحِجَابَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ {عَزَّ وَجَلَّ} الْحِجَابَ. {الحديث: ٥٦٣٥ = ٥٦٢٧ فم. تجريد/١/١٤٣، رقم: ١١٩ = ١٤٦، ١٤٧، ٤٧٩٥، ٥٢٣٧، ٦٢٤٠}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کەدەچوون بۆ سەراو بەشەو دەردەچوون، دەچوون بۆ سەراو خانەکانی مەدینە، کە چۆڵێکی پانو پۆڕ بوو لەلا ماڵان بوو، پێیان دەگوت:

مەناصیع. عومەریش هەمیشە پێشنیاری دەکردو عەرزی حەزرەتی دەکرد: قوربان! ژنەکانت قەدەغە بکەو مەیانهێڵە لەماڵ دەربچن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەگوێی نەدەکرد، تا شەوێ لەشەوان وارێ دەکەوێ، کە سەودەی کچی زەمعە، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، دەمی خەوتنان لەماڵ دەردەچێو دەچێ بۆ سەراو، لەبەرئەوەی کە سەودە ئافرەتێکی کەڵەگەت بوو، عومەر دەیناسێتەوەو بانگی دەکا: ئەی سەودە! بزانە دەتناسین!

عومەر لەپەرۆشی ئەوەی ئایەتی حیجابو خۆ پۆشینو باڵا پۆشی بێتە خوارەوە، بەهیوای ئەم مەبەستە بەرزە، ئەم قسەیەی کرد، جا خودای گەورەو سەروەر، ئایەتەکانی حیجابو باڵا پۆشی ناردە خوارەوە، کەباسی حوکمو بڕیاری خۆ داپۆشینی ژنانیان تیادا روون کراوەتەوە).

**روونکردنەوە:**

لە تەجریدی بوخاریدا، لە روونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا، لە کوردییەکەیدا دەفەرموێ: مەبەست لە حیجاب، لەشەرعدا ئەوەیە: پیاو تەماشای ناڕەوای لەشی ئافرەتی بێگانە نەکا، ئەویش بەم چەند شێوەیە جێبەجێ دەبێ: لەماڵەوە بەهۆی پەردەو هۆدەی تایبەتو جێگەی جیاوە. لەدەریشەوە بەهۆی عاباو سەرپۆشو باڵا پۆشو پەچەو بەرگی ئاودامانەوە. جلی کوردی ژنانەی خۆمان بەرگێکی شەرعی زۆر جوانە، لەڕاستیدا جوانترین نموونەیە بۆ حیجابی ئیسلامی، گرنگ ئەوەیە ژن شەرمگای شەرعی خۆی بەجلێکی ژنانە بپۆشێ، هەتا ئەگەر بلووزو پانتۆڵی ژنانەی ئاسایی بەحەیاو حورمەت لەبەربکا دەبێ، چونکە جلو بەرگ لەبەشی عاداتە، لەبەشی عیبادات نییە، لەبەرئەوە دروستە، کە بەپێی عورفو باوی جوانی سەردەم جلو بەرگ بگۆڕێ، بەڵام لەهێڵی سەرەکی مەبەستی رەوای شەرع دەرنەچێ.

لەڕاستیدا خۆ بەستنەوە بەهەموو نەریتو باوو عادەتێکی سەردەمی حەزرەتەوە، لەم سەردەمەی ئێمەدا کارێ زەحمەتە، شتی وا بۆ کەسی خۆی دەست

دەدا، وەشتی چاکیشە، بەلام بۆ ئەم خەلکەی ئێمەی ئەمڕۆ بەگشتی زەحمەتە، بناغەی ئایینیش لەسەر ئاسانکارییە. {بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢٢٥م چاپی چوارەم، لاپەڕە: ٣١٧ هەتا لاپەڕە: ٣٣١}.

## ١١١٢) ڕێگە دەدرێ بەژن کە لەماڵ دەربچێ بۆ کاری ئاسایی خۆی. (٥٦٣٣ - ٥٦٣٦)

## بَابٌ: الإِذْنُ لِلنِّسَاءِ فِي الخُرُوجِ لِحَاجَتِهِنَّ

١٤٣٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: خَرَجَتْ سَوْدَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) بَعْدَ مَا ضُرِبَ عَلَيْهَا الْحِجَابُ لِتَقْضِيَ حَاجَتَهَا، وَكَانَتِ امْرَأَةً جَسِيمَةً، تَفْرَعُ النِّسَاءَ جِسْمًا لاَ تَخْفَى عَلَى مَنْ يَعْرِفُهَا، فَرَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَقَالَ: يَا سَوْدَةُ! وَاللَّهِ مَا تَخْفَيْنَ عَلَيْنَا فَانْظُرِي كَيْفَ تَخْرُجِينَ، قَالَتْ: فَانْكَفَأَتْ رَاجِعَةً، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِي، وَإِنَّهُ لَيَتَعَشَّى وَفِي يَدِهِ عَرْقٌ، فَدَخَلَتْ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي خَرَجْتُ، فَقَالَ لِي عُمَرُ: كَذَا وَكَذَا، قَالَتْ: فَأُوحِيَ إِلَيْهِ، ثُمَّ رُفِعَ عَنْهُ وَإِنَّ الْعَرْقَ فِي يَدِهِ مَا وَضَعَهُ، فَقَالَ: «إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُنَّ أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَاجَتِكُنَّ». {الحديث: ٥٦٣٣ = ٥٦٢٤ فم = فتح الملهم. تجريد/١، رقم: ١١٩ = ١٤٦}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودای گەورە لەهەموو هاوەڵو هاوسەرە بەڕێزەکانی بێت) فەرمووی: پاش ئەوەی کە حیجاب لەسەر ئێمەی هاوسەرانی پێغەمبەر فەرزکرا، سەودەی کچی زەمعە کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، شەوێ لەماڵ دەردەچێ بۆ کارێکی خۆی، دەچێ بۆ سەراوکردن، سەودە ژنێکی قەبەی قووچ بوو، بە بالا لەهەموو ژنێ کەڵەگەتتر بوو، ئەوانەی کە لەووپێش دەیانناسی، بەشەو بەبالا دەیانناسییەوە. عومەر دەیبینێو دەیناسێو دەڵێ: ئەی سەودە! بەخودا دەتناسمەوە! ببینە چۆن بەم شەوە لەماڵ دەردەچیت!

عائیشە فەرمووی: سەودە بەرەودوا دەگەڕێتەوە، یەکسەر هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەو دەمەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهۆدەکەی من بوو،

شێوی ئێوارەی نۆش دەکرد، لەوکاتەدا گرتکێ گۆشتی بەدەستەوە بوو، خەریك بوو دەیخوارد، سەودە کەهاتە ژوورەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من بۆ ئیشی خۆم لەماڵ دەرچووم، کەچی عومەر واوای پێم گوت، قسەکەی عومەری بۆیگێڕایەوە، عائیشە فەرمووی: گرتکەکەی دانەنا کە سرووشی بۆهات، کە دۆخو باری هاتنی سرووشەکە بەریدا، کوتە گۆشتەکە هەر بەدەستیەوە بوو، کە فەرمووی: (ئەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر! وە هەروەها ئەی ژنانی موسوڵمانان! مۆڵەتتان پێ دراوە، کەبۆ کارو فەرمانی رەوای خۆتان لەماڵ دەرچن). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ٢١٦٦ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١١١٣) ژنی خۆیی (مەحرەم) لە پاشکۆی پیاوەوە سواردەکرێ. (٥٦٥٦ - ٥٦٥٧)
## بَابٌ: جَعْلَ الْمَرْأَة ذَاتَ الْمُحَرم مِنْ خَلْفِه

١٤٣٦- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ، وَمَا لَهُ فِي الأَرْضِ مِنْ مَالٍ وَلاَ مَمْلُوكٍ وَلاَ شَيْءٍ غَيْرَ فَرَسِهِ، قَالَتْ: فَكُنْتُ أَعْلِفُ فَرَسَهُ، وَأَكْفِيهِ مَئُونَتَهُ، وَأَسُوسُهُ، وَأَدُقُّ النَّوَى لِنَاضِحِهِ، وَأَعْلِفُهُ، وَأَسْتَقِي الْمَاءَ وَأَخْرِزُ غَرْبَهُ، وَأَعْجِنُ، وَلَمْ أَكُنْ أُحْسِنُ أَخْبِزُ، فَكَانَ يَخْبِزُ لِي جَارَاتٌ مِنَ الأَنْصَارِ، وَكُنَّ نِسْوَةَ صِدْقٍ، قَالَتْ: وَكُنْتُ أَنْقُلُ النَّوَى مِنْ أَرْضِ الزُّبَيْرِ الَّتِي أَقْطَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رَأْسِي، وَهِيَ عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ، قَالَتْ: فَجِئْتُ يَوْمًا وَالنَّوَى عَلَى رَأْسِي فَلَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَدَعَانِي ثُمَّ قَالَ: «إِخْ إِخْ». لِيَحْمِلَنِي خَلْفَهُ، قَالَتْ: فَاسْتَحْيَيْتُ وَعَرَفْتُ غَيْرَتَكَ، فَقَالَ: «وَاللَّهِ لَحَمْلُكِ النَّوَى عَلَى رَأْسِكِ أَشَدُّ مِنْ رُكُوبِكِ مَعَهُ»، قَالَتْ: حَتَّى أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ ذَلِكَ بِخَادِمٍ، فَكَفَتْنِي سِيَاسَةَ الْفَرَسِ، فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَتْنِي. {الحديث: ٥٦٥٦ = ٥٦٤٨ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٨٠ = ٥٢٢٤، ٣١٥١}:

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق، کە خوشکی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر بوو، فەرمووی: کاتێ زوبەیری کوڕی عەوام منی هێناو شووم پێی کرد، ئەوەی پێی بڵێی ماڵو بەندەو شتی تری وا نەیبوو لەسەر رووی زەوی، تەنیا ئەسپەکەی نەبێ، لەگەڵ وشترێکی ئاوکێش، وەمن خۆم ئالیکم دەدا بە ئەسپەکەیو خزمەتیم دەکردو

دام دەکرد، وە ناوکی خورمام دەکوتیو وردم دەکرد بۆ ئالیکی وشترە ئاوکێشەکەی، وە ئـاوم دەکێشا بـۆ خۆمـانو سـەتڵو دۆڵچەکەیم دەدوورییـەوەو پینـەو پـەڕۆیم دەکرد، وە هەرخۆم هەویرو نانم دەکرد، بەڵام نەمدەزانی کە بـەجوانی نـان بکـەم، چەند ژنێکی دراوسێمان هەبوو، ئەنصاری بوون، ئەوان نانیان بۆ دەکردم، بەڕاستی ژنی راستو دروست خۆیان بوون.

لەوپارچـە زەویـەوە، کـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) بەخـەڵاتی دابـووی بەزوبەیری مێردم، لەوێوە بەسەر سەر ناوکی خورمام دەگواستەوە بۆ ماڵەوە، بۆ ئالیکی وشترەکە، زەویەکە نزیکەی دوو میل لەماڵەوە دوور بوو (میلێ چوار هەزار هەنگاوە).

ئەسماء فەرمووی: جا رۆژێ لەسەر ئەم بارودۆخە کۆڵێ ناوکە خورما بەسەر سەرمەوە بوو، لەڕێ گەیشتم بە پێغەمبەرو بە کۆمەڵێ لەیارانی، کە لەکۆمەڵەی یاریدەدەران بوون، بانگی کردم بۆلای خۆی، ئەوجا خوڕی لە وشترەکەی ژێری کەییخی بدا، فەرمووی: (ییخ .. ییخ) هەتا من لە پاشکۆی خۆیەوە سواربکا، چونکە من بیانی نەبووم خوشکی عائیشەی ژنی بوومو ژنی زوبەیری کوڕی عەوام بووم، کە پورزای پێغەمبەرە، چونکە دایکی زوبەیر صەفییەی کچی عەبدولموطەلیبە، کـە خوشـکی عەبـدوڵڵای بـاوکی پێغەمبـەرە، صـەفییە موسـوڵمان بـوو، ئـەسماء فـەرمووی: بـەڵام مـن سـوار نـەبووم، چونکە شـەرمم دەکـرد، لەگـەڵ پیاوانا بـڕۆم بەڕێگەدا، لەهەمان کاتیشا بیری ئەوەشم کردەوە کە زوبەیری مێـردم، بـۆ شـتی واو لەکاتی وادا تەنگە دەیگرێو پێی ناخۆشە.

جا کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەمەی زانی، کەوا من شەرم دەکەمو شـەرم دەمگرێ، تەشریفی رۆیشتو منیان بـەجێ هـێڵا، جا کاتـێ زوبـەیرم دی، حاڵەکـەم لەنووکەوە بۆیگێڕایەوە، کە لەسـەر حـاڵێکی وا بەخزمـەت پێغەمبـەرو کۆمـەڵێ لـە یاریدەدەران گەیشتم، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وشترەکەی ییخ دا، کـەمن لەپشتی

خۆیەوە سواربکا، بەڵام من شەرمم کردو بیری غیرەکردنی تۆم کەوتەوە، ئیتر سوار نەبوومو ئەوان رۆیشتنو من مامەوە!

زوبەیر فەرمووی: (سوێندم بەخودا ئەوەم بەلاوە گرانتر بوو، کە لەسەر ئەو حاڵە کۆڵە ناوکە خورما هەڵبگری، هەتا ئەوەی کە لەپاشکۆی پێغەمبەرەوە سواربیویتایە!).

ئەسماء فەرمووی: ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە مامەوە خۆم خزمەتی زوبەیرو وڵاخەکانیم دەکرد، هەتا ماوەیێ لەوەدوا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهۆی ئەبوبەکری باوکمەوە کارەکەرێکی بۆم نارد، خزمەتی ئەسپەکەی لەکۆڵ خستم، ئەو خزمەتی ئەسپەکەی دەکرد، ئەم کارە ئەوەندە گرنگ بوو بەلامەوە، وەك لەبەندەیی‌و کۆیلەیی ئازادم بکات وابوو ئەوەندەم پێ خۆش بوو).

**روونکردنەوە:**

راقە نووسەکانی ئەم فەرموودەیە، ئەسماء بەبیانی دادەنێن بۆ پێغەمبەر چونکە ژنخوشك لەپیاو حەرام نابێ، بەتەواوی، هەروا ژنی پورزایش لەپیاو حەرام نابێ، بەتەواوی. رەنگبێ مەبەستی مامۆستای دانەری ئەم موختەصەری صەحیحی موسلیمە، ئەوەبێ: کە مەحرەمییەتی کاتی بێ، بەتایبەتی بۆ پێغەمبەری خودا، لەناو کۆمەڵێ پیاو باشدا، لەگەڵ ژنێکی تەواو خزمی خۆیدا، شتی وا لەبڕیاری ئافرەتی خۆیی دابێ).

**١١١٤) لەکاتی گومان پێ بردندا، واباشە مرۆڤ بڵێ: کە ئەمە فیسارە ژنە، جێگەی گومانی خراپ نییە.** (٥٦٤٢ - ٥٦٤٤)

**بَابٌ: إِذَا مَرَّ بِرَجُلٍ وَمَعَهُ امرأةٌ فَلْيَقُلْ: إنَّهَا فُلاَنَةُ**

١٤٣٧- عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مُعْتَكِفًا، فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلاً، فَحَدَّثْتُهُ، ثُمَّ قُمْتُ لأَنْقَلِبَ فَقَامَ مَعِي لِيَقْلِبَنِي، وَكَانَ مَسْكَنُهَا فِي دَارِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، فَمَرَّ رَجُلاَنِ مِنَ الأَنْصَارِ: فَلَمَّا رَأَيَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَسْرَعَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «عَلَى

رِسْلِكُمَا إِنَّهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيّ»، فَقَالَا: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَرًّا»، أَوْ قَالَ: «شَيْئًا». {الحديث: ٥٦٤٣ = ٥٦٣٥ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ٣٠٨، رقم: ٩٣١ = ٢٠٣٥، ٢٠٣٨، ٢٠٣٩، ٣١٠١، ٣٢٨١، ٦٢١٩، ٧١٧١. أبو داود. صوم: ٢٤٧٠. ابن ماجة. صوم: ١٧٧٩. تحفة الأشراف: ١٥٩٠١}:

صەفییەی کچی حویەی، کە هاوسەری پێغەمبەرە (دروودی خودا لە پێغەمبەرو هەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێت) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەی دوایی رەمەزاندا، لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، واتە: ئیعتیکافی دەکرد، شەوێ چووم بۆلای بۆ مزگەوت بۆ سەردانی، تاوێ لەخزمەتیدا مامەوەو قسەو گوفتوگۆم لەگەڵیدا کردو، هەڵسام کە بچمەوە بۆ ماڵەوەم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا لەگەڵماو هات تا رەوانەم بکات، وەماڵی صەفییە لەو خانووەدا بوو، کە لەوەدوا بوو بەهی ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خودایان لێ بێ)، صەفییە فەرمووی: منو حەزرەت رۆیشتین هەتا گەیشتینە ئەو دەرگایەی مزگەوت کەوا لەلای دەرگای ماڵی ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەردا، جا لەوکاتەدا، دوو پیاو، لە یاریدەدەران (ئەنصار) لەوێوە رەت بوون، کاتێ کە پێغەمبەریان دی لەگەڵ مندا بوو، سلاویان لێ کردو، پێیان هەلگرتو ویستیان بە پەلە برۆنو تێ پەڕن، پێغەمبەریش هەستی بەوەیان کردو پێی فەرموون: (هێواش بن، پەلەمەکەنو مەپەشۆکێن، ئەمە صەفییەی کچی حویەییە کەژنی خۆمە). ئەوانیش لە ئاماژەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تێ گەیشتنو گوتیان: سوبحانەڵلا! ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە چۆن دڵ لەتۆ پیس دەکەین! وە قسەکەی پێغەمبەریان بەلاوە گران بوو، کەبۆنی ئەوەی لێ دەهات، خوانەخواستە ئەوان گومانی خراپ بە پێغەمبەر بەرن.

فەرمووی: (ئاخر شەیتان لەناو جەستەی مرۆڤدا وەك خوێن هاتوچۆ دەکا، لەبەرئەوە ترسام کە شەیتان شتێ، یا گومانێکی بەد بخاتە ناو دڵتانەوە، دڵتان لەمن

کرمێ ببێو، ئەوە ببێ بەهۆی سەرتیاچوونتانو، خودا بەهۆی ئەو گومانە بەدەوە بە پێغەمبەرەکەی رقتان لێ بگرێو بە فەتارەت بچن!!). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٥، لاپەڕە: ١٥٦، ژمارە: ١٤٦٤ چاپی چوارەم} + {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٤٩ ج/٢}.

**١١١٥) شەو مانەوە بەتەنیا لەلای ژنی بیانی ناخۆیی.** (٥٦٣٧ - ٥٦٤١)

**بَابٌ: نَهْيُ الرَّجُلِ عَنِ المَبِيتِ عِنْدَ امْرَأَةٍ غَيْرِ ذَاتِ مَحْرَمٍ**

**١٤٣٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَلاَ لاَ يَبِيتَنَّ رَجُلٌ عِنْدَ امْرَأَةٍ ثَيِّبٍ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ نَاكِحًا أَوْ ذَا مَحْرَمٍ». {الحديث: ٥٦٣٧ = ٥٦٢٩ فم}:**

**جابیر** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (بێداربن! هیچ پیاوێ بەشەو بەتەنیا لەلای ژنێ کە بێوەژن بێ، شەو نەکاتەوەو دوو بەدوو بەیەکەوە نەمێننەوە، مەگەر مێردی بێ، یا خۆیی بێ، وەك باوكو كوڕو براو مامو خاڵ، ئەوە دروستەو قەیدی نییە).**

**١٤٣٩- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ؟ قَالَ: «الْحَمْوُ الْمَوْتُ»، قَالَ اللَّيْثُ بْنَ سَعْدٍ: الْحَمْوُ أَخُ الزَّوْجِ وَمَا أَشْبَهَهُ مِنْ أَقَارِبِ الزَّوْجِ: ابْنُ الْعَمِّ وَنَحْوُهُ. {الحديث: ٥٦٣٨ = ٥٦٣٠ فم. تجريد/٥/٥١، رقم: ١٧٨٢ = ٥٢٣٢. ترمذي. رِضاع: ١١٧١، تحفة الأشراف: ٩٩٥٨}:**

**عوقبەی کوڕی عامیر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (بەتەنیا مەچن بۆلای ژنانی ناخۆیی (واتە: نامەحرەم) پیاوێکی ئەنصاری عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئەگەر خزمی مێردەکەی بێ، وەك شووبراو مامی مێرد؟ فەرمووی: (خزمی مێرد مردنە: ئەو لەهەمووی خراپترە، چونکە بەناوی خزمایەتییەوە، ئەگەر ناخۆیی بێ، دوور نییە کاری دوژمنێ بکا). {تاج/٢/٥٤٥، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٢١٩١}.**

**ڕوونکردنەوە:**

١- لە فەرموودەی یەکەما، ئەوەی کە دەفەرموێ: (... لەلای ژنێ کە بێوە ژن بێ... تاد) بێوە ژنی قەیدنییە، کچیش هەروایە، بەڵام بۆیە دەق لەسەر بێوەژن کراوە، چونکە ئەو شەرمی لەپیاو شکاوەو نزیکترە لە گومان، بەڵام کچ بەهۆی کچێنییەوە جۆرە لەمپەرێ لەنێواندا هەیەو نزیکبوونەوە لێی ستەمترە.

٢- لەم شوێنەدا لە تەجریددا دەفەرموێ: مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە: کردنی احتیاطو دووربینیو وەرعو پارێزە، دەنا مەبەست چاندنی تۆوی دوو دڵیو خانە گومانیو بەد گومانی نییە، لەناو کەسەوکاردا، جا هەرکاتێ لەناو خێزانا، هەست بەم جۆرە پەیوەندییە گوماناوییە کرا، پێویستە پێشگیریی لێ بکرێ، دەنا ئەگەر هیچ هۆیەکی ڕەوا نەبوو، بۆ پێکەوە ژیانی خێزانیی ناو کەسوکار، ئەوە پێویست بە وروژانی وا ناکات، کەببێ بەهۆی دڵپیسیو پچڕاندنی شیرازەی ناو خێزانو کەسوکار، وەك بازێ ناحاڵی وا حاڵی دەبن.

لەڕاستیدا لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیەوە، هەتا ئێستا خوشكو براو مامو خاڵو برازاو خوشکەزا، چی هی مێردبن، چی هی ژن بن، بەکەسێکی ئەمیندار ناسراونو ڕێگەی هاموشۆی ئاساییان لێ نەگیراوە، مەگەر بەهۆی ئەو هاموشۆیەوە گومان، یا کێشەیێ دروست بووبێ، ئەویش زۆر بەکەمیو بەدەگمەن، دیارە بڕیاریش بەپێی زۆرینەیەو کەمینە ناکرێ بە پێوەر!).

٣- لەکۆتایی فەرموودەکەوە لەیثی کوڕی سەعد دەفەرموێ: حەمو، واتە: خزمی مێرد، وەك شووبراو وێنەی شووبرا لەخزمانی مێرد، وەك ئامۆزاو ئەمانە.

٤- خزمو کەسوکاری ژنو مێرد، ئەوەی خۆیی بێو دەستنوێژی لە ژنەکە نەشکێ، دروستە دوو بەدوو لەشوێنێکا پێکەوە بژینو بەبێ نەهێڵ هاموشۆیان دروستە، ئەمانەیش وەك باوكو باپیرو کوڕو کوڕەزاو کچەزای مێرد، یا وەك: باوكو باپیرو کوڕو براو مامو خاڵو برازاو خوشکەزای ژن، ئەمانە هی شیریش بن هەمان شتە، خزمی پیاوو ژن ئەمانەی لێ دەرچێ، بە ناخۆیی دەژمێرێنو

دەستنوێژیان لە ژنەکە دەشکێ. ئەوەندە هەیە کەسوکاری مێرد، چی هی مێردی حازری بێ، چی هی مێردی کۆنی مردوو، یا تەڵاقدەر بێ جیاوازی نییەو هەردووڵا بەخۆیی دادەنرێن!!

هەروا کوڕەزای مێردو کچەزای مێردیش، با بەرەو خواریش بڕۆن خۆیین بۆ ژنی باپیرەیان‌و دەستنوێژیان لێی ناشکێ!

## ١١١٦) جلەوگیریی لەهاموشۆی ژنێ کە مێردی لەماڵ نەبێ. (٥٦٣٧ - ٥٦٤١)

## بَابٌ: النهي عَنْ الدُّخُولِ عَلَى الْمُغِيبَاتِ

١٤٤٠- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): أَنَّ نَفَرًا مِنْ بَنِي هَاشِمٍ دَخَلُوا عَلَى أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَهِيَ تَحْتَهُ يَوْمَئِذٍ، فَرَآهُمْ فَكَرِهَ ذَلِكَ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالَ: لَمْ أَرَ إِلاَّ خَيْرًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَرَّأَهَا مِنْ ذَلِكَ»، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: «لاَ يَدْخُلَنَّ رَجُلٌ بَعْدَ يَوْمِي هَذَا عَلَى مُغِيبَةٍ، إِلاَّ وَمَعَهُ رَجُلٌ أَوِ اثْنَانِ». {الحديث: ٥٦٤١ = ٥٦٣٣ فم = فتح الملهم}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: چەند کەسێ لەبەنی هاشم، بەسەردان دەچن بۆ خزمەتی ئەسمائی کچی عومەیس، کە هاوسەری ئەبوبەکری صەدیق بوو لەوکاتەدا، کاتێ ئەبوبەکر دەچێتەوە بۆ ماڵەوە، دەبینێ ئەو پیاوانە لەوێن، لەماڵی ئەون لەلای ئەسمائی هاوسەری، وەزعەکەی پێ ناخۆش دەبێ، جا ئەمە باس دەکا بۆ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وە عەرزی دەکا: ئەی پێغەمبەری خودا! لەم لایەنەوە ئەوەی چاکە نەبێ، هیچی ترم نەدیوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە خۆی ئەو ئافرەتە فرە باشەی بەدوور گرتووە لەشتی واو خۆی پاکانەی بۆیکردووە!).

پاشان پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆیشتە سەر دوانگەکەو راوەستاو فەرمووی: (لەمڕۆ بەدواوە، با هیچ پیاوێکی بیانی، نەچێ بۆلای ژنێ لە ماڵەوەی، کەمێردەکەی لەماڵ نەبێ، مەگەر پیاوێ، یا دوو پیاوی تری باشی لەگەڵدا بێ).

**روونكردنەوە:**

ئـەسمائی کچـی عومـەیس (رەزای خودای لێ بێ) هـاوەڵێکی مـەزنی پێغەمبـەرە، بـەر لەکۆبوونەوەکانی داری ئەرقـەم ئیسلام بـووە، لەگـەڵ مێردەکەیـدا، کـە جەعفـەری کوڕی ئەبو طالیب بوو، کۆچی کرد بۆ حەبەشـە، لـەپاش شـەهیدبوونی جەعفـەری مێـردی لەغـەزای مۆتـەدا، شـوویکرد بـە ئەبوبـەکری صـەدیق، لـەپاش مـەرگی ئەبوبەکری صەدیقیش عەلی کوڕی ئەبو طالیب مارەیکرد، ئیمامی عومـەر لـەبارەی خەو پەرژێنی خەوەوە پرسیاری لێ دەکرد.

ئـەسماء لـەمێردی یەکـەمی، لـە جەعفـەری کـوڕی ئـەبو طالیـب، لـە خـاکی حەبەشە، موحەممەدو عەبدوڵڵاو عەونی لێی بوو، لەمێردی دووەمی لە ئەبوبـەکر موحەممەدی بوو، لـەمێردی سێیەمی، لـە عـەلی کوڕی ئـەبو طالیـب یـەحیای بـوو. ئەسماء لەدایکەوە خوشکی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەرە. {بڕوانـە: تەجریـد/٤، لاپەڕە: ٣١٧، ژمارە: ١٥٧٦ = ٤٢٣٠ فتح}.

### ١١١٧) هەڕەشەکردن لە هاموشۆکردنی پیاوی سەرژنانی بۆلای ژنان. (٥٦٥٤ - ٥٦٥٥)

### بَابٌ: الزَّجْرُ عَنْ دُخُولِ الْمُخَنَّثِينَ عَلَى النِّسَاءِ

١٤٤١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ يَـدْخُلُ عَلَـى أَزْوَاجِ النَّبِـيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مُخَنَّثٌ فَكَانُوا يَعُدُّونَهُ مِنْ غَيْرِ أُولِي الإِرْبَـةِ، قَـالَ: فَـدَخَلَ النَّبِـيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمًا وَهُوَ عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ وَهُـوَ يَنْعَـتُ امْـرَأَةً، قَـالَ: إِذَا أَقْبَلَـتْ أَقْبَلَـتْ بِأَرْبَعٍ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ أَدْبَرَتْ بِثَمَـانٍ، فَقَـالَ النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ): «أَلاَ، أَرَى هَـذَا يَعْرِفُ مَا هَا هُنَا، لاَ يَدْخُلَنَّ عَلَيْكُنَّ»، قَالَتْ: فَحَجَبُوهُ.

بَابٌ: إِطْفَاء النَّارَ عِنْدَ النَوْم {الحديث: ٥٦٥٥ = ٥٦٤٧ فم. تجريـد/٤، رقـم: ١٥٩١ = ٤٣٢٤، ٥٢٣٥، ٥٨٨٧}:

عائیشـه (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پیـاوێکی سـەرژنانی هـەبوو، هاتوچـۆی هاوسەرەکانی پێغەمبەری دەکرد، خەڵکی وایان دانابوو، کە لـەوجۆرە پیاوانەیـە کـە

کاری جووتبوونیان بەژنان نییەو هاموشۆیان بۆلای ژنان دروستە، چونکە بەر ئەم ئایەتە دەکەون، کەوا لەسوورەتی نووردا و دەفەرموێ: {أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ - النــور/ ٣١}.

راوی فەرمووی: جا رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆیشت بۆلای ئوم سەلەمەی هاوسەری، ئەم پیاوە سەر ژنانییەیش لەوێ بوو، بە عەبدوڵلای کوڕی ئومەییەی برای ئوم سەلەمەی گوت: ئەگەر سبەینێ بەپشتی خودا تا ئیفتان رزگار کرد، خۆم کچەکەی غەیلانت نیشان دەدەم، لەدەستی نەدەی، نێچیرێکی قەڵەوە، چۆن شۆخو شەنگو گەرمو نەرمێکە!! لەپێشەوە نەرمو نۆڵەو چوار لۆیە، لەپاشەوە خڕو پڕەو خەپانەو هەشت لۆیە!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئەم قسانەی بیست لەم کابرایە، فەرمووی: (ئەدیی من نەمدەزانی کە ئەمە ئەم قسانە دەزانێ کە پەیوەندی بەم جێگە هەستیارانەی ژنانەوە هەیە؟ مەهێڵن کە ئەمە هاموشۆتان بکا). لە تەجریددا دەفەرموێ: لەگێڕانەوەیەکی تاجدا دەفەرموێ: (کە دادەنیشێ خڕو خەپانەو هەر لۆیەو دەنیشێتە سەرلۆ، کە قسە دەکا، دەڵێی شەکر دەشکێنێ، یا بولبولەو دەخوێنێ، بەینی هەردوو رانەکانی وەك خەپلەی هەڵاتە وایە! جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لەم قسانەی بوو، فەرمووی: (مەهێڵن ئەمە بێ بۆلاتان!). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٢١٩٦، چ/٤ = چاپی چوارەم}. هەروا لەتەجریددا دەفەرموێ: ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- ئەم پیاوە سەرژنانییە ناوی هیت بوو، وە دادەنرێ بەصەحابی!

٢- ئەم عەبدوڵلایە کە باوك برای خاتوو ئوم سەلەمە بوو، لە ئازادکردنی مەککەدا، لەگەڵ ئەبو سوفیانا ئیسلام بوون، لەرزگارکردنی مەککەدا، لەغەزای تائیفدا بەتیرێ شەهید بوو.

٣- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەم جۆرە قسانە هیتی لەمەدینە وەدەرنا، ناردی بۆ (الحِمی). نەفیکردنو رەهەنە کردن جۆرێکە لەسزادان.

٤- عەرزی پێغەمبەریان کرد: با فیسارە پیاوی سەرژنانی بکوژین؟ فەرمووی: (خودا ڕێگەی ئەوەی پێم نەداوە کە نوێژکاران بکوژم!).

لەڕاستیدا ئەم فەرموودەیە، چارەسەری کێشەیەکی گەورەی ئەم سەردەمەمان بۆدەکـا، زۆرینـەی لاوان و هونەرمەنـدان و گۆرانیبێـژان و موسـیقا ژنـەکان و چەنەبازەکان لەم بابەتەن، جا کورت و پوخت: (هاوڕێتی و دۆستایەتی ئەم جۆرە مرۆڤە سەر ژنانییانە کارێکی ناباشە، بەڵام جنێو پێدان و غەیبەت و ئازاردانیان بە بەلاش و بەخۆڕایی کارێ ناباش و نادروستە و ئەمانیش هەر بە موسوڵمان دادەنرێن، ئەوەی کە لەسەر ئێمەیە هەوڵی چاکبوونیان بدەین، بەڵام تۆڵە و هەڕەشە و گوڕەشە و ئازاردانیان ئەوە لە ئەستۆی دەوڵەتە، بۆ ئێمە نەهاتووە لەوەدا خۆتێ هەڵقورتێنین، بەڵام ئەوەندە هەیە لەکاتی پێویستدا، وەبۆ ڕوونکردنەوەی ڕووی ڕاستی، وەبۆ بەرژەوەندی خاوەن پەیوەندی، وە لەکاتی پرسیارو هەواڵپرسی لە ڕەفتاری کەسێ، بۆ ئەم مەبەستانە و لەم کاتانەدا، بەڵام شتی وا دروستە، بەمەرجێ، باسی فیسق و خراپی و نەنگەکانی، بۆ مەبەستێ ڕەوابێ، وەك خوازبێنی و دراوسێتی و هاوڕێتی و هاوبەشێتی لەشتێکا، شتی وا بەر ئەم گوتەیە دەکەوێ: {لاَغَيْبَةَ فِي فَاسِقٍ: غەیبەتی فاسق بەغەیبەت دانانرێ!!}.

٥- لەسەردەمی پێغەمبەردا، سێ مرۆی سەرژنانی (مُخَنَّث) لە مەدینە هەبوون، هیت و ماتیع و هەدم، ئەم سێ زەلامە هاموشۆی ژنانیان دەکرد، پێغەمبەر هیتی ڕەهەنە کرد بۆ کێوی عەیر، کە کێوێ بوو لەنزیك ذولحولەیفەوە، ئیتر لەوێ مایەوە، هەتا سەردەمی عومەر، زۆر نەداراو بێ دەرەتان بوو، ڕێگەیان پێ دەدا کە ڕۆژی هەینی بێ بۆ مەدینە بۆ سواڵ و دوایی دەگەڕایەوە بۆ جێگەی خۆی، لەوێ ما هەتا مرد. ئەم سێ کەسە دادەنرێن بە صەحابی، دروست نییە، بەچاوی بێ ڕێز تەماشا بکرێن.

## ١١١٨) كوژاندنەوەی ئاگر لەکاتی خەوتندا. (٥٢١٤ - ٥٢٢٦)

## بابٌ: إطفاءُ النَّارِ عِنْدَ النَّوْمِ

**١٤٤٢- عَنْ أَبِى مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: احْتَرَقَ بَيْتٌ عَلَى أَهْلِهِ بِالْمَدِينَةِ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا حُدِّثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِشَأْنِهِمْ، قَالَ: «إِنَّ هَذِهِ النَّارَ إِنَّمَا هِيَ عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ». {الحديث: ٥٢٢٦ = ٥٢١٧ فم. تجريد/٥، رقم: ١٩٧٣ = ٦٢٩٤ فتح الباري. تحفة الأشراف: ٩٠٤٨} :**

**ئەبو مووسای ئەشعەری** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەمەدینە شەوێ، ماڵێ سووتا بەسەر خاوەنەکەیدا، کە ئەم رووداوەیان عەرزی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کرد، فەرمووی: (ئاگر دوژمنی ئێوەیە، کە دەخەون لەخۆتانی بکوژێننەوە!). {ریاض/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١٦١/٦، لاپەڕە: ١٥٠ - ش} + {ژمارە: ١٣٢٤ تجرید = ٣٢٨٠ فتح الباری = بەرگی/٣، لاپەڕە: ٤٥٢ چاپی یەکەم} .**

### (پوختەی فەموودەکانی ئەم نامەیە)

**١- ئێستا وەك سەردەمی پێغەمبەر نییە، دروستە بە موسوڵمان بگوترێ: (ئەبولقاسم: باوکی قاسم).**

**٢- سوننەتە ناوی پێغەمبەر بکرێ بەناوی تازە لەدایکبوو بە ئومێدی ئەوە، کە رەفتاری رەفتاری موسوڵمانانە بێ.**

**٣- ناوی عەبدوڵلاو عەبدوڕەحمان خۆشەویستترین ناون لەلای خوا.**

**٤- سوننەتە لەکاتی ناوناندا، دەست بهێنرێ بەساوەکەداو نزای خێری دین‌و دنیای بۆ بکرێ‌و دەمی بەخورما، یا بەشیرینی شیرین بکرێ‌و بانگ بدرێ بەگوێی راستیداو قامەت بکرێ بەگوێی چەپیدا.**

**٥- سوننەتە ناوی پێغەمبەران‌و پیاو چاکان بکرێن بەناوی کوڕی ساوا، وە هەروەها سوننەتە ناوی ئافرەتە باشەکان بکرێ بەناوی کچی ساوا، وەك: مەریەم‌و فاطیمەو عائیشەو ساراو خەدیجە.**

**٦- سوننەتە ناو بگۆڕدرێ بەناوی خۆشترو باشترو لەبارترو بێ کێشە تر.**

٧- سـونـنـه‌تـه لـه‌كاتی گوفتوگـۆدا، مـرۆڤ ڕێـزی به‌رامبـه‌ر بگـرێ‌و به‌خۆشه‌ویسترین ناوو نازناو ناوببرێ، وه‌ك كوڕه‌كه‌م، مامه.

٨- هه‌ندێ ناو ناباش‌و ناپه‌سه‌ندن، له فه‌رمووده‌كانا دیاری كراون، سوننه‌ته مرۆڤ خۆی لێیان بپارێزێ.

٩- مافه‌كانی موسوڵمان له‌سه‌ر موسوڵمان زۆرن.

١٠- دانیشتن له‌سه‌ر ڕێ مافی خۆی هه‌یه، ده‌بێ ڕه‌چاو بكرێن.

١١- ده‌ستووری سڵاوكردن‌و مۆڵه‌تخواستن، له‌كاتی سه‌ردانا.

١٢- هه‌ندێ بڕیاری تری تایبه‌ت، كه له‌خودی فه‌رمووده‌كان وه‌رده‌گیرێن.

١٣- كوژاندنـه‌وه‌ی ئـاگر لـه‌كاتی خه‌وتنـدا سـوننه‌ته، مه‌گـه‌ر له‌بـه‌ر پێویستی‌و ناچاری، كاره‌بایش به‌شێكه له‌ئاگر.

١٤- پێشگیریی له هاوڕێتی‌و هاموشۆی پیاوی سه‌رژنانی.

١٥- ژنـێ مێـردی لـه‌ماڵ نـه‌بێ، یـا كه‌سـوكاری نزیكـی خـۆیی له‌گـه‌ڵ نـه‌بێ، هاموشۆیێ ببێ به‌هۆی دڵپیسی حه‌رامه.

١٦- لـه‌كاتی ئه‌گـه‌ری دروسـتبوونی گومانـێ، لـه‌نێوانی پیـاوو ژنێكـا، پێویسـته ڕونكردنه‌وه‌ی پێویست ئـه‌نجام بـدرێ هـه‌تا خـه‌ڵك توشـی بوختـانی‌و گومـانی بـه‌د نه‌بێ. {بڕوانه: ژماره: ١٤٣٧}.

١٧- ژن مافی هه‌یه بۆ كاروبارو پێویستی خۆی لـه‌ماڵ ده‌رچێ، به‌مـه‌رجێ سـه‌ر نه‌كێشێ بۆ به‌د ڕه‌وشتی.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤١- نامەی نووشتەو نزاو دووعا

## كتابُ الرُّقي

{بڕوانە: رياض الصالحين، بەرگی سێیەم، زنجیرە: ٢٥٠ لە ژمارە: ١٤٦٥٨وە هەتا ژمارە: ١٥٠٢ + تەجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاري، بەرگی پێنجەم، ژمارە: ١٩٧٥ هەتا ژمارە: ١٩٩٦ + التاج الجامعُ لِلْأُصُولِ فِي أحاديث الرسول (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، بەکوردی، بەرگی سێیەم لەزنجیرە: ٧٣وە هەتا زنجیرە: ٨٠ لەژمارە: ٣٠٢٠ وە هەتا ژمارە: ٣٠٦٦}.

### ١١١٩) نزاو نووشتەکەی جوبرائیل (سلاوی خودای لێ بێ) بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ)

### بَابٌ: فِي رَقْيَةِ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمْ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٤٤٣- عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ إِذَا اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَقَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمْ، قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ يُبْرِيكَ، وَمِنْ كُلِّ دَاءٍ يَشْفِيكَ، وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ، وَشَرِّ كُلِّ ذِي عَيْنٍ. {الحديث: ٥٦٦٣ = ٥٦٥٥ فم}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵانو هاوسەرانی بێ) فەرمووی: جاران ئەگەر پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئێشێ، ئازارێ، سکاڵایەکی لەدەست نەخۆشی ببوایە، جوبرائیل (درووودو سەلامی خودای مەزنی لەسەربێ) نزای دەکرد بۆیو دەیفەرموو: {بِاسْمِ اللَّهِ يُبْرِيكَ، وَمِنْ كُلِّ دَاءٍ يَشْفِيكَ، وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ، وَشَرِّ كُلِّ ذِيَ عَيْنٍ}:

واتە: بەناوی خودا، خۆی خۆشت دەکاتەوە، وە لەهەموو دەردێ شیفات دەداو، چارەی هەموو نەخۆشینێکت بۆدەکا، وە لەزیانی ئەو حەسوودانەی کە حەسوودی

بەخەڵك دەبەن، پەنات دەدا، وە لەزیانی هەموو چاوپیسانێ بەدوورت دەگرێ!).
{تاج/٣، زنجيره: ٧٤، ژماره: ٣٠٣٣ ج/٤}:

١٤٤٤- عَنْ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ عَنْ أَبِى نَضْرَةَ عَنْ أَبِى سَعِيدٍ: أَنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَلاَمْ أَتَى النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اشْتَكَيْتَ؟ فَقَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَىْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ، اللَّهُ يَشْفِيكَ، بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ. {الحديث: ٥٦٦٤ = ٥٦٥٦ فم}:

عەبدولعەزیزی کوڕی صوهەیب فەرمووی: ئەبو نەضرە فەرمووی: ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) فەرمووی: جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی موحەممەد! نەخۆشیت؟ فەرمووی: بەڵێ، نەخۆشم. جوبرائیل فەرمووی پێی: {بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَىْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ، اللَّهُ يَشْفِيكَ، بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ}:

واتە: بە پیرۆزیی ناوی خودا، نزات بۆدەکەم، کە پەنات بدات لەئێش‌و ئازاری هەموو شتێ کە ئازارت دەدا، وەبت پارێزێ لەزیانی هەموو کەسێ، وە بێچاوێنی بی لەچاوی پیسی حەسوود! خودا شیفات دەداو چارەسەری دەردت دەدا، بەپیرۆزیی ناوی خودا دیسان نووشتەو دووعات بۆ دەکەم!). {تاج/٣، زنجيره: ٧٤، ژماره: ٣٠٣١ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم نزایەی وا لەم دوو فەرموودەیەدا، باشترین وێنەو نموونەن بۆ نزاو نووشتەی یاسایی، واتە: شەرعی. وە بۆ هەموو جۆرە نەخۆشی‌و ئێش‌و ئازاری جەستەیی‌و دەروونی دەست دەدەن، باشتر وایە کە کەسێکی خواناس بیخوێنێ بەسەر خاوەن سکاڵاکەدا. نزاو نووشتەو دووعا لەم بابەتەدا سێ ناون بۆیەك ناوەڕۆك.

## ١١٢٠) باسی جادوو بازی، جوولەکە جادوو لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەکەن. (٥٦٦٧ - ٥٦٦٨)

## بَابٌ: فِي السِّحْرِ وَسحر اليَهُود لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٤٤٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَحَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَهُودِيٌّ مِنْ يَهُودِ بَنِى زُرَيْقٍ، يُقَالَ: لَهُ لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ قَالَتْ: حَتَّى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشَّىْءَ وَمَا يَفْعَلُهُ، حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ، دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ، أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِى فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟ جَاءَنِى رَجُلاَنِ فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِى وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَىَّ، فَقَالَ الَّذِى عِنْدَ رَأْسِى لِلَّذِى عِنْدَ رِجْلَىَّ، أَوِ الَّذِى عِنْدَ رِجْلَىَّ لِلَّذِى عِنْدَ رَأْسِى: مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ، قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ، قَالَ: فِى أَىِّ شَىْءٍ؟ قَالَ: فِى مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ وَجُبِّ طَلْعَةِ ذَكَرٍ، قَالَ: فَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِى بِئْرِ ذِى أَرْوَانَ»، قَالَتْ: فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، ثُمَّ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ وَاللَّهِ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ، وَلَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ»، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ أَحْرَقْتَهُ؟ قَالَ: « لاَ، أَمَّا أَنَا فَقَدْ عَافَانِى اللَّهُ، وَكَرِهْتُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى النَّاسِ شَرًّا، فَأَمَرْتُ بِهَا فَدُفِنَتْ». {الحديث: ٥٦٦٧ = ٥٦٥٩ فم. بخارى. طِبّ: ٥٧٦٦. تحفة الأَشْرَافِ: ١٦٩٨٥}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو یاران‌و هاوەڵان‌و هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: جوولەکەیەکی بەنی زورەیقی، کە ناوی لەبیدی کوڕی ئەعصەم بوو، جادووی لە پێغەمبەر کردبوو، هەتا هەندێ جار شتی واهەبوو، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەیکردبوو، کەچی بەخەیاڵ وایدەزانی کە کردوویەتی!

تا رۆژێکیان، یا شەوێکیان، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زۆر زۆر پاڕایەوە لەخودا، کە ئەم وەیەی لەکۆڵ بخا، لەپاشا فەرمووی: ئەی عائیشە! ئاگات لێیە کەخودا هات بەدەنگمەوەو چارەی دەردەکەمی پێ فەرمووم: دوو پیاو هاتن بۆلام، یەکێکیان لەسەرینمەوە دانیشت‌و ئەوی تریان لە پایینمەوە دانیشت، ئەوەیان کە

لەسەرینمەوە بوو گوتی بەوەیان کە لەپایینمەوە بوو، یا فەرمووی: ئەوەیان کە لە پایینمەوە بوو، گوتی بەوەیان کە لەسەرینمەوە بوو: ئازاری ئەم پیاوە چییە؟ گوتی: جادووی لێ کراوە، گوتی: کێ جادووی لێ کردووە؟ گوتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم، گوتی: لەچی؟ گوتی: لەشانەو لە کوڵكو مووی دەمی شانە کە لەکاتی موو داهێنانا بەردەبێتەوە، یا لەناو ددانەکانی شانەکەدا دەمێنێتەوەو لەکیف (قاوغ)ی هێشووی خورمای نێردا، گوتی: جا ئەوە لەکوێیە؟ گوتی: لەناو بیری ذی ئەروان دایە، عائیشە گوتی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ دەستەیێ لەیارانی خۆیدا، چوون بۆ ئەوێ، لەپاشا کە گەڕایەوە فەرمووی: ئەی عائیشە! بەو خودایە ئاوەکەی دەڵێی لینجاوی خەنەیەو، دارە خورماکانی دەڵێی سەرو گوێلاکی شەیتانن، وا ڕەزا قورسو نالەبارن. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا دەریت هێنا لەبیرەکە؟ فەرمووی: (نەء، وەڵێ من خودا چاکی کردمەوەو حەزیشم نەکرد کە شەڕ بورووژێنم لەخەڵك، جا لەبەرئەوە دەستوورم دا بیرەکەیان پڕکردەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٢٩٤٩ چاپی چوارەم}.

## ١١٢١) نوشتە کردن بۆ نەخۆش بەخوێندنی (قُلْ أعُوذُ)وەکان لەگەڵ تەڕایی دەمدا. (٥٦٧١ - ٥٦٨٠)

## بَابٌ: الْقِرَاءة على المَرِيضِ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَالنَّفْث

١٤٤٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِذَا مَرِضَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِهِ نَفَثَ عَلَيْهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ، فَلَمَّا مَرِضَ مَرَضَهُ الَّذِى مَاتَ فِيهِ جَعَلْتُ أَنْفُثُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُهُ بِيَدِ نَفْسِهِ، لأَنَّهَا كَانَتْ أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْ يَدِى. {الحديث: ٥٦٧٨ = ٥٨٧٠ فم. تجريد/٥، رقم: ١٦٢٣ = ٤٤٣٩، ١٦، ٥٠، ٥٧٣٥، ٥٧٥١}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ یەکێ لەکەسوکارەکەی خۆی نەخۆش دەکەوت، سووەتی: (قُلْ هُوَ اللّهُ)و سوورەتی: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَق)و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النّاسِ)ی بەسەریدا دەخوێندو لەپاشا بە تەڕایی دەمی پفی لێ دەکرد، بەڵام لەو نەخۆشییەدا، کە پێغەمبەر تیادا

مەرگ بوو بەمیوانی، من خۆم سوورەتەکانم بەسەریدا دەخوێندو ئەنجا بە تەڕایی دەمم فووم لێ دەکرد، بەڵام دەستی پێغەمبەر خۆیم هەڵدەگرتو دەمهێنا بەسەر جەستەی پیرۆزیدا، لەبەرئەوەی کەدەستی ئەو گەلێ گەلێ لەدەستی من بەپیتو فەڕو بەرکەتتر بوو). {تاج/٣، زنجیره: ٧٥، ژماره: ٣٠٣٧ ج/٤}.

## ١١٢٢) نووشتەکردن بە پیرۆزیی ناوی خوداو پەناگرتن بەناوی خوداو سیفەتە جوانەکانی خودا (٥٧٠١)

## بَابٌ: الرَقية بِاسْمِ اللّهِ وَالتَعْوِيذ

١٤٤٧- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ الثَّقَفِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَعًا يَجِدُهُ فِي جَسَدِهِ مُنْذُ أَسْلَمَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «ضَعْ يَدَكَ عَلَى الَّذِي تَأَلَّمَ مِنْ جَسَدِكَ، وَقُلْ: بِاسْمِ اللَّهِ ثَلاَثًا، وَقُلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ: أَعُوذُ بِاللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ». {الحديث: ٥٧٠١ = ٥٦٩٣ فم. أبو داود. طب: ٣٨٩١. ترمذي. طب: ٢٠٨٠. تحفة الأشراف: ٩٧٧٤}:

عوثمانی کوڕی ئەبولعاصی ئەل-ثەقەفی (رەزای خودای لێ بێ) عەرزی پێغەمبەری کرد (درودی خودای لەسەر بێ) کە ئەوەتی موسوڵمان بووم، ئازارێ لە جەستەمدا پەیدا بووە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (دەستت دابنێ لەسەر ئەو شوێنەی جەستەت کە دەئێشێو سێجار بڵێ: (بِاسْمِ اللّهِ: بەناوی خودا!) وەحەوت جاریش بڵێ: (أَعُوذُ بِاللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ): پەنا دەگرم بەخوداو بەتەوانایی ئەو لەزیانی ئەم ئێشو ئازارەی کە هەستی پێ دەکەمو مەترسیم هەیە لێی!)

لە تاجدا دەفەرموێ: گفتەی ئەبو داوودو تەرمەزی بۆ ئەم فەرموودەیە ئاوایە: عوثمان دەفەرموێ: ژانێکم لەگەڵدا بوو، ئەوەندەی نەمابوو کە بمکوژێ، جا چوومە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حەوت جار دەستی راستت بەسەر جێی ژانەکەدا بهێنەو هەموو جارێ لەگەڵیدا بڵێ: أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ: پەنا دەگرم بەگەورەیی‌و دەستەڵاتو تەوانایی خودا لەزیانی ئەم ئێشەی کە هەستی پێ دەکەم).

فەرمووی: کە ئەمەم کرد، ئیتر خودا ئەو ژانەی لەکۆڵ خستم، ئیتر منیش لەوساکەوە، کەسوکارو خەڵکی تریش رادەسپێرم کە لەکاتی هەبوونی ئێشو ئازارێ لەجەستەیاندا ئاوابکەنو بەم شێوەیە ئەو نزایە بخوێنن). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٣٠٣٢}.

## ١١٢٣) پەناگرتن بەخودا لەزیانی شەیتانی وەسوەسە لەناو نوێژدا.

(٥٧٠٢ - ٥٧٠٤)

## بَابٌ: التَعَوِيذ مِنْ شَيْطَانْ الوَسْوَسَةِ فِي الصَّلاَةِ

١٤٤٨- عَنْ أَبِي الْعَلاَءِ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ حَالَ بَيْنِي وَبَيْنَ صَلاَتِي وَقِرَاءَتِي يَلْبِسُهَا عَلَيَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «ذَاكَ شَيْطَانٌ يُقَالُ: لَهُ خِنْزِبٌ، فَإِذَا أَحْسَسْتَهُ فَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْهُ، وَاتْفِلْ عَلَى يَسَارِكَ ثَلاَثًا»، قَالَ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ، فَأَذْهَبَهُ اللَّهُ عَنِّي. {الحديث: ٥٧٠٢ = ٥٦٩٤ فم}:

ئەبو عەلاء فەرمووی: عوثمانی کوڕی ئەبولعاصی ثەقەفی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەڕاستی شەیتان نوێژەکەمی لێ شێواندووم، خوێندنی ناو نوێژەکەی لێ تێك داوم، نازانم چەند رکات دەکەم، قورئان خوێندنەکەم لێ دەشێوێ، خۆشیو لەززەت لە نوێژەکەم وەرناگرم. خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە شەیتانێکە ناوی خەنزەبە، کە هەستت پێی کرد، سێجار ئەعوزو بیللا بکەو پەنا بگرە بەخودا لێیو لەلای چەپتەوە سێ تف رۆکە!). فەرمووی: ئیتر وام کرد، خودای گەورەیش وەسوەسەو دڵە راوکێکەی لەکۆڵ خستم). {تاج/١/٢٥٠، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٤٩٦ چاپی چوارەم}.

**روونكردنەوە:**

١- خوێندنی ئەم نزایەو تف رۆكردنەكە، نابێ لەناو نوێژەكەدا بێ، یا لەپێش دەست پێكردنیدا، یا لەپاش تەواوكردنی. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە هەركاتێو لەهەر شوێنێ مرۆڤ هەستی بەزیانی شەیتانو وەسوەسەی ئەم مەلعوونە كرد، سوننەتە سێجار (أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرجيم) بكا، یا بەهەر سیغەیەكی تر پەنا بگرێ بەخودای گەورە لێیو سێ تف لەلای چەپیەوە رۆبكات، بەڵام نابێ لەكاتی تف رۆكردنەكەدا، كێشەیەكی ئەدەبی دروست بكا، وەك ئەوە رووی لەكەسێ بێو كەسەكە واهەست بكا كە تفەكە لەو دەكا، یا لەناو مزگەوتا تفەكە رۆبكا، یا تفەكە بەر شتێكی پاك بكەوێ، وەك ئاوو نانو قاپو شتی وا. لەغایە المأمول شەرحی تاجول ئوصولدا دەفەرموێ: (لەپێش دەست پێكردنی نوێژەكەدا سێجار (أَعُوذُ بِاللّٰه)بكاو سێ تف لەلای چەپیەوە رۆبكا. {تاج/١، ص١٨٤ هامش رقم: ١٠، ط/٤}.

نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: مەبەست لە (رِيق)و (نَفْث)و (تَفْل) لەم جۆرە شوێنانەدا، پفێكی بێ تەڕییە، بەڵام بەهەر حاڵ، تفیش دەبێ، پفی تەڕیش دەبێ. {بڕوانە: شەرحی نەوەوی، بەرگی/١٤، ص٤٠٣، حدیث رقم: ٥٦٧٨ شیحا، هەروا بەرگی/١٥، ص١٨. كتاب الرؤیا طبعة ثانیة}.

٢- عوثمانی كوڕی ئەبولعاصی ئەل-ثەقەفی (رەزای خودای لێ بێ) هاوەڵێكی ناوداری پێغەمبەرە، كۆمەڵێ فەرموودەی هەیە لە صەحیحی موسلیمدا، هەروا لە (السُّنَن)دا، وەفدەكەی ثەقیف كاتێ هاتن، ئەویشیان لەگەڵدا بوو، ئیسلام بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كردی بە كارمەندی سەر طائیف، ئەبوبەكرو عومەریش لەوێ هێشتیانەوە، لەپاشا لەساڵی پازدەی كۆچیدا، عومەر كردی بە كارمەندی سەر عومانو بەحرەین، لەپاشا لەبەصرە نیشتەجێ بوو هەتا لەوێ لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا مەرگ بوو بەمیوانی، هەندێ دەڵێن ساڵی پەنجاو پێنجو هەندێ دەڵێن: ساڵی پەنجاو یەك مردووە!

لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەلێ هۆز لە ئیسلام هەلگەڕانەوە، ئەقیفیش ویستیان لە ئیسلام پاشگەز ببنەوە، بەڵام عوثمان نەیهێشت پاشگەز ببنەوەو وتارێکی دا بۆیان‌و فەرمووی: (ئێوە دواترین هۆز بوون کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامتان قەبوولکردووە، مەبن بەسووری بەرلەشکرو یەکەم هۆز بن کە لەئیسلام پاشگەز ببنەوە!).

خۆی دەفەرموێ: (کاتێ ئامینەی کچی وەهەب پێغەمبەری بوو، من ئامادەی ئەوکاتە بووم). لەسەر ئەم بنیاتە دەبێ نزیکەی سەدو بیست ساڵ ژیابێ.

**١١٢٤) نووشتەی کەسێ گەزەندەو شتی وا پێوەی دابێ بە خوێندنی سوورەتی فاتیحە.** (٥٦٩٧ - ٥٧٠٠)

**بَابُ: رُقْيَةُ اللَّدِيغِ بِأُمِّ الْقُرْآنِ**

١٤٤٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانُوا فِي سَفَرٍ، فَمَرُّوا بِحَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ، فَاسْتَضَافُوهُمْ، فَلَمْ يُضِيفُوهُمْ، فَقَالُوا لَهُمْ: هَلْ فِيكُمْ رَاقٍ؟ فَإِنَّ سَيِّدَ الْحَيِّ لَدِيغٌ أَوْ مُصَابٌ؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: نَعَمْ، فَأَتَاهُ فَرَقَاهُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَبَرَأَ الرَّجُلُ، فَأُعْطِيَ قَطِيعًا مِنْ غَنَمٍ، فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَهَا، وَقَالَ: حَتَّى أَذْكُرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! وَاللَّهِ مَا رَقَيْتُ إِلاَّ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَتَبَسَّمَ وَقَالَ: «وَمَا أَدْرَاكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ»؟ ثُمَّ قَالَ: «خُذُوا مِنْهُمْ، وَاضْرِبُوا لِي بِسَهْمٍ مَعَكُمْ».
{الحديث: ٥٦٩٧ = ٥٦٨٩ فم = فتح الملهم. تجريد/٣، رقم: ١٠٠٦ = ٢٢٧٦، ٥٠٠٧، ٥٧٣٦، ٥٧٤٩}:

ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاری‌و تاجول ئوصولدا ئاوایە، دەیکەین بە راڤەی ئەم فەرموودەیەی ئێرەی موسلیم:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووین، چووین بۆ سەفەرێ، رۆیشتین تالای خێڵی عەرەبدا، لاماندا، ویستمان کە بەمیوان قەبووڵمان بکەن، بەڵام خێڵەکە رازی نابن‌و دایان

نەکردین‌و میوانداریان پێ نەکردین، جا ئاغای خێڵەکە شت پێوەی دەدا، وە بەزۆر شت هەوڵی لەگەڵ دەدەن، بەلام سوودی نابێ بۆی تا هەندێکیان دەڵێن: بۆناچن بۆناو ئەم کاروانییە، کە لێرەدا لایان داوە، سا بەشکوو چارەیێ لەلای کەسێکیان هەبێ.

جا دەڕۆن بۆلایان‌و دەڵێن: سەرخێڵەکەمان شت پێوەی داوەو بەزۆر شت هەوڵمان لەگەڵی داوە، بەلام سوودی نییە بۆی، ئایا لەلای کەسێ لەئێوە چارەیێ، چارەسەرێ نییە؟ یەکێکیان (کە ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: ئەبو مووسا خۆی بووە) دەڵێ: با، بەخودا من نووشتەی گەزندە دەکەم، بەلام بەخودا چونکە ئێمە داوای میوانداریمان لێتان کرد، کەچی ئێوە داتان نەکردین‌و رازی نەبوون، منیش دووعاتان بۆ ناکەم، هەتا سەرقەڵەمانە یێکمان بۆ بڕیار نەدەن.

ئینجا رێەکەون لەسەر بڕکەیێ پەز، ئیتر ئەبو مووسایش لەگەڵیان دەچێ بۆلای سەرخێڵەکەیان‌و لەوێ سووەتی (الحمد لله رَبِّ العَالَمِينَ) بەسەریا دەخوێنێ‌و بەتەڕایی دەمی کەمێ تفی لێ دەدا، وە هەتا حەوت جار ئەمە دووبارە دەکاتەوە، هەموو جارێ لەپێشا فاتیحە دەخوێنێ، وە ئەنجا بەتەڕایی دەمی پفی لێ دەکا، ئیتر شتپێوە دراوەکە وەك وشترێ لەپەت بەربێ، دەست‌و پای کرایەوەو هەستاو کەوتە گەڕو رۆیشتن‌و یەك دەنك پەلە قاژێ‌و پەلە فرتێ‌و پەلە پرووسکێی نەما.

فەرمووی: ئیتر ئەو سەر قەڵەمانەی کە لەسەری پێك هاتبووین بەتەواوی دایان پێمان.

جا هەندێ کەسیان گوتیان: با بەشی بکەین لەناو خۆمانا، بەلام دووعا خوێنەکە فەرمووی: دابەشەی مەکەن تا دەچینەوە لای پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ)و راستی رووداوەکەی عەرز دەکەین، هەتا بزانین ئەو فەرمانی بەچییە پێمان، جا کەهاتنەوە لای پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ)و ئەمەیان بۆیگێڕایەوە، فەرمووی: (چۆنت زانی کە ئەوە دووعایە؟!). فەرمووی: (شتێ راست بوو خودا خستیە ناو دڵمەوە).

فەرمووی: (شتێ باشتان کردووە، دەی دابەشی بکەن‌و پشکێکیش بۆمن دابنێن لەگەڵ خۆتاندا، هەتا بەتەواوی دڵنیابن لە دروستی کارەکەتان‌و لە حەڵاڵی سەر قەڵەمانەکەتان‌و لەوکرێیەی کە وەرتان گرتووە).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش دابەشکردنەکە دیسانەوە رەزامەندی خۆی دەربڕییەوە بەزەردە خەنەیێ!).

لە گێڕانەوەیەکی تاجا: (هەندێ کەسیان ئەمەیان بەدڵ نەبوو، وە دەیانگوت: تۆ ئەی ئەبو مووسا! لەسەر نامەی خودا کرێت وەرگرتووە، تا کاتێ هاتینەوە بۆ مەدینە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو مووسا لەسەر قورئانی نامەی خودا کرێی وەرگرتووە؟ ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (رەواترین شت کە کرێی لەسەر وەربگرن قورئانی پیرۆزە، کە نامەی خودای گەورەیە)ز {تاج/٣، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٣٠٣٩ چاپی چوارەم} + {تاج/٣، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٣٠٤٠ ج/٤ = چاپی چوارەم} .

## ١١٢٥) نووشتە کردن بۆ دەمبەستی هەموو جانەوەرێکی زەهردار.

(٥٦٨١ - ٥٦٩٦)

## بَابٌ: الرُّقْيَةِ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ

١٤٥٠- عَنْ الأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ الرُّقْيَةِ؟ فَقَالَتْ : رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الأَنْصَارِ فِى الرُّقْيَةِ مِنْ كُلِّ ذِى حُمَةٍ. {الحديث: ٥٦٨١ = ٥٦٧٣ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٨٣ = ٥٧٤١. تحفة الأشراف: ١٦٠١١} :

ئەلئەسوەد فەرمووی: پرسیم لە عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) لەبارەی نووشتەو چاوەزارەوە؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی دا بەماڵێ ئەنصاری کە نووشتەو چاوەزارو دەمبەست بکەن بۆ هەموو جانەوەرێکی زەهردار، وەك مارو دووپشك‌و زەردەواڵەو هەموو چزوودارو ژەهرداریکی تر).

## ١١٢٦) نووشتەی مێکووتە. (٥٦٨١ - ٥٦٩٦)

## بَابٌ: فِي الرُّقْيَةِ مِنَ النَّمْلَةِ

١٤٥١- عَنْ أَنَسِ بن مالك (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الْعَيْنِ، وَالْحُمَةِ، وَالنَّمْلَةِ. {الحديث: ٥٦٨٨ = ٥٦٨٠ فم}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ڕێگەی ئێمەی داوە کە چاوەزارو دەمبەستی مارو دووپشكو جڕو جانەوەری زەهردارو ژەهردارو نووشتەو نزای نەخۆشی مێکوتە بکەین). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٣٠٢٥ ج/٤}.**

## ١١٢٧) نووشتەی دووپشك. (٥٦٨١ - ٥٦٩٦)

## بَابٌ: فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الْعَقْرَبِ

١٤٥٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الرُّقَى؟ فَجَاءَ آلُ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ كَانَتْ عِنْدَنَا رُقْيَةٌ، نَرْقِي بِهَا مِنَ الْعَقْرَبِ وَإِنَّكَ نَهَيْتَ عَنِ الرُّقَى، قَالَ: فَعَرَضُوهَا عَلَيْهِ، فَقَالَ: «مَا أَرَى بَأْسًا، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَنْفَعَ أَخَاهُ فَلْيَنْفَعْهُ». {الحديث: ٥٦٩٥ = ٥٦٨٧ فم}:

**جابیر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **جڵەوگیریی کرد لەنووشتە کردن، خزمانی عەمری کوڕی حەزم هاتن بۆ خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەمەوپێش نووشتەمان دەکرد، نووشتەی دووپشکمان دەکرد، بەڵام ئێستا تۆ جڵەوگیریی لەنووشتە کردن دەکەی، سەبارەت بەئێمە فەرمانت بەچییە؟ خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەو نووشتەو دووعایانەی کە دەیانکەن، کامانەن نیشانمیان بدەن).**

**ئەوانیش نووشتەو دووعاکانی خۆیان خوێندەوە بۆ پێغەمبەرو عەرزیان کرد کەچینو چی نین. ئەویش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (لەم نووشتانەی ئێوەدا شتێ**

خراپ نابینم، بەشێوەی گشتیتش وەك دەستوورێکی دامەزراو: هەر کەسێکتان دەتوانێ، بەهەر شێوەیێ بێ، بەهۆی نووشتەوە بێ، یا بەهۆی شتێکی ترەوەبێ، باسوود بە برادەرێکی خۆی بگەیەنێ، با درێغی لێ نەکا). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٣٠٢٠، ٣٠٢١، ٣٠٢٢، ٣٠٢٣، ٣٠٢٤}.

١٤٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَقِيتُ مِنْ عَقْرَبٍ لَدَغَتْنِي الْبَارِحَةَ، قَالَ: «أَمَا لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ تَضُرُّكَ». {الحديث: ٦٨١٨}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درووی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم شەو دووپشکێ پێمەوەیدا، تا بەیانی خەوم لێ نەکەوت. فەرمووی: (ئەدی ئەگەر لەکاتی ئێوارەدا بتگوتبایە: {أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ}: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خودا لەزیان‌و وەزەنی ئەوەی کەخودا خۆی دروستی کردووە، ئەگەر ئەم نزایەت سەر لەئێوارێ، بخوێندبایێ، مەگەر حەزی خودای لەسەر بوایە، دەنا ئەو دووپشکە زیانی نەدەبوو بۆت). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٣٠٣٥} + {تاج/٣، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٣٠٣٣ ج/٤}.

## ١١٢٨) چاوێنی ڕاستەو بۆی هەیە. (٥٦٦٣ - ٥٦٦٦)
## بَابٌ: الْعَيْنُ حَقٌّ وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ فَاغْسِلُوا

١٤٥٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الْعَيْنُ حَقٌّ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ سَبَقَتْهُ الْعَيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ فَاغْسِلُوا». {الحديث: ٥٦٦٦ – ٥٦٥٨ فم}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (چاوێنیی چاوی پیس ڕاستەو هەیەو کاریگەری هەیە، گریمان شتێ

وابووایــه کەدەســت پێشــکەریی لــە چارەنووســی خــودایی بکردایــە، چــاوی پــیس دەستپێشکەریی لێ دەکردو دەیئەنگاوت، چونکە چاوی پیس ئەوەندە کاریگەرە، جا ئەگەر دنیابوو، کەسێ بوو بەچاوتانەوەو داوایان لێ کردن کە خۆتان بشۆرن بۆیـان، ئەوە خۆتان بشۆرنو ئاوەکە لە شتێکا کۆبکەنـەوەو لەپاشـا ئـاوی خۆشـۆردنەکەتان بکـەن بەســەر ئەوکەســەدا کـەبووە بەچـاوتانەوە، تـا خـودا شـیفای بـدا). {تـاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٢٩٩٩}.

**روونکردنەوە:**

لــە تاجـدا دەفــەرموێ: دەســتووری ئــەم خۆشــۆردنەیش ئاوایــە: بــەپێی ئــەم فەرموودەیەی دواوە، کە ئەحمەدو نەسائیو ئیبنو حـەببان (ڕەحمـەتی خودایـان لێ بێ) گێڕاویانەتەوە:

(چـاو پیسـەکە دەموچـاویو هـەردوو دەسـتی هـەتا هـەردوو ئانیشـکیو لەشـی لەناوکی بەرەو خوار، تا خوارەوە دەشۆرێو ئەو ئاوە چۆڕاوەیە دەکەنـە قاپێکـەوەو دەیکەن بەسەر سەرو پشتی ئەو کەسەدا کەبووە بەچاویەوە، پاشـان قاپەکـە دەمـەو نخوون دەکەنەوە، ئـیتر بـە فـەرمانی خـودا چاوێنیی بەچـاوەبووەکە خـۆشو چـاك دەبێتەوە. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٣٠٠٠}.

### ١١٢٩) نووشتەی بەچاوەبوون، واتە: چاوەزار. (٥٦٨١ - ٥٦٩٦)
### بَابٌ: فِى الرُّقْيَةِ مِنَ الْعَيْنِ

١٤٥٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْمُرُنِى أَنْ أَسْتَرْقِىَ مِنَ الْعَيْنِ. {الحديث: ٥٦٨٦ = ٥٦٧٨ فم. تجريـد/٥، لاپـەڕە: ١٧٦، رقم: ١٨٨١ = ٥٧٣٨ فتح البارى. تحفة الأشراف: ١٦١٩٩}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو لەسەر هەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بـێ) فـەرمووی: جـاران پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمانی

پێم دەكرد، كەداوا لەكەسی شارەزا بكەم كە چاوەزاری چاوێنی بكا، بۆ كەسێ كەبووە بەچاوەوە).

١٤٥٦- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: رَخَّصَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لآلِ حَزْمٍ فِي رُقْيَةِ الْحَيَّةِ، وَقَالَ: لأَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ: «مَا لِي أَرَى أَجْسَامَ بَنِي أَخِي ضَارِعَةً تُصِيبُهُمُ الْحَاجَةُ»؟ قَالَتْ: لاَ، وَلَكِنِ الْعَيْنُ تُسْرِعُ إِلَيْهِمْ، قَالَ: «ارْقِيهِمْ»، قَالَتْ: فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «ارْقِيهِمْ». {الحديث: ٥٦٩٠ = ٥٦٨٢ فم}:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی دا بە خانەوادەی حەزم كە نووشتەو دەمبەستی ماربكەن. وە فەرمووشی بە ئەسمائی كچی عومەیس، كە هاوسەری جەعفەری كوڕی ئەبو تالیب بوو، كەبرای ئیمامی عەلی بوو، ئامۆزای پێغەمبەر بوو، پێی فەرموو (درودی خودای لەسەر بێ): (ئەی ئەسماء! ئەی دایكی مناڵەكانی جەعفەری كوڕی ئەبو تالیب! ئەوە بۆچی دەبینم لەشی برازاكانم، واتە: كوڕەكانی جەعفەری ئامۆزام، لەڕو لاوازو پووكاوەن، ئایا لەبەرئەوەیە كە برسییانەو پێویستیان بە خۆراكە؟).

ئەسماء فەرمووی: (نەء، لەبەرئەوە نییە، بەڵام مناڵەكانی جەعفەر بەرچاوین‌و زوو زوو دەبن بەچاوەوە، هی ئەوەیە). فەرمووی: (دەی چاوەزاریان بۆ بكە، ئەسماء فەرمووی: جا دووعاو وشەكانی نووشتووەكەم عەرزی پێغەمبەر كرد، ئەویش رەزای لەسەر دەربڕین‌و فەرمووی: (دەی بەم نزاو نووشتەو وشانە چاوەزاریان بۆ بكە، من رەزام لەسەریەتی!). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٣٠٠٢}. بڕوانە: ژمارە: (١٤٤٠) بۆ ژینامەی ئەسمائی كچی عومەیس.

### ١١٣٠) نووشتووی بەچاوەوە بوون. (٥٦٨١ - ٥٦٩٦)
### بَابٌ: فِي الرُّقْيَةِ مِنَ نَظْرَةِ

١٤٥٧- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: لِجَارِيَةٍ فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى بِوَجْهِهَا سَفْعَةً، فَقَالَ: «بِهَا نَظْرَةٌ، فَاسْتَرْقُوا لَهَا»، يَعْنِي بِوَجْهِهَا صُفْرَةً. {الحديث: ٥٦٨٩ = ٥٦٨١ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٨٢ = ٥٧٣٩ فتح الباری. تحفة الأشراف: ١٨٢٦٦}:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵی من بوو، کچۆڵەیەکی بینی پڵێ بەدەمو چاویەوە بوو، فەرمووی: (ئەمە بووە بەچاوەوە، چاوەزاری بۆ بکەن!) واتە پڵێکی زەرد بە روویەوە بوو، وەك خەرکانە. {تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٣٠٠١ چ/٤}.

## ١١٣١) نووشتەکردن بە خۆڵی زەوی. (٥٦٨١ - ٥٦٩٦)

## بَابُ: الرُّقْيَةِ بِتُرْبَةِ الأَرْضِ

١٤٥٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا اشْتَكَى الإِنْسَانُ الشَّيْءَ مِنْهُ أَوْ كَانَتْ بِهِ قَرْحَةٌ أَوْ جَرْحٌ، قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِإِصْبَعِهِ هَكَذَا، وَوَضَعَ سُفْيَانُ سَبَّابَتَهُ بِالأَرْضِ، ثُمَّ رَفَعَهَا: «بِاسْمِ اللَّهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، لِيُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا»، قَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: «يُشْفَى»، وَقَالَ زُهَيْرٌ: «لِيُشْفَى سَقِيمُنَا». {الحديث: ٥٦٨٣ = ٥٦٧٥ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٨٤ = ٥٧٤٥، ٥٧٤٦ فتح الباری. أبو داود. طبّ: ٣٨٩٥. ابن ماجة. طبّ: ٣٥٢١. تحفة الأشراف: ١٧٩٠٦}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر کەسێ ئێشێ، ئازارێ لە لەشیا بوایە، یاخود برینێ، یا زامێکی پێوە بوایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەی شایەتمانی خۆی بەتفی خۆی تەڕ دەکردو دەینایە سەر خاكو پەنجەی تۆزێ خۆڵی پێوە دەلکا، ئەوجا پەنجەی بە خۆڵو تەڕاییەکەی دەمیەوە دەهێنا بەسەر شوێنی ئازارەکەداو لەوکاتەدا ئەم نزایەی دەخوێندو دەیفەرموو: {بِاسْمِ اللَّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، لِيُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا}:

واته: به پیرۆزیی ناوی خودای گەورە، دۆعاو نزاو نووشتەت بۆدەکەم، ئەمە خاکی زەوی خۆمانە، لەگەڵ تەڕاییی دەمی موسوڵمانێ لەخۆمانە، بەفەرمانی پەروەردگارمان، دەبێ بەچارەو دەرمان بۆ نەخۆشمان!).

ئەم فەرموودەیە ئیمامی مَوسلیم لەسێ مامۆستای خۆیەوە دەیگێڕێتەوە، کە ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبەو زوهەیری کوڕی حەربو ئیبنو ئەبی عومەرە، هەرکەسێ لەم سێ مامۆستایە رستەی کۆتاییان بەشێوەیێ گێڕاوەتەوە، کەمێ جیایە لەوی تریان، ئیبنو ئەبی عومەر ئاوای دەگێڕێتەوە: (لِیُشْفَی بِهِ سَقِیمُنَا). ئیبنو ئەبی شەیبە ئاوای دەگێڕێتەوە: (یُشْفَی بِهِ سَقِیمُنَا) واتە: بەبێ لامی ئەمرەکە، زوهەیریش ئاوا: (لِیُشْفَی سَقِیمُنَا) واتە: بەبێ (بِهِ). گەرچی ئەم سێ لەفزە، لەدەقی عەرەبییەکەدا، رۆڵ دەبینن‌و لەواتادا کاریگەرییان هەیە، بەلام لە کوردییەکەدا مەئالی هەرسێکیان ئەوەیە کە نووسراوە.

١٤٥٩- عَنْ خَوْلَةَ بِنْتَ حَكِيمٍ السُّلَمِيَّةَ تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ نَزَلَ مَنْزِلاً، ثُمَّ قَالَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ يَضُرُّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ». {الحديث: ٦٨١٧}.

خەولەی کچی حەکیمی ئەل‌سولەمییە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ کاتێ دەچێتە جێگەیێ، یا دەچیتە هەوارێ نوێ بڵێ: {أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ} : پەنا دەگرم بە پیرۆزیی وشە تەواوەکانی خودا، لەشەڕی هەموو دروسکراوانی خودا). هەرکەسێ لەم کاتەدا ئەم نزایە بخوێنێ، ئیتر هیچ شتێ زیانی پێ ناگەیەنێ، هەتا لەو شوێن‌و هەوارە دەگوێزێتەوە).

**روونکردنەوە:**

خەولەی کچی حەکیم، هاوەڵی پێغەمبەرە، هاوسەری عوثمانی کوڕی مەظعوون بوو، ئافرەتێکی فریشتە ئاسا، زۆر خودا پەرست بوو، هەمیشە بەرۆژ بەڕۆژوو بوو، بەشەویش سەرگەرمی شەو نوێژ بوو.

## ١١٣٢) لەكاتی نەخۆشیو ئازارا، پیاو نووشتە دەكا بۆ كەسوكاری.

(٥٦٧١ - ٥٦٨٠)

## بابٌ: رُقْيَةُ الرَّجُلِ أَهْلَهُ إِذَا اشْتَكَوا

١٤٦٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اشْتَكَى مِنَّا إِنْسَانٌ مَسَحَهُ بِيَمِينِهِ ثُمَّ قَالَ: «أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا»، فَلَمَّا مَرِضَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَثَقُلَ أَخَذْتُ بِيَدِهِ، لأَصْنَعَ بِهِ نَحْوَ مَا كَانَ يَصْنَعُ، فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ يَدِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَاجْعَلْنِي مَعَ الرَّفِيقِ الأَعْلَى»، قَالَتْ: فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ، فَإِذَا هُوَ قَدْ قَضَى. {الحديث: ٥٦٧١ = ٥٦٦٣ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٦٩ = ٥٦٧٥، ٥٧٤٣، ٥٧٤٤، ٥٧٥٠}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، كاتێ كەسێ لەئێمە ئازارێكی ببوایە، دەستی راستی دەهێنا بەسەر شوێنی ئازارەكەداو دەیفەرموو: (أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا):

واتە: ئەی خودای من! ئەی پەروەردگاری هەرچی ئادەمیزادە! ئەی لابەری ئێشو ئازار! شیفای بدەو خۆشو چاكی بكەرەوە، شیفادەری بەڕاستی هەر خۆتیتو خۆشبوونەوە هەر بەدەستی تۆیە، بێجگە لەتۆ شیفادەری تر نییە، ئەگەر خواستی تۆی لەسەر نەبێ، دەرمانو نوشتی پارە ناكا، شیفایەكی تەواوی وا كەهیچ دەردێ نەهێڵێ!).

جا كاتێ پێغەمبەر خۆی نەخۆش كەوتو دەردەكەی گران بوو، دەستیم گرت تالەسەر شێوەی جارانی خۆی ئەو دۆعایەی بۆ بكەم كە ئەو جاران كاتێ نەخۆش دەبووین دەیكرد بۆ ئێمە، كەچی دەستی خۆی لەدەستم راپسكاند، لەپاشا فەرمووی: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَاجْعَلْنِي مَعَ الرَّفِيقِ الأَعْلَى): خودایە! لێم خۆشبەو شادم كە بەدیداری هاوڕێی هەرە پایە بڵندو بمبەرەوە بۆناو یارانی ئەنجومەنی باڵا (مەلەئولئەعلا) كەوان لەپەنای خۆتا).

عائیشه فەرمووی: ئیتر كه سەرنجمدا روانیم واگیانی پاكی سپاردو فەرمانی هەقی بەجێ هێنا. {تاج/٣، زنجیره: ٧٤، ژماره: ٣٠٢٨} + {تاج/٣، زنجیره: ٧٥، ژماره: ٣٠٣٧}.

١٤٦١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَانَ يَرْقِي بِهَذِهِ الرُّقْيَةِ: «أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، بِيَدِكَ الشِّفَاءُ، لاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ أَنْتَ». {الحديث: ٥٦٧٦ = ٥٦٦٨ فم}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم دۆعایە نووشتەی دەكرد:(أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، بِيَدِكَ الشِّفَاءُ، لاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ أَنْتَ):

واته: ئەی خودایه! ئەم ئازاره بەرەوه بۆلای خۆت، ئەی پەروەردگاری كۆمەڵەی ئادەمیزادەكان! چارەو چارەسەرو خۆشبوونەوه هەر بەدەستی تۆیه، لابەری ئەم ئێش‌و ئازاره تەنیا هەر تۆی‌و بەس).

## ١١٣٣-
## بَابٌ: لاَ بَأسَ بِالرُّقَى مَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ شِرْكٌ

١٤٦٢- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نَرْقِي فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! كَيْفَ تَرَى فِي ذَلِكَ؟ فَقَالَ: «اعْرِضُوا عَلَيَّ رُقَاكُمْ، لاَ بَأْسَ بِالرُّقَى، مَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ شِرْكٌ». {الحديث: ٥٦٩٦ = ٥٦٨٨ فم}:

عەوفی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران لەسەردەمی نەزانیدا، واتە لەسەردەمی نەفامی‌و جاهیلییەتدا، دۆعاو نووشتەمان دەكرد، جا عەرزی پێغەمبەرمان كرد (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ ئەم بابەتە تۆچی دەفەرمووی؟ فەرمووی: (ئەو نووشتەو دۆعایانەی دەیانكەن كامانەن، نیشانمیان بدەن، هەر دۆعاو نووشتەیێ قسەو باسی شیرك‌و بتپەرستی تیانەبێ‌و بۆنی فرەخوایی لێ نەیێ قەیدی نییە). {تاج/٣، زنجیره: ٧٣، ژماره: ٣٠٢٠ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

## پوختەی نامەی نزاو نووشتە

یەکەم:

أ/ لە تەجریدی بوخاریدا، کە ناوداره بـه (مختصر صحیح البخاری) بابـەتێکم نووسیوه، لەکۆتایی فەرموودەی ژماره: ١٠٠٦وه، ئەگەر تەماشای بفـەرموون جێگـەی خۆیەتی.

جا والێرەدا بۆ تەواوکەری ئەو بابەتە ئەم فائیدەیە لەهـەمان سەرچاوەوە، کـە پەڕاوی (بَيْنَ يَدَی كِتَابِ الله)یە، لەپاش بەکوردی کردنی، بەکورتیو پـوختی ڕاگـوێز دەکەم، ئومێدەکەم کە خودای گەوره بیکا بە سەرچاوەی قەبووڵی نـزای نـزاکاران:

١/ دەستوورەکانی نـزاو نووشتەو دووعا:

١- ڕووکردنە ڕووگە.

٢- لەشی پاك بێ.

٣- دەستی بەدەستنوێژەوە بێ.

٤- جلو بەرگی پاك بێ.

٥- هەردوو دەستی بەپاکی هەتا ئاستی هەردوو سەرشـانی هـەڵبڕێ، وەك کەسـێ لەئاودا نوقم بووبێو دەست درێژبکا بۆلای خودا لێـی بپاڕێتـەوه، کـە ڕزگـاری بکـاو نەهێڵێ بخنکێ.

٦- نزاو یادو زیکردو دووعاو نووشتەکە بەنهێنی بێ، مەگەر هۆیـەك هـەبێ بـۆ دەنگ هەڵبڕین، وەك ئەوە کۆمەڵێ لەدوا ئەوەوە هەمان زیکر، یـا هـەمان پاڕانـەوەو نزابکەن، لەکاتی وادا واباشە بەدەنگی بەرزبێ.

٧- لەسەرەتاوە بە حەمدو سوپاسو ستایشی خودا دەسـت پـێ بکـا، وەك گـوتنی زیکری (البـاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ) کە ئەمەیە: (سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ). وەهەروەها بە صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر، لەپاش سوپاسی خودا، دەست پێ بکا.

٨- كۆتایی نزاو پاڕانەوەكەیش بە سوپاسی خوداو صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر كۆتایی بێت.

٩- لەدوا دواییدا بڵێ (ئامین).

١٠) زۆر ورك بگرێ لەكاتێ نزاكردنەكەدا، بەكوڵی دڵ بپاڕێتەوە.

١١) دڵی لای نزاو پاڕانەوەكەی بێ.

١٢) بەری دەستی بكاتە ئاسمانو وەك سواڵكەر هەردوو لەپی پان بكاتەوە، وەك كەسێ لەدۆستێ دیارییەك وەربگرێ. ئەمە لەكاتێكا بەری دەستی بكاتە ئاسمان، كەداوای شتێ باش لەخودا بكا، بەڵام ئەگەر داوای ئەوەی لێ دەكرد، كە بەڵایەكی لەسەر لابەرێ، واباشە پشتی دەستەكانی بەكراوەیی بكاتە ئاسمان.

١٣- بەجەختو بە باوەڕی تەواوەوە داواكەی پێشكەش بە بارەگای زاتی پەروەردگاری هەرە پاكو پیرۆز بكا.

١٤- لەپێشا بەخودی خۆی دەست پێ بكا، لەمەدا حەزرەتی ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەر بێ) بكا بەسەر مەشق، كە دەفەرموێ: (رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الحِسَابُ – ١٤/١١).

واتە: ئەی پەروەردگارمان! لەخۆم خۆشبە، لەدایكو باوكم خۆشبە، لەسەرجەمی موسوڵمانان خۆشبە، لەو رۆژەدا كە حیسابو لێپرسینەوە بەرپا دەبێ).

١٥- چەند جارێ نزاكە دووبارە بكرێتەوە، واباشە تا سێ‌جار، دەقی نزاكە دووبارە بكرێتەوە، گشت جارێ كەدەیكا.

١٦- واباشە ئەگەر دەكرا، بەو نزایانە نزا بكرێ، كە لەقورئانو سوننەتدا هاتوون، وە دەقەكەیان پیت بەپیت بگوترێ، كە ئەمە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: (الإقتصار عَلَى اللفظ الوَارِدِ في القرآن والسنة بحروفه). یا دووعای مەئثوور.

١٧- باوەڕی تەواوت وابێ كە نزاو پاڕانەوەكەت گیرایە ئەگەر مەرجەكانی گیرابوونیان هاتە جێ كە ئەمانەن:

١٨- خۆراكی پاكو حەڵاڵ، پاكخۆرو حەڵاڵ خۆر.

١٩- خۆپاراستن لەشتی نادروستو ناڕەواو لە زوڵمو زۆرو تاوان.

٢٠- ئەركە ئایینییەكان بەجوانی بەجێ بهێنرێ.

٢١- پاكی لەشو دەروونو دەرەوەو ناوەوە.

٢٢- هەڵبـژاردنی كـاتی بـاشو دۆخـی بـاشو جێگـەی بـاش بـۆ نـزاو پاڕانـەوەو نووشـتەو بەرزكردنــەوەی داوا بــۆلای خــودا، وەك: رۆژی هــەینی، نێـوانی بـانگو قامەت، بەتایبەتی سێیەكی كۆتـایی شـەوو دەمـەو سـەحەرو مـەلا بانگدان، لـەپاش هەموو نوێژە فـەرزەكان، لـەناو كڕنووشـدا، لـەناو قونووتـدا، كـە لەنوێـژی بـەیانیو لەنیوەی دوایـی رەمەزانـدا دەخـوێنرێ، یـا لـەوەتری مـانگی رەمەزانـدا دەخـوێنرێ، لەسەرەتاوە تاكۆتا.

٢٣- بۆنەكانی نزاو پاڕانەوەو نووشتە هەر زۆر زۆرن، هـەموو كـونو قـوژبنێكی ژیان دەگرنەوە، لەچركە ساتی لەدایكبوونەوە، هەتا ئەو دەمەی دەچینەوە نـاو دوو تۆی خاكی دایكمان! لە ناونانو حەوتمـەوە دەسـت پـێ دەكـات، هـەتا نوێـژی تـەرمو تەڵقینی مردوو.

٢٤- واباشە نـزا هەمیشە دووبـارە بكرێتـەوە، لـەڕۆژەكانا، لـە هەینییـەكانا، هـەتا گیرا دەبێ، مرۆڤ لەكردنی كۆڵ نەدا.

٢٥- نـزاو پاڕانـەوەو نووشتە جۆری زۆرە، بە نووسـین دەبـێ، بـەگوتن دەبـێ، بـە نوێژدەبێ وەك نوێژی ئیستخارەو نزاو نوێژی گیرابـوونی مـرازو نوێـژە بارانـەو نـاو قوونووتو ناو تەحیات.

٢٦- واباشە لەكاتی كردنی نووشتەو نزادا، كە بەئومێدی گیرابوونی مرازبێ ئەم سێ شتە یەك بگرن: (قۆل وفیعلو صەدەقە: گوتنو كردارو خێر!).

٢٧- هەموو نـزاو نووشتەیێ كە بەناوی خوداو نیشـانە جوانـەكانی بـێ دروسـتە، وە هەموو جۆرە نووشتەو نـزاو پاڕانەوەیەكی تر، با مەئثووریش نـەبێ، بەمـەرجێ

بۆنی بتپەرستی‌و بێباوەڕی‌و جادووبازیی لێ نەیێ دروستەو کارێ باشە، ئیتر نووسراوبێ یا خوێندراو جیاوازی نییە.

٢٨- هەلگرتنی نووشتە، بەهەر شێوەیێ بێ دروستە، بەمەرجێ نووشتەکە لەزاتی خۆیدا ڕەوابێ، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص وایدەکرد {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٣٠٣٣}.

دووەم:

١- لەکاتی نەخۆشی‌و ترس‌و وەسوەسەو شتی وادا نزاو دووعا سوننەتە، پەنا گرتن بەخودا لەشەڕی دروستکراوانی خۆی سوننەتە.

٢- نووشتەو نزای خراپ، ئەگەر بەنووسین بوو، کاتێ دەدۆزرێتەوە واباشە یا بسووتێنرێ، یا بکرێ بەژێر خۆڵەوە، تا مەردوم لەزیانی بەدووربن‌و شەڕ نەورووژێنرێ.

٣- کرێ‌و سەر قەڵەمانەی نووشتوو حەلاڵە.

٤- نووشتەی تایبەت بۆهەندێ نەخۆی‌و پەتا هەیە.

٥- چاوێنی ڕاستەو چاوەزارکردن سوننەتە.

٦- دروستە هەندێ شتی تایبەت بەکاربهێنرێن لەکاتی نووشتەکردندا، وەك: تەف‌و تەڕایی دەم‌و خۆڵ‌و بۆنی خۆش‌و ئاوی زەمزەم‌و هەنگوین، وەك: کاتی ناونان‌و، ئاوی دەستنوێژو خۆشۆردن لەگەڵ نووشتووی تایبەت. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٢٩٩٨} و دەستهێنان بەشوێنی ئازارداو تەکاندن‌و...هتد.

٧- درووستە لەگەڵ نزاو نووشتەکردندا، داو دەرمانیش بەکاربهێنرێن، هاموشۆی پزیشك بکرێ، هەموو هۆیەك‌و ڕێگەیەکی ڕەوا بۆ گەیشتن بەمەبەست بگیرێتە بەر. دوعاو نزا بەبێ پەیڕەوی ئەم دەستوورو مەرجانەیش دروستەو زۆر باشە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٢- نامەی نەخۆشیو پزیشکی

## كِتابُ المرض وَالطِبّ

{بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٧٩، لە ژمارە: ١٨٧٠وە هەتا ژمارە: ١٨٩٠ + تاج/٣، لاپەڕە: ٣١٩ چاپی چوارەم، لە زنجیرە: ٥٢ هەتا زنجیرە: ٨١، لە ژمارە: ٢٩٣٥ هەتا ژمارە: ٣٠٦٦ + ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٣٧ چاپی دووەم، زنجیرە: ١٤٤ هەتا زنجیرە: ١٦٠، لە ژمارە: ٨٩٤ هەتا ژمارە: ٩٤٥}.

### ١١٣٤) هەر نەخۆشیو ئازارێ تووشی موسوڵمان دەبێ دەبێ بە پاکەوەکەری گوناهەکانی. (٦٥٠٢ - ٦٥١٦)

### بَابٌ: مَا يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ مِنَ الْوَجَعِ وَالْمَرَضِ

١٤٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَسْعُود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهُوَ يُوعَكُ، فَمَسِسْتُهُ بِيَدِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ لَتُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَجَلْ إِنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلَانِ مِنْكُمْ»، قَالَ: فَقُلْتُ: ذَلِكَ أَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَجَلْ»، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى مِنْ مَرَضٍ فَمَا سِوَاهُ، إِلاَّ حَطَّ اللَّهُ بِهِ سَيِّئَاتِهِ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا».

بَابٌ: فِي فَضْلِ عيادة المرضى {الحديث: ٦٥٠٤ = ٦٥١٩ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٥٥، رقم: ١٨٦١ = ٥٦٤٧، ٥٦٤٨، ٥٦٦٠، ٥٦٦١، ٥٦٦٧}:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەخۆش بوو، چووم بۆ سەردانو هەواڵپرسینی، تایەکی گرانی لێ هاتبوو، دەستم لێدا زۆر گەرم بوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تایەکی گرانو سەخت دایگرتووی؟ فەرمووی: (ئەدیی وایە، من کەتا دامدەگرێ، بەقەد دوو پیاو لەئێوە تا دامدەگرێ).

گوتم: ئەوە لەبەرئەوەیە کەتۆ دوو قات پاداشتت بۆ هەیە. فەرمووی: (بەڵێ ئەوە وایە، هەر موسوڵمانێ هەر ئێشو ئازارێکی بێتەڕێ، وەك ئەوە تووشی

نەخۆشییەك، یا ئازارێ تر ببێ، بەهۆی ئەوەوە خودای گەورە خراپەو گوناهەكانی لێ هەڵ دەوەرێنێ، تا لەئەنجاما موسوڵمان لە گوناه پاك دەبێتەوە، وەك چۆن گەڵای درەختێ سەرپاك هەڵوەرێ ئاوا). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٢٩٣٩ چ/٤}.

### ١١٣٥) خێرو بەهرەی سەردانی نەخۆش. (٦٤٩٦ - ٦٥٠١)

### بَابٌ: فِي فَضْلِ عِيَادَةِ الْمَرْضَى

١٤٦٤- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا عَادَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَرْجِعَ». {الحديث: ٦٤٩٨ = ٦٥١٣ فم}.

ثەوبان (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ موسوڵمان دەچێ بۆ سەردانی برای موسوڵمانی نەخۆشی، بۆ هەواڵپرسینی، ئەوە دەچێت بۆ چنینو رنینی میوەی بەهەشت هەتا دەگەڕێتەوە!). لە كۆتایی گێڕانەوەی ژمارە (٦٤٩٩)دا دەفەرموێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! مەبەست لەم رنینی میوەیە چییە؟ فەرمووی: (یانی بەری باخی بەهەشت دەڕنێو ئەم كارە باشەی كەدەچێ بۆ سەردانی نەخۆش، دەبێ بەمایەی چوونە بەهەشتی). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٤٤، ژمارە: ٨٩٨}.

١٤٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: يَا ابْنَ آدَمَ مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِي، قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أَعُودُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلَانًا مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ لَوَجَدْتَنِي عِنْدَهُ؟ يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِي، قَالَ: يَا رَبِّ وَكَيْفَ أُطْعِمُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّهُ اسْتَطْعَمَكَ عَبْدِي فُلَانٌ فَلَمْ تُطْعِمْهُ، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ أَطْعَمْتَهُ، لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي، يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِي، قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أَسْقِيكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ: اسْتَسْقَاكَ عَبْدِي فُلَانٌ، فَلَمْ تَسْقِهِ، أَمَا إِنَّكَ لَوْ سَقَيْتَهُ وَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي». {الحديث: ٦٥٠١ = ٦٥١٦ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەرۆژی قیامەتدا خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد!

من نەخۆش بووم، کەچی تۆ نەهاتی بۆ سەردانم، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! تۆیێ کە خودای هەردوو جیهانی، ئیتر من چۆن چۆنی بێم بۆ سەردانت؟ خودا دەفەرموێ: تۆ دەزانی کەکاتی خۆی لەجیهانا، فیسارە بەندەی من نەخۆش بوو، بۆچی سەرت لێ نەدا، ئەدی نەتدەزانی ئەگەر سەرت لێ بدایەو سەرخۆشیت لێ بکردایە، لەو کاتەدا من لەوێ لەلای بووم، ئەی ئادەمیزاد! داوای نانو ئاوو خۆراکم لەتۆ کرد کەچی بەشت نەدام، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم تۆیێ کە خودای هەموو لایەکیو هەموو شتانی، ئیتر من چۆن چۆنی نانو ئاوت پێ بدەمو چ رادەیەکی ئەوەم دەکەوێ؟ دەفەرموێ: تۆ دەزانی کەکاتی خۆی لەجیهانا فیسارە بەندەم لە فیسارە رۆژدا، داوای نانو خواردەمەنی لێ کردیت کەچی بەشیت نەدا، ئەدی نەتدەزانی ئەگەر بەشیت بدایە ئێساکە پاداشی ئەوەت لەلای من هەبوو، ئەی ئادەمیزاد! من توونیم بوو، داوای ئاوم لێ کردی، کەچی تۆ بەشت نەدام، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! تۆیێ کە خودای هەمووانی من چ رادەم دەکەوێو چۆن چۆنی ئاو بدەم بەتۆ؟ دەفەرموێ: فیسارە بەندەی من لەجیهانا داوای ئاوی لێ کردیت، کەچی تۆ بەشیت پێ نەدا، ئەدیی ئەگەر ئەو رۆژە ئەو ئاوەت پێی بدایە، ئێستا پاداشی باشی ئەو چاکەیەت لەلای من بوو!). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٢٩٥٨} + {ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٣٧ چاپی دووەم، ژمارە: ٨٩٦}.

**١١٣٦) مەڵێ: خَبُثَتْ نَفْسِي : کەدەم کەنیوە: دەروونم چەپەڵ بووە: دڵم تێك هەڵ دێ: بەڵام لەباتی ئەوە بڵێن: لَقِسَتْ نَفْسِي: دڵم تێك دەچێ: دڵم بەیەکا دێ. (٥٨٣٩ - ٥٨٤١)**

**بَابٌ: لاَ تَقُولَنَّ خَبُثَتْ نَفْسِي**

١٤٦٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ خَبُثَتْ نَفْسِي، وَلَكِنْ لِيَقُلْ لَقِسَتْ نَفْسِي». {الحديث: ٥٨٣٩ = ٥٨٣٢ فم. بخاري. أدب: ٦١٨٠. أبو داود. أدب: ٩٧٨}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودو سڵاوی خودای گەورەو سەروەری لێ بێ) فەرمووی: (کاتێ دڵتان دێ بەیەکا، مەڵێن: خَبُثَتْ نَفْسِي: کەدەم

گەنیوە، بەڵام بڵێن: لَقِسَتْ نَفْسِی: دڵم تێك هەڵ دێ). {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٢٩، ژمارە: ١٧٣٩ + تاج/٥، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٥٤٦٩ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) مەبەستی ئەوەیە کە موسوڵمانان فێری قسەو گفتو لفتی شیرینو جوان بنو قسەو گوتەی ناشیرین واز لێ بێنن، لەکاتی گفتوگۆدا ناسكو بەنەزاکەت بن، دەنا (خَبُثَتْ نَفْسِی) لە عەرەبیدا، دەق بەواتای (لَقِسَتْ نَفْسِی)یە، بەڵام وشەی (خَبُث) وشەیەکی قێزەونە، بۆ نموونە، بەپێی ئەم فەرموودەیە، ئەم رستانەی دواوە لە کوردیدا، گەرچی رستەی یەکەم دەق بەواتای رستەی دووەمە، بەڵام یەکەمیان ناسکترە لە دووەمیان:

١- سەراو دەکا: پیسایی دەکا. ٢- لووتت بسڕە: چڵمەکەت بسڕە.

٣- ئینتەلای کردووە: ترخەی کردووە.

### ١١٣٧) گشت دەردێ دەرمانی هەیە. (٥٧٠٥ - ٥٧٣٢)

### بَابٌ: لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ

١٤٦٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: «لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ، فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ بَرَأَ بِإِذْنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ». {الحديث: ٧٠٥ = ٥٦٩٧ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (گشت دەردێ دەرمانی هەیە، جا هەرکاتێ دەرمانەکە دەردەکەی پێکا، یاخود هەرکاتێ دەرمانی دەردەکە دۆزرایەوەو پێی دەرمان کرا، ئیتر بە فەرمانی خودای گەورەو سەروەر، نەخۆشەکە چاك دەبێتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٢٩٦٣ ج/٤}.

### ١١٣٨) تا لەهاڵاوی دۆزەخە بەئاو فێنکی بکەنەوە. (٥٧٠٥ - ٥٧٣٢)

### بَابٌ: الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ فَأَبْرِدُوهَا بِالْمَاءِ

١٤٦٨- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّهَا كَانَتْ تُؤْتَى بِالْمَرْأَةِ الْمَوْعُوكَةِ فَتَدْعُو بِالْمَاءِ، فَتَصُبُّهُ فِي جَيْبِهَا، وَتَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «ابْرُدُوهَا

بِالْمَاءِ»، وَقَالَ: «إِنَّهَا مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ». {الحديث: ٥٧١٦ = ٥٧٠٧ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٧٩ = ٥٧٢٤ فتح الباري}:

دەستووری ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خودایان لێ بێ) وابوو، ژنێکی تاداریان دەهێنا بۆلای، لەکاتی تا لێ هاتنەکەدا، تا دۆعای بۆبکا، دەچوو ئاوی دەهێناو لە یەخەیەوە ئاوەکەی دەکرد بە باخەڵیدا بۆسەر لەشی، وە دەیگوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە پێمان کە تادار بە ئاو فێنك بکەینەوە!) وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (تا لەهاڵاوی دۆزەخە بەئاو فێنکی بکەنەوە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٢٩٩٧ ج/٤}.

### ١١٣٩) تا گوناه لادەبات. (٦٥٠٢ - ٦٥١٦)

### بَابٌ: الْحُمَّى تُذْهِبُ خَطَايَا

١٤٦٩- عَنْ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) دَخَلَ عَلَى أُمِّ السَّائِبِ، أَوْ أُمِّ الْمُسَيَّبِ، فَقَالَ: «مَا لَكِ يَا أُمَّ السَّائِبِ - أَوْ يَا أُمَّ الْمُسَيَّبِ - تُزَفْزِفِينَ»؟ قَالَتِ: الْحُمَّى، لاَ بَارَكَ اللَّهُ فِيهَا، فَقَالَ: «لاَ تَسُبِّى الْحُمَّى، فَإِنَّهَا تُذْهِبُ خَطَايَا بَنِى آدَمَ كَمَا يُذْهِبُ الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ». {الحديث: ٦٥١٥ = ٦٥٣٠ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای ئوم سائیب، یا بۆلای ئوم موسەییەب، فەرمووی: (ئەی ئوم سائیب! یا فەرمووی: (ئەی ئوم موسەییەب! ئەوە چیتە وا هەڵ دەچۆقیت؟ گوتی: تام لێ هاتووە، خودا لێی هەڵێپچێ‌و پیتی بەرێ بەحەوادا، فەرمووی: (جنێو بە تا مەدە، چونکە تا گوناهی ئادەمیزاد لادەبات وەك چۆن مووشە دەمە چڵك‌و ژەنگی ئاسن لادەبات). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٢٩٤١ ج/٤}.

### ١١٤٠) باسی پەرکەم‌و پاداشی باشی. (٦٥٠٢ - ٦٥١٦)

### بَابٌ: فِي الصَّرْعِ وَثَوَابِهِ

١٤٧٠- عَنْ عَطَاءُ بْنُ أَبِى رَبَاحٍ قَالَ: قَالَ لِى ابْنُ عَبَّاسٍ: أَلاَ أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: هَذِهِ الْمَرْأَةُ السَّوْدَاءُ، أَتَتِ النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَتْ:

إِنِّى أُصْرَعُ وَإِنِّى أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ لِى، قَالَ: «إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ، وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يُعَافِيَكِ»، قَالَتْ: أَصْبِرُ، قَالَتْ: فَإِنِّى أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ أَنْ لاَ أَتَكَشَّفَ، فَدَعَا لَهَا. {الحديث: ٦٥١٦ = ٦٥٣١فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٦٢ = ٥٦٥٢}:

عەتای كوڕی ئەبو ڕەباح (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: با ژنێكی بەهەشتیت پێ نیشان بدەم. گوتم: ئادەی بفەرموو، فەرمووی: ئەم ژنە ڕەشە هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیكرد: قوربان! من فێم لێ دێ و كاتێ پەركەمەكە دەمگرێ گیانم دەردەكەوێ، لەخودا بپاڕێرەوە بۆم كە چاكم بكاتەوە. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەگەر حەزدەكەی ددان بەخۆتا بگرەو ئۆقرە بگرەو بەهەشت بۆ تۆ، ئەگەر حەزیش دەكەی ئەوا لەخودا دەپاڕێمەوە بۆت كەخودا چاكت بكاتەوە!). ژنە ڕەشەكە فەرمووی: (باشە ئارام دەگرمو لەژێر باری خودادا صەبر دەگرم، بەڵام لەكاتی خوو لێهاتنەكەدا لەشم دەردەكەوێ، لەخودا بپاڕێرەوە بۆم كەئیتر لەمەودوا لەشم دەرنەكەوێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای ئەوەی بۆیكرد). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٢٩٤٣ چاپی چوارەم}.

## ١١٤١) پەڵووڵە بەرەی دڵی نەخۆش دەگرێ. (٥٧٠٥ - ٥٧٣٢)

## بَابٌ: التَّلْبِينَةُ مَجَمَّةٌ لِفُؤَادِ الْمَرِيضِ

١٤٧١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَنَّهَا كَانَتْ إِذَا مَاتَ الْمَيِّتُ مِنْ أَهْلِهَا، فَاجْتَمَعَ لِذَلِكَ النِّسَاءُ ثُمَّ تَفَرَّقْنَ إِلاَّ أَهْلَهَا وَخَاصَّتَهَا، أَمَرَتْ بِبُرْمَةٍ مِنْ تَلْبِينَةٍ، فَطُبِخَتْ، ثُمَّ صُنِعَ ثَرِيدٌ فَصُبَّتِ التَّلْبِينَةُ عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: كُلْنَ مِنْهَا، فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «التَّلْبِينَةُ مَجَمَّةٌ لِفُؤَادِ الْمَرِيضِ تُذْهِبُ بَعْضَ الْحُزْنِ». {الحديث: ٥٧٣٠ = ٥٧٢٣ فم. تجريد/٥/٨٥، رقم: ١٨١٢ = ٥٤١٧، ٥٦٨٩، ٥٦٩٠}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو یارو هاوەڵو هاوسەرانی بێ) كاتێ كەسێكی دەمرد، ژنان كە بەم بۆنەیەوە

لێی کۆدەبوونەوە، کاتێ کە بڵاوەیان لێ دەکردو بەس کەسوکارو دەستو پێوەندەکەی خۆی دەمانەوە، دەستووری دەدا، کەپرِ دیزەیێ پەڵوولەیان دەکردو دەیان کرد بەسەر تریتدا، ئەوسا عائیشە بەژنەکانی دەفەرموو: لەمە بخۆن، چونکە ئەمە بۆ خەم باشە، من بۆ خۆم بیستوومە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (پەڵووڵە بەری دڵی نەخۆش دەگرێو ناوسکی دەحەوێنێتەوەو خەمو خەفەتیش دەرِەوێنێتەوە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٣٠٠٣}.

## ١١٤٢) دەرمانکردن بە شەربەتی هەنگوین. (٥٧٠٥ – ٥٧٣٢)

## بَابٌ: التَّدَاوِي بِسقي العَسَلْ

١٤٧٢- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: إِنَّ أَخِي اسْتَطْلَقَ بَطْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «اسْقِهِ عَسَلاً»، فَسَقَاهُ، ثُمَّ جَاءَهُ، فَقَالَ: إِنِّي سَقَيْتُهُ عَسَلاً فَلَمْ يَزِدْهُ إِلاَّ اسْتِطْلاَقًا، فَقَالَ لَهُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ جَاءَ الرَّابِعَةَ، فَقَالَ: «اسْقِهِ عَسَلاً»، فَقَالَ: لَقَدْ سَقَيْتُهُ فَلَمْ يَزِدْهُ إِلاَّ اسْتِطْلاَقًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «صَدَقَ اللَّهُ، وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ»، فَسَقَاهُ فَبَرَأَ. {الحديث: ٥٧٣١ = ٥٧٢٤ فم. تجريد/٥/١٦٢، رقم: ١٨٧٢ = ٥٦٨٤، ٥٧١٦}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: برایەکم هەیە سکی دێشێ، لە گفتێکا: سکی دەچێ؟ فەرمووی: (هەنگوینی پێ بدە) ئەویش شەربەتی هەنگوینی داپێی، بەڵام بۆجاری دووەم هاتەوە بۆ خزمەتیو عەرزیکرد: من وەك تۆ فەرمووت شەربەتی هەنگوینم دەرخواردی براکەمدا، بەڵام ئەوەندەی تر رەوانی کرد، ئەویش تا سێجار هەر وایفەرموو، کە شەربەتی هەنگوینی پێ بدا، بۆ جاری چوارەم هاتەوەو گوتی: قوربان! هەنگوینی دەدەمێ، کەچی زیاتر سکی دەچێ؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {فِيهِ شِفَاءُ لِلنَّاسِ}: لە هەنگوینا شیفاو دەرمان هەیە بۆ مەردوم) کەواتە: ئەم فەرمایشتەی خودا راستە، بەڵام ئەوەی کەتۆ

هەنگوین دەدەی بە براکەتو سکی براکەت پێی چاك نابێ، ئەوە سکی براکەت درۆ دەکا، کەواتە: دیسان هەنگوینی پێ بدە، جا جارێ تریش هەنگوینی پێ دەدا، ئیتر سکی چاك دەبێتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٢٩٧٣ چاپی چوارەم}.

**١١٤٣) خۆ دەرمانکردن بە رەشکە.** (٥٧٠٥ - ٥٧٣٢)

**بَابٌ: التَدَوي بِالحَبَّةِ بِالشُونِيز**

١٤٧٣- عَنِ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِنَّ فِي الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ، إِلاَّ السَّامَ». وَالسَّامُ: الْمَوْتُ، وَالْحَبَّةُ السَّوْدَاءُ: الشُّونِيزُ. {الحديث: ٥٧٢٨ = ٥٧٢٠ فم. تجريد/٥/١٦٥، رقم: ١٨٧٣ = ٥٦٨٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)م بیست دەیفەرموو: (رەشکە دەرمانی هەموو دەردێکە، مەرگی لێ دەرچێ) عەرزیم کرد مەبەست لەمەرگ چییە؟ فەرمووی: مەبەست لەمەرگ مردنە، رەشکەش سیاوڵەیە). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٢٩٨٧}.

**١١٤٤) کەسێ لەسەر خورێنی خورمای عەجوە بخوات.** (٥٣٠٦ - ٥٣٠٩)

**بَابٌ: مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرَّهُ سُمٌّ وَلاَ سِحْرٌ**

١٤٧٤- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدًا يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سُمٌّ وَلاَ سِحْرٌ». {الحديث: ٥٣٠٦ = ٥٢٩٨ فم. تجريد/٥/٩٢، رقم: ١٨١٧ = ٥٤٤٥، ٥٧٦٨، ٥٧٦٩، ٥٧٧٩. أبو داود. طبّ: ٣٨٧٦}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەرکەسێ بەیانیان لەسەر خورێنی حەوت دەنك خورمای (عەجوە) بخوات، ئیتر ئەو رۆژە نە زەهرو نە جادوو زیانیان نابێ بۆی).

١٤٧٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ فِى عَجْوَةِ الْعَالِيَةِ شِفَاءً، أَوْ إِنَّهَا تِرْيَاقٌ أَوَّلَ الْبُكْرَةِ». {الحديث: ٥٣٠٩ = ٥٣٠٠ فم}:

**عائیشــه** (رەزای خـودای لێ بـێ) **فــەرمووی: پێغەمبــەر** (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) **دەفــەرمویٚ: (خورمای عەجوەی ئەلعالییە دەرمانە، بەڕاستی لەسەرەتای بەیانیدا، لەسەر ناشتا، وەك تریاق كاریگەرە).**

**ڕوونكردنەوە:**

**١- ڕاڤەكاران دەفەرموون: عەجوە جۆرە خورمایەكە حـەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بەدەستی خۆی ناشتوویەتی.**

**٢- ئەلعالییە كۆمەڵێ گوندو باخە، كەوان لەلای سـەرووی مەدینـەوە، نـزیكترین شوێنی ئەلعالییە سێ میلە، دوورترینی هەشت میلە.**

**٣- تریاق تێكەڵەیەكی دەرمانییە دەگیرێتەوە، چارەسەری ئەوانـەی پـێ دەكـرێ، كەزەهرو ژار كاری تێ كردوون، بەتایبەت ئەوانەی كەشت پێوەی داون.**

## ١١٤٥) دوومەڵانیش چەشنێكە لەگەزۆ، ئاوەكەی دەرمانە بۆچاو. (٥٣١٠ - ٥٣١٦)

## بَابٌ: الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ

١٤٧٦- عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ الَّذِى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى موسى، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ». {الحديث: ٥٣١٣ = ٥٣٠٤ فم. تجريد/٤، رقم: ١٦٣٢ = ٤٤٧٨، ٤٦٣٩، ٥٧٠٨}:

**ســەعیدی كـوڕی زەیـد** (رەزای خـودای لێ بـێ) **فــەرمووی: پێغەمبــەر** (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) **دەفەرمویٚ: (دوومەڵان لەچەشنی ئەو گەزۆیە كە خودای گەورەو سەروەر بارانی بۆ نەوەی ئیسرئیل، كە ناسراون بە بەنی ئیسرائیل، وە ئاوەكەی دەرمان (شیفا)یە بـۆ چاو). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٢٩٩٤ چ/٤ = چاپی چوارەم} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٦٨}.**

**ڕوونکردنەوە:**

واتــە: دوومــەڵانیش وەك ئــەو گەزۆیــەی کــە لەســاری ســینادا، لــەکاتی سەرگەردانییەکەی نـەوەی ئیسـرائیلدا، دەبـاری بۆیـان، وەك ئـەو لەخۆیـەوە بـەبێ کەسێ بیڕوێنێ خۆی دەڕوێ.

## ١١٤٦) تیمارکردن بە عوودی هیندی، واتە بە کوست. (٥٧٠٥ - ٥٧٣٢
## بَابٌ: التَدَّاوي بِالْعُودِ الْهِنْدِيِّ وهو الْكُسْتَ

١٤٧٧- عَنْ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ أُمَّ قَيْسِ بِنْتَ مِحْصَنٍ - وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ اللاَّتِى بَايَعْنَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَهِيَ أُخْتُ عُكَّاشَةَ بْنِ مِحْصَنٍ أَحَدُ بَنِى أَسَدِ بْنِ خُزَيْمَةَ، قَالَ أَخْبَرَتْنِى أَنَّهَا: أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِابْنٍ لَهَا لَمْ يَبْلُغْ أَنْ يَأْكُلَ الطَّعَامَ وَقَدْ أَعْلَقَتْ عَلَيْهِ مِنَ الْعُذْرَةِ (قَالَ يُونُسُ: أَعْلَقَتْ غَمَزَتْ فَهِىَ تَخَافُ أَنْ يَكُونَ بِهِ عُذْرَةٌ) قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «عَلاَمَهْ تَدْغَرْنَ أَوْلاَدَكُنَّ بِهَذَا الإِعْلاَقِ؟! عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ (يَعْنِى: الْكُسْتَ) فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ، مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ»، قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَخْبَرَتْنِى أَنَّ ابْنَهَا ذَاكَ بَالَ فِى حِجْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ عَلَى ثَوْبِهِ وَلَمْ يَغْسِلْهُ غَسْلاً. {الحديث: ٥٧٢٧ = ٥٧١٩ فـم. تجريد/٥/١٦٥، رقم: ١٨٧٤ = ٥٦٩٢، ٥٧١٣، ٥٧١٥، ٥٧١٨} + {تجريد/١/١٨٣، رقم: ١٦٢ = ٢٢٣، ٥٦٩٣ فتح الباری}.

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوود فەرمووی: ئوم قەیسی کچی میحصەن، کە خوشکی وەکاشەی کوڕی میحصەن بوو، کە پیاوێ بوو لە خێڵی بەنی ئەسەدی کوڕی خوزەیمە، کە ئوم قـەیس لـە کۆچبەرە پێشینەکان بوو، کە پەیمانیان دابوو بـە پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵەکانی بێ) عوبەیدوڵڵا فـەرمووی: ئـەم ئـوم قەیسـە هـەواڵی پێمدا، گـوتی: کوڕێکم هـەبوو، شیرە خۆرە بـوو، نانـە خـۆرە نـەبوو بـوو، دوومـەڵ لـەناو قوڕگی دەرچوو بوو، بـەزەبری پەنجـە دوومەڵەکـەم تەقانـد، وە بـردم بـۆ خزمـەتی

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆچی بەزەبری پەنجە دوومەڵی گەرووی مناڵتان دەتەقێننو ئازارێکی زۆریان دەدەن، بە عوودی هیندی {واتە: بە کوست: بە قوسط} کەرۆنێکە بۆ دەرمانی دەرد، دەرمانی بکەن، ئەم عوودی هیندی (دارە هیندی)یە، دەرمانی حەوت دەردە: بۆ دوومەڵی گەرووی مناڵ دەیتکێننە ناو کونە لووتی، وە ئاوەکەشی بۆ نەخۆشی پاڵوو دەخورێتەوە). عوبەیدولاّ فەرمووی: ئوم قەیس پێی فەرمووم: ئەو کورەم میزی کرد بەکۆشی پێغەمبەردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای ئاوی کردو پرژاندی لەشوێنی میزەکەی بە جلەکەیەوەو بەشۆردن نەیشۆرد). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ١٩٨٩ = چاپی چوارەم} + {تەجرید/٥، رقم: ١٨٧٥ = ٥٦٩٦}.

**روونکردنەوە:**

یەکەم: عوودی هیندیو کوستو قوسط یەك بابەتن نەوەوی دەفەرموێ: (وَالعُودُ الهندیُّ یقالُ لَهُ القُسْطُ والکُسْتُ). عوودی هیندی دارێکی پارچە پارچەیە، لە رەگی رووەکی قوسط دەکرێ، کە ئەم رووەکی قوسطە لە هیندو لە کیشمیرو لە وڵاتی چین دەڕوێ، بازرگانەکان جاران لەدەریاوە دەیانهێنا لەبەرئەوە پێیان دەوت: قوسطی بەحری. بەزۆر شێوە بەکاردەهێنرێ، وەك عەسقەلانی دەفەرموێ:

١ - طەلاء ئەوەیە کە دەکرێ بە مەڵهەمو بەزەیت چەوردەکرێو شوێنی ئازاری پێ دەهەنوورێ.

٢ - تەکمیدیش هەروەها.

٣ - شەراب، دەکوترێو دەکرێتە ناو هەنگوین، یا ناو ئاو، یا ناو شتی ترو دەخورێتەوە.

٤ - تەنطیلیش هەروەها.

٥ - سموط، لەزەیتا دەکوترێو دەتکێنرێتە ناو کونە لووت.

٦ - دهنیش هەروەها.

٧- تـەبخيريش دەسـووتێنرێو بـە دووكەڵەكـەی جێگـەی مەبەسـت قـانگ دەدرێ.

هەروەها دەفەرموێ: پزیشكەكان دەڵێن: قوسط: پەلە لە سوورِی مانگانـە دەكـاو میز خێرا دەكاو كرمـی نـاو گـەدە دەكـوژێو بـەری ژەهـر دەگـرێو بـۆ سێبەرِۆ بەكاردێو گەدە گەرم دەكاو ئارەزووی جووتبـوونی نێـرو مـێ پـتر دەكـاو پـڵو شـڵی لـەش بـە هـەنوین لادەبـا. بەشـێوەی گشـتی ئـەم دارە هیندییـە: بـۆ نەخۆشییەكانی سینگـو بۆ بەڵغەمو كۆكەو هەلامەتو بۆ باو دوومـەڵ سوودی زۆرە، بۆ هەڵدانەوەی ئاڵو كەوتنو بۆ هەوی ناو دەمو ناو گەروو سوودی هەیـە. ئەم عووی هیندییە: هەیەتی سپییە، هەیەتی رەشە، هەیەتی شیرینە، هەیـەتی تاڵە.

دووەم: عـودی هینـدی بۆنـدار (العـود الهنـدی العطـریّ) جیایـە لـەم عـودی هیندییـە، ئەمـە لـە بۆنـە پیرۆزەكانـا دەیسووتێنن تـا بـۆنی شوێنەكە خـۆش بكـا، لەچەشنی دەنكە شقارتەی درێژ وایە، وا لەناوپاكەتا.

سێیەم: (قسـط أظفـار) كـە پێشـی دەگـوترێ (كوسـت) هـەروەك پێـی دەگـوترێ (أَظْفَارُ الطيب) لێرەدا مەبەست ئـەم جـۆرەش نییـە، بـەڵكوو ئەمـە جـۆرە بـۆنێكی خۆشە، دەدرێ لـەو جێگانـەی لـەش كـە بۆنیـان ناخۆشـە، بـۆ لابردنـی بـۆ درِنو بـۆ ساردیی. {تەجرید/٥/١٦٧، ژمارە: ١٨٧٥}.

## ١١٤٧) دەرمانكردن لەلادەمەوە بەدەمی نەخۆشەوە. (٥٧٠٥ - ٥٧٣٢)

## بَابٌ: التَّدَاوِي بِاللَّدُود

١٤٧٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهـا) قَالَـتْ: لَـدَدْنَا رَسُولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ)، فِي مَرَضٍ، فَأَشَارَ أَنْ لاَ تَلُدُّونِي، فَقُلْنَا: كَرَاهِيَةُ الْمَرِيضِ لِلدَّوَاءِ، فَلَمَّا أَفَـاقَ قَـالَ: «لاَ يَبْقَى أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلاَّ لُدَّ، غَيْرُ الْعَبَّاسِ فَإِنَّهُ لَمْ يَشْـهَدْكُمْ». {الحـديث: ٥٧٢٥ = ٥٧١٧ فم. بخاری. مفازی: ٤٤٥٨، ٥٧٠٩، ٥٧١٠، ٥٧١١، ٦٦٨٦، ٦٨٩٧}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە نەخۆشینەکەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلادەمیەوە بەزۆر دەرمانمان دەکرد بەدەمیەوە، ئەویش کارەکەی ئێمەی بەدل نەبوو، ئاماژەی بۆدەکردین کەشتی وا نەکەین، ئێمەیش گوتمان: بۆیە وانیشان دەدا، چونکە نەخۆش حەزی لەدەرمان نییە، لەبەرئەوە بەگوێمان نەکردو بەزۆر لەلادەمیەوە دەرمانەکەمان کرد بەدەمیەوە!

بەڵام کەهۆشی هاتەوە فەرمووی: (ئەوە من جڵەوگیریم لێتان نەکرد، کە بەزۆر لەلاوە دەرمان مەکەن بەدەممەوە؟).

گوتمان: بۆیە بەگوێمان نەکردی، لەدڵی خۆمانا گوتمان: نەخۆش حەزی لەدەرمان نییە. فەرمووی: (دەبێ لە تۆڵەی ئەوەدا کەواتان لەمن کرد، ئەوەی لەم هۆدەیەدایە، لەبەر چاوی من بەزۆرو نابەدڵ، دەرمان بکرێ بە لادەمیانەوە یەکە یەکە، تەنیا عەبباس نەبێ، چونکە لەوکاتەدا ئەوتان لەگەڵ نەبوو).

لەتاجا ئەمەی پترە: تەنانەت لەبەر سوێندەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئوممولوئمنین مەیموونە، لەوکاتەدا بەڕۆژووش بوو، بەڵام دەرمانیان بەزۆر کرد بەلادەمیەوەو دەرخواردیان دا). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ٢٩٩٠ — ش/ت}.

## ١١٤٨) باسی کەڵەشاخگرو دەرمان کردنە ناو لووت. (٥٧٠٥ - ٥٧٣٢)

## بَابٌ: فِي الْحَجَّامِ وَالسَّعُوطِ

١٤٧٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) احْتَجَمَ، وَأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ وَاسْتَعَطَ. {الحديث: ٥٧١٣ = ٥٧٠٥فم. بخاری. إجارة: ٢٢٧٨، ٢٢٧٩، ٢١٠٣. تجريد/٣/٢٧، رقم: ٩٥٤ = ٢١٠٣، ١٨٣} + {تجريد/٥، رقم: ١٨٧٥ = ٥٦٩٦ + تجريد/٩٥٣ = ٢١٠٢}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەڵەشاخی لەخۆی گرتو بەخششی بەو پیاوەدا، کە کەڵەشاخەکەی لێی گرت، دیارە ئەگەر مزو هەقدەستی کەڵەشاخگر حەرام بوایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتی وای نەدەکرد/ کەبچێ بەخششێ بدا بەو کەسەی

كەڵەشاخی لێ گرتووە، وە بۆ خۆتیمارکردن دەرمانی دەتکاندە لووتی خۆی).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٤٦، ژمارە: ١٧٧٠ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١١٤٩) خۆ تیمارکردن بە کەڵەشاخگرتنو بەخۆ داخکردن. (٥٧٠٥ – ٥٧٣٢)

## بَابٌ: التَّدَاوِي بِالْحِجَامَةِ وَالْكَيِّ

١٤٨٠- عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ قَالَ: جَاءَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) فِي أَهْلِنَا، وَرَجُلٌ يَشْتَكِي خُرَاجًا بِهِ أَوْ جِرَاحًا، فَقَالَ: مَا تَشْتَكِي؟ قَالَ: خُرَاجٌ بِي قَدْ شَقَّ عَلَيَّ، فَقَالَ: يَا غُلَامُ ائْتِنِي بِحَجَّامٍ، فَقَالَ لَهُ: مَا تَصْنَعُ بِالْحَجَّامِ يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ؟ قَالَ: أُرِيدُ أَنْ أُعَلِّقَ فِيهِ مِحْجَمًا، قَالَ: وَاللَّهِ إِنَّ الذُّبَابَ لَيُصِيبُنِي، أَوْ يُصِيبُنِي الثَّوْبُ فَيُؤْذِينِي، وَيَشُقُّ عَلَيَّ! فَلَمَّا رَأَى تَبَرُّمَهُ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ خَيْرٌ فَفِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةٍ مِنْ عَسَلٍ أَوْ لَذْعَةٍ بِنَارٍ»، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَمَا أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِيَ»، قَالَ: فَجَاءَ بِحَجَّامٍ فَشَرَطَهُ، فَذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ. {الحديث: ٥٧٠٧ = ٥٦٩٩ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٧١ = ٥٦٨٠، ٥٦٨١}:

عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادە (رەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: جابیری کوڕی عەبدوڵا (رەزای خودایان لێ بێ) هات بۆ ماڵمان، پیاوێکی لێ بوو، سکاڵای بوو، لەدەستی کوانێ (واتە: لەدەست دوومەڵێکی تەڕ) یا سکاڵای بوو لەدەستی برینێ، جابیر پێی فەرموو: ئەوە چیتە، سکاڵات لەچی دەردێکە؟ پیاوەکە گوتی: کوانێ زۆر ئازارم دەدا، بەرگەی ئازارەکەی ناگرم!

جابیر فەرمووی بەکەسێ: ئادەی کوڕەکە! کەڵەشاخگرێکم بۆ بهێنە. پێی گوت: ئەی باوکی عەبدوڵڵا! کەڵەشاخگرت بۆچییە؟ جابیر فەرمووی: دەمەوێ کەڵەشاخی لێ بگرێ. پیاوەکە گوتی: ئەوە تۆ دەڵێی چی سوێندم بەخودا، مێشی پێوە بنیشێ ئێشم پێ دەگەیەنێ، تەنانەت جلەکەم بەری بکەوێ ئێش بەدڵم دەگەیەنێ، ئیتر چۆن دەتوانم کەڵەشاخی پێوە بنێمو کەڵەشاخی لێ بگرم؟ جا کاتێ ئیمامی جابیر (رەزای خودای لێ بێ) ئەم وەڕس بوونو بێزارییەی لێ بینی، لە کەڵەشاخگرتن، فەرمووی:

دەی من بۆخۆم بیستم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەگەر شتێ لەم دەرمانانەی ئێوە، خێریان تیادابێ) یا فەرمووی: (خێریان پێوە بێ، ئەوە لەم سێ شتەدا هەیە:

یەکەم: لەنەشتەری کەڵەشاخدا. دووەم: لەشەربەتی هەنگویندا.

سێیەم: لە داخکردن بەئاگر. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم، حەزناکەم کە خۆم داخ بکەم) عاصم فەرمووی: (جا کەڵەشاخگری هێنا، کەڵەشاخی لێ گرت، ئازارەکەی نەما). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٢٩٧٢ چ/٤ + زنجیرە: ٦٠، لاپەڕە: ٣٤١، ژمارە: ٢٩٧١ چ/٤}.

١٤٨١- عَنْ جَابِرٍ أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): اسْتَأْذَنَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي الْحِجَامَةِ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَبَا طَيْبَةَ أَنْ يَحْجُمَهَا، قَالَ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ أَخَاهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ أَوْ غُلامًا لَمْ يَحْتَلِمْ. {الحديث: ٥٧٠٨ = ٥٧٠٠فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێت) مۆڵەتی لە پێغەمبەر خواست، کە ڕێگەی بدات کەڵەشاخ لەخۆی بگرێ، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە ئەبو طەیبە کرد، کە کەڵەشاخی لێ بگرێ.

فەرمووی: وادەزانم کە جابیر فەرموو‌شی: ئەبو طەیبە برای شیریی ئوم سەلەمە بوو، خۆیی بوو پێی نامەحرەم نەبوو، یا فەرمووی: (ئەوکاتە ئەبو طەیبە کوڕێکی مێرد منداڵ بوو، هێشتا ڕەسیدە نەبوو بوو).

## ١١٥٠) دەرمانکردن بە بڕینی دەمارو بەداخکردن. (٥٧٠٥ - ٥٧٣٢)
## بَابٌ: التَّدَاوِي بِقَطْعِ الْعِرْقِ وَالْكَيِّ

١٤٨٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ طَبِيبًا، فَقَطَعَ مِنْهُ عِرْقًا، ثُمَّ كَوَاهُ عَلَيْهِ. {الحديث: ٥٧٠٩ = ٥٧٠١ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەغەزای خەندەقدا، تیرێ دای لە ڕەگی ژیانی باڵی ئوبەیی کوڕی کەعب، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پزیشکێکی نارد بۆ تیمارکردنی، پزیشکەکە دەمارێکی ئوبەیی بڕیو لەپاشا دەمی دەمارەکەی بەداخێکی سوورەوە کراو داخ کرد.

## ١١٥١) دەرمانکردنی دەمی زام بە داخکردن

## بَابٌ: التَدَّاوي لِلجِرَاحِ بِالكَيِّ

١٤٨٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رُمِيَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فِي أَكْحَلِهِ، قَالَ: فَحَسَمَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ بِمِشْقَصٍ، ثُمَّ وَرِمَتْ فَحَسَمَهُ الثَّانِيَةَ. {الحديث: ٥٧١٢ = ٥٧٠٤ فم. أبو داود. طب: ٣٨٦٤. تحفة الأشراف: ٢٧٣٩}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای ئەحزابا، کە ناسراوە بە غەزای خەندەق، تیرێ دای لە ڕەگی حەیاتی باڵی سەعدی کوڕی موعاذ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی خۆی بە پەیکانێکی پانکۆڵە، شوێنی برینەکەی داخ کرد، پاشان دەستی سەعد پەنەما، دووبارە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داخی کردەوە). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٤، ژمارە: ١١٥٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٢٩٧٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٣٤٦٧، ٣٤٦٨، ٣٤٦٩ + تاج/٤، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ٤٦٠٧، ٤٦١٠}.

## ١١٥٢) تیمارکردن بەمەی

## بَابٌ: التَدَّاوِي بِالخَمْرِ

بڕوانە: ژمارە (١٢٧٩) فەرموودەکەی وائیلی کوڕی حوجر (ڕەزای خودای لێ بێ) کە لەپێشەوە، لە زنجیرە (١٠٢١)دا ڕابورد.

**(پوختەی نامەی نەخۆشیو پزیشکی)**

١- سەردان لە نەخۆش ئەرکێکی پیرۆزی ئایینییە، وەك سەردانو دێنی خودای گەورە بکەی وایە.

٢- موسوڵمان لەکاتی قسەو ئاخاوتنو گوفتوگۆدا، دەبێ زمانی شیرین بێ، خۆی لە قسەو گوتەی رەشۆکیو بازاڕی بپارێزێ.

٣- هەموو دەردێ دەرمانی هەیە، لەپاش خۆ دەرمانکردن نزایش بکرێ باشە، گەلێ جار چاکبوونەوە بەسراوە بەهەردوو لاوە.

٤- خۆ تیمارکردن، بە کۆمەڵێ دەرمان، کە لەسەردەمی پێغەمبەردا باو بوونو کاریان پێکراوە، ئەگەر لەوان باشتر هەبوو دروستە بە باشترەکە خۆ تیماربکرێ.

٥- لەڕاستیدا، کۆمەڵێ دەرمانو چارەسەری زامو نەخۆشیو گرفتی دەروونیو جەستەیی، لەکۆندا هەبوون، لەسەردەمی پێغەمبەریشدا سوودیان لێ وەرگیراوە، وەك: کەڵەشاخ گرتنو خێن بەردانو خۆ داخکردنو زالوو بەکارهێنانو سینەمەکیو زەنجەفیلو ئەو شتانەی کە لەم نامەی پزیشکیدا لە پێشا رابووردن، وەك هەنگوینو رەشکەو فرنیو پەلۆولەو مەحەلەبیو دارە هیندیو دوومەلانو... تاد. ئەمانەو وێنەی ئەمانە لەشەرعا رێگەیان پێ دراوە، وە هەتا ئێستایش کەم تا زۆر، نیازمەندان بەکاریان دەهێنن، وە سوودیان لێ وەردەگرن، وە پزیشكو دوکتۆریش رێگەی شتی وا دەدەنو بگرە هەندێکیان گەشەیان کردووە، وەك کەڵەشاخو خوێن بەردانو بەکارهێنانی زالووی پزیشکی.

٦- وەك یاسایەکی سەرەکی گوتراوە: (هەرکاتێ باشتر هەبوو، کاربەو دەکرێ، باش تەرك دەکرێ!!).

دەی بەپێی ئەم یاسایە، ئێستا هەموو شتێ گۆڕاوە، وە ئەم رێنماییە پزیشکیانە، پەیوەندییان بە پەرستشو خوا پەرستیو عیبادەتەوە نییە، لەبەرئەوە دەتوانرێ خۆدەرمان کردنو خۆ چارەسەر کردن بەشێوەیەکی سەردەمانە بێ، نەك

بەم شێوانەی کە لەپەڕاوەکانی (الطِّبُّ النَّبَـوِی = پزیشکی سەردەمی پێغەمبەردا) ئاماژەیان بۆکراوە.

بگرە زۆرینەی ئەم بابەتی پزیشکییە لە روانگەی ئیسلامەوە، یەکێکە لەم سێ شتە:

١- بەپێی رۆژ داوو دەرمانی سەردەم بوون، پێغەمبەریش خەڵکەکەی هانداوە، کە خۆیان تیماربکەن‌و بەپێی توانا داوو دەرمانی رەوا بەکاربهێنن، کە لەبەردەستتا بوون‌و پزیشکان نواندوویانن بۆ خەڵك. ئەم جۆرەیان کارێکی ئاساییو باوێکی دامەزراوی ناو کۆمەڵگەی ئەو رۆژە بووە، پەیوەندی بە وەحی‌و پێغەمبەرییەوە نییە.

٢- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەرێگەی سرووش‌و نیگاوە قسەی لێکردوون، زۆرترینی ئەم جۆرەیان جۆرێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

٣- کۆمەڵێ بڕیار کە پەیوەندی بە پزیشك‌و کاری پزیشکەوە هەیە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٣- نامەی تاعوون

## كتابُ الطّاعون

{بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٢٩٤٥، ٢٩٤٦، ٢٩٤٧، ٢٩٤٨}.

**١١٥٣) تاعوون سزایەكی خودایيە، لەهەر شوێنێ بوو مەچن بۆ ئەوێ، لەشوێنێ كە ئێوەی لێ بوون تاعوون كەوتەوە لەوێ هەڵمەیەن.** (٥٧٣٣ - ٥٧٤٨)

**بَابٌ: في الطّاعون، وأنّهُ رِجْزٌ فَلاَ تَدْخُلوا عَلَيْهِ ولاَ تَخْرُجوا فِراراً مِنْهُ**

١٤٨٤- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنّهُ قَالَ: «إِنَّ هَذَا الْوَجَعَ أَوِ السَّقَمَ رِجْزٌ عُذِّبَ بِهِ بَعْضُ الأُمَمِ قَبْلَكُمْ ثُمَّ بَقِيَ بَعْدُ بِالأَرْضِ، فَيَذْهَبُ الْمَرَّةَ وَيَأْتِي الأُخْرَى، فَمَنْ سَمِعَ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ يَقْدَمَنَّ عَلَيْهِ، وَمَنْ وَقَعَ بِأَرْضٍ وَهُوَ بِهَا فَلاَ يُخْرِجَنَّهُ الْفِرَارُ مِنْهُ». {الحديث: ٥٧٣٤ = ٥٧٣١ فم. تجريد/٤/٧٢، رقم: ١٣٨٥ = ٣٤٧٣، ٥٧٢٨، ٦٩٧٤}:

پرسیاركرا لە ئوسامەی كوڕی زەید (رەزای خودایان لێ بێ) سەبارەت بە پەتای تاعوون، چیت لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بیستووە؟ فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم تاعوونە دەردێكی پیسە، خودای گەورە لەسەر شێوەی سزا ناردی بۆسەر بەرەیێ لەنەوەی ئیسرائیل، كە یەكێكن لە نەتەوەكانی پێش ئێوەی نەتەوەی ئیسلام، ئیتر لەپاش ئەوان ماكەكەی ما لەسەر زەوی، ناو بەناو نامێنێ‌و ناو بەناو پەیدا دەبێتەوە، جاوەك رێنمایيەكی پزیشكی: ئەگەر بیستتان كەوا تاعوون لەخاكێ داكەوتووە، ئەوا ئێوە لەخۆتانەوە، بەبێ پێویستی مەچن بۆسەری بۆئەوێ، كاتێكیش تاعوون لەشوێنێ پەیدا بوو، كەئێوە لەوێ بوون، ئەوە دەرمەچن لەوێ‌و لەدەستی هەڕامەكەن!). {تاج/٣/٣٢٤، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٢٩٤٧ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

١٤٨٥- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) خَرَجَ إِلَى الشَّامِ حَتَّى إِذَا كَانَ (بِسَرْغَ) لَقِيَهُ أَهْلُ الأَجْنَادِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ

وَأَصْحَابُهُ فَأَخْبَرُوهُ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ، قَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَالَ عُمَرُ: ادْعُ لِي الْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَاسْتَشَارَهُمْ وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ، فَاخْتَلَفُوا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَدْ خَرَجْتَ لأَمْرٍ وَلاَ نَرَى أَنْ تَرْجِعَ عَنْهُ، وَقَالَ: بَعْضُهُمْ: مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاسِ، وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَلاَ نَرَى أَنْ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ، قَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّى، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِيَ الأَنْصَارَ، فَدَعَوْتُهُمْ لَهُ، فَاسْتَشَارَهُمْ، فَسَلَكُوا سَبِيلَ الْمُهَاجِرِينَ، وَاخْتَلَفُوا كَاخْتِلاَفِهِمْ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّى، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي مَنْ كَانَ هَا هُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ، فَدَعَوْتُهُمْ فَلَمْ يَخْتَلِفْ عَلَيْهِ رَجُلاَنِ، فَقَالُوا: نَرَى أَنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ، وَلاَ تُقْدِمْهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ، فَنَادَى عُمَرُ بِالنَّاسِ: إِنِّى مُصْبِحٌ عَلَى ظَهْرٍ، فَأَصْبِحُوا عَلَيْهِ، فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ: أَفِرَارًا مِنْ قَدَرِ اللَّهِ؟ فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ! وَكَانَ عُمَرُ يَكْرَهُ خِلاَفَهُ، نَعَمْ نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللَّهِ إِلَى قَدَرِ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَتْ لَكَ إِبِلٌ فَهَبَطْتَ وَادِيًا لَهُ عِدْوَتَانِ إِحْدَاهُمَا خَصْبَةٌ، وَالأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الْخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ، وَإِنْ رَعَيْتَ الْجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ؟ قَالَ: فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ وَكَانَ مُتَغَيِّبًا فِي بَعْضِ حَاجَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِى مِنْ هَذَا عِلْمًا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ»، قَالَ: فَحَمِدَ اللَّهَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ثُمَّ انْصَرَفَ. {الحديث: ٥٧٤٥ = ٥٧٣٨ فم. بخاري. طبّ: ٤٧٢٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا کەوتەڕێو چوو بۆ شام، کە گەیشتە سەرغ لەوێ فەرماندارەکانی سەر گەورە شارەکانی شام هاتن بە پیریەوە، کە بریتی بوون لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحو هاوڕێکانی، عەرزیان کرد: کەوا تاعوون لەشام بڵاوبۆتەوە، جا عومەر فەرمووی بەمن: کۆچکارە پێشینەکانم بۆ بانگ بکە، منیش بانگم کردن بۆی، جا عومەر بۆ ئەم باسە راوێژی پێ کردن، بەڵام قسەیان یەك نەبوو، هەندێکیان دەیانگوت: تۆ هاتووی بۆ کارێکی وا، لەبەرئەوە بەباشی نازانین کە نەچیو بگەڕێیتەوە، هەندێکی تریان دەیان گوت: تۆ هاوەڵانی



پێغەمبەرو خەڵکی تریشت لەگەڵ دایە، لەبەرئەوە ئێمە بەباشی نازانین کە بیانبەیت بۆناو ئەم پەتایە، عومەریش فەرمووی: دەورم چۆڵ کەن.

ئینجا بەمنی فەرموو: یاریدەدەران (ئەنصار)ەکانم بۆ بانگکە. منیش بانگیانم کرد بۆی، راوێژی بەوانیش کرد، ئەوانیش وەك کۆچکاران (وەك: موهاجیرین) رایان یەك نەبوو، جا بەوانیشی فەرموو: دەورم چۆڵ کەن. ئینجا فەرمووی: کێ لێرەیە لە پیرە مێردانی قورەیش، ئەوانەی کە لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا کۆچیان کردووە، ئەوانەم بۆ بانگ کە، جا کەبانگم کردن بەیەك دەنگ سەرجەم گوتیان: ئێمە رامان وایە کە خەڵکەکە بگێڕیتەوە بۆ دواوەو نەیان بەیت بۆناو ئەم پەتایە، ئیتر عومەر جاڕیدا بەناو عەشاماتەکەدا: کە سبەینێ سەر لەبەیانی سواردەبین‌و دەگەڕێینەوە بۆ مەدینە. ئەبو عوبەیدەیش فەرمووی: ئایا لەدەستی چارەنووسی خودا هەڵدێین؟ عومەریش فەرمووی: ئەی ئەبو عوبەیدە! کاشکی کەسێکی تر ئەم قسەیەی تۆی بکردایە! عومەر حەزی نەدەکرد کەبێ دڵی ئەبو عوبەیدە بکا، ئینجا عومەر فەرمووی: بەڵێ لەدەست چارەنووسی خودا رادەکەین بۆلای چارەنووسی خودا خۆی! ئەدی پێم بڵێ: ئەگەر تۆ رانێ وشترت هەبێ‌و بچێتە ناو دۆڵێکەوە، کەدوو لاپاڵی هەبێ، لا پاڵێکیان بژوێن‌و ئەویتریان چەقەن‌و رەقەن بێ، جا ئەگەر ئەو رانە لە لاپاڵە بژوێنەکەدا بلەوەڕێنیت، هەر بەچارەنووسی خودا نییەو ئەگەر لەلاپاڵە رەقەنەکەشدا بیلەوەڕێنیت هەر بەچارەنووسی خودا نییە؟ فەرمووی: جا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هات بەسەر ئەم مشت‌و مڕەدا، کە لەوەپێش لەوێ نەبوو، چوو بوو بۆ هەندێ ئیشی خۆی، جا عەبدوڕەحمان هات فەرمووی: من شارەزاییم لەم باسە هەیە: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کاتێ بیستتان کەوا تاعوون لەجێگەیێ بڵاوبۆتەوە مەچن بۆلای بۆ ئەوێ‌و بەپێی خۆتان مەچن بە پیریەوە، کاتێ لەو جێگەیەش بڵاوبۆوە کەئێوە لەوێن، دەرمەچن لەوێ‌و لەدەستی رامەکەن).



فەرمووی: ئیتر عومەر سوپاس‌و ستایشی خودای کردو گەڕایەوە بۆ مەدینەو سەفەرەکەی بڕی‌و نەچوو بۆ شام. {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٦١، ژمارە: ١٧٩٢. چاپی دووەم + تاج/٣، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٢٩٤٨ ج/٤ = چاپی چوارەم}. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٨٢، ١٠٨٣ لەپێشەوە}.

**ڕوونکردنەوە:**

تاعوون پەتایەکی تایبەتە، زۆرینەی کات لەشێوەی دوومەڵی تەڕ لەناکاو بە مرۆڤ دەگاو، لە بنباڵ‌و ئانیشك‌و دەست‌و پەنجەو نەرمەی لووت‌و پشت گوێ‌و شوێنەکانی تری جەستە دەردێ‌و پەیدا دەبێ، جا تاعوون، چی دوومەڵ بێ‌و چی برین بێ، بەرە بەرە دەوروبەرەکەی یاڕەش دەبێتەوە، یا سوور دەبێتەوە، لە ڕەنگی سووری وەنەوشەیی، یا مەیلەو سەوز هەڵ دەگەڕێ‌و ئەنجا زەهرو ژارەکەی دەگاتە ناو دڵ‌و ناو گەدەو مرۆڤەکە تووشی دڵە تەپێ‌و ڕشانەوەو چاوە قووڵە دەبێ!

ڕەشەکەی کەم کەس لەدەستی ڕزگاری دەبێ، سوورەکەی لەهەموو جۆرەکانی تری باشترە. خوا بمانپارێزێ لێی.

تاعوون پەتایەکی زۆر زۆر مەترسیدارە، گەلێ جار شارێکی بەتەواوی وێران کردووە، کەسێ بەتاعوون بمرێ، پلەی شەهیدی بۆ هەیە. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٨٢ و ١٠٨٣ لە زنجیرە: ٨٥٩و زنجیرە: ٨٦٠ کە لەپێشەوە لەم پەڕاوە پیرۆزەدا ڕابورد}.



# ٤٤- نامەی بەدبینیو رەشبینیو تەنینەوەو تەشەنەکردنی نەخۆشی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر

## كتابُ الطِيرة وَالعَدْوَى

{بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ٣٧٤، زنجیرە: ٧٦، ٧٧، ٧٨. لە ژمارە: ٣٠٤١ وە هەتا ژمارە: ٣٠٥٤}.

**١١٥٤) ئەم جۆرە شتە ئەفسانەییە بایەخیان نییە: تەشەنەی نەخۆشی لەخۆیەوەو نوقلانەی خراپو نە مانگی موحەررەم دەبێ بە مانگی صەفەرو نە کوندەبوو بەدبوومە.** (٥٧٤٩ - ٥٧٥٨)

**بابٌ: لاَ عدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ وَلاَ صَفَرَ وَلاَ هَامَةَ**

١٤٨٦- عَنْ أَبِى سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): حِينَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لاَ عَدْوَى، وَلاَ صَفَرَ، وَلاَ هَامَةَ»، فَقَالَ أَعْرَابِىٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَا بَالُ الإِبِلِ تَكُونُ فِى الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ فَيَجِىءُ الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ فِيهَا فَيُجْرِبُهَا كُلَّهَا؟ قَالَ: «فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ»؟ وَفِي رِوَايَةٍ: «لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ وَلاَ صَفرَ وَلاَ هَامَةَ». {الحديث: ٥٧٤٩ = ٥٧٤٢ فم. بخاري. طب: ٥٧٥٤، ٥٧٧٠، ٥٧٧٣، ٥٧٧٥. أبو داود. طب: ٣٩١١} + {تجريد/٥/١٧٤، رقم: ١٨٧٧ = ٥٧١٥، ٥٧٠٧ فتح الباري}:

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان ئەفەرموێ: ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نە نەخۆشی تەنینەوە لەخۆیەوە هەیەو، نە مانگی موحەررەم دەبێ بەمانگی صەفەرو نەهامە هەیە). پیاوێکی عارەبی دەشتەکی عەرزیکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! وادەبێ کە وشترەکان لەناو لمی ئەو دەشتەدان، لەبەر گورجو گۆڵیو پاکیو پوختی دەڵێی ڕەوە ئاسکن، چ دەردیان نییە، کەچی کە وشترێکی لاوەکی گەڕیان تێکەڵاو دەبێ،

هەموویان گەڕدەکا، ئەی ئەوە بۆچی وایە؟ فەرمووی: (ئەی باشە نەخۆشییەکەو گەڕییەکە لەکێوە تەنییەوەو گەیشت بە یەکەم وشتر؟!). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٣٠٤٣}.

لە گێڕانەوەی ژمارە (٥٧٥٠)دا دەفەرموێ: (نە نەخۆشی تەنینەوە لەخۆیەوە هەیەو نە نوقلانەی خراپ هەیەو نەپێ ڕەشیو بەد قوومی هەیەو، نە پاشخستنی موحەررەم بۆ کاتی صەفەرو نە پێشخستنی صەفەر بۆ کاتی موحەررەم هەیەو، نەماری وا هەیە لەناو سکا، کە ناوی صەفەر بێو لەکاتی برسێتیدا ئازاری ئادەمیزاد بداو، لەویشەوە تەشەنە بکاو بتەنێتەوە بۆ یەکێکی ترو نە (هامە) هەیە، کە گوایە: ئێسکی کوژراو ببێ بە مەلێكو هەمیشە، لە دەوروبەری گۆڕەکەی بقێژێنێ هەتا کەسوکارەکەی تۆڵەی بستێنن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٣٠٤٥}.

ئەم گێڕانەوەی ژمارە (٥٧٥٠)ی موسلیمە لە تەجریدی بوخاریدا ئەمەی زیاترە: (لەگەڵ ئەوەیشە، ئەمە واتای وا نییە، کە پارێز لە نەخۆشی نەکرێ، بەڵکوو پارێزکردنو خۆپاراستن لە نەخۆشیو لەپەتاو دووربینی لەکاتی وادا، کاری باشو دروستە، دەی کەواتە هەتا بۆت دەکرێ پارێز لە گول بکە، کە گولی دەردێکی پیسە، زوو تەشەنە دەکا، وە لەبەر گول هەڵبێ، نەبادا تۆش تووشی ببی هەروەك چۆن لەترسا لەبەر شێر هەڵ دێیت ئاوا). {تجرید/١٧٣/٥، رقم: ١٨٧٧ = ٥٧٠٧، ٥٧١٧، ٥٧٥٧، ٥٧٧٠، ٥٧٧٣} + {تاج/٣، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٣٠٤٥ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- پوختەی قسەی ساخ لەم شوێنەدا ئەمەیە: (ئەفسانەو قسەی کۆنی سەردەمی نەزانی، بێ بایەخە، هەموو شت لە بنەڕەتدا بەدەست خودا خۆیەتی، بەڵام بەپێی یاسای ئاساییو بەپێی حاڵو عادەتو باوو بەراورد، دەبێ بۆ ئیحتیاطو دوور بینی، خۆت لەدەردو نەخۆشی بپارێزی، نەبادا تۆیش تووش ببی، بەتایبەتی لەنەخۆشی خراپ، کە بەئەزموون دەرکەوتووە، لەکاتی تێکلاویو خۆنەپارستندا، بەئاسانی لە یەکێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ یەکێ تر.

ئەمە پوختەی فەرمایشتی ئیمامی نەوەوییە لەم شوێنەدا.

٢- مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودانە دوو ئامانجی سەرەکین:

أ/ پووچکردنەوەی بیرو باوەڕی سەردەمی نەزانی، کە زۆرینەیان قسەی پڕو پووچو ئەفسانەن‌و لە راستیدا، هیچ بنەمایەکی دروست‌و راستیان نییە. وەك: کونە پەپوو شوومە، کەروێشك کولۆلە، قەلەڕەش بەد قوومە، رێوی بێت بە پیرتەوە، بایە قووش لەشوێنێ بخوێنێ کاول دەبێ، گیانی کوژراو دەبێ بە باڵندەیێ، لەدەوری گۆڕەکەی دەخوێنێ‌و بانگی کەسوکارەکەی دەکا، تا تۆڵەی بستێنن، زۆر بەیت‌و بالۆرەی تری لەم بابەتە.

## ١١٥٥) نەخۆش نەکرێتە ناو ساخەوە. (٥٧٤٩ - ٥٧٥٨)

## بَابٌ: لاَ يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ

١٤٨٧- عَنْ ابن شهاب: أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوف حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لاَ عَدْوَى»، وَيُحَدِّث أَنَّ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لاَ يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ». قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ بَعْدَ ذلك عَنْ قوله: «لاَ عَدْوَى» وَأَقَام على أن: «لاَ يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ»، قَالَ: فَقَالَ الْحَارِثُ بْنُ أَبِي ذُبَابٍ (وَهُوَ ابْنُ عَمِّ أَبِي هُرَيْرَةَ) قَدْ كُنْتُ أَسْمَعُكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ تُحَدِّثُنَا مَعَ هَذَا الْحَدِيثِ حَدِيثًا آخَرَ قَدْ سَكَتَّ عَنْهُ، كُنْتَ تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لاَ عَدْوَى»، فَأَبَى أَبُو هُرَيْرَةَ أَنْ يَعْرِفَ ذَلِكَ، وَقَالَ: «لاَ يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ». فَمَا رَآهُ الْحَارِثُ فِي ذَلِكَ حَتَّى غَضِبَ أَبُو هُرَيْرَةَ، فَرَطَنَ بِالْحَبَشِيَّةِ، فَقَالَ لِلْحَارِثِ: أَتَدْرِي مَاذَا قُلْتُ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِنِي قُلْتُ: أَبَيْتُ. قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: وَلَعَمْرِي لَقَدْ كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لاَ عَدْوَى»، فَلاَ أَدْرِي أَنَسِيَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَوْ نَسَخَ أَحَدُ الْقَوْلَيْنِ الآخَرَ. {الحديث: ٥٧٥٢ = ٥٧٤٥ فم} + {تجريد/٥/١٨٠، رقم: ١٨٨٨ = ٥٧٧١، ٥٧٧٤}:

ئیبنو شەهاب، کە ئیمامی زوهرییە (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوررەحمانی کوڕی عەوف گێڕایەوە بۆم، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

فەرموویەتی: (نەخۆشی تەنینەوە نییە) هەروەها گێڕایەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نەخۆش نەکرێتە ناو ساخەوە، نەبادا ساخەکانیش نەخۆش بکەون).

ئەبو سەلەمە فەرمووی: من ئەم دوو فەرموودەیەم لە ئەبو هورەیرە بیستووە، کە هەردووکیانی لە پێغەمبەرەوە دەگێڕایەوە بۆمان، کەچی لەدواییدا، ئەبو هورەیرە لەئاستی فەرموودەی یەکەم بێ دەنگ بوو، کە فەرموودەی (لاَ عَدْوَى: نەخۆشی تەنینەوە نییە)بەڵام بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەی فەرموودەی دووەم، کە فەرموودەی (لاَ يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ: نەخۆش نەکرێتە ناو ساخەوە).

فەرمووی: جا حاریثی کوڕی ئەبو ذوباب، کە ئامۆزای ئەبو هورەیرە بوو، کە کوڕی مامی بوو، ڕەخنەی لێ گرتو پێی گوت: ئەی ئەبو هورەیرە! تۆ جاران لەگەڵ ئەم فەرموودەیەدا فەرموودەیەکی تریشت بۆمان دەگێڕایەوە، کەمن ئەو فەرموودەی ترم بەگوێی خۆم لەتۆ بیستووە، کەتۆ ئێستا لەو فەرموودەی ترە بێ دەنگ بوویت، جاران دەشت فەرمووو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لاَ عَدْوَى: نەخۆشی تەنینەوە نییە).

ئەبو هورەیرە قاییل نەبوو کەشتی وای ئاگا لێ بێو پێی لێ بنێ، وە گوتیەوە هەر ئەمەیە: (لاَ يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ: نەخۆش نەکرێتە ناو ساخەوە). حاریثیش ئەم گوتەی ئەوی بەدروست نەزانیو بووبە دەمەقاڵەیان. هەتا ئەبو هورەیرە تووڕە بوو، بەزمانی حەبەشی گوڵماندیو بە حاریثی فەرموو: دەزانی گوتم چی؟ حاریث گوتی: نەو، ئەبو هورەیرە پێی فەرموو: هەر ئەوەیە کەپێتم گوت: قاییل نیم کەپێ لەشتی وابنێم!!

ئەبو سەلەمە بۆ پشتیوانی قسەکەی حاریث، فەرمووی: (بەگیانی خۆم، بەبێ گومان کە لەپێشا ئەبو هورەیرە ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە بۆمان کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لاَ عَدْوَى: نەخۆشی تەشەنە ناکات!) بەڵام نازانم کە ئەبو هورەیرە ئەمەی لەبیرچوو بوو، کەپێی لێ نەدەناو حاشای لێ دەکرد، یا قسەی دوایینی قسەی پێشینی نەسخ دەکاتەوە.

**روونكردنەوە:**

قسەی پێشین (لاَ عَدْوى)یە، قسەی دوایین (لاَ يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ)ە، چونكە قسەی پێشین، تەشەنەو تەنینەوەی دەردو نەخۆشی، نەفیو قەدەغە دەكا، بەڵام قسەی دوایین (لاَ يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ) تەشەنەو تەنینەوەی دەردو نەخۆشی دەسەلمێنیو دەیچەسپێنیو پێشگیری لەوە دەكا، كەساخ تێكلاو نەخۆش نەكریو نەخۆشیش تێكلاوی ساخ نەكری، نەبادا دەردەكە لە نەخۆشەكەوە بچی بۆ ساخەكە.

**١١٥٦) مەڵێن: لە فیسارە بورجا بارانمان بۆ باری.** (٥٧٤٩ - ٥٧٥٨)

**بَابٌ: وَلاَ نَوْءَ**

**١٤٨٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لاَ عَدْوَى، وَلاَ هَامَةَ، وَلاَ نَوْءَ، وَلاَ صَفَرَ». {الحديث: ٥٧٥٥ = ٥٧٤٨ فم}:**

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (نە نەخۆشی تەنینەوە هەیەو نە (هامە) هەیەو نە هیچ بەدەست ئەستێرەو بورج هەیەو نە مانگی سەفەر بەدبوومی هەیە). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٣٠٤١}.**

**١١٥٧) غوولی بیابان درۆیەو راست نییە.** (٥٧٤٩ - ٥٧٥٨)

**بَابٌ: لاَ غُوْلَ**

**١٤٨٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ عَدْوَى، وَلاَ طِيَرَةَ، وَلاَ غُولَ». {الحديث: ٥٧٥٦ = ٥٧٤٩ فم}:**

**جابیری كوڕی عەبدوڵڵا** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (نە نەخۆشی تەنینەوە لەخۆیەوە هەیە (چونكە لەڕاستیدا ئەو نەخۆشییە كە دەتەنێتەوە، لەمەوە بۆ ئەو بەپێی چارەنووسو فەرمانی خودایە) وە نە نۆقڵانەی خراپ هەیەو نەپێ رەشیو بەدقوومی هەیەو، نە حۆلی بیابان هەبوون (وجود)ی هەیە).**

**روونكردنەوە:**

جەماوەری زانایان دەفەرموون: حۆلی بیابان، لەباوەڕی ڕەشە خەڵكەكەدا، جۆرە شەیاتینییەك بووە، لە چۆڵو بیابانەكانا خۆی دەردەخست بۆ خەڵكو بەفرو فێڵ لەرێگە وێڵیان دەكا، هەتا بە فەتارەتیان دەباو لەناویان دەبا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم فەرموودەیەدا ئەوەی پووچ كردۆتەوەو دەفەرموێ: شتی وا بێ بایەخو بێ بنەمایە، بەهەرحاڵ لە {مغنی المحتاج}دا دەفەرموێ: {وَ أَنَّهُ (ای الأَذَانُ) يُشْرَعُ إِذَا تَغَوَّلَتِ الغِيلاَنُ: أي تَمَرَّدَتِ الجَانُّ، بِخَبَرٍ صحيحٍ وَرَدَ فِيهِ}.

جا بەپێی ئەم فەرموودەیەو ئەم فەرمایشتەی خەطیبی شەربینی لەكاتی ترس، لەجنۆكەو پەریو شەیاتینیدا، واباشە بانگ بدرێ.

**١١٥٨) خۆپاراستن لەكەسێ دووچاری نەخۆشی خراپ بووبێ.** (٥٧٨٣)

**بَابٌ: فِي اجْتِنَابُ المُبتَلى**

١٤٩٠- عَنْ الشَّرِيدِ قَالَ: كَانَ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ رَجُلٌ مَجْذُومٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّا قَدْ بَايَعْنَاكَ فَارْجِعْ». {الحديث: ٥٧٨٣ = ٥٧٧٦ فم}:

عەمری كوڕی شەرید فەرمووی: شەریدی باوكم فەرمووی: نوێنەرەكانی هۆزی ثەقیف كەهاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێكی گولیان تیابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەكێكی نارد بۆلای: (كەوا هەرلێرەوە، لەدوورەوە پەیمانم بەست لەگەڵ تۆ ئیتر بگەڕێرەوە بۆ وڵاتی خۆت!). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٣٠٤٦}.

**روونكردنەوە:**

شەریدی كوڕی سووەیدی ئەلثەقەفی (رەزای خودای لێ بێ) لە تائیف نیشتەجێ بوو، دەڵێن: لە بنەڕەتدا حەضرەمەوتییە. كۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، لەپیاوانی صەحیحی موسلیمو صەحیحی بوخارییە، چونكە بوخاری، لەوەوە بە تەعلیق فەرموودەی (لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ) دەگێڕێتەوە، ئەبو

نەعیم دەفەرموێ: ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی (بیعة الرضوان) بووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕێزلێنانی لە پاشكۆی خۆیەوە سواری كردووە، دەفەرموێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا، ژنێكمان بەردەباران (ڕەجم) كرد، كە لێ بووینەوە چووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). عەمری كوڕی دەگێڕێتەوە: كە باوكم شەرید فەرمووی: دەوری سەد شیعرم لە شیعرەكانی ئومەییەی كوڕی ئەبو صەلت خوێندەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە شیعرەكانیەوە وا دەردەكەوێ وەك موسوڵمان بووبێ وایە). ئومەییە فریای موسوڵمان بوون نەكەوتووە). {بڕوانە: ژمارە: ١٥٠٦ لەدواوە} + {تاج/٥، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٥٤٢٦}.

### ١١٥٩) نوقلانەی باش فرە باشە. (٥٧٥٩ - ٥٧٧٣)

### بَابٌ: فِي الْفَأْلُ الصَّالِحِ

١٤٩١- عَنْ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «لاَ طِيَرَةَ وَخَيْرُهَا الْفَأْلُ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْفَأْلُ؟ قَالَ: «الْكَلِمَةُ الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ». {الحديث: ٥٧٥٩ = ٥٧٥٢ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٨٥ = ٥٧٥٤، ٥٧٥٥ فتح الباري}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (نوقلانەی خراپ بایەخی نییە، باشترین نوقلانەیش نوخشە لێدانە!). گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! نوخشە لێدان وەكوو چی؟ فەرمووی: (وەك ئەوە دەتانەوێ كارێ بكەن لەكاتی نیازی كردنەكەیا، وشەیەكی باش بەرگوێتان بكەوێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٣٠٤٩}.

**ڕوونكردنەوە:**

بۆ نموونە: یەكێ بچێ بۆ حەج و عەمرە، لەكاتی باسكردنی ئەو سەفەرەدا، بەرگوێی بكەوێ كەسێ ئەم ئایەتە بخوێنێ:

{فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ} ئەوە جۆرە نوقلانەیەکی باشە لەخوداوە، نیشانەی ئەوەیە کە حەجو عەمرەکەی بەنسیب دەبێ. زۆر جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ ئەرکێکی دەسپارد بەیەکێ، ئەگەر ناوەکەی بەدڵی نەبوایە پێی ناخۆش بوو، بەوێنە: ئەگەر کارمەندێکی دابنایێ لەسەر کارێ، ناوی سەرکەوت بوایە پێی خۆش بوو، بەڵام ئەگەر ناوی ژێرکەوت بوایە پێی ناخۆش بوو. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٣٠٤٩ تا دوایی}.

## ١١٦٠) شوومیو پێ ڕەشی لەخانوو ژنو مایینندا. (٥٧٥٩ - ٥٧٧٣)

## بَابٌ: الشُّؤْمِ فِي الدَّارِ وَالْمَرْأَةِ وَالْفَرَسِ

١٤٩٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: «إِنْ يَكُنْ مِنَ الشُّؤْمِ شَيْءٌ حَقٌّ فَفِي الْفَرَسِ وَالْمَرْأَةِ وَالدَّارِ». {الحديث: ٥٧٦٨ = ٥٧٦١ فم}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: {ئەگەر شوومیو بەدبوومی هەبێو هەقو ڕاست بێ، ئەوا لەم سێ شتەدا هەیە:

یەکەم: مایینو ئەسپ.

دووەم: ژن.

سێیەم: خانوو. {تاج/٣، زنجیرە: ٧٧، ژمارە: ٣٠٤٧}.

١٤٩٣- عَنِ جَابِرًا يُخْبِرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ فَفِي الرَّبْعِ وَالْخَادِمِ وَالْفَرَسِ». {الحديث: ٥٧٧٣ = ٥٧٦٦ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێ ڕەشیو شوومی ئەگەر لەشتێکا هەبێ، ئەوا لەهەندێ لەم سێ شتەدا هەیە:

١ - لەخانووماڵدا.

٢ - لە نۆکەرو کارەکەردا.

٣ - لە ئەسپو مایینندا.

**ڕوونکردنەوە:**

نـــەوەوی (ڕەحمــەتی خــودای لێ بــێ) دەفـــەرموێ: (زاناکـــان لـــەم پرســـی پـــێ ڕەشـــیو بەدقوومییەدا، دوو بۆچوونی سەرەکییان هەیە:

بۆچوونی یەکـەم: کـە بـەڵێ لەڕاسـتیدا، ئـەم سـێ شـتە بـەپێی ئـەو سروشـتەی کەخودا دروسـتی کـردوون لەسـەری، لەهەنـدێ لەمانـەدا، لەسـەر رووی راسـتی، پـێ ڕەشـیو بـەدقوومی هەیـە، جـا هـەرکاتێ مـرۆڤ هەسـتی بەشـوومی یـەکێ لـەژنو ئەسپو ماینو نۆکەرو کارەکەر کرد، بەزوویی لێی جیابێتەوە، بـە تـەڵاق دان بـێ، بە فرۆشتن بێ، بەهەر شێوەیێ تر بێ).

بـە بۆچـوونی بەنـدەی وەرگێـڕیش، ڕووداوەکـانیش ئـەم بۆچـوونی یەکەمـە دووپات دەکەنەوە، گەرچی رای دووەمیش بێ بایەخ نییە.

بۆچوونی دووەم:

١- بەدبوونی ژن شتێکی سروشتی نییە، کەشتی وا لەچارەی نووسـرابێ، بـەڵکوو هەر ژنێ بیگری، کە ئەم کێشانەی هەبوو، ئەوە پێ ڕەشیو بەدقوومە: نەزۆك بـێو زمان درێژبێو بەدڕەوشت بێو هۆی دڵ لێپیسکردنی مێرد بێو ماڵکەر نەبێ.

٢- شوومی مـاڵو خـانوو، لەوەدایـە کـە تەنگەبـەر بـێو نـاخۆش بـێو دراوسـێی خەراپی زیانەخرۆی هەبێ.

٣- شوومی ئەسپو ماین لەوەدایە کە غەزای پێ نەکرێو بۆ کاری خێـر بـەکار نەهێنرێو بۆشتی دنیایی رووت بەکاربهێنرێ.

٤- شوومیو پـێ ڕەشـی کارەکـەرو نۆکـەریش لەوەدایـە: کـە خـووی خـراپ بـێو درۆزن بێو هەرچی پێ بسپێری بەجوانی نەیکا.

نـــەوەوی دەفـــەرموێ: زاناکـــان دەفـــەرموون، لـــەبارەی نەخۆشـــی تەنینـــەوەو نوقڵانـــەو پـــێ ڕەشـــیو ئـــەم جـۆرە شـتانەوە: کـۆگیرێ بـۆ ئـەم بابەتانـە، ئـەم سـێ ڕێبازەیە:

١- ئەوەی کەنابێ بەهۆی زیانی راستو دروست، دەبێ پشتگوێ بخرێو بایەخی پێ نەدرێ، وەك نوقلأنەی خراپ (طيرة).

٢- ئەوەی زیانی ئاشکرای هەیەو بە ئەزموون زیانی چەسپاوە، دەبێ پارێزی لێ بکرێ، وەك پەتاو تاعوونو گولیو ... تاد.

٣- ئەوەی کە جاروبار وا چەسپاوە زیانی هەبێ، ئەوە دروستە پارێزی لێ بکرێ، وەك: ژنو ماینو خانوو.

کورتو پوخت بەکوردی پەتی:

١- پارێزو خۆپاراستن لەنەخۆشی خراپو پەتاو شتی وا کارێ رەوایە.

٢- لەم جۆرە شتانەدا واباشە راوێژ بە پسپۆڕی ئەم بابەتانە بکرێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٤٥- نامەی کاهینیو کوڵەنانی

## كِتَابُ الكِهَانَةِ

{بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٣٠٥٥ هەتا ژمارە: ٣٠٦٢. هەروا بڕوانە: ریاض الصالِحين/٤، لاپەڕە: ٩٨، زنجیرە: ٣٠٣، ژمارە: ١٦٦٨}.

**١١٦١) ڕێگریی لەهاموشۆی کوڵە نانیو ئەوانەی لافی نهێنی (غەیب) زانی دەکەن.** (٥٧٧٤ - ٥٧٨٢) **(باب: النهي عَنْ إِتْيَانِ الْكُهَّانِ وَذِكر الخَطّ)**

بڕوانە ژمارەی (٣٣٣) فەرموودەکەی موعاوییەی کوڕی حکەمی سولەمی، کە لەنامەی نوێژدا رابورد.

**١١٦٢) باسی ئەوەی کە جنۆکە دەیفڕێنێ.** (٥٧٧٤ - ٥٧٨٢)

**بَابٌ: مَا تَخْطَفُهُ الْجِنّ**

١٤٩٤- عَنِ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: سَأَلَ أُنَاسٌ رَسُولَ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْكُهَّانِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَيْسُوا بِشَيْءٍ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ أَحْيَانًا الشَّيْءَ يَكُونُ حَقًّا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْجِنِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ قَرَّ الدَّجَاجَةِ فَيَخْلِطُونَ فِيهَا أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ كَذْبَةٍ». {الحديث: ٥٧٧٨ = ٥٧٧١ فم. بخاری. طب: ٥٧٦٢، ٦٢١٣، ٥٧٦١. تحفة الأشراف: ١٧٣٤٩}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چەن کەسێ لەبارەی کوڵە نانیو کاهینانەوە، کەلافی ئەوە لێ دەدەن، بەهۆی هەندێ هۆی تایبەتەوە، عیلمی غەیبیان هەیە، چەن کەسێ سەبارەت بەمانە، لە پێغەمبەریان پرسی، فەرمووی: (هیچ نین)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! جاروبار قسەکەیان ڕاست دەردەچێ، ئەی ئەوە چییە؟ فەرمووی: (ئەو قسە ڕاستەیان، هی ئەوەیە، کە جندۆکە گوێ هەڵ دەخەن بۆ گوفتوگۆی فریشتەکانو لەدەمی ئەوانی دەڕفێنن، ئینجا وەك مریشکێ بلێ قرت، ئاوا دەیچپێنن بەگوێی برادەرەکەیاندا، کە کوڵە نانییەکەیە، جا ئەوانیش لە

گیرفانی خۆیانەوە سەد درۆی تری پێوە دەنێن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٣٠٥٦، ج/٤} + {ریاض الصالحین/٤، زنجیرە: ٣٠٣، ژمارە: ١٦٦٨، چ/٢}.

**١١٦٣) ئەستێرە گرتنە جنۆکە، لەوکاتەدا کە گوێ هەڵ دەخەن بۆ دزینی هەواڵ لە فریشتەکان.** (٥٧٧٤ - ٥٧٨٢)

**بَابٌ: فِي رَمْيِ الشَّيَاطِينِ بِالنُّجُومِ عِنْدَ اسْتِرَاقِ السَّمْعِ**

١٤٩٥- عَنِ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَخْبَرَنِي رَجُلٌ وَفي رواية: رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَّهُمْ بَيْنَمَا هُمْ جُلُوسٌ لَيْلَةً مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رُمِيَ بِنَجْمٍ فَاسْتَنَارَ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَاذَا كُنْتُمْ تَقُولُونَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا رُمِيَ بِمِثْلِ هَذَا»؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، كُنَّا نَقُولُ: وُلِدَ اللَّيْلَةَ رَجُلٌ عَظِيمٌ، وَمَاتَ رَجُلٌ عَظِيمٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «فَإِنَّهَا لاَ يُرْمَى بِهَا لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنْ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى اسْمُهُ إِذَا قَضَى أَمْرًا سَبَّحَ حَمَلَةُ الْعَرْشِ، ثُمَّ سَبَّحَ أَهْلُ السَّمَاءِ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ حَتَّى يَبْلُغَ التَّسْبِيحُ أَهْلَ هَذِهِ السَّمَاءِ الدُّنْيَا، ثُمَّ قَالَ الَّذِينَ يَلُونَ حَمَلَةَ الْعَرْشِ لِحَمَلَةِ الْعَرْشِ: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ فَيُخْبِرُونَهُمْ مَاذَا قَالَ. قَالَ: فَيَسْتَخْبِرُ بَعْضُ أَهْلِ السَّمَوَاتِ بَعْضًا، حَتَّى يَبْلُغَ الْخَبَرُ هَذِهِ السَّمَاءَ الدُّنْيَا فَتَخْطَفُ الْجِنُّ السَّمْعَ، فَيَقْذِفُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ وَيُرْمَوْنَ بِهِ، فَمَا جَاءُوا بِهِ عَلَى وَجْهِهِ فَهُوَ حَقٌّ، وَلَكِنَّهُمْ يَقْرِفُونَ فِيهِ وَيَزِيدُونَ». {الحديث: ٥٧٨٠ = ٥٧٧٣ فم}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی یاریدەدەران (واتە: ئەنصار) لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیگێڕامەوە فەرمووی: شەوێ لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووین، لەوکاتەدا ئەستێرەیێ کشاو شەوقی دایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: لەسەردەمی نەزانیدا ئەگەر ئەستێرە بکشایە دەتانگوت چییە؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتر دەزانن، ئێمە دەمانگوت: ئەم شەو پیاوێکی گەورە لەدایك دەبێ، یا پیاوێکی گەورە دەمرێ! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو ئەستێرەیە کە دەکشێ لەبەرئەوە نییە کە یەکێ دەمرێ، یا یەکێ لەدایك دەبێ، بەڵام پەروەردگارمان (ناوی پیرۆزی هەمیشە هەر بەرزو بڵند بێ) کاتێ کە بڕیاری کارێ دەدا دەست بەجێ هەڵگرانی

تـەختو بارەگـای خوداوەنـدیی (حەمەلەتولعـەرش) دەسـت دەکـەن بـە تەسـبیحات کردن بۆ خوداو لەشکۆو گەورەیی ئەو کردگارە مەزنو گەورەیـە، دێنـە جومبـوشو ستایشو سوپاسی دەکەن ئینجا خەڵکی ئاسمان (کەوان لەخوار ئەوانـەوە، ئـەوانیش دەست دەکەن بە تەسبیحات کردن بۆ خودا، ئیتر دەستە لەدوا دەسـتەو چـین لـەدوا چین، دەسـت دەکـەن بـە تەسـبیحات کـردن، هـەتا دەنگـی تەسـبیحات کـردن دەگـا بەخەڵکی ئاسمانی هـەرە خـواروو، کـە ئـەم ئاسمانـەی ئێمەیـە، ئینجا ئەوانـەی کـە لــەخوار فریشــتە هــەڵگرەکانی تــەختو بارەگــای خوداوەندییــەوەن بەفریشــتە هەڵگرەکانی تەختو بارەگا دەڵێن: ئەوە پەروەردگاری ئێوە چی فەرمووە؟ ئـەوانیش چـی فـەرموو بـوو بـەوانی دەڵـێن جـا یـەك لەدوایـەكو دەسـتە بەدەسـتە خـەڵکی ئاسمانـەکان هـەواڵ لەیـەکتری دەپرسـن تـا سـەرەنجام ئـەو هەواڵـە دەگـا بـە خـەڵکی ئاسمانی هەرە خواروو، ئیتر لەوێ جنۆکە گوێ هەڵ دەخەن تا ئەو هەواڵە بدزن، لە خەڵکی ئاسمانی خواروو، وە بیفرێنن بۆ کۆڵە نانیو کاهینەکانی دۆستیان، جـا لـەم کاتەدا فریشتەکان ئەو ئەستێرەیان تێ دەگرن، جا هەر قسەو هەواڵێ کە بەشـێوەی خـۆی دەیهێـنن ئـەوە راسـتو دروسـتە، بـەڵام خۆشـیان درۆو دەلەسـەی تـری پێـوە دەنێنو لێی زیاد دەکەن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٣٠٥٧ چ/٤}.

**١١٦٤) کەسێ بچێ بۆلای فاڵچی، یەك نوێژی گیرا نابێ. (٥٧٧٤ - ٥٧٨٢)**
**بَابٌ: مَنْ أَتَى عَرَّافًا لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ**

١٤٩٦- عَنْ صَفِيَّةَ (هي بنت أبي عبيد) عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً».

كِتَابُ الحيَّات وَغيرهَا. {الحديث: ٥٧٨٢ = ٥٧٧٥ فم}:

صــەفییەی کچــی ئــەبو عوبەیــد، فــەرمووی: لەهەنــدێ لــە هاوســەرەکانی پێغەمبـەرەوە، لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (ئـەوەی بـڕوا بـۆلای فاڵچیو لەبارەی شتێکەوە پرسیاری لێ بکاو بەختی لەلا بگرێتەوە، ئەوە نوێژی چل شەوی گیرا نابێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٣٠٥٩ چ/٤}.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٤٦- نامەی مارو جانەوەرانی تر
## كِتَابُ الحَيَّاتِ وَغَيْرِهَا

### ١١٦٥) جڵەوگیریی لەکوشتنی ماری ماڵی. (٥٧٨٤ - ٥٨٠٢)
### بَابٌ: النَّهي عَنْ ذَوَاتِ البُيُوت

١٤٩٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَأْمُرُ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ يَقُولُ: «اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ وَالْكِلاَبَ، وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالأَبْتَرَ، فَإِنَّهُمَا يَلْتَمِسَانِ الْبَصَرَ، وَيَسْتَسْقِطَانِ الْحَبَالَى». قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَنُرَى ذَلِكَ مِنْ سُمَّيْهِمَا وَاللَّهُ أَعْلَمُ. قَالَ سَالِمٌ: قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: فَلَبِثْتُ لاَ أَتْرُكُ حَيَّةً أَرَاهَا إِلاَّ قَتَلْتُهَا، فَبَيْنَا أَنَا أُطَارِدُ حَيَّةً يَوْمًا مِنْ ذَوَاتِ الْبُيُوتِ مَرَّ بِي زَيْدُ بْنُ الْخَطَّابِ، أَوْ أَبُو لُبَابَةَ، وَأَنَا أُطَارِدُهَا، فَقَالَ: مَهْلاً يَا عَبْدَ اللَّهِ! فَقُلْتُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَمَرَ بِقَتْلِهِنَّ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدْ نَهَى عَنْ ذَوَاتِ الْبُيُوتِ. {الحديث: ٥٧٨٧ = ٥٧٨٠فم. تجريد/٣، رقم: ١٣٢٩ = ٣٢٩٧، ٣٣١٠، ٣٣١٢، ٤٠١٦، ٤٠١٧. أبو داود. أدب: ٥٢٥٢. تحفة الأشراف: ١٢١٤٧}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست، لەسەر دوانگە وتاری دەدا، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (گشت ماری بکوژن، هەروەها گشت سەگێ بکوژن، بەتایبەتی ئەو چەشنە مارانەی کەدوو هێڵی رەش، وەك هێڵی پەلکە خورما وا بەسەر پشتیانەوەو هەروا هەموو کوڵە وەیبابێ بکوژن، چونکە ئەم دوو جۆرە مارە، ئاوی چاو دەبەنو سك لەباری ژنی دووگیان دەبەن، ئەوەندە رەزایان تاڵەو ئێسکیان قورسو گرانەو رەزایان بێ رەزایە، تەنانەت بە چاوپێکەوتنینان ئاوی چاو دادێو کورپەلە لەباردەچێ!).

زوهری (کە ئەم فەرموودەیە، لە سالمی کوڕی عەبدوڵلاوە، لە ئیبنو عومەرە، دەگێڕێتەوە) دەفەرموێ: وادەزانم کە ئەم سك لەبارچوونو ئاوی چاو بردنە، لە کاریگەریی زەهری ئەم دوو جۆرە مارانەوەیە، وە خودا بۆخۆی باشتری لێ دەزانێ!.

سالم دەفەرموێ: عەبدوڵلای کوڕی عومەر فەرمووی: ئیتر کە ئەمەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیست، هەر مارێکم دەبینی بوارەم نەدەدا، دەمکوشت، جارێ مارێکم راودەنا تا بیکوژم، لەو چەشنە مارانە بوو، کە پێیان دەگوترێ ماریماڵی ناو ماڵ، لەو کاتەدا زەیدی کوڕی خەطاب، یا فەرمووی: ئەبو لوبابە بانگی لێ کردم: هێواش ئەی عەبدوڵلا! مەیکوژە. گوتم: بۆچی؟ خۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە بەکوژتنی مار. فەرمووی: ئاخر لەوەدوا، کوشتنی ماری ناو ماڵی قەدەغە کردووە، کە بەو مارانە دەڵێن: (عَوَامِرُ الْبُيُوتِ: خێوی ناو ماڵ، نەبادا جنۆکەی ماڵی موسوڵمان بن). {تاج/٣، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٢٥٨٤ ج/٤}.

## ١١٦٦) ماری ماڵی ناو ماڵ تا سێجار هەڕەشەی لێ دەکرێ. (٥٧٨٤ - ٥٨٠٢)

## بَابٌ: إِيْذَانِ الْعَوَامِرْ ثَلاَثاً

١٤٩٨- عَنْ أَبِي السَّائِبِ مَوْلَى هِشَامِ بْنِ زُهْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ فِى بَيْتِهِ، قَالَ: فَوَجَدْتُهُ يُصَلِّى، فَجَلَسْتُ أَنْتَظِرُهُ حَتَّى يَقْضِىَ صَلاَتَهُ، فَسَمِعْتُ تَحْرِيكًا فِى عَرَاجِينَ فِى نَاحِيَةِ الْبَيْتِ، فَالْتَفَتُّ، فَإِذَا حَيَّةٌ، فَوَثَبْتُ لأَقْتُلَهَا، فَأَشَارَ إِلَىَّ أَنِ اجْلِسْ، فَجَلَسْتُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَشَارَ إِلَى بَيْتٍ فِى الدَّارِ، فَقَالَ: أَتَرَى هَذَا الْبَيْتَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: كَانَ فِيهِ فَتًى مِنَّا حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسٍ قَالَ: فَخَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْخَنْدَقِ، فَكَانَ ذَلِكَ الْفَتَى يَسْتَأْذِنُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِأَنْصَافِ النَّهَارِ فَيَرْجِعُ إِلَى أَهْلِهِ، فَاسْتَأْذَنَهُ يَوْمًا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «خُذْ عَلَيْكَ سِلاَحَكَ، فَإِنِّى أَخْشَى عَلَيْكَ قُرَيْظَةَ»، فَأَخَذَ الرَّجُلُ سِلاَحَهُ، ثُمَّ رَجَعَ، فَإِذَا امْرَأَتُهُ بَيْنَ الْبَابَيْنِ قَائِمَةً، فَأَهْوَى إِلَيْهَا الرُّمْحَ لِيَطْعُنَهَا بِهِ - وَأَصَابَتْهُ غَيْرَةٌ - فَقَالَتْ لَهُ: اكْفُفْ عَلَيْكَ رُمْحَكَ، وَادْخُلِ الْبَيْتَ حَتَّى تَنْظُرَ مَا الَّذِى أَخْرَجَنِى، فَدَخَلَ، فَإِذَا بِحَيَّةٍ عَظِيمَةٍ مُنْطَوِيَةٍ عَلَى الْفِرَاشِ، فَأَهْوَى إِلَيْهَا بِالرُّمْحِ فَانْتَظَمَهَا بِهِ، ثُمَّ خَرَجَ فَرَكَزَهُ فِى الدَّارِ، فَاضْطَرَبَتْ عَلَيْهِ، فَمَا يُدْرَى أَيُّهُمَا كَانَ أَسْرَعَ مَوْتًا الْحَيَّةُ أَمِ الْفَتَى؟ قَالَ: فَجِئْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ، وَقُلْنَا: ادْعُ اللَّهَ يُحْيِيهِ لَنَا، فَقَالَ:

«اسْتَغْفِرُوا لِصَاحِبِكُمْ»، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ بِالْمَدِينَةِ جِنًّا قَدْ أَسْلَمُوا، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهُمْ شَيْئًا، فَآذِنُوهُ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنْ بَدَا لَكُمْ بَعْدَ ذَلِكَ فَاقْتُلُوهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ». {الحديث: ٥٨٠٠ = ٥٧٩٣ فم}:

ئەبو سائیب بەندەی ئازادكراوی هشامی كوڕی زوهرە (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەبو سەعیدی خودری لەماڵەوەی بوو، چووم بۆلای، روانیم وا نوێژ دەكا، منیش دانیشتم چاوەڕوانیم كرد هەتا نوێژەكەی تەواو دەكا، كەچی لەو دەمەدا، لەناو كۆمەڵێ داركی بۆڵە خورمادا، دەنگی خشە خشێك دەهات، لەناو قوژبنێكی ماڵەكەدا، كە ئاورم دایەوە، دەڕوانم وا مارێكە، منیش راپەڕیم كە بیكوژم، كەچی ئەبو سەعید، لەناو نوێژەكەدا ئاماژەی بۆم كرد، كەنەكەی دانیشە، مەیكوژە، منیش دانیشتمەوە. كە لەنوێژەكەی بوویەوە، ئاماژەی كرد بۆ هۆدەیە لەناو خانووەكەداو فەرمووی: ئەم هۆدەیە دەبینی؟ گوتم: بەڵێ بۆچی؟ فەرمووی: لاوێكی لەئێمە تیادابوو، تازە زاوا بوو، جا لەغەزای خەندەقا لەخزمەت پێغەمبەردا دەرچووین بۆ ئەم غەزایە، جا ئەو لاوە رۆژانە، لەكاتی نیوەڕۆدا، مۆڵەتی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەردەگرت و دەگەڕایەوە بۆلای خێزانەكەی، رۆژێ كە داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (چەكەكەت لەگەڵ خۆت ببە، چونكە من مەترسی ئەوەم هەیە، كە جوولەكەكانی بەنی قوڕەیظە، لەرێگەدەست درێژیت لێ بكەن). جا پیاوەكەیش چەكەكەی لەگەڵ خۆی برد، كە دەچێتەوە بۆ ماڵەوە، دەڕوانێ وا ژنەكەی لەنێوانی هەردوو دەرگاكەدا راوەستاوە، لاوەكەیش بەتەنگەوە بوونی ناموس دەیكرێ و، رمەكەی لێ بەرزدەكاتەوە كە پیادا بماڵێ، ژنەكەی پێی دەڵێ: (تۆ جارێ رمەكەت لابەو بچۆرە ژوورەوە، هەتا بەچاوی خۆت ببینی كەمن لەترسی چی هۆدەكەم چۆڵ كردووە). كە لاوەكە دەچێتە ژوورەوە دەڕوانێ وا مارێكی حەفیانی گەورە خۆی ئاڵاندووە لە نوێنەكەیانەوە، ئەویش رمەكەی پیاداو تێی چەقاندو وەك ماسی بدەی لەشیش ئاوا دای لەرمەكەی و هێنایە دەرەوەو لە حەوشەكەدا

دایچەقاند، کەچی لەپڕ مارەکە وەك شارە زەردەواڵە لێی ئاڵۆسکا، کەس نەیزانی کامیان لەپێشدا مردن: مارەکە، یا لاوەکە؟

ئەبو مووسا فەرمووی: جا چووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە رووداوەکەمان گێڕایەوە بۆی، وە عەرزمان کرد: لەخودا داوا بکە کە خودا ئەم لاوە زیندوو بکاتەوە بۆمان. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (داوای لێبووردن و لێخۆش بوون لەخودا بکەن بۆ ئەم هاوڕێ مردووەتان!).

لەپاشا فەرمووی: (لەناو شاری مەدینەدا، هۆزی جنۆکەو شەیاتینی نیشتەجێن، هەیانە ئیسلام بوون، جا ئەگەر دنیابوو شتێ لەوانەتان بینی، یەکسەر هەڵمەکوتنە سەریان، لەپێشا هەتا سێ جار کە دەیانبینن، ئاگاداریان بکەنەوەو قاویان بدەن، ئیتر لەوەدوا، لەپاش ئەو سێجارە ئەگەر بینیتانەوە بیکوژن، چونکە ئەوە شەیتانە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٢٥٨٤ ج/٤}.

### ١١٦٧) باسی کوشتنی مار. (٥٧٨٤ - ٥٨٠٢)

### بَابٌ: قَتَلَ الحَيَّاتْ

١٤٩٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَارٍ وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ (وَالْمُرْسَلاَتِ عُرْفًا) فَنَحْنُ نَأْخُذُهَا مِنْ فِيهِ رَطْبَةً إِذْ خَرَجَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ فَقَالَ: «اقْتُلُوهَا»، فَابْتَدَرْنَاهَا لِنَقْتُلَهَا، فَسَبَقَتْنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَقَاهَا اللَّهُ شَرَّكُمْ كَمَا وَقَاكُمْ شَرَّهَا». {الحديث: ٥٧٩٦ = ٥٧٨٩ فم. تجريد/٢/٢٤١، رقم: ٨٤١ = ١٨٣٠، ٣٣١٧، ٤٩٣١، ٤٩٣٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەشەوی عەرەفەدا، لەخاکی مینادا، لە ئەشکەوتێکا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا، سوورەتی (وَالْمُرْسَلاَتِ)ی هات بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی ئەم سوورەتەی بەقەدرو ڕێزەوە دەخوێندەوەو منیش وشە بەوشەو ئایەت بەئایەت، لەدەمی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وەرم دەگرت و لەبەرم دەکرد، جا لەمکاتەدا کە

هێشتا سوورەتەکە بەسەر زاری پێغەمبەرەوە بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) وەدەمی پیرۆزی پێی تەڕو پاراو بوو، لەپڕ لەناکاو، مارێ دەرپەڕی‌و پەلاماری داین!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی بیکوژن! بەڵام مارەکە دەرباز بوو ڕۆیشت، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەم ئەو قوتاری بوو لەچنگی ئێوەو هەم ئێوە قوتارتان بوو لەچنگی ئەو!). {تاج/٤، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٤١٩٩ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

لەپەڕاوی ڕاڤەکانا دەفەرموون: (جنۆکەو پەری‌و شەیاتینی، خودای گەورە توانای ئەوەی پێیان داوە، کە شکل‌و شێوەی خۆیان بگۆڕن‌و بچنە شێوەو شکڵ‌و بیچمی شتی ترەوە، جاری واهەیە لەشێوەی مارێکا خۆیان نیشان دەدەن، یا لەشکڵی دووپشکێکا دەردەکەون، یا لەوێنەی پشیلەیەکا خۆی پیشان دەدا، یا لەهەر شێوەیەکی تردا، خۆیان دەنوێنن! تەنانەت دەتوانن بچنە کلێشەی مرۆڤەوە!).

جا پاش ئەمە نەوەوی دەفەرموێ:

١- ئەم ئاگاداری‌و هەڕەشەیە، کە لەجنۆکەی ناو ماڵ دەکرێ، تا سێ‌جار، بەس بۆشاری مەدینە وایە، لەشوێنانی تر، هەموو مارێ بەبێ هۆشیاری پێدان‌و هەڕەشە کردن لێی دەکوژرێ.

٢- مارو دووپشك، بەبێ بوارەدان، لەدەشت‌و دەر دەکوژرێن. نەوەوی دەفەرموێ: ئیمامی مالیك دەفەرموێ: بەبێ مەرج‌و قەید ماری ناو مزگەوت دەکوژرێ.

٣- شێوەی هەڕەشەکە ئاوایە: (سوێندتان دەدەم بەو پەیمانەی کە سولەیمانی کوڕی داوود لێی وەرگرتوون، کە ئازارمان مەدەن‌و مەیەنە بەرچاومان!). ئیمامی مالیك دەفەرموێ: (ئەوەندە بەسە کەبڵێ: (بەپشتی خودا، بەحەقی ڕۆژی قیامەت تەنگتان پێ هەڵ دەچنم، کە مەیەنە بەرچاومان‌و ئازارمان مەدەن!).

## ١١٦٨) کوشتنی شەوگەرد. (٥٨٠٣ - ٥٨٠٩)

## بَابٌ: في قَتْلِ الأوزاغ

١٥٠٠- عَنْ سَعْدِ بْنِ أبي وقاص (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَرَ بِقَتْلِ الْوَزَغِ وَسَمَّاهُ فُوَيْسِقًا. {الحديث: ٥٨٠٥ = ٥٧٩٨ فم}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دەدا بەکوشتنی شەوگەرد (وەزەغ). وە ناویشی نا: لەڕێدەرچوو، واتە: فاسیق). {تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٢٥٨٠ ج/٤} + {تەجرید/٢، ژمارە: ٨٤٢ = ٣٣٠٦} + {ریاض/٤، زنجریە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٦٣، ١٨٦٤}.

١٥٠١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَتَلَ وَزَغَةً فِى أَوَّلِ ضَرْبَةٍ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، وَمَنْ قَتَلَهَا فِى الضَّرْبَةِ الثَّانِيَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، لِدُونِ الأُولَى، وَإِنْ قَتَلَهَا فِى الضَّرْبَةِ الثَّالِثَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، لِدُونِ الثَّانِيَةِ». وفي رواية: «مَنْ قَتَلَ وَزَغًا فِى أَوَّلِ ضَرْبَةٍ كُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَفِى الثَّانِيَةِ دُونَ ذَلِكَ، وَفِى الثَّالِثَةِ دُونَ ذَلِكَ». {الحديث: ٥٨٠٧ = ٥٨٠١ فم} + {رياض/٤، زنجيره: ٣٧٠، رقم: ١٨٦٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بەیەکەم لێدان شەوگەردێ بکوژێ، ئەوەندەو ئەوەندە خێرو چاکەی بۆهەیە، وە ئەو کەسەی بەلێدانی دووەم بیکوژێ، ئەوەندەو ئەوەندە چاکەی بۆهەیە، بەلاّم کەمتر لەجاری یەکەم، وە ئەو کەسەی بەلێدانی سێیەم بیکوژێ ئەوەندەو ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە بەلاّم کەمتر لەجاری دووەم). لە گێڕانەوەی ژمارە (٥٨٠٨)دا، دەفەرموێ: (کەسێ بە پیاکێشانی یەکەم شەوگەردێ بکوژێ، سەد چاکەی بۆ دەنووسرێ، ئەوەی بە پیاکێشانی دووەم بیکوژێ کەمتری بۆ دەنووسرێ، ئەوەی بە پیاداکێشانی سێیەم بیکوژێ لەهی دوو کەمتری بۆدەنووسرێ!).

**روونکردنەوە:**

شەوگەرد (وەك فەرهەنگی خاڵ) دەڵێ: (شەوگەرد دەعبایەکە وەك مارمێلکە، بەلاّم ئەم پێوەئەدا). لەعەینیدا، دەفەرموێ: (لەقاپو شتی وادا دەتفێتەوە، زیانێکی

گەورەی بۆ مرۆڤ لێ دەكەوێتەوە، لەناو خوێدا خۆی دەگەوزێنێو ماكی تووشبوون بە گولی لێ پەیدا دەبێ. وێنەكەی لە مونجددا دەق لەمارمێلكە دەكا، كەمێ شلْ بێ).

ئەم جانەوەرە چەند جۆرێكی هەیە، گەورەو بچووكی هەیە، لە عەرەبیدا بە گەورەكانیان دەگوترێ سام ئەبرەص. بەزەینم ئەم دەعبایە لەگەرمیان زۆرترە، وە وەزەنیشی زیاترە.

**١١٦٩) كوشتنی مێرووله.** (٥٨١٠ - ٥٨١٢)

**بَابٌ: فِي قَتْلِ النَّمْلِ**

١٥٠٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِـيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: «نَزَلَ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَلَدَغَتْهُ نَمْلَةٌ، فَأَمَرَ بِجِهَازِهِ، فَأُخْرِجَ مِنْ تَحْتِهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ، فَهَلاَّ نَمْلَةً وَاحِدَةً!». {الحديث: ٥٨١١ = ٥٨٠٤ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢٣٦ = ٣٠١٩، ٣٣١٩}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران لەژێر سێبەری درەختێكا بارەگاكەی دەخات، مێرووڵەیێ پێوەی دەدا، جا فەرمان دەكا شمەكەكەی دەگوێزنەوە بۆ جێگەیێ تر، ئەوجا فەرمان دەدا شارە مێرووڵەكە گشتی دەسووتێنن، جا خودا لەسەرئەوە گلەیی لێ دەكاو سرووشی بۆ دەنێرێ: خۆ تۆ تاقە یەك مێرووڵە گەستتی، كەچی نەتەوەیەكت لە نەتەوەكان سەرجەم سووتاند، كە حاڵیان وابوو تەسبیحاتو سوپاسو ستایشی خودایان دەكرد، دەبوو هەر ئەو مێرووڵەیەت سزا بدایە كە پێوەی دایت). {تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٢٥٧٤ چ/٤}.

**روونكردنەوە:**

كوشتنی مێرووله بەبێ هۆكارێكی رەوا حەرامەو گوناهە، بەڵام ئەگەر ئازاری ناو ماڵی دەدا، وەك ئەوە دەكەوتە ناو نانو ئاوەو هەرچی دادەنرا لە مەوبەق

میرۆلە تێی دەداو خراپی دەکرد، یا لەناو باخچەو حەوشە کێشەیەکی بۆ دانیشتوان دروست دەکرد، ئەوە لەکاتی وادا:

١- دروستە بەهۆی بۆنو شتی واوە دوور بخرێتەوە.

٢- ئەگەر هەر چاری نەدەکراو زیانو ئازارەکەی بەردەوام بوو، ئەوا دروستە بکوژرێ، بەڵام بەسووتان نا. ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: (لەمەزهەبی ئێمەدا — واتە: لەمەزهەبی شافیعیدا — کوشتنی مێروولە دروست نییە، لەبەر ئەم فەرموودەیە، کە ئەبو داود بەڕشتەی دروست، بەپێی مەرجی بوخاریو موسلیم گێڕاویەتەوە: (ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی کوشتنی ئەم چوار گیانلەبەرەی نەداوە: مێروولەو هەنگو پەپوو سلێمانکەو صورەد (باشووکە؟). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٢٥٧٨ چاپی چوارەم} {هەروا بڕوانە: فتح الملهم، بەرگی/٣ — ٤، ص٢٣٨، رقم الحديث: ٥٨٠٥}.

## ١١٧٠) باسی کوشتنی پشیلە. (٥٨١٣ - ٥٨١٩)

## بَابٌ: فِي قَتْلِ الْهِرِّ

١٥٠٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ عُمَرْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ، سَجَنَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ، فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ، لاَ هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَسَقَتْهَا إِذْ حَبَسَتْهَا، وَلاَ هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ». {الحديث: ٥٨١٣ = ٥٨٠٥ فم. بخاري. بدء الخلق: ٣٤٨٢}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ژنێ لەسەر پشیلەیێ سزادراوە، پشیلەکەی بەند کردبوو، هەتا لەبرسانا مردبوو، لەو ماوەیەدا نەخۆی ئاوو نانی دابوو پێی، وەنە بەرەڵای کردبوو هەتا بۆخۆی لەچرو جانەوەری ناو زەوی بخوات لەسەر ئەوە خودا خستیە ناو ئاگری دۆزەخەوە). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠٠}.

### ١١٧١) باسی مشك‌و كەسانێ كەخودا كردوونی بەمشك. (٧٤٠٨ - ٧٤٠٩)
### بَابٌ: فِي الْفَأْرِ وَأَنَّهُ مُسِخَ

١٥٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فُقِدَتْ أُمَّةٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ لاَ يُدْرَى مَا فَعَلَتْ، وَلاَ أُرَاهَا إِلاَّ الْفَأْرَ، أَلاَ تَرَوْنَهَا إِذَا وُضِعَ لَهَا أَلْبَانُ الإِبِلِ لَمْ تَشْرَبْهُ، وَإِذَا وُضِعَ لَهَا أَلْبَانُ الشَّاءِ شَرِبَتْهُ؟»، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَحَدَّثْتُ هَذَا الْحَدِيثَ كَعْبًا، فَقَالَ: آنْتَ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ ذَلِكَ مِرَارًا؟ قُلْتُ أَأَقْرَأُ التَّوْرَاةَ؟! وَفِي رِوَايَةٍ: أفأنزلت عليَّ التوراة؟
{الحديث: ٧٤٢١ = ٧٤٥٧ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٣٣٣ = ٣٣٠٥}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (بەرەیێ لەنەوەی ئیسرائیل، واتە: لەملەتی جوولەکە، بزربوون‌و بێ سەرو شوێن رۆیشتوون، کەس نازانێ چییان بەسەرهاتووە، وەمن وادەزانم کە خودا کردوونی بە مشك، وە ئەم مشکانەی ئێستا هەن لەو بەرە بابەن، چونکە مشکیش وەك جوولەکە ئەگەر شیری وشتری بۆ دابنرێ نایخواتەوە، بەلام ئەگەر شیری مەڕی بۆدابنرێ دەیخواتەوە).

جا کاتێ ئەم فەرموودەیەم بۆ کەعبولئەحبار گێڕایەوە، گوتی: تۆ خۆت ئەم فەرموودەیەت بیست لەدەمی پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەر بێ)؟ کە پێغەمبەر وابفەرموێ؟ گوتم: بەلێ، چەند جارێ ئەمەی لێم دووبارە کردەوە، منیش لەوە بێزار بووم‌و پێم گوت: خۆ من تەوراتت بۆ ناخوێنمەوە؟ هەتا تۆ مەودای رەخنەگرتنت هەبێ. لە گێڕانەوەیەکا گوتم: لەتۆ وایە تەوراتم بۆهاتووە؟

**روونکردنەوە:**

لەکۆتایی ئەم فەرموودەیەدا، لە کوردییەکەی تاجول ئوصولدا دەفەرموێ: بەلام وەکوو لەعەینی (عومدەتولقارئ)دا دەفەرموێ: (لەپاش ئەم فەرمایشتە روونکرایەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەشتی مەسخ کراو، واتە: ئەو

مرۆڤانەی کە کراون بە بەرازو مەیموونو ئاژەڵو دەعبا، زاوزێ ناکەنو وەچەیان لێ ناکەوێتەوە). کەواتە: ئەم مشکانەی ئێستا هەن لەوەچەی ئەو بەرە بابە نین!

## ١١٧٢) پاداشی ئاودان بە ئاژەڵ. (٥٨٢٠ - ٥٨٢٢)

## بَابٌ: سَقْيِ الْبَهَائِمِ

١٥٠٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِى بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا، فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِى كَانَ بَلَغَ مِنِّى، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ مَاءً ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ حَتَّى رَقِىَ فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَإِنَّ لَنَا فِى هَذِهِ الْبَهَائِمِ لأَجْرًا؟ فَقَالَ: «فِى كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ». {الحديث: ٥٨٢٠ = ٥٨١٣ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٣٨ = ٢٣٦٣ فتح البارى} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پیاوێ لە چۆڵێ بە رێگەیەکا دەڕۆیشت، توونێتی زۆری بۆ هێنا، تا بیرێکی دۆزییەوەو چووە ناوی‌و تێر ئاوی خواردەوە، کاتێ هاتە دەرەوە روانی وا سەگێ لەتوونیانا وازمانی دەرکێشاوەو هاسکە هاسکیەتی‌و، لەتاوا تەڕایی دەوری بیرەکە دەلێسێتەوە، جا پیاوەکە، لەبەرخۆیەوە دەڵێ: ئەم سەگەیش لە توونیانا وەکوو منی بەسەرهاتووە! جا دیسانەوە رۆیشتەوە خوارەوە بۆناو بیرەکەو کاڵە (خوففە)کەی پێی داکەندو پڕی کرد لەئاوو، گرتی بەدەمیەوەو بەدیواری بیرەکەدا هەڵزنییەوەو سەرکەوتەوە سەرێو سەگەکەی ئاودا، جا خودا لەسەرئەوە سوپاسی کردو تۆڵەی بۆیکردەوەو لێی خۆش بوو!)

هاوەڵان عەرزیانکرد: قوربان ئەی فروستادەی خودا! ئەی رەوانەکراوی خودا! ئەی پێغەمبەری خودا! دیارە هەر چاکەیێ لەگەڵ گیانلەبەری بێزمانا بکەین، خێرو پاداشی هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ وایە، هەرچاکەیێ لەگەڵ هەرشتێ بکرێ کە

تەڕایی ژیانی تیابێ خێرێکی گەورەیە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٧، ژمارە: ١٩٣٩ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## (پوختەیەکی کورتی نامەی مار)

١- جۆرە مارێکی تایبەت هەیە، وەك کوڵە وەیباب، لەهەر شوێنێ بینران، سوننەتە بکوژرێن و مۆڵەت و مەودای دەربازبوون نەدرێن.

٢- مارو دووپشك و جانەوەری تری زیانە خرۆ، لەدەشت و دەر، بەبێ مەرج دەکوژرێن.

٣- ماری ناو ماڵ، بەتایبەتی ئەوانەیان کەپێیان دەگوترێ: (عَوَامِرُ البُيُوتِ = خێوی ناو ماڵ) واباشە تا سێ جار، کە دەردەکەون، هۆشیار بکرێنەوە کە ماڵەکە چۆڵ بکەن، دەنا دەکوژرێن، جا ئەگەر پاش سێ جارەکە دەرکەوتن، ئەوا دەکوژرێن بەبێ مەرج.

٤- کوشتنی شەوگەرد سوننەتە، چونکە زیانی زۆرە.

٥- کوشتنی مێروولە بەبێ هۆی ڕەوا ناباشەو حەرامە، دەبێ مرۆی موسوڵمان لەشتی وا خۆی بپارێزێ، جۆرێ لە مێروولە پێوە دەدا.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٧- نامەی شیعرو شتانی تری وا

## كِتَابُ الشِّعْرِ وَغَيْرِهِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول بەكوردی بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٦٨، لاپەڕە: ٤٨٨، لەژمارە: ٥٤٢٢ هەتا ژمارە: ٥٤٥٣، زنجیرە: ٧٥ + تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٥٤}.

### ١١٧٣) باسی شیعرو خوێندنەوەی شیعر. (٥٨٤٦ - ٥٨٥٥)

### بَابٌ: فِي الشِّعْرِ وَإِنْشَادِهِ

١٥٠٦- عَنْ الشَّرِيدِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَدِفْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا، فَقَالَ: «هَلْ مَعَكَ مِنْ شِعْرِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ شَيْئً»؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «هِيهِ»، فَأَنْشَدْتُهُ بَيْتًا، فَقَالَ: «هِيهِ»، ثُمَّ أَنْشَدْتُهُ بَيْتًا، فَقَالَ: «هِيهِ»، حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةَ بَيْتٍ. {الحديث: ٥٨٤٦ = ٥٨٣٩ فم}:

عەمری كوڕی شەرید (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەباوكیەوە فەرمووی: ڕۆژێ لەپاشكۆی پێغەمبەرەوە سوار بوو بووم، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئایا هیچ هەڵبەستی ئومەییەی كوڕی ئەبو صەلتت لەبەرە؟). گوتم: ئا، لەبەرمە! فەرمووی: (ئادەی بڵێ) منیش شیعرێكم لە شیعرەكانی خوێندەوە بۆی. فەرمووی: (بابێ). ئیتر هەر شیعری ئەوم بۆی دەخوێندەوەو هەر دەیفەرموو: (بابێ) هەتا سەد بەیتم بۆی خوێندەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٥٤٣٧ چاپی چوارەم}.

### ١١٧٤) ڕاسترین گوتەیێ كە هۆنەر گوتوویەتی

### بَابٌ: أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا شَاعِرٌ

١٥٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا شَاعِرٌ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللَّهَ بَاطِلٌ». {الحديث: ٥٨٤٩ = ٥٨٤٣ فم}:

خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (راستترین گوتەیێ کە هەستیار (شاعیر) وتبێتی، ئەم گوتەیەی لەبیدە کەدەڵێ:

(أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللَّهَ بَاطِلٌ
(وَكُلُّ نَعِيمٍ لاَ مَحَالَةَ زَائِلُ)

واتە:

ئەم دنیایە کاوو بایە
هیچ و پووچ و بێ بەهایە
نازو بەهرەی بێ بەقایە
ئەوەی راست بێ بەس خوایە!

{تاج/٥، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٥٤٢٦ ج/٤ + تجریدی بوخاری بەرگی چوارەم، لاپەڕە: ١٩٠، ژمارە: ١٥٠٤}.

لە تەجریدی بوخاریدا، لە کوردییەکەیدا، دەفەرموێ:

**روونکردنەوە:**

(لەسەر فەرمایشتی فەتحولباری شەرحی صەحیحی بوخاری لەڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا، کە ژمارەکەی لە فەتحولباریدا = ٣٨٤١، کەدوو طەرەفی هەیە، ژمارە: ٦١٤٧ و ٦٤٨٩، لەوێدا دەفەرموێ: لەبید ئیسلام بووە، وە ئیمامی بوخاری بە صەحابەی داناوە. لە ئیصابەو ئیستیعابیشدا دەفەرموێ: ناوی لەبیدی کوڕی رەبیعەی کوڕی عامیرە، شاعیرێکی بەناوبانگە، سوار چاکێکی ئازاو دلێر بووە، لەدوو سەردەما ژیاوە، زۆرینەی شیعرەکانی لەپێش ئیسلامبووندا گوتووە، موسوڵمانێکی زۆر جوانو رێکو پێک بووە، لەگەڵ دەستەیێ کە ژمارەیان سیازدە پیاو بوو، لەهۆزی بەنی کلاب، کە نوێنەری هۆزەکەیان بوون، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەرو ئیسلام بوو). عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) گەڵێ جار دەیفەرموو: رەحمەتی خودا لە لەبید کە دەڵێ (کامل):

ذَهَبَ الَّذِينَ يُعَاشُ فِي أَكْنَافِهِمْ
وَبَقِيتُ فِي خَلَفٍ كَجِلْدِ الْأَجْرَبِ

واتە:

ڕوویـــــین ئەوانـــــەی کـــــە لـــــەژیانا
گـــــوزەران خـــــۆش بـــــوو لـــــە پـــــەنایانا
مامـــــەوە لـــــەناو وەچـــــەیێ بـــــێ فـــــەڕ
بـــێ وەچ و بـــێ فـــەڕ، وەکـــوو کـــەوڵی گـــەڕ!

**عائیشە** (رەزای خودای لێ بێ) **دەیفەرموو:**

دەی ئەگەر لەبید فریای ئەم سەردەمەی ئێمە بکەوتایـە، دەبـێ چـی بگوتبایـە! **ئیمامی عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) لەبارەی شیعر وتنەوە، لـەپاش ئیسلامبوونی پرسـیاری لێ دەکا، دەڵێ: خودا لەجیاتی شیعر، بەسوورەتی بەقـەرە هـەقی بـۆ کردوومەتـەوە، سـەدو پـەنجا سـاڵ ژیـاوە، لەکووفـە نیشتـەجێ بـوو، هـەر لـەوێ لـەکاتی حـوکمڕانی وەلیـدی کـوڕی عوقبـەدا دەمـرێ، لەسـەردەمی جێنشـینی پێشـەوا عوسمانـدا گیـانی پاکی بەخزمەتی خودای گەورە شاد دەبێ، لەساڵی چل و یەکی کۆچیدا، لـەو ڕۆژەدا کە موعاوییە دەچێتە ناو کووفە. لە ئیصابەدا ئاماژە دەکا، کە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر دوانگە، شیعرەکەی لەبید دەخوێنێتەوە.

ئیبنـو عەبـدول بـەرر (رەحمەتی خودای لێ بێ) لـە ئیسـتیعابا دەفـەرموێ: (کاتـێ دەگاتـە تەمەنی سەدو بیست ساڵ ئەم هۆنراوەیە، دەڵێ (کامل):

وَلَقَـــدْ سَـــئِمْتُ مِـــنَ الحَيَـــاةِ وَطُولِهَـــا
وَسُـــؤَالِ هـــذَا النَّـــاسِ: كَيْـــفَ لَبِيـــدُ

واتە:

لـــــەژین و درێـــــژیی، تـــــەواو بێـــــزارم
{چـــۆنی؟ ئـــەی لەبیـــد!} دەدا ئـــازارم!

## ١١٧٥) خۆ خەریککردنی زۆر بەشیعرەوە ناباشە

## بَابٌ: كَرَاهِيَةُ الأمْتِلَاءِ مِنَ الشِّعْرِ

١٥٠٨- عَنْ سَعْدِ بْنُ أَبِي وَقَّاصْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا يَرِيهِ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا». {الحديث: ٥٨٥٣ =

٥٨٤٨ فم. تجريد البخاري/٥/٢٢٣، رقم: ١٩٥٥ = ٦١٥٤. ترمذي. أدَب: ٢٨٥٢. ابن ماجة. أدب: ٢٧٦٠. تحفة الأشراف: ٢٩١٩}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەڕاستیدا ناودڵی مرۆڤ پڕبێ لەکێمو زوخاوێکی وا، کە ناوسکی بگەنێنێ، هێشتا ئەوەی باشترە لەوە کە دڵی پڕبێ لە هەڵبەستو هۆنراوە). {تاج/٥/٤٩٠، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٥٤٢٢ چ/٤}.

## ١١٧٦) خۆڵکردن بەڕووی ئەوانەی کە لەڕوو، لە گۆترە مەدحو ستایشی کەسێ لەڕوو دەکەن. (٧٤٢٦ - ٧٤٣٣)

## بَابٌ: حثي التُّرَابَ فِي وُجُوهِ الْمَدَّاحِينَ

١٥٠٩- عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ: أَنَّ رَجُلاً جَعَلَ يَمْدَحُ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَعَمِدَ الْمِقْدَادُ فَجَثَا عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَكَانَ رَجُلاً ضَخْمًا فَجَعَلَ يَحْثُو فِي وَجْهِهِ الْحَصْبَاءَ، فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: مَا شَأْنُكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْمَدَّاحِينَ فَاحْثُوا فِي وُجُوهِهِمُ التُّرَابَ». {الحديث: ٧٤٣١ = ٧٤٦٦ فم}:

هەممامی کوڕی حاریث فەرمووی: پیاوێ لەڕوو، دەستی کرد بەمەدحو ستایشی ئیمامی عوثمان (رەزای خودای لێ بێ) میقدادی کوڕی عەمریش، کە ناسراوە بە میقدادی کوڕی ئەسوەد، هەستا چوو بۆلای پیاوەکەو هات بەسەر چۆکدا، گەرچی میقداد پیاوێکی قەبەی زلی زەبەلاح بوو، بەلام بۆئەوەی کە فەرمانەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جێبەجێ بکا هات بەسەر چۆکاو تۆزێ لمو خۆڵی هەلگرتو وەشاندی بەڕووی کابرای مەتحکاردا. عوثمان فەرمووی: ئەوە چیتە بۆ وادەکەی؟ میقداد فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر کەسێکتان بینی، دەستی کرد بەمەدحو ستایش خوانی لەڕوو، خۆڵ بکەن بەسەرو چاویدا). {ریاض/٤/١٧٠، زنجیرە: ٣٦٠، ژمارە: ١٧٩٠} + {تاج/٥، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٤٧٨٣، چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

نـەوەوی (رەحمـەتی خـودای لێ بێ) دەفـەرموێ: کۆمـەڵێ فـەرمووده هەیـه سـەبارەت بـه قەدەغـەکردنی مـەتحی لـەڕوو، فـەرموودەی زۆری تـریش هەیـه لـەبارەی ڕێگـه پێدانیەوە، هەردوو جۆره فەرموودەکانیش فەرموودەی ڕاستو دروستن. لەبەرئەوه زاناکان دەفەرموون: ڕێبازی ڕێکخستنو پێکەوه سازانیان ئاوایـه: کـه بگـوترێ ئـەو کەسـەی کـه لـەڕوو وەسـپی دەکـرێ، ئەگـەر خـاوەنی بـاوەڕێکی پتـەوی تـەواو بـوو، بەکۆششی خۆی دەروونی خۆیی دامراندبوو، بەو ستایشه لەخۆی نەدەگۆڕا، نەفسی دنیایی مردبوو، وەگەیبووه پایەی دڵنیاییو خودا ناسی تەواو، لەبەرئـەوه مەترسـی ئەوەی لێ نەدەکرا که بـەو ستایشو تاریفـه، لـەخۆی بـایی ببـێو کـەیفی پێـی بـێ، ئـەوه وەسـپی جـوانی ئـەو جـۆره کەسـانه بـا لـەڕووی خۆیـانیش بـێ دروسـته، نادروستو ناباش نییـه، بـەڵام ئەگـەر مەترسـی شـتی وای لێ دەکـراو، لەوانـه بـوو کەبـەو مەتحـه گـیرۆدە ببـێ، یـا بگـۆڕێ، یـا بـایی ببـێ، یـا کـابرای وەسـپگۆ، لـه وەسـپکردنەکەی، مەبەسـتی دەسـتکەوتنی خـەڵاتو شـتی تـری وابـێ، ئـەوه مـەتحی لەڕوو، لەم کاتانەدا، زۆر خراپو ناباشو ناپەسەنده).

ئیتر بەپێی ئەم درێژه پێدانەی نەوەوییەو ڕاڤه نووسەکانی تر، ئەو فـەرمووده جیاجیایانه، که لەم بارەیـەوە هـاتوون پیـاده دەکـرێن. {بـڕوانـه: ریـاض/٤، زنجـیره: ٣٦٠، ژماره: ١٧٩٠ هەتا کۆتایی}.

**١١٧٧) تاریفو مەتحێ لەڕووش نەبێ هەر ناباشە.** (٧٤٢٦ - ٧٤٣٣)

**بَابٌ: فِي كَرَاهِيَّةُ التزكِيَةِ وَالمَدْحِ**

١٥١٠- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَّهُ ذُكِـرَ عِنْدَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا مِنْ رَجُلٍ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفْضَلُ مِنْهُ فِي كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ»، مِرَارًا يَقُولُ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا أَخَاهُ لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُ فُلاَنًا - إِنْ كَانَ يُرَى أَنَّهُ كَذَلِكَ - وَلاَ أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ

أَحَدًا». {الحديث: ٧٤٢٧ = ٧٤٦٢ فتح المُلْهِم. تجريد/٣، رقم: ١١٢٢ = ٢٦٦٢، ٦٠٦١، ٦١٦٢. أبو داود. أدب: ٤٨٠٥. ابن ماجة. أدب: ٣٧٤٤. تحفة الأشراف: ١١٦٧٨}:

ئەبو بەكرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی پیاوێ كرا، پیاوێكی تریش وەسپی چاكیو باشیی ئەوی كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ ئەستۆی هاورێكەتت شكاند!). وە چەندجار لەسەر یەك ئەم وشەیەی دووبارە كردەوە، ئەوجا فەرمووی:

(ئەگەر كەسێكتان هەر چاری نەبوو، كە ویستی وەسپی كەسێ بكا، با جەزمی پیادا نەنێو بیخاتە خانەی بۆچوونەوەو بڵێ: من وادەزانم كە وایە، ئەمەیش بەمەرجی ئەوە كە ئەو كابرایە، بەزەینی خۆی وابێ كە وەك خۆی دەڵێ، وەبڵێ: بەڵام شایەتی ئەوەی بۆنادەم كە لەلای خودایش وەك من دەیڵێم وا پاكو باشە، چونكە شتی واو بڕیاری وا بەس خودا بۆ خۆی دەیزانێ!).

## ١١٧٨) نەردین (تاوڵەكردن). (٥٨٥٦)

## بَابٌ: اللَّعِبُ بِالنَّرْدَشِيرِ

١٥١١- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ فَكَأَنَّمَا صَبَغَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ». {الحديث: ٥٨٥٦ = ٥٨٥٠ فم. أبو داود. أدب: ٤٩٣٩. ابن ماجتز أدب: ٣٧٦٣. تحفة الأشراف: ١٩٣٥}:

بورەیدە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ وازی بە تاوڵە بكا، وەك دەستی بەگۆشتو خوێنی بەراز رەنگ بكا ئاوایە)، واتە: وەك پارووی لێ بگرێو بیخوات ئاوایە، دیارو ئاشكرایە كە گۆشتی بەراز گڵاوو چەپەڵو حەرامە بەدەقی قورئان). {تاج/٥/٥٠٢، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٥٤٤٦}.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٤٨- نامەی خەون بینین

## كتابُ الرُّؤْيا

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی چوارەم، لاپەڕە: ٦٠٥ چاپی چوارەم، زنجیرە: ١، ژمارە: ٤٢٣٩ هەتا زنجیرە: ١١، لاپەڕە: ٦٤٣، ژمارە: ٤٢٩٦} + {ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٠٨، چاپی دووەم، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٨٣٨ هەتا ژمارە: ٨٤٤ + تەجریدی بوخاری = پوختەی (مختصر صحيح البخاری) بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ٣٤٠، چاپی یەكەم، زنجیرە: ٩٣، لە ژمارە: ٢٠٨١ هەتا لاپەڕە: ٣٥٢، ژمارە: ٢٠٩١}.

### ١١٧٩) خەوبینینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

### بَابٌ: فِي رُؤْيَا النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٥١٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «رَأَيْتُ ذَاتَ لَيْلَةٍ فِيمَا يَرَى النَّائِمُ كَأَنَّا فِى دَارِ عُقْبَةَ بْنِ رَافِعٍ، فَأُتِينَا بِرُطَبٍ مِنْ رُطَبِ ابْنِ طَابٍ، فَأَوَّلْتُ الرِّفْعَةَ لَنَا فِى الدُّنْيَا، وَالْعَاقِبَةَ فِى الآخِرَةِ، وَأَنَّ دِينَنَا قَدْ طَابَ». {الحديث: ٥٨٩١ = ٥٨٨٦ فم}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەوێ لەخەوما دیتم كەوا، وەكوو لەماڵی عوقبەی كوڕی رافیعدا بین وابوو، كە هاوەڵێكی ئەنصاری پێغەمبەرە، تەڕە خورمای تازەیان بۆمان هێنا، لەوجۆرە خورمایە كەپێی دەڵێن: خورمای ئیبنو طاب! منیش ئەم خەونەم ئاوا خەون پەرژێن كرد: رافیعم لێكدایەوە بەسەر بەرزیی دنیامانو عوقبەیشم دانا بەسەرەنجامی باشی دوارۆژمانو روطابی ئیبنو طابیشم لێكدایەوە بەوە كەوا ئەم ئایینەی ئێمە خۆشو باش بووەو دامەزراوەو رەگی داكوتاوە). {تاج/٤، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٤٢٦٠ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**روونكردنەوە:**

لە فەتحولمولهیمدا، لەقازی عەیاضەوە (رەزای خودای لێ بێ) راگوێز دەكا: كە خەو لێكدانەوەو خەون پەرژێن، بەم چوار شێوەیە دەبێ:

١- ئیشتیقاق، وەك ئەمەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە نموونەیەكی جوانە، بۆ ئیشتیقاق، واتە: بۆ دۆزینەوەی مانای خەون لەواتای ناوو كونیەو كەسناوو نازناو، چونكە (عوقبە) بە كوردی واتە: سەرەنجام، (رافیع) واتە: سەربەرز، ئیبنو طاب (كە كونیەیە: واتە: كەسناوە) واتە: كاكە باشە.

هەموو رستەكە بەسەر یەكەوە بەكوردی، واتاكەی ئەمەیە: {شەوێ لەخەوما دیتم كەوا وەكوو لەماڵی (سەرەنجام)ی كوڕی (سەربەرز)دا بین وابوو، تەڕە خورمای تازەیان هێنا بۆمان، لەو جۆرە خورمایە كەپێی دەڵێن: روتابی (كاكە باشە!)}.

٢- بەوشتانەی كە بەشێوازێكی پتەو لەیەكتری دەچن، وەك مامۆستای قوتابخانە، خەو پەرژێن دەكرێ بە قازیو دەسەلاتدارو سەرۆكی پاپۆڕ.

٣- ئەوكارەی كە مرۆڤ لەخەوندا دەیكا، بكرێ بەنیشانەو بەلگە، لەسەر واتای خەونەكە، وەك كەسێ لەخەوندا دەبینێ خەریكی خانوو دروستكردنە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە كەژن دێنێ، چونكە مەبەستی سەرەكی لە دروستكردنی خانوو، ماڵو منالْ پێكەوەنانە، ئەوەیش بەبێ ژن نابێ.

٤- كردنی ئەو شتانەی كە لەقورئانو سوننەتو پەندی پێشینانا، باسكراون، بكرێن بەسەرچاوە بۆ خەون پەرژێنەكە. وەك تەعبیری (تەختە = خەشەبە) بە مونافیقو كەسی ناپاك، چونكە قورئان دەفەرموێ: (كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ). وەك مشك بە (فاسق) چونكە پێغەمبەر ناوی ناوە (فُوَيسِقَةٌ) وەك شووشە بەژن، چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەنجەشەی فەرموو كە وشتری ژێر ئافرەتەكانی لێ دەخوڕی (رِفْقاً بِالقَوَارِيرِ).

١٥١٣- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أُهَاجِرُ مِنْ مَكَّةَ إِلَى أَرْضٍ بِهَا نَخْلٌ، فَذَهَبَ وَهَلِي إِلَى

أَنَّهَا الْيَمَامَةُ أَوْ هَجَرُ، فَإِذَا هِيَ الْمَدِينَةُ يَثْرِبُ، وَرَأَيْتُ فِي رُؤْيَايَ هَذِهِ أَنِّي هَزَزْتُ سَيْفًا فَانْقَطَعَ صَدْرُهُ، فَإِذَا هُوَ مَا أُصِيبَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، ثُمَّ هَزَزْتُهُ أُخْرَى فَعَادَ أَحْسَنَ مَا كَانَ فَإِذَا هُوَ مَا جَاءَ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْفَتْحِ وَاجْتِمَاعِ الْمُؤْمِنِينَ، وَرَأَيْتُ فِيهَا أَيْضًا بَقَرًا، وَاللَّهُ خَيْرٌ، فَإِذَا هُمُ النَّفَرُ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَإِذَا الْخَيْرُ مَا جَاءَ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْخَيْرِ بَعْدُ، وَثَوَابُ الصِّدْقِ الَّذِي آتَانَا اللَّهُ بَعْدُ يَوْمَ بَدْرٍ». {الحديث: ٥٨٩٣ = ٥٨٨٨ فم. بخاری. مناقب: ٣٦٢٢، ٣٩٨٧، ٤٠٨١، ٧٠٣٥، ٧٠٤١}:

**ئەبو مووساى ئەشعەرى** (رەزاى خوداى لێ بێ) **فەرمووى: خۆشەویست** (دروودى خوداى لەسەر بێ) **فەرمووى:** (لەخەوما دیم وا لەمەککەوە کۆچو باردەکەم بۆ وڵاتێ کە باخو دارە خورماى زۆرى واڵێ، زەینم بۆئەوە چوو کە ئەو شوێنە یا یەمامە بێ، یا هەجەر بێ، کەچی خۆى نەبوو، نە یەمامە بوو، نە شارى هەجەر، بەڵکوو ئەو شوێنە مەدینە دەرچوو، کە لەپێش کۆچدا ناوى یەثریب بوو، خوداى گەورە لە قورئانا، ناوى نا (المدينە).

هەر لەم خەونەمدا، روانیم کەوا شمشێرێ وابەدەستمەوە، کە رام وەشاند نووکەکەى پەڕى، دیاربوو کە ئەو شکستە بوو، کە لەغەزاى ئوحوددا تووشى موسوڵمانان بوو، جا لەپاشا کەجارێ تر رام وەشاندەوە، گەلێ لەجاران باشترى لێ هاتەوە، دیاربوو کە ئەو سەرکەوتنو یەکگرتنى موسوڵمانانە بوو، کە لەپاش تێکشکانى ئوحود، لەساڵى ئایندەدا، لەغەزاى بەدرى دووەمدا، کە ناودارە بە بەدرى مەوعید، خودا رەخساندى بۆ موسوڵمانان، هەر لەو خەونەمدا چەن سەرێ گام بینى سەر دەبڕان، هەر لەو خەونەمدا ئەم رستەیە درا بەگوێما: (وَاللَّهُ خَيْرٌ: خێر لاى خوایە) دیاربوو ئەو گا سەربڕینە، ئەو حەفتا شەهیدە بوون، کە لەغەزاى ئوحوددا شەهید بوون، دیاربوو ئەو خێرەیش کە لەلاى خودا بوو، ئەو خێرو بێرە بوو کە خوداى گەورە لەپاش بەدرى دووەم رەخساندى، وە پاداشى باشى ئەو سەر راستییە بوو، کە موسوڵمانان لەبەدرى دووەمدا، پیادەیان کردو ئامادەى بەدرى مەوعید بوون، بەڵام بێباوەڕەکان، بەڵێنى خۆیان نەبردە سەرو نەهاتن!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٣١٥٩} + {تاج/٤، زنجیرە: ٥، لاپەڕە: ٦١٧، ژمارە: ٤٢٥٧}.

## ١١٨٠) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەوندا، موسەیلەمەی کەذذابو ئەسوەدی عەنسی دەبینی

## بَابٌ: رُؤْيَا النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّابُ الْعَنْسِيَّ الْكَذَّابُ

١٥١٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: قَدِمَ مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّابُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ، فَجَعَلَ يَقُولُ: إِنْ جَعَلَ لِي مُحَمَّدٌ الأَمْرَ مِنْ بَعْدِهِ تَبِعْتُهُ! فَقَدِمَهَا فِي بَشَرٍ كَثِيرٍ مِنْ قَوْمِهِ، فَأَقْبَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَمَعَهُ ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، وَفِي يَدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قِطْعَةُ جَرِيدَةٍ حَتَّى وَقَفَ عَلَى مُسَيْلِمَةَ فِي أَصْحَابِهِ، قَالَ: «لَوْ سَأَلْتَنِي هَذِهِ الْقِطْعَةَ مَا أَعْطَيْتُكَهَا، وَلَنْ أَتَعَدَّى أَمْرَ اللَّهِ فِيكَ، وَلَئِنْ أَدْبَرْتَ لَيَعْقِرَنَّكَ اللَّهُ، وَإِنِّي لأُرَاكَ الَّذِي أُرِيتُ فِيكَ مَا أُرِيتُ، وَهَذَا ثَابِتٌ يُجِيبُكَ عَنِّي»، ثُمَّ انْصَرَفَ عَنْهُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَسَأَلْتُ عَنْ قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّكَ أَرَى الَّذِي أُرِيتُ فِيكَ مَا أُرِيتُ»، فَأَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ فِي يَدَيَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَهَمَّنِي شَأْنُهُمَا، فَأُوحِيَ إِلَيَّ فِي الْمَنَامِ أَنِ انْفُخْهُمَا فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا، فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ مِنْ بَعْدِي، فَكَانَ أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيَّ صَاحِبَ صَنْعَاءَ وَالآخَرُ مُسَيْلِمَةَ صَاحِبَ الْيَمَامَةِ». {الحديث: ٥٨٩٤ = ٥٨٨٩ فم. تجريد البخاري/٤، لاپەڕە: ٣٦٢، رقم: ١٦٠٨/ = ٥٣٧٣، ٣٦٢٠، ٤٣٧٨، ٧٠٣٣، ٧٤٦١، ٤٣٧٤، ٣٦٢١، ٤٣٧٥، ٤٣٧٩، ٧٠٣٤، ٧٠٣٧. ترمذي. رؤيا: ٢٢٩٢. تحفة الأشراف: ٦٥١٨، ١٣٥٧٤}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موسەیلەمەی درۆزن کەناسراوە بە موسەیلەمەی کەذذاب، هات بۆ مەدینە، عەشاماتێکی زۆری لەهۆزەکەی خۆی لەگەڵدا بوو، دەیگوت:

ئەگەر موحەممەد لەدوای خۆی، کاروبارو جێنشینی خۆی بسپێرێ بەمنو بمکات بەجێنشینی خۆی، دێمە سەر دینەکەیو پەیڕەوی ئەو دەکەم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) سابیتی کوڕی قەیسی لەگەڵدا بوو، کە خەتیبو وتار خوێنێکی زاناو دانابوو، چوو بۆلای موسەیلەمە، هەتا لەبەرچاوی هەمووان، ئیقامە حوججەی لەسەر بکات، وە لەم کاتەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پارچە

چیلکەیەکی پەلکە خورمای بەدەستەوە بوو، کە گەیشتە لای موسەیلەمە لەناو هۆزەکەیدا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدیاری راوەستا، لەپاش گوفتوگۆیەك، کەبریتی بوو لەوە کە موسەیلەمە داوای جێنشینی پێغەمبەری کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەگەر داوای ئەم پارچە چیلکەیەشم لێ بکەی نایدەم پێت! چ جای ئەوەی کەبتکەم بە جێنشینی خۆم لەدوای خۆم، تۆ ناتوانی فەرمانی خودا سەبارەت بەخۆت بشکێنیو رادەی ئەوەت ناکەوێ کە ئەو فەرمانەی خودا لەبارەی تۆوە بڕیاری داوە بەتۆ رەت نابێتەوە، خۆ ئەگەر تۆ لەمن هەڵبگەڕێیتەوە، خودا لە گلوگۆت دەخات، وات دەبینم کەتۆ ئەو کابرایەیت کە بەخەو حاڵی بەدی ئەوم پێ نیشان دراوە، ئەوا من دەڕۆم ئەمە سابیتە چی قسەیەکت هەیە ئەو لەجیاتی من وەڵامت دەداتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەجێی هێشتو رۆیشت. ئیبنو عەبباس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی ئەم خەونەی پێغەمبەرەوە، کە فەرمووی: (... وات دەبینم کەتۆ ئەو کابرایەیت کە بەخەو...) لەبارەی ئەم خەونەوە لە ئەبو هورەیرەم پرسی فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوستبووم لەخەوما دیم کە لەهەردوو دەستمدا دوو بازنی زێڕم دی، ئەوە خەمگینی کردم، لە خەوەکەمدا سرووشم بۆکرا: ئادەی فوویان لێ بکە، منیش فووم لێکردن، جا هەردووکیان بابردنیو فڕین، ئەو دوو بازنەم بەدوو درۆزن لێك دایەوە، کە لەدوای من شۆڕەتیان بڵاو دەبێتەوەو ناویان دەزڕێ، ئەو دوو فرە درۆزنە یەکێکیان ئەسوەدی عەنسی بوو، ئەویتریان: موسەیلەمەی کەززاب بوو، کە ئەسوەد لە صەنعاء بوو، موسەیلەمەیش لە یەمامە بوو). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ٥٥٣٢ چ/٤} + {تاج/٤، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٤٢٥٦ چ/٤}.

**١١٨١) ديتنى پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەوندا.** (٥٨٥٧ - ٥٨٩٦)

**بَابٌ: قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي**

١٥١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ، أَوْ لَكَأَنَّمَا رَآنِي فِي الْيَقَظَةِ، لاَ يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي»، وَقَالَ: فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَالَ أَبُو قَتَادَةَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ». {الحديث: ٥٨٧٩ = ٨٧٤ فم. تجريد البخاري/٥/٣٤٢، رقم: ٢٠٨٤ = ٦٩٩٣، ٦٩٩٦. أبو داود. أدب: ٥٠٢٣}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەرکەسێ بەخەو من ببینێ، ئەوە بەچاوی سەریش لەحاڵی هۆشیاریدا من دەبینێ، یا وەك ئەوە وایە کە بەچاوی سەر لەحاڵی بێداریدا من ببینێ، شەیتان خۆی بۆناکرێ بەمن. واتە: ناتوانێ خۆی بگۆڕێو خۆی بباتە شێوەو شەکڵی منەوە) + {ریاض/٢، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٨٤٠}.

ئیبنو شەهاب، ئیمامی زوهری (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەخەونیدا من ببینێ، ئەوە خەوێکی راستو دروستی دیوە، چونکە شەیتان خۆی بۆ ناکرێ بەمنو، ناتوانێ بەهیچ شێوەیێو لەهیچ حاڵێکا بچێتە شکڵو شێوەی منەوە). {تاج/٤، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٢٦٧، ٤٢٦٨، ٤٢٦٩ + بخاری. تعبیر: رقم: ٦٩٩٦} + {فتح الملهم. رقم: ٥٨٧٥ = ٦٩٩٥، ٦٩٩٦ = فتح الباری} + {تەجریدی بوخاری/٥/٣٤٢، ژمارە: ٢٠٨٥ = ٦٩٩٧ فتح الباری}.

**١١٨٢) خەونی خۆشی باش لەخوداوەیە، خەونی خراپیش لەشەیتانەوەیە.** (٥٨٥٧ - ٥٨٩٦)

**بَابٌ: الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ**

١٥١٦- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا حَلَمَ أَحَدُكُمْ حُلْمًا يَكْرَهُهُ، فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثًا وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ»، فَقَالَ: إِنْ كُنْتُ لأَرَى

الرُّؤْيَا أَثْقَلَ عَلَيَّ مِنْ جَبَلٍ، فَمَا هُوَ إِلاَّ أَنْ سَمِعْتُ بِهَذَا الْحَدِيثِ فَمَا أُبَالِيهَا. {الحديث: ٥٨٦٠ = ٥٨٥٤ فم}:

ئەبو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لەئەبو قەتادە دەیفەرموو: (خەونی خۆش‌و باش لەخوداوەیە، خەونی ناخۆش‌و خراپیش لە شەیتانەوەیە، جاکاتێ کەسێکتان خەونێکی دی‌و ئەو خەونەی پێ ناخۆش بوو، با لەلای چەپیەوە سێ تف رۆبکاو پەنابگرێ بەخودا لەشەڕی شەیتان‌و لەشەڕی ئەو خەونەو ئیتر بۆ کەسی نەگێڕێتەوە، ئیتر زیانی نابێ بۆی).

ئەبو سەلەمە دەفەرموێ: کە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرم لە ئەبو قەتادە بیست، ئیتر دەربەستی خەونی ناخۆش نەبووم، بەلاّم لەوەپێش خەونی ناخۆشی وام دەبینی، لەکێو قورستربوو، بەلاّم لەپاش بیستنی ئەم فەرموودەیە، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرم جێبەجێ دەکرد، ئیتر زیانی نەدەبوو بۆم). {ریاض/٢، لاپەڕە: ٣١٠، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٨٤٢}.

### ١١٨٣) خەونی باش لەخوداوەیە، کەسێ خەونی ناخۆشی بینی با بۆکەسی نەگێڕێتەوە. (٥٨٥٧ - ٥٨٩٦)

### بَابُ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ، وَمَنْ رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلاَ يُحَدِّثُ بِهِ

١٥١٧- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: إِنْ كُنْتُ لأَرَى الرُّؤْيَا تُمْرِضُنِي، قَالَ: فَلَقِيتُ أَبَا قَتَادَةَ فَقَالَ: وَأَنَا كُنْتُ لأَرَى الرُّؤْيَا فَتُمْرِضُنِي، حَتَّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِنَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ فَلاَ يُحَدِّثُ بِهَا إِلاَّ مَنْ يُحِبُّ، وَإِنْ رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلْيَتْفِلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثًا وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشَرِّهَا وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا أَحَدًا فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ». {الحديث: ٥٨٦٢ = ٥٨٥٧ فم. بخاري. طب: ٥٧٤٧، ٦٩٨٥، ٦٩٩٥، ٧٠٠٥، ٧٠٤٤، أبو داوودز أدب: ٥٠٢١. ترمذي. رؤيا: ٢٢٧٧. تجريد/٥/٣٤١، رقم: ٢٠٨٢}:

ئەبو سەلەمە فەرمووی: جاری وادەبوو خەونی وام دەدی، نەخۆشی دەخستم، هەتا جارێ گەیشتم بە ئەبو قەتادە فەرمووی: منیش ئاوا بووم، خەونی وام

دەبینی نەخۆشی دەخستم، هەتا بەخزمەتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشتم، وەلێیم بیست دەیفەرموو: (لەڕاستیدا خەونی باش موژدەی خۆشە لە خوداوە، جا کاتێ کەسێکتان خەوێکی خۆشی بینی، بانەیگێڕێتەوە بۆ کەس، مەگەر بۆ دۆستو خەونزان، بەڵام کاتێ خەونێکی ناخۆشی دی، با لەلای چەپیەوە سێ تف رۆبکا، وە پەنابگرێ بەخودا لەشەڕی شەیتانو لە شەڕی ئەو خەونەو ئیتر بۆ کەسی نەگێڕێتەوە، ئیتر خوا یاربێ زیانی نابێ بۆی). {تاج/٤، زنجیرە: ١، لاپەڕە: ٦٠٧، ژمارە: ٤٢٤٣}.

**١١٨٤) کاتێ خەونێکی ناخۆش دەبینێ، با پەنابگرێ بەخوداو وەرچەرخێ بۆسەر لایەکەی تری**

**بَابٌ: إِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلْيَتَعَوَّذْ وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ**

١٥١٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يَكْرَهُهَا فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاثًا، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ثَلاثًا، وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ». {الحديث: ٥٨٦٤ = ٥٨٥٨ فم = فتح الملهم}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ کەسێ لەئێوە خەونێ دەبینێ، ئەگەر پێی ناخۆش بوو، با لەلای چەپیەوە سێ تف رۆبکا، وە سێجار پەنابگرێ بەخودا لەشەڕی شەیتان، وەبا وەرچەرخێ لەسەر ئەو لایەی کە لەسەری راکشاوە بۆسەر ئەولاکەی تری).

**١١٨٥) خەونی موسوڵمان یەك بەشە لەچلو شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی.**

(٥٨٥٧ - ٥٨٩٦)

**بَابٌ: رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ**

١٥١٩- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ». {الحديث: ٥٨٦٩ =

٥٨٦٣ فم. تجريد/٥/٣٤٥، رقم: ٢٠٨٧ = بخاري. تفسير: ٧٠١٧. ترمذي. رُؤيا: ٢٢٩١. أبو داود. أدَب: ٥٠١٨} :

**عوبادەی کوڕی صامیت** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (خەونی موسوڵمان یەك بەشە لەچلو شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی).**
{تاج/٤، زنجیره: ١، ژماره: ٤٢٣٩}.

## ١١٨٦) کاتێ شەو ڕۆژ بەرابەر بوون، زۆر نزیکە کە خەونی موسوڵمان هەڵەی نەبێ
## بَابٌ: إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ

١٥٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُكُمْ حَدِيثًا، وَرُؤْيَا الْمُسْلِمِ جُزْءٌ مِنْ خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ، وَالرُّؤْيَا ثَلاَثَةٌ: فَرُؤْيَا الصَّالِحَةِ بُشْرَى مِنَ اللَّهِ، وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَرُؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ الْمَرْءُ نَفْسَهُ، فَإِنْ رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ، وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا النَّاسَ»، قَالَ: «وَأُحِبُّ الْقَيْدَ وَأَكْرَهُ الْغُلَّ، وَالْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ». فَلاَ أَدْرِي هُوَ فِي الْحَدِيثِ أَمْ قَالَهُ ابْنُ سِيرِينَ. {الحديث: ٥٨٦٥ = ٥٨٥٩ فم. تەجریدی بوخاری بەکوردی/٥/٣٤٥، رقم: ٢٠٨٧ = ٧٠١٧ فتح الباري. أبو داود. أدب: ٥٠١٩. ترمذي. رؤيا: ٢٢٧٠. تحفة الأشراف: ١٤٤٤٤} :

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (کاتێ شەوو ڕۆژ بەرابەر بوون، وەك ناوەڕاستی وەرزی بەهارو ناوەڕاستی وەرزی پاییز، لەوکاتەدا زۆر نزیکە کە خەونی موسوڵمان هەڵەی نەبێو ڕاست دەرچێ، ئەوکەسەیشتان خەونی زۆر ڕاستو دروستە کە خۆی زۆر ڕاستگۆیە. وە خەونی موسوڵمان بەشێکە لەچلو پێنج بەش لە پێغەمبەرایەتی، خەونیش سێ جۆرە: خەونی باش، ئەمەیان مژدەی خۆشە لە خوداوە بۆ بەندە. هەندێ خەونی تریش خەمو خەفەتە، ئەمەشیان لەشەیتانەوەیە. هەندێ خەونی تریش قسە جوینەوەو ووڕاوەی دەروونە، کەسێ خەیاڵی لای شتێ بێ دیارە خەونی پێوە دەبینێ! چونکە لەوەپێش ئەوەندە لەدڵی خۆیدا بیری لێ کردۆتەوە لەخەویشدا هەر دێتەوە خەوی،

ئەمەشیان بایەخی نییە. جا ئەگەر کەسێکتان خەونێکی وای دی کە بەدڵی نەبوو با هەڵسێ و نوێژبکاو ئەو خەونە نەگێڕێتەوە بۆ خەڵك!).

ئەبو هورەیرە دەیفەرموو: من بەش بەحاڵی خۆم دیتنی پێوەندو پابەندم لەخەونـدا پێ خۆشـە، چونکە نیشانەی بەنـدەیی خودایـە، بـەڵام حـەز لـەدیتنی زنجیری مل ناکەم لەخەوندا، چونکە نیشانەی باش نییـە، بـەڵام پابەنـد نیشانەی دامەزراوییە لە ئاییندا، بۆیە حەزم لێیەتی. {فتح الملهم رقم: ٥٨٦٠}.

بەڵام عەبدول وەهابی ئەل – ثەقەفی لەکۆتایی ئەم گێڕانەوەیەدا دەفەرموێ: (نازانم ئەم رستەی: «وَأُحِبُّ الْقَيْدَ وَأَكْرَهُ الْغُلَّ، وَالْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِى الدِّينِ»: واتە: من بەش بەحاڵی خۆم، دیتنی پێوەندو پابەندم لەخەوندا پێ خۆشە، چونکە نیشانەی بەنـدەیی خودایـە، بـەڵام حـەز لـەدیتنی زنجیری مـل ناکـەم لەخەونـدا، چـونکە نیشانەی باش نییـە، بـەڵام پابەنـد نیشانەی دامەزراوییـە لـە ئاییندا، بۆیـە حـەزم لێیەتی).

بـەڵام نـازانم ئـەم رسـتەیە بەشـێکە لـە فەرموودەکـەی پێغەمبـەر یـا قسـەی موحەممەدی کوڕی سیرینە!). {تاج/٤، زنجیرە: ١، ژمارە: ٤٢٤٢}.

## ١١٨٧) خەونی خەو پەرژینکراو
## بَابٌ: مَا جَاءَ فِي تَأْوِيلِ الرُّؤْيَا

١٥٢١- عَنِ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) كَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أَرَى اللَّيْلَةَ فِى الْمَنَامِ ظُلَّةً تَنْطِفُ السَّمْنَ وَالْعَسَلَ، فَأَرَى النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ مِنْهَا بِأَيْدِيهِمْ، فَالْمُسْتَكْثِرُ وَالْمُسْتَقِلُّ، وَأَرَى سَبَبًا وَاصِلاً مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ، فَأَرَاكَ أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ، فَعَلاَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلاَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَانْقَطَعَ بِهِ، ثُمَّ وُصِلَ لَهُ فَعَلاَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِى أَنْتَ وَاللَّهِ لَتَدَعَنِّى فَلأَعْبُرَنَّهَا. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «اعْبُرْهَا». فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ:

أَمَّا الظُّلَّةُ فَظُلَّةُ الإِسْلاَمِ، وَأَمَّا الَّذِى يَنْطِفُ مِنَ السَّمْنِ وَالْعَسَلِ فَالْقُرْآنُ حَلاَوَتُهُ وَلِينُهُ، وَأَمَّا مَا يَتَكَفَّفُ النَّاسُ مِنْ ذَلِكَ، فَالْمُسْتَكْثِرُ مِنَ الْقُرْآنِ وَالْمُسْتَقِلُّ مِنْهُ. وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ فَالْحَقُّ الَّذِى أَنْتَ عَلَيْهِ تَأْخُذُ بِهِ فَيُعْلِيكَ اللَّهُ بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ، رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ، ثُمَّ يُوصَلُ لَهُ فَيَعْلُو بِهِ، فَأَخْبِرْنِى يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِى أَنْتَ أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا»، قَالَ: فَوَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَتُحَدِّثَنِّى مَا الَّذِى أَخْطَأْتُ؟ قَالَ: «لاَ تُقْسِمْ». {الحديث: ٥٨٨٧ = ٥٨٨٢ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ٣٤٧، رقم: ٢٠٩١ = ٧٠٤٦، ٧٠٠٠. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٢٦٧، ٣٢٦٩}:

عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبە (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمشەو لەخەومدا پەڵەیەك هەورم دینی، ڕۆنو هەنگوینی لێ دەچۆڕایەوە، بینیشم کە ئەو خەڵکە بەهەردوو لەپی دەستیان لێیان دەگرتەوە، هەبوو زۆرو هەبوو کەمی گرتبۆوە!

وەبینیشم کەمەندێ لە ئاسمانەوە شۆڕبۆتەوەو گەیشتۆتە سەر زەوی، وە تۆم دی ئەو کەمەندەت گرتو سەرکەوتیت، لەپاش تۆ پیاوێکی تر گرتیو ئەویش سەرکەوت، لەپاش ئەو پیاوێکی تریش هەروا، لەپاش ئەو پیاوێکی تریش گرتی، بەڵام کەمەندەکە لەدەستیدا پسا! هەتا بەستیانەوە بەیەکەوە بۆیو ئەویش سەرکەوت.

ئەبو بەکری صەدیقیش (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بەقوربانت بێ، بەخودا دەبێ وازم لێ بهێنی من ئەم خەوە لێك دەدەمەوە. فەرمووی: (باشە خەوپەرژێنی بکە) ئەبوبەکریش فەرمووی: پەڵە هەورەکە کەپرو ساباتی ئیسلامە، ئەو ڕۆنو هەنگوینەیش کە دەچۆڕایەوەو لێی دەتکا، ئەوە شیرینیو نەرمو ناسکیو نازداری قورئانە، ئەوەیش کە ئەو خەڵکە بەهەردوو بەری دەستیان لێیان دەگرتنەوە، ئەوەیە کە هەندێ کەس زۆر لە قورئانا وەردەگرنو

هەندێ کەس کەم. ئەو کەمەنـدەیش کە لەئاسمانـەوە گەیشتبووە سـەر زەوی، ئـەو ئایینـە هـەق‌و راسـت‌و دروسـتەیە کـە کـەتوی لەسـەریت، ڕێگـەی هـەق‌و راسـتی ئیسلامە، هەر لەسەری دەڕۆیت‌و هەر خودا پلەو پایەت جار لەگەڵ جاردا بلێنـدتر دەکا، لەپاش تۆیش پیاوێ ڕێگەی راستی تۆ دەگرێ‌و پێی بلێند دەبێتـەوە، پیـاوێکی تریش دوای ئەو هەروەها، لەپاشدا پیاوێکی تریش دەیگرێ‌و لەسـەری دەڕوا، بـەڵام لەدەستیدا دەپچڕێ‌و بۆی دەبەستنەوە بەیەکەوە، جا ئەویش پێی بەرز دەبێتەوە!

جـا ئـەی پێغەمبـەری خـودا! بـاوکم بـەقوربانت بـێ، پـێم بفـەرموو کـە ئایـا پێکاومە یا بەهەڵەدا چووم؟

پێغەمبــەریش (درودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: (هەنـدێکیت پێکـاوەو هەنـدێکیت هەڵە کردووە).

ئەبوبــەکر فــەرمووی: دەســا بــەخودا ئــەی پێغەمبــەری خــودا! دەبــێ پــێم بفەرمووی کە کامـەیم بەهەڵـە خـەو پـەرژێن کـردووە، فـەرمووی: (سـوێند مـەخۆ پێت نالێم). {تاج/٤، لاپەڕە: ٦٢٠، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٤٢٦٤ ج/٤}.

### ١١٨٨) کەسێ شەیتان لەخەوندا، یاری بە ئەقڵی کرد با نەیگێڕێتەوە.
### (٥٨٥٧ - ٥٨٩٦)
### بَابٌ: لا يَخْبِر بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ بِهِ فِى مَنَام

١٥٢٢- عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمـا) قَـالَ: جَـاءَ أَعْرَابِـيٌّ إِلَـى النَّبِـيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! رَأَيْتُ فِى الْمَنَامِ كَأَنَّ رَأْسِى ضُـرِبَ فَتَـدَحْرَجَ، فَاشْتَدَدْتُ عَلَى أَثَرِهِ، فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) لِلأَعْرَابِـيِّ: «لاَ تُحَـدِّثْ النَّاسَ بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ بِكَ فِى مَنَامِكَ». وَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بَعْدُ يَخْطُبُ فَقَالَ: «لاَ يُحَدِّثَنَّ أَحَدُكُمْ بِتَلَعُّـبِ الشَّـيْطَانِ بِـهِ فِـى مَنَامِـهِ». {الحـديث: ٥٨٨٥ = ٥٨٨٠ فم}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: عـارەبێکی دەشـتەکی هاتـە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخەوما بینـیم

وەكوو لەسەرم بدرێ‌و سەرم بپەڕێ‌و خلۆر ببێتەوە وا بوو، وە خۆیشم رامكرد بەشوێنیا! دەبێ ئەمە واتەی چی بێ؟ فەرمووی بە ئەعرابییەكە: (ئەمە خەونی تێكەڵ‌و پێكەڵە، لەخەوتا شەیتان وازی پێ كردووی، شتی وا مەگێڕەوە بۆ خەڵك).

وە فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست وتاری دەدا، فەرمووی: (كەسێكتان خەونێكی هەڵەشەو پەڵەشەی بینی‌و لەخەونیدا شەیتان یاری بە ئەقڵی كرد، باشتی وا نەگێڕێتەوە بۆ خەڵك). {تاج/٤، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٤٢٤٧ چ/٤}.

## (پوختەی نامەی شیعرو نامەی خەون)

١- شیعر لەكۆن‌و نوێدا دوو جۆری هەیە، باش‌و خراپ باشەكەی ئەوەیە سوودێكی كۆمەڵایەتی، یا رەوشتی، یا زانستی، یا ئایینی، یا نیشتمانی تیابێ، هەر شیعرێ لەم سووڕكەدا بخولێتەوە، ئەوە دروستە، بگرە پەسەندو جوانە، وەئەم جۆرە شیعرە لە قورئان‌و سوننەتدا مۆڵەتی پێ دراوە، وەهەر لەم روانگەوەیە كە زۆرینەی مامۆستاو پێشەوا ئایینی‌و دینی‌و كۆمەڵایەتییەكان، شیعریان داناوەو بەڵگە سازی‌و نموونەیان بەشیعر هێناوەتەوە.

خراپەكەیشی ئەوەیە، كەوەك ماكی گوڵی، كۆمەڵگا چەپەڵ دەكا، دژی بەها بەرزە مرۆییەكانە، دژی ئایینە، دژی رەوشتی بەرزە، دژی باوی جوانە، هەر بەدەوری گەندەڵی‌و باخەڵ‌و ناوگەڵدا، دەسووڕێتەوە.

٢- گوێگرتن لەشیعری باش جوان‌و پەسەندە، پێغەمبەر خۆی شتی وای كردووە، بگرە داوایشی كردووە كە شیعری وای بۆ بخوێنرێتەوە هەتا گوێی لێ بگرێ.

٣- پەسنی شیعری باش سوننەتە، پێغەمبەر خۆی كردوویەتی.

٤- خوودا نە شیعر، بەشێوەیەكی وا، كە پەكی كارو پێشەو خواپەرستی بخا، یا سەربكاتە هەجوو زەمی خەڵك بەناهەق، وەك زۆرینەی شاعیران، بەدرێژایی

مێژوو، هەر خەریکی مەتحی درۆو شتی وا بوون، خوودانە شیعر بەشێوەی وا نادروستە.

٥- مەتحی لەروو باش نییە، مەگەر بەپێی چەند مەرجێ.

٦- خەون بینین هەقە، خەون دیاردەیەکی مرۆییە، لە قورئانو نامە پیرۆزەکانی تری ئاسماندا، خەون بە دیاردەیەکی راستو دروست دانراوە.

٧- دەستوورەکانی خۆپاراستن لەشەڕی خەوی خراپ کردنی ئەم شەش شتەیە:

أ/ پەنابگرێ بەخوا لەشەڕی ئەو خەونە.

ب/ پەنابگرێ بەخوا لەشەڕی شەیتان.

ج/ سێ تف لەلای چەپیەوە بکا، بەشێوەیێ کە کێشەیێ بۆ خۆی، یا بۆ کەسێ دروست نەبێ.

د/ بۆکەسی نەگێڕێتەوە.

ه/ هەستێ نوێژبکا، بەلایەنی کەمەوە دوورکات نوێژ بکا، ئیتر هەر جۆرە نوێژێ بێ، بریتی دەکەوێ، بەزەینم دروستە دوورکات نوێژی سوننەت بکا، بەنیازی رزگاربوون لەشەڕی ئەو خەونەوە.

و/ ئەو لایە بگۆڕێ کە لەسەری راکشاوەو خەونەکەی دیوەو وەرچەرخێ بۆسەر تەنیشتەکەی تری.

نەوەوی لەشەرحی صەحیحی موسلیمدا، لەم شوێنەدا دەفەرموێ: (دەبێ کار بەکۆی ئەم گێڕانەوانەی صەحیحی موسلێمە بکرێ، کاتێ کەسێ خەونێکی ناخۆشی خراپ دەبینێ، با سێ تف بەلای چەپا بکاو بلێ: (أعُوذُ بِاللّهِ مِنَ الشيطانِ وَمِنْ شَرِّها: پەنا دەگرم بەخودا لەشەڕی شەیتانو لەشەڕی ئەم خەونە، وە وەرچەرخێ بۆسەر تەنیشتەکەی تری، وە دوو رکات نوێژ بکا، ئەگەر ئەمانە بکا، ئەوە کاری بەکۆی هەموو گێڕانەوەکان کردووە، خۆ ئەگەر تەنیا هەندێ لەمانەیش بکا، بەسیەتی بۆ دوورخستنەوەی شەڕی ئەو خەونە، وەك فەرموودەکان بەڕاشکاوی ئەوە دەڵێن). فەرمایشتی نەوەوی هاتە کۆتایی.

٨- خەو هەڵبەستن بەدرۆ، تاوانێکی گەورەیە، لە موسوڵمانی باش ناوەشێتەوە، لە فەرموودەدا هەڕەشە لەشتی وا بەتوندی کراوە.

٩- هەندێ کاتی باش هەیە بۆ خەون بینین، وەك کاتی بەهارو پاش نوێژی بەیانیو خەونی پیاوی باشو خەونی پێغەمبەران.

**تیبینی دووەم سەبارەت بەم بابەتە:**

وەك لەکۆتایی زنجیرەی: ٦٧٦، ژمارە: ٨٧٣ وە روونمان کردەوە، کە زۆر لە مامۆستاو سوودمەندانو بەهرەمەندان لەم کتێبە پیرۆزانە، دەفەرموون: روونکردنەوەو ژینامەکان زۆر جێگەی سوودو کەڵكو بەهرەنو سەرچاوەن بۆ زۆر داستانو بڕیارو سوودو بەهرەی جۆر بەجۆر، بەڵام هەروا بەئاسانی ناکەونە بەرچاو، جا والەسەر داوای ئەو مامۆستاو بەهرەمەندە بەڕێزانە لێرەشدا کۆمەڵێ تر لە ژینامەی سەحابەو راوییەکان دەنووسین، کە بەژمارە: (٨٧٦) بەناوی (خاتوو ثووەیبەی دایەنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەوبێ) دەست پێ دەکەین).

**بەشی دووەم لە: لیست و ناوی ئەو هاوەڵ و کەسانەی کە لەژمارە (٨٧٦)وە دەست پێ دەکەن**

| ژمارەی زنجیرە | ناوی خاوەن ژیننامە، یا بابەت | ژمارەی فەرموودە |
|---|---|---|
| ١٤٧ | ثووەیبەی دایەنی پێغەمبەر | ٨٧٦ |
| ١٤٨ | هیندی کچی عوتبە دایکی موعاوییە | ٨٨٧ |
| ١٤٩ | بەریرە (کارەکەرو ئازادکراوی عائیشە) | ٨٩٦ |
| ١٥٠ | مەعمەری کوڕی عەبدوڵڵای کورشی نەضلە | ٩٠٨ |
| ١٥١ | مەڕوانی کوڕی حەکەم | ٩١٠ |
| - | باسی حیلە شەرع | ٩٢٦ |
| ١٥٢ | أبو طەيبة الحجّام | ٩٣٥ |

| | | |
|---|---|---|
| - | باسی ئەموستیلەو نقێمی ئەمووستیلە بۆ ژنو بۆ پیاو | ١٣٧٩ |
| - | باڕۆکەو قژدانە دەم قژو شتی وا، وەك چاندنی موو بۆسەر یابۆ ریش یا برۆ | ١٣٨٥ + ١٣٩٥ |
| - | خۆی لەمزگەوتەو ژنەکەی لەماڵەوە نیوە رووتو قووتە | ١٣٨٨ |
| ١٨٦ | ئەبو ئوسەیدی ساعیدی | ١٤٠٤ |
| ١٨٧ | ثابیتی کوڕی ئەسلەمی ئەل-بەنانی | ١٤٣١ |
| - | رەفتار لەگەڵ خاوەن نامەدا لە وڵاتی خۆمانا | ١٤٣٢ |
| - | ئاموشۆو پێکەوە دانیشتنی خێزان | ١٤٣٩ |
| ١٨٨ | ئەسمائی کچی عومەیس | ١٤٤٠ |
| ١٨٩ | هیتو عەبدوڵلای باوك برای ئوم سەلەمەو ماتیعو هەدم | ١٤٤١ |
| ١٩٠ | عوثمانی کوڕی ئەبولعاصی ئەل-ثەقەفی | ١٤٤٨ |
| ١٩١ | خەولەی کچی حەکیم ئەل — سولەمییە | ١٤٥٩ |
| - | پوختەی نامەی نزا (كتاب الدعاو) | ١٤٦٢ |
| - | عودی هیندیو کوستو قوسط | ١٤٧٧ |
| ١٩٢ | شەریدی کوڕی سووەیدی ئەل - ثەقەفی | ١٤٩٠ |
| ١٩٣ | لەبیدی کوڕی رەبیعە / الشاعر المشهور | ١٥٠٧ |

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٤٩- نامەی گەورەیی‌و پایە بەرزی

## كِتابُ الفَضَائِل

{بڕوانە: تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی سێیەم، زنجیرە: ١، لاپەڕە: ٥٣٠، لەژمارە: ٣٢٢١ وە هەتا ژمارە: ٣٥٨٩. لە زنجیرە یەکەوە هەتا زنجیرە: ٧٠ + تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی چوارەم، لاپەڕە: ١٣٧، لە زنجیرە: ٦٦ وە هەتا زنجیرە: ٦٧، لە ژمارە: ١٤٤٩ وە هەتا ١٥٢٢}.

### گەورەیی‌و پایە بەرزیی پێغەمبەری خودا (درووودی خودای لەسەر بێ)

### فَضائِلُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

### ١١٨٩) خودای گەورە پێغەمبەری هەڵبژاردووە

### بابٌ: اصْطِفاءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٥٢٣- عَنِ وَاثِلَةَ بْنَ الأَسْقَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ عَلَيْهِ السَلاَمْ، وَاصْطَفَى قُرَيْشًا مِنْ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ». {الحديث: ٥٨٩٧ = ٥٨٩٣ فم = ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لأحاديثِ صحيح مسلم + ترقيم فتح الملهم لِلأحاديث صحيح مسلم. ترمذي. مَناقب: ٣٦٠٥، ٣٦٠٨}:

واثیلەی کوڕی ئەسقەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درووودی خودای لەسەر بێ): (خودای گەورەیٔ شکۆدار، لەناو هەموو وەچەو نەوەی ئیسماعیلدا، کینانەی هەڵبژاردووە، کە یەکێکە لە باپیرە گەورەکانم، وە لەناو وەچەو نەوەی کینانەیشدا، هۆزی قوڕەیشی هەڵبژاردووە، وە لەناو هۆزی قوڕەیشیشدا کوڕانی هاشم (بەنی هاشم)ی پەسەند کردووە، وە لەناو کوڕانی هاشمیشدا منی پەسەند کردووە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨، لاپەڕە: ٣٩٢، ژمارە: ٣٠٧٠. چاپی چوارەم}.

### ١١٩٠) فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ): من گەورەی نەوەی بابە ئادەمم

### بَابٌ: قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ

١٥٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ): «أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْـهُ الْقَبْـرُ، وَأَنَـا أَوَّلُ شَـافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَـفَّعٍ». {الحـديث: ٥٨٩٩ = ٥٨٩٥ فـم. أبـو داود. السـنة: ٤٦٧٣. تحفـة الأشـراف: ١٣٥٨٦}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی:** (لەرۆژی دوارۆژدا من سەرگەورەی سەرجەم نەوەی ئادەمم، وە یەکەم کەسیشم کە دەمی گۆڕم بۆ دەکرێتەوەو لـەگۆڕ دێمـە دەرەوە، وە یەکـەم تکا کاریشم، وە یەکـەم کەسیشم کە لەلای خـودای گـەورە تکام گـیرا دەبـێ!). {بڕوانـە: تـاج/٣، زنجـیرە: ٨١، لاپەڕە: ٣٩١، ژمارە: ٣٠٦٤ چاپی چوارەم = ج/٤}.

### ١١٩١) نموونەی ئەو ڕێنمایی‌و زانستەی کە خودای گەورە بە پێغەمبەردا ناردوویەتی

### بَابٌ: مَثَلَ مَا بَعَثَنِي بِهِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنَ الْهُدَى وَالْعِلْمِ

١٥٢٥- عَنْ أَبِي مُوسَـى الأَشْـعَرِي (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ مَثَلَ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ الْهُدَى وَالْعِلْـمِ، كَمَثَـلِ غَيْـثٍ أَصَـابَ أَرْضًا، فَكَانَتْ مِنْهَا طَائِفَةٌ طَيِّبَةٌ، قَبِلَتِ الْمَاءَ، فَأَنْبَتَتِ الْكَلأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَكَانَ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتِ الْمَاءَ، فَنَفَعَ اللَّهُ بِهَا النَّاسَ، فَشَرِبُوا مِنْهَا وَسَقَوْا، وَرَعَوْا، وَأَصَابَ طَائِفَـةً مِنْهَا أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لاَ تُمْسِكُ مَاءً، وَلاَ تُنْبِتُ كَلأً، فَذَلِكَ مَثَلُ مَـنْ فَقُـهَ فِـي دِيـنِ اللَّهِ وَنَفَعَهُ بِمَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ، فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا، وَلَمْ يَقْبَـلْ هُـدَى اللَّهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِـهِ». {الحـديث: ٥٩١٢ = ٥٩٠٨ فـم. تجريـد/١، رقـم: ٦٩ = ٧٩ فـتح الباري. تحفة الأشراف: ٩٠٤٤}:

**ئەبو مووسای ئەشعەری** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (نموونەی ئەو ڕێنمایی‌و زانستە جوانەی، کە خودای گەورە بەمنا ناردوویەتی، بۆ ئەو خەڵکە، وەك بارانێکی زۆری بەپیت‌و فەڕوایە، کە بباریٚ لە** خاکێ، بەشێکی خاکێکی پاك‌و بەپیز بێ‌و باراناوەکە بگرێتە خۆی‌و لەوەڕو گیایەکی زۆری پێ سەوزبێ، وە بەشێکی تری زەوییەکی ڕەقەن‌و رووتەن بێ، شینایی‌و سەوزایی نەڕوێنێ، بەڵام ئاوەکە قووت نەداتەوە، بەڵکوو گلی بداتەوەو ببێ بە ئەستێڵ‌و بە گۆماوو بەکانیاو، وە خودا بیکات بە مایەی خێرو خۆشی‌و سوودو کەڵك بۆ مەردوم، چی بۆ خۆیان‌و چی بۆ ماڵاتیان: بەم ڕەنگە: هەم خۆیان لێی بخۆنەوەو هەم ئاژەڵ‌و ماڵاتیانی پێ ئاو بدەن‌و هەم کشتووکاڵی لەبەرنا بکەن، وە بەشێکی تریشی دەشتایی‌و شۆرەکات بێ، نە ئاو گل بداتەوەو نە لەوەڕیش بلەوەڕێنێ، جا ئەم خاك‌و بارانە نموونەو وێنەن بۆ ئەو کەسە خودا پێداوانە، کە لەئایینی خودا شارەزا دەبن‌و بە فەرمانی خودا لەم ئایینی منە سوودو بەهرە وەردەگرن‌و، هەم خۆیان فێری زانین دەبن‌و هەم خەڵکی تریش فێردەکەن، بەهۆی ئەوەوە لەهەردوو جیهانا سەریان پێی بەرزدەبێتەوە، هەروەك نموونەو وێنەیشن بۆ ئەو کەسانەیش کە سەریان پێی بەرز نابێ‌و، ئەو هیدایەت‌و دینە ڕاستەی کە خودا بەمنا ناردوویەتی ئەوان نایانەوێ‌و وەری ناگرن!). {ڕیاض/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١٦٢ + تاج/١، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١١٢ ج/٤}.

١٥٢٦- عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلَ مَا بَعَثَنِيَ اللَّهُ بِهِ، كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْمَهُ، فَقَالَ: يَا قَوْمِ إِنِّي رَأَيْتُ الْجَيْشَ بِعَيْنَيَّ وَإِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ فَالنَّجَاءَ، فَأَطَاعَهُ طَائِفَةٌ مِنْ قَوْمِهِ فَأَدْلَجُوا فَانْطَلَقُوا عَلَى مُهْلَتِهِمْ، وَكَذَّبَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ فَأَصْبَحُوا مَكَانَهُمْ، فَصَبَّحَهُمُ الْجَيْشُ، فَأَهْلَكَهُمْ وَاجْتَاحَهُمْ، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ أَطَاعَنِي وَاتَّبَعَ مَا جِئْتُ بِهِ، وَمَثَلُ مَنْ عَصَانِي وَكَذَّبَ مَا جِئْتُ بِهِ مِنَ الْحَقِّ».

**{الحديث: ٥٩١٣ = ٥٩٠٥ فم. تجريد/٥/٢٧٣، رقم: ٢٠١٥ = ٦٤٨٢، ٧٢٨٣. تحفة الأشراف: ٩٠٦٥}:**

ئـەبو مووسـای ئەشـعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی: (نموونەی منو نموونەی ئەم ئايينە پيرۆزەی کە خـودای گـەورە بەمنـدا ناردوويەتی، وەك نموونەی پياوێکی راسـتگۆ وايـە، کـە بەدڵسـۆزی هۆزەکـەی خـۆی، لەمەترسييەکی گەورەی نزيك هۆشيار بکاتەوە، بچێتە ناويانو بڵێ: ئەی خزمينـە! ئەی خزمەکانم! من بەچاوی خۆم، ئەو سوپايەم دی، کە هاتوون بۆسەر ئێوە، وەمن ترسێنەرێکی راستو دروستو پـەتيم بـۆ ئێـوە، دەی هـەتا زووە خۆتـان رزگارکـەن، درەنگە درەنگ!

جا کۆمەڵێ لەهۆزەکەی بڕوای پێ بکەنو بـەگوێی بکـەنو رزگاريـان ببـێ، بـەم شـێوەيە: لەسـەرەتای شـەوەوە لەسـەرەخۆ، شـەو رەوی بکـەنو خـۆ قوتـار بکـەن لەدەسـتی شـەبەيخوونی ئـەو لەشـکری دوژمنــە، بـەڵام کۆمـەڵێکی تريـان هۆشـيار کردنەوەکـەی ئـەو کەسـە دڵسـۆزەيان بـەدرۆ بـزانن و بـاوەڕ بـە ئامۆژگارييـەکانی نەکـەنو بـێ ئاگـاو بـێ باکانـە پشـتی لێبەنـەوە، هـەتا لەگـەڵ بـەيانا سـوپاکە بـدا بەسەرياندا، تەفرو تووناپان بکەنو بە فەتارەتيان بەرن.

دەی کۆمەڵەی يەکەم سەر مەشقێ جوانن بۆ ئەوانەی کە بەگوێی مـن دەکـەنو پەيڕەوی بەرنامەکەی من دەکەنو دەستەی رزگارو رزگارين!

دەستەی دووەميش نموونـەن بـۆ ئەوانـەی کـە لەفـەرمانی مـن دەردەچـنو ئـەم ئايينە پيرۆزە راستو دروستەی من بەدرۆ دەزانن!).

**١١٩٢) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواوکەری کۆمەڵەی پێغەمبەرانەو کۆتا پێغەمبەريانە (دروودی خودای لەسەريان بێ)**

**بَابٌ: تتميم الأنْبِيَاءِ وَخَتْمِهِمْ بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وبارك وَسَلَّمَ)**

١٥٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَثَلِي وَمَثَلُ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي، كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بُنْيَانًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ، إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ مِنْ زَوَايَاهُ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، وَيَعْجَبُونَ لَهُ وَيَقُولُونَ: هَلاَّ وُضِعَتْ هَذِهِ

اللَّبِنَــةُ؟ قَــالَ: فَأَنَــا اللَّبِنَــةُ، وَأَنَــا خَــاتَمُ النَّبِــيِّينَ». {الحـديث: ٥٩٢٠ = ٥٩١٦ فــم. تجريد/٤/٩٨، رقم: ١٤٠٩ = ٣٥٣٦ فتح الباري. ترمذي. أمثال: ٢٨٦٤} :

ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (داستانی منو داستانی پێغەمبەرەکانی پێش من، وەك داستانی پیاوێ وایە، خانووبەرەیێ هەڵبخاو تەلارێ دروست بکاو، لەهەموو لایەنێکەوە زۆر بەجوانی دروستی بکاو بەباشی بیرازێنێتەوە، تەنیا شوێنی تاقە یەك خشت نەبێ کە لە گۆشەیەکا، لە گۆشەکانی تەلارەکە چۆڵ بێ، دەستە دەستە خەڵك بەناویا بسوورێنەوەو بڵێن: ئەم کۆشکە چەندە خۆشە! خۆزگە ئەم خشتەیش دادەنراو شوێنەکەی ئاوا چۆڵ نەدەبوو!).

فەرمووی: (دەی من ئەو خشتەیەمو ئەو چۆڵییەم پڕ کردۆتەوەو، بووم بەدواترین پێغەمبەر، کۆتا پێغەمبەرمو ئیتر لەپاش من پێغەمبەری تر نابێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٣٠٧١}.

### ١١٩٣) بەرد سڵاوی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکرد. (٥٨٩٧ - ٥٨٩٨)

### بَابٌ: تَسلِمْ الحَجَرْ على النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)

١٥٢٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنِّي لأَعْرِفُ حَجَرًا بِمَكَّةَ كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ، إِنِّي لأَعْرِفُهُ الآنَ». {الحديث: ٥٨٩٨ = ٥٨٩٤ فم} :

جابیری کوڕی سەموورە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (بەردێ هەیە لە مەککە دەیزانم، بەرلەوە کە بکرێم بە پێغەمبەر، ئەو بەردە سڵاوی لێ دەکردم، ئێستایش دەزانم ئەو بەردە کامەیە). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٣١٤١ ج/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٣١٤٢}.

**روونكردنەوە:**

لە قورئانو نامە پیرۆزەكانی پێش قورئانو لە صەحیحی سوننەتدا كۆمەڵێ زانیاری هەیە لەسەر:

١- دارو بەردیش زمانیان هەیەو قسەو گفتوگۆو راكردنو رۆیشتنو زۆر شتی سەیری تریش دەكەن، لەسەر رووی راستی، نەك لەسەر شێوەی مەجازو شتی وا، هەروا هەندێ گیانداری بێ زمانیش، لەسەر شێوەی خەواریقو موعجیزە قسە دەكەن، وەك ئەم بەردەو ئەو بەردەی جلەكانی مووسای فڕاند، وەك ئەو خواردنانەی كە لەبەردەم پێغەمبەردا تەسبیحاتیان دەكرد. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٠٧، ژمارە: ٣١٨١ + زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٣١٨٣، ٣١٨٤ چ/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٣١٤٢}.

٢- لە قورئانا ئەوەی واتیا كە هەموو شتێ تەسبیحات دەكا، بەرد لە خەشیەتو سامو هەیبەتی خودا بەردەبنەوەو شەقار شەقار دەبن، میروولەو پەپوو سلێمانە قسەیان كردووە، زۆر شتی تری لەم بابەتەز {بڕوانە: ژمارە: ١٦١٠ كە لەدواوە دێت. باسی فڕاندنی جلەكانی مووسا}.

## ١١٩٤) ئاو وەك كانیاو لەنێوانی پەنجەكانی پێغەمبەرەوە هەڵقوڵاوە.

(٥٩٠٠ - ٥٩٠٨)

### بَابٌ: نَبعَ مِنْ بَيْنِ أَصابعِ النَّبِيِّ (صلَّى اللّهُ عليْهِ وسلم)

١٥٢٩- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَأَصْحَابُهُ بِالزَّوْرَاءِ (قَالَ: وَالزَّوْرَاءُ بِالْمَدِينَةِ عِنْدَ السُّوقِ وَالْمَسْجِدِ فِيمَا ثَمَّهْ) دَعَا بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ، فَوَضَعَ كَفَّهُ فِيهِ، فَجَعَلَ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ جَمِيعُ أَصْحَابِهِ قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كَانُوا يَا أَبَا حَمْزَةَ! قَالَ: كَانُوا زُهَاءَ الثَّلاَثِمِائَةِ. {الحديث: ٥٩٠٢ = ٥٨٩٨ فم. تجريد/١، رقم: ١٣٠ = ١٦٩، ١٩٥، ٢٠٠، ٣٥٧٢، ٣٥٧٣، ٣٥٧٤، ٣٥٧٥. ترمذي. مناقب: ٣٦٣١. نسائي. موضوع: ٧٦}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **لە زەوراء بوو، کە جێگەیەکی زانراو بوو، لەبازاڕی مەدینە، خۆی و کۆمەڵێ لە هاوڕێکانی بوون، لەنزیك زەوارئەوە، کاتی نوێژی عەصر بوو، ئاو نەبوو بۆ دەسنوێژ، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **داوای ئاوی کرد، جامێکی دەم پەلیان بۆ هێنا کەمێ ئاوی تیابوو، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **لەپی تیادانا، ئەنەس فەرموی: کە سەیری ئاوەکەم کرد، لەنێوانی پەنجەکانی پێغەمبەرەوە هەڵ دەقولا، ئیتر هاوەڵەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوەڵانی بێ) هەموویان دەسنوێژیان لەو ئاوە گرت. قەتادە فەرموی: عەرزی ئەنەسم کرد: ئەی باوکی حەمزە! ئەو هاوەڵانەی کە لەو جامە دەسنوێژیان گرت چەند کەس دەبوون؟ فەرموی: ئەندازەی سێ سەد کەس دەبوون). {تاج/١، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥٠، چ/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٣١٧٠}.**

### ١١٩٥) چەند نیشانەو موعجیزەی روون و ئاشکرای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەئاو (٥٩٠٠ - ٥٩٠٨)

### بَابٌ: آيَات النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي الْمَاءِ

١٥٣٠- عَنْ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَامَ غَزْوَةِ تَبُوكَ فَكَانَ يَجْمَعُ الصَّلاَةَ، فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمًا أَخَّرَ الصَّلاَةَ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ بَعْدَ ذَلِكَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَأْتُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى عَيْنَ تَبُوكَ، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَأْتُوهَا حَتَّى يُضْحِيَ النَّهَارُ، فَمَنْ جَاءَهَا مِنْكُمْ فَلاَ يَمَسَّ مِنْ مَائِهَا شَيْئًا، حَتَّى آتِيَ»، فَجِئْنَاهَا، وَقَدْ سَبَقَنَا إِلَيْهَا رَجُلاَنِ، وَالْعَيْنُ مِثْلُ الشِّرَاكِ، تَبِضُّ بِشَيْءٍ مِنْ مَاءٍ، قَالَ: فَسَأَلَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «هَلْ مَسَسْتُمَا مِنْ مَائِهَا شَيْئًا»؟ قَالاَ: نَعَمْ، فَسَبَّهُمَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَقَالَ لَهُمَا مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، قَالَ: ثُمَّ غَرَفُوا بِأَيْدِيهِمْ مِنَ الْعَيْنِ قَلِيلاً قَلِيلاً، حَتَّى اجْتَمَعَ فِي شَيْءٍ، قَالَ: وَغَسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِيهِ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ، ثُمَّ أَعَادَهُ فِيهَا

فَجَرَتِ الْعَيْنُ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ أَوْ قَالَ غَزِيرٍ (شَكَّ أَبُو عَلِيٍّ أَيُّهُمَا قَالَ) حَتَّى اسْتَقَى النَّاسُ ثُمَّ قَالَ: «يُوشِكُ يَا مُعَاذُ إِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ أَنْ تَرَى مَا هَا هُنَا قَدْ مُلِئَ جِنَانًا». {الحديث: ٥٩٠٦ = ٥٩٠٢ فم}:

موعـاذی کـوڕی جەبـەل (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: لەسـاڵی غـەزای تەبووکـدا، لەخزمەتی پێغەمبەردا دەرچووین بۆ ئەم غەزایە، دەستووری پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو لەم غەزایەدا نوێـژە چوارینەکانی کۆدەکردەوە، بـە جـەمع دەیکـردن: نیـوەڕۆو عەصـری پێکـەوە بەیەکـەوە، بـەدوو سـلاوەدانەوە دەکـرد، وە شـێوان و خەوتنانیشی پێکەوە بەیەکەوە بەدوو سلاوەدانەوە دەکرد، لەپێشا نیـوەڕۆی بەچوار رکات دەکردو سـلاوی دەدایـەوە، دوابـەدوا ئـەویش عەصـری بەچـوار رکـات دەکـردو سلاوی دەدایەوە، هەروا شێوان و خەوتنانیش، لەپێشا شـێوانی بەسـێ رکـات دەکـردو سلاوی دەدایەوە، ئەوجا یەکسەر خەوتنانی بەچوار رکات دەکردو سلاوی دەدایـەوە. هـەتا ڕۆژێ نوێـژی دواخسـت، ئـەوجا دەرچـوو، بەجـەمع، بـە کۆکردنـەوە نوێـژی نیوەڕۆو نوێژی عەصـری کـرد، ئـەوجا چـووە ژوورەوە بۆنـاو بارەگاکـەی خـۆی، جـا لەپاشان دیسان دەرچوو بەجەمع، بە کۆکردنەوە نوێژی شێوان و نوێـژی خـەوتنانی بەیەکەوە کرد، لەپاشا فـەرمووی: (خـوا حـەزکا، سـبەینێ دەگەینـە سـەرکانییەکەی تەبووک، چێشتەنگاوێکی درەنگ دەگەنە ئەوێ، جا هەرکەسێ لەئێوە گەیشـتە سـەر کانیەکە دەست نەبا بۆ ئاوەکەی هەتا خۆم دێم!).

جاکاتـێ گەیشـتینە سـەرکانییەکە، ڕوانیمـان وادوو پیـاو لـەپێش ئێمـەدا گەیشـتبوونە سـەرکانییەکە، ڕوانیمـان واکانییەکـە، بەقـەد قـەیتانی سـۆڵێ ئـاوێکی کەمی لەبەر دەڕوا. فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەدوو پیاوەکـەی پرسـی: (ئایا دەستتان لەئاوەکە داوە؟)

گوتیـان: بـەڵێ، پێغەمبـەریش جمێنـی پێیانـدا، وە ئـەوەی کـە حـەزی خـودای لەسـەر بـوو پێیـانی گـوت. فـەرمووی: جـا بەمشـت، کەمـە کەمـە، هـەنێ ئاویـان لـە کانیاوەکە هەڵ گۆزیو لەشتێکا کۆیـان کـردەوە، ئـەوجا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

لەو ئاوەدا هەردوو دەستو دەموچاوی خۆی تیا شۆرد، ئەوجا ئاوەکەی کردەوە ناو کانیەکە، ئیتر بە فەرمانی خودا کانیەکە تەقیو بەخوڕ ئاوی لەبەر دەڕۆیشت، یا فەرمووی: بە لێشاو ئاوی لەبەر دەڕۆیشت. ئەبو عەلی ئەل-حەنەفی، کە مامۆستای مامۆستاکەی ئیمامی موسلیمە، لە رشتەی ئەم فەرموودەیەدا، بەگومان بوو لەوەدا کە فەرموویەتی: (بەخوڕ ئاوی لەبەر دەڕۆیشت) یا فەرموویەتی: (بە لێشاو ئاوی لەبەر دەڕۆیشت). ئیتر خەڵکەکە بەتێرو پڕی ئاویان گرت.

پاشان حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی موعاذ! ئەگەر تەمەنت درێژبێ، بەچاوی خۆت دەبینی، دەوروبەری ئەم کانییە، کە ئێستا وا وشكو برینگە، پڕدەبێ لە باخو باخاتو رەزو دێبەر!)ز

**روونکردنەوە:**

لە فەتحولولهیمدا دەفەرموێ: بە پیتو فەڕی ئەم موعجیزەی پێغەمبەرە، دەوروبەری ئەو کانییە، لەوەدوا کرابوو بە باخو رەزو دارو درەختو سەوزایی گەشو جوان!).

## ١١٩٦) خۆراك بەهۆی پێغەمبەرەوە پیتو فەڕی تێدەکەوێ. (٥٩٠٠ - ٥٩٠٨)

## بَابٌ: بركة النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) في الطَّعَام

١٥٣١- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَطْعِمُ، فَأَطْعَمَهُ شَطْرَ وَسْقِ شَعِيرٍ، فَمَا زَالَ الرَّجُلُ يَأْكُلُ مِنْهُ، وَامْرَأَتُهُ وَضَيْفُهُمَا حَتَّى كَالَهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: «لَوْ لَمْ تَكِلْهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ وَلَقَامَ لَكُمْ».
{الحديث: ٥٩٠٥ = ٥٩٠١ فم}:

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) داوای خۆراکی لێی کرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نیو وەسق جۆی پێ بەخشی، ئیتر پیاوەکە خۆیو ژنەکەیو میوانیان هەر لێیان دەخواردو هەر تەواو نەدەبوو، هەتا رۆژێ پیاوەکە جۆکەی پێوا، ئیتر بەرە بەرە کەم بۆوەو تەواو بوو، جا پیاوەکە

چوو بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی عەرزیکرد، فەرمووی: (ئەگەر نەیت پێوایە، هەتا هەتایە هەر لێتان دەخواردو هەر تەواو نەدەبوو!).

**شت شت یاد دەخاتەوە:**

لە کەرکووک، لە موستەشفا کەرکووکی عەسکەری، کوردێکی مەردی، موسوڵمانێکی پاکی لێ بوو، ناوی (نائب ضابط مضمد/ مەلا جبار) بوو، لەقاوشی حومەییات بوو، لە گەڕەکی ئازادی کەرکووك دائەنیشت، پیاوێکی زۆر بەدین و موتەصەویف بوو، سەر بە تەریقەتی قادری بوو، هەتا بڵێیت سەخی و دەم بەویردو ذیکرو صەڵاوات و یادی خودا بوو، خولیای مزگەوت کردنەوە بوو، لەهەر وەحدەیەکی عەسکەری ببوایە، مزگەوتێکی خنجیلەی لێ دروست دەکرد، لە موعەسکەری رەواندزو لە مەقەری وەحدەت مەیدان طبیە رابیعەو لەمەقەری فوجی یەکی لوای چوارو لە مەرکەز تەدریب و لە موستەشفا کەرکووك عەسکەری، سەرو مزگەوتی خنجیلەو نەشمیلەی دروست کردبوو، کە مزگەوتەکەی (م ل٤)دوایی بوو بە مزگەوتی مەقەڕی فەیلەقی یەك.

لە گەڕەکی ئازادی لە کەرکووك مزگەوتێکی گەورەی دروست کردبوو، بەناوی (مزگەوتی مەلا جەبار). کە جەنابی شێخ عەبدولکەریمی کەرەبچنە هات بۆ کەرکووك ئەو مزگەوتەی کرد بە مەقەڕی تەکیەکەی خۆی.

ئەم مەلا جەبارە کەسایەتییەکی ئایینی زۆر بەهێزی هەبوو، لەڕووی ئایینییەوە شەرمی لەدێو نەدەکرد، لەسەربازێکەوە هەتا قائید فەیلەق، بەیەك شێوە ئامۆژگاری ئایینی دەکردن و داوای لێ دەکردن کە تەریقەت وەربگرن و تەوبە بکەن و ببن بە تەوبەکار، زۆر لە دکتورو ئەفسەرو مەراتیب، دڵیان رادەگرت و شەرمیان لێ دەکردو، بەڕاست یا بەدرۆ تەریقەتیان لێ وەردەگرت و داوای دووعای نزاو بەرەکەت و شتی وایان لێ دەکرد!! من و خێزانم حاجی زەکیەی مەلا کەریم عەلی، تەریقەتمان لێ وەرگرت و هاموشۆی دەکردین و زۆر خۆشمان دەویست، حاجی زەکییە ئێستایش هەردەڵێ دەترسم تەوبەکەم بۆ راگیرنەکرێ! هۆدەکەمان نزیکی

یەکتری بوو، بە گەرمی هاموشۆی یەکتریمان دەکرد، عەصرانێ حەزم لەچابوو، چووم بۆلای مەلا جەبار بۆ چا خواردنەوە، قۆرییەکی بچکۆلەی هەبوو، بەسەر هیتەرەکەوە بوو، قورییەکە رەنگبێ سێ پەرداخی ئاو بگرتایە، تەماشام کرد هەر خەڵك دێ‌و مەلا جەبار چای بۆ تێدەکا، هەرکەسێ دەهات دەیگوت: مامۆستا مەلا جەبار چایی هەیە، ئەویش پەلاماری قوریە بچکۆلەکەی دەداو دەیگوت: بەڵێ، بەڵێ چایی زۆرە، دەیگوت (بسم الله)و چایێ دوانی بۆ تێدەکرد، بەبێ گومان نزیکەی دە پەرداخی گەورە چای لەو قۆرییە بچکۆلە لێ تێکرد، قوریەکە هەروەکوو خۆی پڕبوو، ئیتر هەتا ئێمە لەوێ دانیشتبووین، هەرکەسێ دەهات مەلا جەبار چای بۆ تێدەکردو بە پەرداخ‌و دوو پەرداخ لێی دەبرد!

١٥٣٢- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: لَمَّا حُفِرَ الْخَنْدَقُ رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) خَمَصًا فَانْكَفَأْتُ إِلَى امْرَأَتِي، فَقُلْتُ: لَهَا هَلْ عِنْدَكِ شَيْءٌ؟ فَإِنِّي رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) خَمَصًا شَدِيدًا، فَأَخْرَجَتْ لِي جِرَابًا فِيهِ صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، وَلَنَا بُهَيْمَةٌ دَاجِنٌ، قَالَ: فَذَبَحْتُهَا، وَطَحَنَتْ فَفَرَغَتْ إِلَى فَرَاغِي فَقَطَّعْتُهَا فِي بُرْمَتِهَا، ثُمَّ وَلَّيْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَتْ: لاَ تَفْضَحْنِي بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَمَنْ مَعَهُ، قَالَ: فَجِئْتُهُ فَسَارَرْتُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا قَدْ ذَبَحْنَا بُهَيْمَةً لَنَا وَطَحَنَتْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ كَانَ عِنْدَنَا، فَتَعَالَ أَنْتَ فِي نَفَرٍ مَعَكَ، فَصَاحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَقَالَ: «يَا أَهْلَ الْخَنْدَقِ إِنَّ جَابِرًا قَدْ صَنَعَ لَكُمْ سُورًا، فَحَيَّهَلاً بِكُمْ»، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لاَ تُنْزِلُنَّ بُرْمَتَكُمْ، وَلاَ تَخْبِزُنَّ عَجِينَتَكُمْ حَتَّى أَجِيءَ». فَجِئْتُ وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقْدُمُ النَّاسَ، حَتَّى جِئْتُ امْرَأَتِي، فَقَالَتْ: بِكَ وَبِكَ! فَقُلْتُ: قَدْ فَعَلْتُ الَّذِي قُلْتِ لِي، فَأَخْرَجْتُ لَهُ عَجِينَتَنَا، فَبَصَقَ فِيهَا، وَبَارَكَ، ثُمَّ عَمَدَ إِلَى بُرْمَتِنَا، فَبَصَقَ فِيهَا، وَبَارَكَ، ثُمَّ قَالَ: «ادْعِي خَابِزَةً فَلْتَخْبِزْ مَعَكِ، وَاقْدَحِي مِنْ بُرْمَتِكُمْ وَلاَ تُنْزِلُوهَا، وَهُمْ أَلْفٌ، فَأُقْسِمُ بِاللَّهِ لأَكَلُوا حَتَّى تَرَكُوهُ، وَانْحَرَفُوا وَإِنَّ بُرْمَتَنَا لَتَغِطُّ كَمَا هِيَ، وَإِنَّ عَجِينَتَنَا (أَوْ كَمَا قَالَ الضَّحَّاكُ) لَتُخْبَزُ كَمَا هُوَ. {الحديث: ٥٢٨٣ = ٥٢٧٤ فم. تجريد/٣، رقم: ٢٠٥٠ = ٣٠٧٠ + ١٥٥٠ تجريد/٤ = ٤١٠١}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای خەندەق، لەکاتی هەڵکەندنی خەندەکەکەدا، سەرنجمدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواو برسیبوو، جا چوومەوە بۆلای ژنەکەم پێیم گوت: هیچمان هەیە؟ دەبینم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواو برسییەتی، ئەویش هەمانەیەکی هێنا مەنێ جۆی تیادابوو، بەرخۆلەیەکی دەستەمۆشمان هەبوو ئەویشم سەربڕی، جا ئەو جۆکەی هاڕیو منیش بەرخەکەم جنیو کردمە ناو دیزەکەیەوەو هەردوکمان پێکەوە لێ بووینەوە، ئیتر ویستم بچمەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەکەم گوتی: ها! روو زەردم نەکەی، نەچی پێغەمبەرو ئەو هەموو عەشاماتەی کە لەگەڵیایەتی، هەموویان خوڵك بکەیو ئەو هەموو خەڵکە بڕژێنی بەسەرما، چونکە نانەکە کەمەو بەشی ئەوەندە ناکا، منیش چووم بەچپە عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرخۆلەیەکمان سەربڕیوەو مەنێ جۆشمان هاڕیوە، خۆتو چەن کەسێ بفەرموون وەرن بۆ نیوەڕۆژە، کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگەوازی هەڵداو فەرمووی: (ئەی ئەهلی خەندەق! جابیر قاوەڵتی نیوە ڕۆژەی دروست کردووە، بفەرموون بەزوویی بچین!).

ئەنجا فەرمووی: نە مەنجەڵەکەتان لەسەر سێ کوچکەکە دابگرنو نە هەویرەکەتان بکەن بەنان تا خۆم دێم). جا منیش گەڕامەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) وەپێش مەردومەکە کەوتو هاتن، کە چوومەوە ژنەکەم گوتی: واوات لێ بێ بۆ وات کرد؟ گوتم: من هەرئەوەم گوت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەخۆت گوتت: ژنەکە هەویرەکەی هێنا بۆ پێغەمبەرو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تفی پیرۆزیی خۆیی تێکردو نزای پیرۆزی بەسەردا خویندو ئەنجا چوو بۆلای مەنجەڵەکەو تفی کردە ئەویشو نزای پیرۆزیی بەسەر ئەویشدا خوێندو فەرمووی: (ژنێکی نانکەری تریش بانگکە با نانت لەگەڵدا بکاو، چێشتەکەیش بە ئەسکوێ لە مەنجەڵەکە تێ بکەو لەسەر ئاگرەکە دایمەگرن، هەزار کەس بوون سوێندم بەیەزدانی پاك هەتا توانییان نانو چێشتیان خوارد، هەتا لێیان مایەوەو پەڕیان لێ

گرت بەڵام هێشتا مەنجەڵەکەمان وەك خۆی مابوو کەمی نەکردبوو!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٣١٧٧} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٥٢٠/٣٠}.

١٥٣٣- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِى بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) ثَلاَثِينَ وَمِائَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «هَلْ مَعَ أَحَدٍ مِنْكُمْ طَعَامٌ»؟ فَإِذَا مَعَ رَجُلٍ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نَحْوُهُ، فَعُجِنَ، ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ مُشْرِكٌ مُشْعَانٌّ طَوِيلٌ بِغَنَمٍ يَسُوقُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَبَيْعٌ أَمْ عَطِيَّةٌ» أَوْ قَالَ: «أَمْ هِبَةٌ»؟ قَالَ: لاَ بَلْ بَيْعٌ، فَاشْتَرَى مِنْهُ شَاةً، فَصُنِعَتْ، وَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِسَوَادِ الْبَطْنِ أَنْ يُشْوَى، قَالَ: وَايْمُ اللَّهِ مَا مِنَ الثَّلاَثِينَ وَمِائَةٍ إِلاَّ حَزَّ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حُزَّةً حُزَّةً مِنْ سَوَادِ بَطْنِهَا، إِنْ كَانَ شَاهِدًا أَعْطَاهُ، وَإِنْ كَانَ غَائِبًا خَبَأَ لَهُ، قَالَ: وَجَعَلَ قَصْعَتَيْنِ، فَأَكَلْنَا مِنْهُمَا أَجْمَعُونَ، وَشَبِعْنَا، وَفَضَلَ فِى الْقَصْعَتَيْنِ فَحَمَلْتُهُ عَلَى الْبَعِيرِ أَوْ كَمَا قَالَ. {الحديث: ٥٣٣٢ = ٥٣٢٣. تجريد/٣، رقم: ١١١١ = ٢٦١٨، ٢٢١٦، ٥٣٨٢}:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: سەدو سیی کەس بووین، لەسەفەرێکا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، خۆراکمان هاتە کزیو برسیمان بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەستان خۆراکی پێ هەیە؟) پیاوێ مەنێ خۆراکی پێ مابوو، یا دەوری مەنێ دەبوو، شێلایانو کردیان بەنان. جا کابرایەکی بتپەرستی قژ ئاڵۆزکاوی قووچی درێژ داهۆڵ، رانێکی بەرەو ئێمە هێنا، بەرەو شوێنێ لێی دەخوڕی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (یا بە فرۆشتن، یا بەپیاوەتی ئاژەڵێکمان پێ بدە؟) یا پێی فەرموو: (یا بەدیاریو بەخشین؟).

کابرا گوتی: بەفرۆشتن دەتاندەمێ، جا ئاژەڵێکی لە رانەکەی لێ کڕی، فەرمانی فەرموو سەریان بڕیو پاکیان کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانیدا ناو سکەکەیان برژاند، سوێندم بەخودا ئەو (١٣٠) سەدو سیی کەسە، پێغەمبەر خۆی، هەریەکەی لەو ناوسکە، پارچەیەکی بۆ بڕیو دای پێی، ئەگەر هاوەڵەکە خۆی لەوێ

بوایە دەیدایە دەست خۆی، خۆ ئەگەر لەوێ نەبوایە بۆی هەڵدەگرت هەتا دەهاتەوەو دەیدا پێی. جا کاتێ گۆشتی مەڕەکە کوڵا، کردی بەدوو قەرەوانە، ئەوجا هەمووومان بەدەوری ئەو قەرەوانەدا دانیشتینو هەمووومان بە بەرەکەتی وجودی پێغەمبەر بە دەوریاندا جێمان بۆوەو دەستمان کرد بەخواردن لێیان، هەتا هەمووومان تەواو تێرمان خوارد، کەچی هێشتا لەبەرمان مایەوە، خودا پیتو فەڕێکی ئاشکرای وای خستە ئەو مەنە خۆراکەو گۆشتی ئەو تاقە ئاژەڵە، جا ئەوەندە مابوو لەو خۆراکو مەرگەیێ من خۆم بارم کرد لە وشترێ، یا وەك راوی خۆی فەرمووی. {بڕوانە: ژمارە: ١٣٨ بۆ زانینی صاع} + {ژمارە: ١٨٦ = أوكما قال}.

**روونکردنەوە:**

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیقی کوڕی ئەبو قوافە خۆیو ئەبوبەکری باوکیو ئەبو قوحافەی باپیری لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوون، کوڕێکی بووە ناوی موحەممەد بووە، نازناوی ئەبو عەتیق بووە، کە ناسراوە بە (أبو عتيق محمد بن عبدالرحمن بن أبي بكر الصديق) دادەنرێ لەریزی صەحابە بچکۆلەکان، چونکە لەپێش مەرگی پێغەمبەرا لەدایك بووە، ئیبنو عەبدول بەڕ، لە ئیستیعابا دەفەرموێ: (ئەم بەهرەیە کەچوار پشت صەحابەی پێغەمبەربن تەنیا بۆ ئەم چوار کەسە چەسپاوەو بەس: موحەممەدی کوڕی عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قوحافە) کە هەرچواریان بەخزمەت پێغەمبەر گەیشتوون.

عەبدورەحمان برای حەقی حەزرەتی عائیشەیە، واتە: برای باوكو دایکییەتی. لەڕیزی لەشکری بێبڕوایانی قوڕەیشا، لەدژی موسوڵمانان ئامادەی شەڕی بەدرو شەڕی ئوحود بووە، پاڵەوانێکی ناسراو بوو، داوای کرد کە پاڵەوانێ بۆی بچێتە مەیدان، ئەبوبەکری باوکی ویستی بچێ بۆ مەیدان بۆی، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نەیهێشتو پێی فەرموو: (خوتمان پێ بهێڵە!).

دەڵێن: جارێ لەپاش ئیسلامبوونی عەرزی باوکی دەکاو پێی دەڵێ: لەشەڕی ئوحوددا تۆ بەرهەوێڵم کەوتی، دڵم بەرایی نەدەدا، دەنا دەمکوشتیت! ئەبەکر پێی

دەڵێ: دەی ئەگەر تۆ بەرهەوێڵی مین بکەوتیتایە، بوارەم نەدەدای دەمکوشتیت!
کەکاتێ موسوڵمان بوو، موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، لەگەڵ ئیمامی خالیدی کوڕی وەلیددا ئامادەی شەڕی یەمامە بوو، حەوت کەسی لە سەرکردەکانیان کوشت، یەکێکیان (محکم)ی یەمامە بوو، کە لەسەر کەلێنێ لە کەلێنەکانی قەڵاکە بوو، ئیتر سوپای ئیسلام لەو کەلێنەوە هەڵڕژانە ناو قەڵاکەوە، عەبدورەحمان کوڕی گەورەی ئەبوبەکرە، لە ئوم رۆمانە، پیاوێکی پیاو چاکی دین قایمی خاوەن پەیمانی راستگۆ بوو، قەت درۆی لێ نەبینراوە، لەرووداوی ئەل-جەمەلدا لەگەڵ عائیشەی خوشکی بوو، بەڵام موحەممەدی برای لەگەڵ پێشەوا عەلی بوو، رۆژێ موعاوییە لەسەر دوانگە وتارێ دەدا، لە خەڵکەکە داوا دەکا، کە لەپاش خۆی، یەزیدی کوڕی هەڵبژێرن بەجێنشین!!

عەبدوڕەحمانیش دەفەرموێ: (بۆ ئەمە هیرقەلییەتە؟ کە دەستووریان وایە هەرکاتێ قەیصەر دەمرێ، قەیسەرێ تر لەشوێنی دادەنیشێ!).

موعاوییە لەپاش ئەم هەڵوێستە سەد هەزار درەمی زیوینی بۆ دەنێرێ، بەڵام ئەو وەری ناگرێو دەفەرموێ: (ئایینم نافرۆشم بۆ جیهانم) جا عەبدوڕەحمان بەرەو مەککە دەکەوێتە رێ، لەرێ لەناو خەودا بە مەرگی کوتوپڕ دەمرێ، تەرمەکەی هەڵ دەگرنو دەیبەن بۆ مەککە لەوێ دەینێژن، ساڵی پەنجاو سێی کۆچی دەبێ. کاتێ عائیشە هەواڵی مەرگی دەبیستێ دەچێ بۆ حەج، لەمەککە دەچێتە سەر گۆڕەکەیو لەسەری دەگرێو ئەم شیعرەی موتەممیمی کوڕی نوووەیرە دەخوێنێتەوە، کە بەسەر مالیکی برایدا هەڵی داوە، لە بەحری طەویله:

وَكُنَّـــا كَنَـــدْ مَـــانَيْ جُذَيْمَـــةَ حِقْبَـــةً
مِـــنَ الـــدَّهْرِ حَتَّـــى قِيـــلَ لَـــنْ يَتَصَـــدَّعَا
فَلَمَّـــا تَفَرَّقْنَـــا، كَـــأَنِّي وَمَالِكـــاً
لِطُـــولِ اجْتِمَـــاعٍ لَـــمْ نَبِـــتْ لَيْلَـــةً مَعَـــا

واتە:

وەک دوو هـــاودەمی گیـــانی بـــەگیانی
ڕۆژگـــاریٚ زۆرمـــان پێکـــەوە ڕانـــی!
گـــەردوون لـــەناکاو بـــیٚ چـــاوەڕوانی
ڕۆژگـــاری دووری و جـــودایی هـــانی!
تـــەونی جـــودایی وەهاتـــە نیـــوە
ڕێگـــەی پەیوەنـــدی تـــەواو بڕیـــوە
منـــی لـــەکاکم وا دابڕیـــوە
دەڵێـــی لەمەوبـــەر یـــەکمان نـــەدیوە!

عەبدوڕەحمان لە سەرەتاوە ناوی عەبدولکەعبە بووە، پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) ناوەکەی گۆڕیو کردی بە عەبـدوڕەحمان، چـەند فەرموودەیـەکی لـە صـەحیحدا هەیـە، ئـەم فەرموودەیـەی ئێـرەی (متفـق علیـە)یـە، شـێخی بوخـاریو موسـلیم گێڕاویانەتەوە، ساڵیٚ لـەپاش مـەرگی عەبـدوڕەحمان عائیشەی خوشکیشی دەمـریٚ (ڕەزای خودایان لیٚ بیٚ). {بڕوانە: ژمارە: ٤١ و ١٢٣٧ و ١٨٩} کە لەپێشەوە ڕابووردن، هەروا بـۆ شانازیو سەروەرییەکانی ئەم بنەماڵەیە بڕوانە ئەم ژمارانە لە تەجریدی بوخـاری، بەشی کوردییەکەی:

١- ژمارە: ٣ ژیاننامەی خاتوو عائیشەی کچی ئەبوبەکری صەدیق.

٢- ژمارە: ٧٥ ژیاننامەی خاتوو ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق.

٣- ژمـارە: ٣٤٩ ژیاننامـەی عەبـدوڕەحمانی کـوڕی ئەبوبـەکری صـەدیق لێـرەدا ژیاننامەی ئەبوبەکری صەدیق، بەتێرو تەسەلی تۆمار دەکەین:

ئەبوبەکری صەدیق ناوی (عەبدوڵڵای کوڕی عوثمانە) ناسـراوە بـە ئەبوبـەکری کوڕی ئەبو قوحافە، لەسەردەمی نەزانیدا ناوی عەبدولکەعبە بوو، پێغەمبەر گۆڕی بە عەبدوڵڵا، ئەبوبەکر قوڕەیشییە، تەمیمییە، دایکی نـاوی سـەلمای کچی صـەخرە، ناسراوە بە ئوممولخەیر. لەپاش ساڵی فیل بەدوو ساڵو نیـو لـەدایك بـووە، لـەپێش هاتنی ئیسلامو لەپاش هاتنی ئیسلام هاوڕێتی پێغەمبـەری کـردووە، لـەکاتی کـۆچو لەسەفەری کۆچدا هاوڕێی پێغەمبەر بوو، لەهـەرە موسـوڵمانە پێشـینەکانە، لـەپاش

مـەرگی پێغەمبـەر، بـە هەڵبـژاردن ئەبوبـەکر بـوو بەیەکـەم جێنشینی پێغەمبـەر، پیاوێکی سپیکاری لەڕکەلەی لاواز بوو، رووخۆش‌و نەرمونیان بوو، شارەزای زانستی بنەچەی عەرەب بوو، بەتایبـەتی رەگـەزی هـۆزی قـورەیش، بازرگـان بـوو، رەفتـاری زۆر جـوان بـوو، هەمیشـە خـاوەنی دیوەخـان بـوو، متمانـەی بەهەرکەسـێ بکردایـە بانگهێشـتی لێ دەکـرد بۆسـەر ئیسلامەتی، زۆر کـەس لەسـەر دەسـتی ئـەودا ئیسـلام بووە، وەك: عوثمـانی کـوڕی عـەففان‌و طـەلحـەو زوبـەیرو سـەعدو عەبـدوڕەحمانی کوڕی عـەوف. بـە دەوڵەمەنـدی موسـوڵمان بـوو، بـەڵام کاتـێ مـەرگ بـوو بـەمیوانی هیچی لەپاش بەجێ نەما! چەندین کۆیلەی لەژیانی خۆیدا ئازاد کردووە، کە یـەکێ لەوانە بیلالی حەبەشی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەفەرمانی خودا ناوی نا (صدیق).

ئەبوبەکر ئەو صاحیبی غارەیە، کـە خـودا لـەم ئایەتـەدا باسـی فـەضلی دەکـاو دەفـەرموێ: {إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا - التوبة}.

ئەبوبـەکر رابـەری خێربـوو لـەنێوانی خـاتوو خەدیجـەو پێغەمبـەردا، هـەتا لەئەنجاما پێغەمبەر مارەیکرد بۆ خۆی. ئەو رۆژەی کە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، ئەبوبەکر هەڵبژێررا کرا بەیەکەم جێنشینی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماوەی جێنشینییەکەی دوو ساڵ‌و دەوری (٣) سێ مـانگ بـوو، رۆژی هـەینی (٢١) بیست‌و یەکی (جمادی الآخره) ساڵی سیازدەی کۆچی مەرگ بـوو بـەمیوانی بـەهۆی نەخۆشی سیلەوە، خۆی رایسپارد کە ژنەکەی بیشوات کە ئـەسمائی کچی عومـەیس بوو، عومەری کوڕی خـەتاب نوێـژی مـردووی لەسـەر تەرمەکـەی کـرد، لەهۆدەکـەی عائیشەدا، لەپاڵ گۆڕی پێغەمبەردا، بەشەو ناشتیان، تەمەنی (٦٣) شەست‌و سێ ساڵ بوو، بۆ زانینی چمکێ لە کۆشش‌و هەوڵ‌و فەضلی ئەبوبـەکر بـۆ خزمـەتی ئیسـلام بڕوانە ئەم شوێنانە:

١- تاجى كوردى بەرگى سێ، زنجيرە: ١٠٠، ژمارە: ٣١٥٥ + زنجيرە: ١٠١ بەتەواوى + تاج/٣، زنجيرە: ٣، ژمارە: ٣٢٣٤، ٣٢٣٥، ٣٢٣٦، ٣٢٣٧، ٣٢٣٨، ٣٢٣٩، ٣٢٤٠، ٣٢٤١، ٣٢٤٢، ٣٢٤٣، ٣٢٤٤ + تاج/٣، زنجيرە: ٤، ژمارە: ٣٢٥٤ + تاج/٣، زنجيرە: ٥، ژمارە: ٣٢٥٨ هەتا ژمارە: ٣٢٦٩ + تاج/٣، زنجيرە: ٨، ژمارە: ٣٢٧٤، ٣٢٧٥، ٣٢٧٣، ٣٢٧٦ + تاج/٣، زنجيرە: ٨، ژمارە: ٣٢٧٩، ٣٢٨٠ + ژمارە: ١٥٣٤ لەدواوە.

١٥٣٤- عَنِ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِى بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما): أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ كَانُوا نَاسًا فُقَرَاءَ، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ مَرَّةً: «مَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ، فَلْيَذْهَبْ بِثَلاَثَةٍ، وَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ أَرْبَعَةٍ، فَلْيَذْهَبْ بِخَامِسٍ، بِسَادِسٍ»، أَوْ كَمَا قَالَ، وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ جَاءَ بِثَلاَثَةٍ، وَانْطَلَقَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِعَشَرَةٍ وَأَبُو بَكْرٍ بِثَلاَثَةٍ، قَالَ: فَهُوَ وَأَنَا وَأَبِى وَأُمِّى، وَلاَ أَدْرِى هَلْ قَالَ: وَامْرَأَتِى وَخَادِمٌ بَيْنَ بَيْتِنَا وَبَيْتِ أَبِى بَكْرٍ، قَالَ: وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) تَعَشَّى عِنْدَ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) ثُمَّ لَبِثَ حَتَّى صُلِّيَتِ الْعِشَاءُ، ثُمَّ رَجَعَ فَلَبِثَ حَتَّى نَعَسَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَجَاءَ بَعْدَ مَا مَضَى مِنَ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللَّهُ، قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ: مَا حَبَسَكَ عَنْ أَضْيَافِكَ؟ - أَوْ قَالَتْ: ضَيْفِكَ - قَالَ: أَوَمَا عَشَّيْتِهِمْ؟ قَالَتْ: أَبَوْا حَتَّى تَجِىءَ، قَدْ عَرَضُوا عَلَيْهِمْ فَغَلَبُوهُمْ، قَالَ: فَذَهَبْتُ أَنَا فَاخْتَبَأْتُ، وَقَالَ: يَا غُنْثَرُ فَجَدَّعَ وَسَبَّ، وَقَالَ: كُلُوا لاَ هَنِيئًا، وَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ أَطْعَمُهُ أَبَدًا، قَالَ: فَايْمُ اللَّهِ مَا كُنَّا نَأْخُذُ مِنْ لُقْمَةٍ، إِلاَّ رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثَرُ مِنْهَا، قَالَ: حَتَّى شَبِعْنَا وَصَارَتْ أَكْثَرَ مِمَّا كَانَتْ قَبْلَ ذَلِكَ، فَنَظَرَ إِلَيْهَا أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَإِذَا هِىَ كَمَا هِىَ أَوْ أَكْثَرُ، قَالَ لاِمْرَأَتِهِ: يَا أُخْتَ بَنِى فِرَاسٍ مَا هَذَا؟ قَالَتْ: لاَ، وَقُرَّةِ عَيْنِى لَهِىَ الآنَ أَكْثَرُ مِنْهَا قَبْلَ ذَلِكَ بِثَلاَثِ مِرَارٍ، قَالَ: فَأَكَلَ مِنْهَا أَبُو بَكْرٍ، وَقَالَ: إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ يَعْنِى يَمِينَهُ، ثُمَّ أَكَلَ مِنْهَا لُقْمَةً ثُمَّ حَمَلَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَصْبَحَتْ عِنْدَهُ، قَالَ: وَكَانَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمٍ عَقْدٌ فَمَضَى الأَجَلُ، فَعَرَّفْنَا اثْنَا عَشَرَ رَجُلاً، مَعَ كُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أُنَاسٌ، اللَّهُ أَعْلَمُ كَمْ مَعَ كُلِّ رَجُلٍ، قَالَ: إِلاَّ أَنَّهُ بَعَثَ مَعَهُمْ فَأَكَلُوا مِنْهَا أَجْمَعُونَ، أَوْ كَمَا قَالَ. {الحديث: ٥٣٣٣ = ٥٣٢٤ فم. تجريد/١/٣٤٤، رقم: ٣٤٩ = ٦٠٢، ٣٥٨١، ٦١٤٠، ٦١٤١. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٢٧٠. تحفة الأشراف: ٩٦٨٨}.

عەبدوڕەحمانی کوڕە ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: دانیشتوانی میوانخانەی صوففە خەڵکێکی هەژار بوون، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی کە نانی دوو کەسی هەیە، با یەکێ لەم میوانانە لەگەڵ خۆی بباتەوەو بیکا بە سێیەمیان هەروا ئەوەی کە نانی چوار کەسی هەیە، با پێنج هەمێ لەگەڵ خۆی بباتەوە، یا فەرمووی: (با پێنج هەمێ، یا شەش هەمێ لەگەڵ خۆی بباتەوە). یا وەك خۆی فەرمووی، فەرمووی: جا ئەبوبەکر سێ کەسی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ ماڵەوە، پێغەمبەر خۆی دە کەسی لەگەڵ خۆی بردەوە، عەبدوڕەحمان فەرمووی: ماڵی ئێمە منو باوکمو دایکم بووین، ڕاوی فەرمووی: وابزانم عەبدورەحمان فەرمووشی: ژنەکەی منو نۆکەرێکیشمان لەگەڵ بوو، نۆکەرەکە هی ئێمەو ماڵی باوکم بوو، بەڵام ئەبوبەکر خۆی چووەوە بۆ لای حەزرەتو لەلای ئەو شێوی کردەوە، لەپاشا لەوێ مایەوە هەتا نوێژی خەوتنانیان کرد، دووبارە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی پێغەمبەرو لەوێ مایەوە هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەنەوز گرتی، ئەوجا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ئەوەندەی خودا مەیلی لەسەربوو لەشەو ڕابووردبوو، جا ژنەکەی پێی گوت: بۆچی درەنگ هاتیتەوە بۆلای میوانەکانت؟ ئەویش بە دایکمی فەرموو: ناشێ هەتا ئێستا شێوت بۆیان دانەنابێ؟ دایکیشم فەرمووی: خولکیان کردن کەنانیان بۆ دابنرێ، بەڵام ڕازی نەبوون، تا خۆت نەیەیتەوە. عەبدورەحمان فەرمووی: جامنیش لەترسی باوکم چووم خۆم شاردەوە نەبادا لەسەر میوانەکان قسەم پێ بڵێ، جا باوکم بانگی کردمو فەرمووی: خوێڕی! ئەوە لەکوێی؟ ئەی لچو لێوت بکرێ، ئەی واوا لێکراو! ئەوە بۆ نانت بۆ ئەم میوانانە دانەناوە؟ جا باوکم کە لەحاڵەکە حاڵی بوو بە میوانەکانی فەرموو: دەبخۆن، بەنۆشی گیانتان نەبێ، دیارە سووچی خۆتان بووە، وە فەرمووشی: سا بەوخودایە بەهیچ جۆرێ نابێ من لێی بخۆم. عەبدورەحمان فەرمووی: شتێکی سەیر ڕوویدا، بەهەقی خودا هەر پارووییەکمان لە خواردەمەنییەکە هەڵدەگرت، گورج لەبن پارووەکەوە بەرز دەبۆوەو پترو زۆرتر

دەبوو، ئیتر هەروا، هەتا تێرمان خوارد، کەچی نانەکە زیادی کردبوو، کەمی نەکردبوو، ئەبوبەکریش بەوردی سەرەنجێکی ئەم حاڵەی داو بە دایکمی فەرموو: ئەریٚ کچەکەی بەنی فیراس! ئەوە چییە؟ خۆ نانەکە هەتا لێی بخۆیت هەر زیاد دەکا!! دایکیشم لە وەڵامیدا فەرمووی: منیش وەك تۆی لیٚ دەزانم، بەڵام سوێندم بەوەی کە بووە بەمایەی ئەم چاوو دڵ رۆشنییەم، نانەکە ئێستا سیٚ قاتی پێشتریەتی‌و، لەپیت‌و فەڕی تۆو میوانەکانتەوە خودا پیت‌و فەڕی تیٚ خستووە.

فەرمووی: لەبەرئەوە ئەبوبەکریش سوێندەکەی خۆی شکاندو تیکەیەکی بۆ موفەڕکی لەو نانە موفەڕکە خواردو فەرمووی: دیارە ئەو سوێندەی کە خواردم لەم نانە نەخۆم ئەوە لەشەیتانەوە بوو، چونکە نانی پیرۆزی وا حەیفە مرۆڤ لێی نەخوا، ئەوجا قەرەوانەکەی بە خواردنەکەوە هەڵگرت‌و بردی بۆ خزمەتی حەزرەت، لەویٚ داینا بۆ بەیانی، عەبدورەحمان فەرمووی: لەوەوپێش لەنێوانی ئێمەو لەنێوانی هۆزێکی تردا پەیمانیٚ هەبوو، ماوەی پەیمانەکەمان تەواو بوو بوو، خۆمان ئامادەکردبوو کە بچین بۆ سەریان، حەزرەت سوپاکەی کرد بەدوازدە بەشەوە، هەربەشیٚ لەو سوپایە سەرکردەیەکی بۆ دانا، هەر سەرکردەییٚ مەگەر خودا بۆ خۆی بزانیٚ کە چەند کەسی لەگەڵدا بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو نان‌و چێشتە کەمە، کە لەو تاقە قەرەوانەیەدا بوو، لەسەرەتاوە بە بەرەکەتی ئەبوبەکری صەدیق‌و میوانەکانی‌و لەوەدوایش بە پیرۆزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بیٚ) پیت‌و فەڕێکی ئاشکرای وای تیٚ کەوت، بەشی ئەو هەموو سوپاو لەشکرەی کردو ئەوانیش گشتیان لێیان خواردو بەشیانی کرد). {ریاچ/٣، لاپەڕە: ٣٥٤ چاپی دووەم، زنجیرە: ٢٥٣، ژمارە: ١٥٠٣/١ — ٥٥٥ = ژمارە: ١ ژمارەی فەرموودەکەیە لە زنجیرە: ٢٥٣، ژمارە: ١٥٠٣ ژمارەی فەرموودەکەیە لە سەرەتای کتێبەکەوە هەتا ئێرە، ژمارە: ٥٥٥ ژمارەی فەرموودەکەیە لەسەرەتای بەری سێیەمەوە هەتا ئێرە}.

## ١١٩٧) پیتو فەڕو پیرۆزیی پێغەمبەر لە شیردا. (٥٣٢٧ - ٥٣٣٤)

## بَابٌ: فِي بَرَكَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي اللَّبَنِ

١٥٣٥- عَنِ الْمِقْدَادِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَصَاحِبَانِ لِى، وَقَدْ ذَهَبَتْ أَسْمَاعُنَا وَأَبْصَارُنَا مِنَ الْجَهْدِ، قَالَ: فَجَعَلْنَا نَعْرِضُ أَنْفُسَنَا عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْهُمْ يَقْبَلُنَا، فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَانْطَلَقَ بِنَا إِلَى أَهْلِهِ، فَإِذَا ثَلاَثَةُ أَعْنُزٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «احْتَلِبُوا هَذَا اللَّبَنَ بَيْنَنَا»، قَالَ: فَكُنَّا نَحْتَلِبُ، فَيَشْرَبُ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنَّا نَصِيبَهُ، وَنَرْفَعُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَصِيبَهُ، قَالَ: فَيَجِيءُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيُسَلِّمُ تَسْلِيمًا لاَ يُوقِظُ نَائِمًا، وَيُسْمِعُ الْيَقْظَانَ، قَالَ: ثُمَّ يَأْتِى الْمَسْجِدَ فَيُصَلِّى، ثُمَّ يَأْتِى شَرَابَهُ فَيَشْرَبُ، فَأَتَانِى الشَّيْطَانُ ذَاتَ لَيْلَةٍ، وَقَدْ شَرِبْتُ نَصِيبِى، فَقَالَ: مُحَمَّدٌ يَأْتِى الأَنْصَارَ فَيُتْحِفُونَهُ، وَيُصِيبُ عِنْدَهُمْ، مَا بِهِ حَاجَةٌ إِلَى هَذِهِ الْجُرْعَةِ فَأَتَيْتُهَا فَشَرِبْتُهَا! فَلَمَّا أَنْ وَغَلَتْ فِى بَطْنِى، وَعَلِمْتُ أَنَّهُ لَيْسَ إِلَيْهَا سَبِيلٌ، قَالَ: نَدَّمَنِى الشَّيْطَانُ، فَقَالَ: وَيْحَكَ مَا صَنَعْتَ؟! أَشَرِبْتَ شَرَابَ مُحَمَّدٍ فَيَجِيءُ فَلاَ يَجِدُهُ فَيَدْعُو عَلَيْكَ فَتَهْلِكُ؟! فَتَذْهَبُ دُنْيَاكَ وَآخِرَتُكَ! وَعَلَيَّ شَمْلَةٌ إِذَا وَضَعْتُهَا عَلَى قَدَمَيَّ خَرَجَ رَأْسِى، وَإِذَا وَضَعْتُهَا عَلَى رَأْسِى خَرَجَ قَدَمَاىَ، وَجَعَلَ لاَ يَجِيئُنِى النَّوْمُ، وَأَمَّا صَاحِبَاىَ فَنَامَا وَلَمْ يَصْنَعَا مَا صَنَعْتُ، قَالَ: فَجَاءَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَسَلَّمَ كَمَا كَانَ يُسَلِّمُ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ فَصَلَّى، ثُمَّ أَتَى شَرَابَهُ فَكَشَفَ عَنْهُ فَلَمْ يَجِدْ فِيهِ شَيْئًا، فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ فَقُلْتُ: الآنَ يَدْعُو عَلَيَّ، فَأَهْلِكُ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَطْعِمْ مَنْ أَطْعَمَنِى، وَأَسْقِ مَنْ أَسْقَانِى»، قَالَ: فَعَمَدْتُ إِلَى الشَّمْلَةِ، فَشَدَدْتُهَا عَلَيَّ، وَأَخَذْتُ الشَّفْرَةَ فَانْطَلَقْتُ إِلَى الأَعْنُزِ أَيُّهَا أَسْمَنُ فَأَذْبَحُهَا لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَإِذَا هِىَ حَافِلَةٌ، وَإِذَا هُنَّ حُفَّلٌ كُلُّهُنَّ، فَعَمَدْتُ إِلَى إِنَاءٍ لآلِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَا كَانُوا يَطْمَعُونَ أَنْ يَحْتَلِبُوا فِيهِ، قَالَ: فَحَلَبْتُ فِيهِ حَتَّى عَلَتْهُ رَغْوَةٌ، فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: «أَشَرِبْتُمْ شَرَابَكُمُ اللَّيْلَةَ»؟ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْرَبْ، فَشَرِبَ، ثُمَّ نَاوَلَنِى، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْرَبْ، فَشَرِبَ، ثُمَّ نَاوَلَنِى، فَلَمَّا عَرَفْتُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدْ رَوِىَ وَأَصَبْتُ دَعْوَتَهُ، ضَحِكْتُ حَتَّى أُلْقِيتُ إِلَى الأَرْضِ، قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِحْدَى سَوْآتِكَ يَا مِقْدَادُ»، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَانَ مِنْ أَمْرِى

كَذَا وَكَذَا، وَفَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا هَذِهِ إِلاَّ رَحْمَةٌ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، أَفَلاَ كُنْتَ آذَنْتَنِي فَنُوقِظَ صَاحِبَيْنَا فَيُصِيبَانِ»، قَالَ: فَقُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُبَالِي إِذَا أَصَبْتَهَا وَأَصَبْتُهَا مَعَكَ مَنْ أَصَابَهَا مِنَ النَّاسِ!}. {الحديث: ٥٣٣٠ = ٥٣٢١ فم}:

میقدادی کوڕی ئەسوەد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ دوو هاوڕێما هاتین بۆ ناو هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهاوەڵانی بێ)، لەبەر ماندوێتیو برسێتی، وەك بڵێی نەگوێمان دەبیستێو نە چاومان دەبینێ وابوو، فەرمووی: جا خۆمان ڕانواند بەسەر هاوەڵانی پێغەمبەردا، بەڵام کەسیان میوانداریيان پێ نەکردین، چونکە ئەوانیش نەدارابوون، جا چووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش لەگەڵ خۆی بردینیەوە بۆلای خێزانەکەی، ڕوانیان واسێ بزن لەوێیە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شیری ئەم بزنانە بدۆشن لەنێوانمانا وەك یەك دابەشی دەکەینو دەیخۆینەوە!).

ئیتر ئێمە بزنەکانمان دەدۆشیو هەرکەسەمان بەشە شیری خۆمان دەخواردەوەو بەشەکەی پێغەمبەریشمان هەڵدەگرت بۆی. فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە بەشەو دەهاتەوە، بەهێواشی لەسەر خۆ سڵاوی دەکرد، ئەوەی کە خەوتوو بوو بەو سڵاوە خەبەری نەدەبۆوە، ئەوەیشی کە بەخەبەر بوو گوێی لە سڵاوەکەی بوو!

فەرمووی: لەپاشا دەچوو بۆ نوێژگاکەیو شەو نوێژی دەکردو ئەوجا دەچوو بۆلای بەشە شیرەکەی خۆیو دەیخواردەوە، جا شەوێکیان ئێمە بزنەکانمان دۆشیو بەشە شیری خۆمان خواردەوە، شەیتان هاتە بن کلێشەمو ئەو لەعنتی بەم شێوەیە تەفرەی دام، وتی: موحەممەد هاموشۆی ماڵە ئەنصارەکان دەکا، ئەوان خواردەمەنی پێشکەش دەکەنو لەلای ئەوان قاوەڵتی دەکا، پێویستی بەم جۆرە شیرە نییە، جا بەم شێوەیە تەفرەی دامو چووم بەشە شیرەکەی پێغەمبەریشم خواردەوە، جا هەر ئەوەندە شیرەکە لەسکما جێگیربوو، وە بۆم دەرکەوت کە تازە لەژێر دەسەڵاتی منا

نـەماوەو نـاتوانم بەدەسـتی بهێنمـەوە، شـەیتان پەشـیمانی کردمـەوەو گـوتی پـێم: کۆستت کەوێ، خانە خراپ، ماڵ وێران ئەمە چی بوو کردت، چۆن بەشـە شـیرەکەی موحەممەدت خواردەوە، ئێستا کەهاتەوە دەیەوێ کە بیخواتەوە، دەبینێ نەماوە، جا نزای خراپت لێ دەکاو دەبێ بەهۆی سەر تیاچوونت ئاوا هەم جیهان و هەم دوارۆژت لەکیس دەچێ!

عابەیـەکی کـوتو کـوێرم لەبـەردابوو، دەمـدا بەقاچـەکانمدا بەسـەرما نەدەگەیشتەوە، دەمدا بەسەرمدا بەقاچەکانما نەدەگەیشتەوە، جا لەپەژارەدا خـەوم زڕا، بەڵام هەردوو هاوڕێکەم خـەویان لێ کـەوتو خـەوتن، چونکە ئـەو هەڵەی مـن کردم ئەوان شتی وایان نەکردبوو!

فـەرمووی: جـا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەك شـەوانی هاتـەوە، وەك شـەوان سـڵاوی کـرد، ئـەوجا چـوو بـۆ نوێژگاکـەی و شـەو نوێـژی کـرد، ئـەوجا ڕۆیشـت بـۆ جێگەی شیری خواردنەوەکەی سـەری دەفرەکـەی لادا، ڕوانـی دەفرەکـە هیچـی تیـادا نییە. جا سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، لەدڵی خۆمـا گـوتم: ئێسـتا نـزای خـراپم لێ دەکاو دەفەوتێم، کەچی خۆشەویست بە پێچەانەوە فەرمووی: (خودایە! ئەوەی کـە نان و ئاوم پێ دەدا تۆیش چاکەی بدەرەوەو نان و ئاوی پێ بدە!). فەرمووی: منـیش پـەلاماری عابەکـەمم داو ئاڵانـدم لەخۆمـەوەو چـەقۆیەکم هـەلگرت و چـووم بـۆلای بزنـەکان، گـوتم کامیـان زۆر قەڵەوبێ ئـەوەیانی بۆسـەر دەبـڕم و پێشکەشـی دەکـەم هەتا بەر نزا خێرەکەی بکەوم، کەچی ڕوانیم بزنەکان هـەموویان گوانیـان پـڕ پـڕە لەشیرو دەڵێی چەند ڕۆژە نەدۆشراون، جا چووم قاپێکم هێنـا، لـەماڵی موحـەممـەد، کە خۆیان بەتەمای ئەوە نەبوون کە لەو قاپەدا شـیر بدۆشـن، فـەرمووی: جـا شـیرم تێ دۆشی هەتا پڕبوو، کەف سەر ڕێـژیکرد لێـی، جا بـردم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئایـا ئێـوە بەشـە شـیرەکەی خۆتـان خواردۆتـەوە!؟). فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرموو تۆ بخۆرەوە، ئـەویش خواردیـەوەو قاپەکەی دایەوە دەستم، عەرزیم کردەوە: ئەی پێغەمبەری خـودا! بفـەرموو دیسـان

بخۆرەوە، ئەویش دیسان خواردیەوە، ئەوجا قاپەکەی دایەوە دەستم، جا کاتێ زانیم کەوا پێغەمبەر تێر شیری خواردەوەو من بەر نزا خێرەکەی کەوتم، ترسەکەم رەوییەوەو ناخۆشییەکەم بوو بەخۆشی، لەبەرئەوە لەخۆشییانا دەستم کرد بە پێکەنینو لەبەر پێکەنین کەوتم بەزەویدا. فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی میقدادا چی کارێکی ناشیرینت لێ قەوماوە کەوا پێدەکەنی؟) منیش رووداوەکەم لەنووکەوە گێڕایەوە بۆی، کە چۆن شەیتان تەفرەی دامو شیرەکەی تۆم خواردەوەو دوایی کەتۆ هاتیتەوە... تا ئەوێ کە شیرەکەم دۆشی بۆی!

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم شیرە لەم کاتەدا رەحمەتێکی خودای گەورەو سەروەر بووە، ئەوە بۆ ئاگادارمت نەکرد، کە ئەو دووبرادەرەی تریشمان هەڵبستانایەو بەشمان شیر بدانایە؟!).

فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: سوێندم بەو خودایەی کە تۆی بەم ئایینە راستو دروستەوە رەوانەکردووە، مادام تۆ لێت خواردەوەو خۆم لێیم خواردەوە ئیتر دەربەستی کەسی ترنیم کە لێی بخواتەوە).

## ١١٩٨) پیتو فەڕو پیرۆزیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە رۆندا.

(٩٠٨ - ٥٩٠٠)

## بَابٌ: بَرَكَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي السَّمْنِ

١٥٣٦- عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ أُمَّ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) كَانَتْ تُهْدِي لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي عُكَّةٍ لَهَا سَمْنًا، فَيَأْتِيهَا بَنُوهَا، فَيَسْأَلُونَ الأُدْمَ، وَلَيْسَ عِنْدَهُمْ شَيْءٌ فَتَعْمِدُ إِلَى الَّذِي كَانَتْ تُهْدِي فِيهِ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَتَجِدُ فِيهِ سَمْنًا، فَمَا زَالَ يُقِيمُ لَهَا أُدْمَ بَيْتِهَا، حَتَّى عَصَرَتْهُ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: «عَصَرْتِيهَا»؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: «لَوْ تَرَكْتِيهَا مَا زَالَ قَائِمًا». {الحديث: ٥٩٠٤ = ٥٩٠٠ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئوممو مالیکی ئەنصارییە (رەزای خودای لێ بێ) دەستووری وابوو لە هیزۆڵکەیەکا رۆنی بەدیاری دەبرد بۆ پێغەمبەر (دروودی

خودای لەسەر بێ). جا گەڵێ جار کوڕەکانی داوای پێخۆریان لێ دەکرد، ئەویش هیچیان نەبوو کە بیکا بە پێخۆر بۆیان، جا دەچوو بۆلای ئەو هیزۆڵکەیەی کە ڕۆنی بەدیاری تیا دەبرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیڕوانی ڕۆنی واتیادا، ئیتر تا ماوەیەکی زۆر، هەرکاتێ پێویستیان بەڕۆن بوایە بۆ پێخۆری خۆیان لەو هیزۆڵکەیە دابینی دەکرد، تا ڕۆژێ ئوم مالیك دەچێ هیزەکە دەگوشێو ڕۆنی تیا ناهێڵێ، ئیتر ڕۆنەکەی تەواو دەبێ، جا ئوممو مالیك دەچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەرو ڕوداوەکەی عەرز دەکا، دەفەرموێ: (هیزۆڵکەکەت تەواو گوشی؟) دەڵێ: بەڵێ، دەفەرموێ: (ئەگەر نەتگوشیبایە هەر بەردەوام پێخۆری بۆتان دابین دەکرد!).

**ڕوونکردنەوە:**

١- لە فەتحولولهیمدا، ئەم چیرۆکە ڕاگوێز دەکا:

(ئوممو مالیکی ئەنصارییە هیزەیێ ڕۆن بەدیاری دەبا بۆ پێغەمبەر، پێغەمبەریش فەرمان دەکا بە بیلال کە خاڵی بکاتو بیگوشێو بیداتەوە دەستی، کەچی ئوم مالیك دەڕوانێ هیزەکە پڕ پڕە لەڕۆن، جا دەچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەرو عەرزی دەکا: شتێ سەبارەت بەمن بە سرووش دابەزیوە، دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (بۆ چی بووە کەوا دەڵێی، هیچ ڕوویداوە؟). دەڵێ: ئەی ئەوە نییە هیزە ڕۆنە دیارییەکەمت قەبووڵ نەکردووە؟ پێغەمبەریش بیلال بانگ دەکاو لەم بارەیەوە پرسیاری لێ دەکا، بیلال دەڵێ: بەو خودایەی کەتۆی بەم ئایینە ڕاستو دروستەوە ڕەوانە کردووە، هیزەکەم تەواو خاڵی کردو زۆریشم گوشی هەتا شەرمم کرد، لەبەر زۆر گوشین!! ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مـوژدەی دا بە ئوممو مالیكو پێی فەرموو: (ئەم پیتو فەڕو بەرەکەتەت پیرۆزبێ ئەی ئوممو مالیك، ئەوە پیتو فەڕو بەرەکەتە، خودای گەورە بەزوویی پاداشی باشی داویتەوە!).

٢- ئوم مالیکی ئەنصارییە یەکێکە لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە بوخاریدا گێڕانەوەی نییە، بەڵام لە موسلیما هەیەتی، ئەم فەرموودەیەی ئێرەی لە موسلیمدا هەیە. خۆی دەڵێ: جارێ چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی

خودای لەسەر بێ) چۆقەی دانم دەهات، لەتاو لەرزوتا، فەرمووی: (ئەی ئوممو ماليك! ئەوە چیتە وا هەڵ دەچۆقیت؟) عەرزیم کرد: ئەوە لەرزو تا دایگرتووم خودا واوای لێ بکا، فەرمووی: (جمێن بە لەرزوتا مەدە، چونکە بەهۆی لەرزو تاوە خودا گوناە لەبەندە هەڵ دەوەرێنێ وەك چۆن گەڵای دار هەڵ دەوەرێ ئاوا). {بڕوانە: تاج/٣٢١/٣، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٢٩٤١ چ/٤}.

## ١١٩٩) درەخت بە ملکەچی شوێنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکەوێ. (٧٤٣٧)

## بَابٌ: انقيادُ الشَّجَرِ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٥٣٧- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الْوَلِيدِ بْنِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: خَرَجْتُ أَنَا وَأَبِي نَطْلُبُ الْعِلْمَ فِي هَذَا الْحَيِّ مِنَ الأَنْصَارِ قَبْلَ أَنْ يَهْلِكُوا فَكَانَ أَوَّلُ مَنْ لَقِينَا أَبَا الْيَسَرِ، صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهُ غُلاَمٌ لَهُ مَعَهُ ضِمَامَةٌ مِنْ صُحُفٍ، وَعَلَى أَبِي الْيَسَرِ بُرْدَةٌ وَمَعَافِرِيٌّ، وَعَلَى غُلاَمِهِ بُرْدَةٌ وَمَعَافِرِيٌّ، فَقَالَ لَهُ أَبِي: يَا عَمِّ إِنِّي أَرَى فِي وَجْهِكَ سَفْعَةً مِنْ غَضَبٍ، قَالَ: أَجَلْ، كَانَ لِي عَلَى فُلاَنِ بْنِ فُلاَنٍ الْحَرَامِيِّ مَالٌ: فَأَتَيْتُ أَهْلَهُ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ السَلاَمْ، فَقُلْتُ: ثَمَّ هُوَ؟ قَالُوا: لاَ، فَخَرَجَ عَلَيَّ ابْنٌ لَهُ جَفْرٌ، فَقُلْتُ لَهُ: أَيْنَ أَبُوكَ؟ قَالَ: سَمِعَ صَوْتَكَ فَدَخَلَ أَرِيكَةَ أُمِّي! فَقُلْتُ: اخْرُجْ إِلَيَّ، فَقَدْ عَلِمْتُ أَيْنَ أَنْتَ، فَخَرَجَ: فَقُلْتُ: مَا حَمَلَكَ عَلَى أَنِ اخْتَبَأْتَ مِنِّي؟ قَالَ: أَنَا وَاللَّهِ أُحَدِّثُكَ ثُمَّ لاَ أَكْذِبُكَ، خَشِيتُ وَاللَّهِ أَنْ أُحَدِّثَكَ فَأَكْذِبَكَ، وَأَنْ أَعِدَكَ فَأُخْلِفَكَ، وَكُنْتَ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَكُنْتُ وَاللَّهِ مُعْسِرًا قَالَ: قُلْتُ: آللَّهِ؟ قَالَ: اللَّهِ، قُلْتُ: آللَّهِ؟ قَالَ: اللَّهِ، قُلْتُ: آللَّهِ؟ قَالَ: اللَّهِ، قَالَ: فَأَتَى بِصَحِيفَتِهِ فَمَحَاهَا بِيَدِهِ، قَالَ: فَإِنْ وَجَدْتَ قَضَاءً فَاقْضِنِي، وَإِلاَّ أَنْتَ فِي حِلٍّ، فَأَشْهَدُ، بَصَرُ عَيْنَيَّ هَاتَيْنِ، (وَوَضَعَ إِصْبَعَيْهِ عَلَى عَيْنَيْهِ) وَسَمْعُ أُذُنَيَّ هَاتَيْنِ، وَوَعَاهُ قَلْبِي هَذَا، (وَأَشَارَ إِلَى مَنَاطِ قَلْبِهِ) رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَهُوَ يَقُولُ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا، أَوْ وَضَعَ عَنْهُ، أَظَلَّهُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ»، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: أَنَا يَا عَمِّ لَوْ أَنَّكَ أَخَذْتَ بُرْدَةَ غُلاَمِكَ وَأَعْطَيْتَهُ مَعَافِرِيَّكَ، وَأَخَذْتَ مَعَافِرِيَّهُ وَأَعْطَيْتَهُ بُرْدَتَكَ، فَكَانَتْ عَلَيْكَ حُلَّةٌ، وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ، فَمَسَحَ رَأْسِي وَقَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهِ»، يَا ابْنَ أَخِي بَصَرُ

عَيْنَيَّ هَاتَيْنِ، وَسَمْعُ أُذُنَيَّ هَاتَيْنِ، وَوَعَاهُ قَلْبِي هَذَا (وَأَشَارَ إِلَى مَنَاطِ قَلْبِهِ) رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَقُولُ: «أَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَأَلْبِسُوهُمْ مِمَّا تَلْبَسُونَ»، وَكَانَ أَنْ أَعْطَيْتُهُ مِنْ مَتَاعِ الدُّنْيَا أَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ مِنْ حَسَنَاتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ. ثُمَّ مَضَيْنَا حَتَّى أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ فِي مَسْجِدِهِ، وَهُوَ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُشْتَمِلاً بِهِ، فَتَخَطَّيْتُ الْقَوْمَ، حَتَّى جَلَسْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ أَتُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ وَرِدَاؤُكَ إِلَى جَنْبِكَ؟ قَالَ: فَقَالَ بِيَدِهِ فِي صَدْرِي هَكَذَا وَفَرَّقَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ وَقَوَّسَهَا: أَرَدْتُ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيَّ الأَحْمَقُ مِثْلُكَ فَيَرَانِي كَيْفَ أَصْنَعُ فَيَصْنَعُ مِثْلَهُ. أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَسْجِدِنَا هَذَا وَفِي يَدِهِ عُرْجُونُ ابْنِ طَابٍ فَرَأَى فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ نُخَامَةً فَحَكَّهَا بِالْعُرْجُونِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا فَقَالَ: «أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يُعْرِضَ اللَّهُ عَنْهُ»؟ قَالَ: فَخَشَعْنَا، ثُمَّ قَالَ: «أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يُعْرِضَ اللَّهُ عَنْهُ»؟ قَالَ: فَخَشَعْنَا، ثُمَّ قَالَ: «أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يُعْرِضَ اللَّهُ عَنْهُ»؟ قُلْنَا: لاَ أَيُّنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي فَإِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قِبَلَ وَجْهِهِ، فَلاَ يَبْصُقَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ، وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ تَحْتَ رِجْلِهِ الْيُسْرَى، فَإِنْ عَجِلَتْ بِهِ بَادِرَةٌ فَلْيَقُلْ بِثَوْبِهِ هَكَذَا»، ثُمَّ طَوَى ثَوْبَهُ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ، فَقَالَ: «أَرُونِي عَبِيرًا»، فَقَامَ فَتًى مِنَ الْحَيِّ يَشْتَدُّ إِلَى أَهْلِهِ، فَجَاءَ بِخَلُوقٍ فِي رَاحَتِهِ، فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَعَلَهُ عَلَى رَأْسِ الْعُرْجُونِ، ثُمَّ لَطَخَ بِهِ عَلَى أَثَرِ النُّخَامَةِ، فَقَالَ جَابِرٌ: فَمِنْ هُنَاكَ جَعَلْتُمُ الْخَلُوقَ فِي مَسَاجِدِكُمْ. سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةِ بَطْنِ بُوَاطٍ وَهُوَ يَطْلُبُ الْمَجْدِيَّ بْنَ عَمْرٍو الْجُهَنِيَّ وَكَانَ النَّاضِحُ يَعْتَقِبُهُ مِنَّا الْخَمْسَةُ وَالسِّتَّةُ وَالسَّبْعَةُ فَدَارَتْ عُقْبَةُ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ عَلَى نَاضِحٍ لَهُ، فَأَنَاخَهُ، فَرَكِبَهُ، ثُمَّ بَعَثَهُ، فَتَلَدَّنَ عَلَيْهِ بَعْضَ التَّلَدُّنِ، فَقَالَ لَهُ: شَأْ لَعَنَكَ اللَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ هَذَا اللاَّعِنُ بَعِيرَهُ»؟ قَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «انْزِلْ عَنْهُ فَلاَ تَصْحَبْنَا بِمَلْعُونٍ، لاَ تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَوْلاَدِكُمْ، وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، لاَ تُوَافِقُوا مِنَ اللَّهِ سَاعَةً يُسْأَلُ فِيهَا عَطَاءٌ فَيَسْتَجِيبُ لَكُمْ»..

سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، حَتَّى إِذَا كَانَتْ عُشَيْشِيَةٌ، وَدَنَوْنَا مَاءً مِنْ مِيَاهِ الْعَرَبِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ رَجُلٌ يَتَقَدَّمُنَا فَيَمْدُرُ الْحَوْضَ، فَيَشْرَبُ وَيَسْقِينَا»؟ قَالَ جَابِرٌ: فَقُمْتُ فَقُلْتُ: هَذَا رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَيُّ رَجُلٍ مَعَ جَابِرٍ»؟ فَقَامَ جَبَّارُ بْنُ صَخْرٍ، فَانْطَلَقْنَا إِلَى الْبِئْرِ فَنَزَعْنَا فِي الْحَوْضِ سَجْلاً أَوْ سَجْلَيْنِ، ثُمَّ مَدَرْنَاهُ، ثُمَّ نَزَعْنَا فِيهِ حَتَّى أَفْهَقْنَاهُ، فَكَانَ أَوَّلَ طَالِعٍ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: «أَتَأْذَنَانِ»؟ قُلْنَا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَشْرَعَ نَاقَتَهُ فَشَرِبَتْ، فَشَنَقَ لَهَا فَشَجَتْ، فَبَالَتْ، ثُمَّ عَدَلَ بِهَا، فَأَنَاخَهَا، ثُمَّ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْحَوْضِ فَتَوَضَّأَ مِنْهُ، ثُمَّ قُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ مِنْ مُتَوَضَّإِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَذَهَبَ جَبَّارُ بْنُ صَخْرٍ يَقْضِي حَاجَتَهُ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيُصَلِّيَ وَكَانَتْ عَلَيَّ بُرْدَةٌ ذَهَبْتُ أَنْ أُخَالِفَ بَيْنَ طَرَفَيْهَا فَلَمْ تَبْلُغْ لِي، وَكَانَتْ لَهَا ذَبَاذِبُ فَنَكَّسْتُهَا، ثُمَّ خَالَفْتُ بَيْنَ طَرَفَيْهَا، ثُمَّ تَوَاقَصْتُ عَلَيْهَا، ثُمَّ جِئْتُ حَتَّى قُمْتُ عَنْ يَسَارِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَدَارَنِي حَتَّى أَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ، ثُمَّ جَاءَ جَبَّارُ بْنُ صَخْرٍ، فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ جَاءَ فَقَامَ عَنْ يَسَارِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدَيْنَا جَمِيعًا، فَدَفَعَنَا حَتَّى أَقَامَنَا خَلْفَهُ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَرْمُقُنِي، وَأَنَا لاَ أَشْعُرُ ثُمَّ فَطِنْتُ بِهِ، فَقَالَ هَكَذَا بِيَدِهِ، يَعْنِي شُدَّ وَسَطَكَ، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَا جَابِرُ»! قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: «إِذَا كَانَ وَاسِعًا فَخَالِفْ بَيْنَ طَرَفَيْهِ، وَإِذَا كَانَ ضَيِّقًا فَاشْدُدْهُ عَلَى حِقْوِكَ»..

سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَ قُوتُ كُلِّ رَجُلٍ مِنَّا فِي كُلِّ يَوْمٍ تَمْرَةً، فَكَانَ يَمَصُّهَا، ثُمَّ يَصُرُّهَا فِي ثَوْبِهِ، وَكُنَّا نَخْتَبِطُ بِقِسِيِّنَا وَنَأْكُلُ حَتَّى قَرِحَتْ أَشْدَاقُنَا فَأُقْسِمُ أُخْطِئَهَا رَجُلٌ مِنَّا يَوْمًا فَانْطَلَقْنَا بِهِ نَنْعَشُهُ، فَشَهِدْنَا أَنَّهُ لَمْ يُعْطَهَا فَأُعْطِيهَا، فَقَامَ فَأَخَذَهَا. سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى نَزَلْنَا وَادِيًا أَفْيَحَ، فَذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْضِي حَاجَتَهُ، فَاتَّبَعْتُهُ بِإِدَاوَةٍ مِنْ مَاءٍ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ يَرَ شَيْئًا يَسْتَتِرُ بِهِ، فَإِذَا شَجَرَتَانِ بِشَاطِئِ الْوَادِي، فَانْطَلَقَ

رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إلَى إحْدَاهُمَا، فَأَخَذَ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا، فَقَالَ: «انْقَادِى عَلَىَّ بِإِذْنِ اللَّهِ»، فَانْقَادَتْ مَعَهُ كَالْبَعِيرِ الْمَخْشُوشِ الَّذِى يُصَانِعُ قَائِدَهُ، حَتَّى أَتَى الشَّجَرَةَ الأُخْرَى، فَأَخَذَ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا، فَقَالَ: «انْقَادِى عَلَىَّ بِإِذْنِ اللَّهِ»، فَانْقَادَتْ مَعَهُ كَذَلِكَ، حَتَّى إذَا كَانَ بِالْمَنْصَفِ مِمَّا بَيْنَهُمَا لأَمَ بَيْنَهُمَا (يَعْنِى جَمَعَهُمَا) فَقَالَ: «الْتَئِمَا عَلَىَّ بِإذْنِ اللَّهِ». فَالْتَأَمَتَا، قَالَ جَابِرٌ: فَخَرَجْتُ أُحْضِرُ مَخَافَةَ أَنْ يُحِسَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقُرْبِى فَيَبْتَعِدَ وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَبَّادٍ فَيَتَبَعَّدَ) فَجَلَسْتُ أُحَدِّثُ نَفْسِى، فَحَانَتْ مِنِّى لَفْتَةٌ، فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُقْبِلاً وَإِذَا الشَّجَرَتَانِ قَدِ افْتَرَقَتَا، فَقَامَتْ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا عَلَى سَاقٍ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَفَ وَقْفَةً، فَقَالَ: بِرَأْسِهِ هَكَذَا (وَأَشَارَ أَبُو إِسْمَاعِيلَ بِرَأْسِهِ يَمِينًا وَشِمَالاً) ثُمَّ أَقْبَلَ، فَلَمَّا انْتَهَى إِلَىَّ قَالَ: «يَا جَابِرُ هَلْ رَأَيْتَ مَقَامِى»؟ قُلْتُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَانْطَلِقْ إِلَى الشَّجَرَتَيْنِ، فَاقْطَعْ مِنْ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا، غُصْنًا فَأَقْبِلْ بِهِمَا حَتَّى إِذَا قُمْتَ مَقَامِى، فَأَرْسِلْ غُصْنًا عَنْ يَمِينِكَ وَغُصْنًا عَنْ يَسَارِكَ»، قَالَ جَابِرٌ: فَقُمْتُ فَأَخَذْتُ حَجَرًا فَكَسَرْتُهُ وَحَسَرْتُهُ فَانْذَلَقَ لِى، فَأَتَيْتُ الشَّجَرَتَيْنِ، فَقَطَعْتُ مِنْ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا غُصْنًا، ثُمَّ أَقْبَلْتُ أَجُرُّهُمَا حَتَّى قُمْتُ مَقَامَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرْسَلْتُ غُصْنًا عَنْ يَمِينِى وَغُصْنًا عَنْ يَسَارِى، ثُمَّ لَحِقْتُهُ، فَقُلْتُ: قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَعَمَّ ذَاكَ؟ قَالَ: «إِنِّى مَرَرْتُ بِقَبْرَيْنِ يُعَذَّبَانِ، فَأَحْبَبْتُ بِشَفَاعَتِى أَنْ يُرَفَّهَ عَنْهُمَا مَا دَامَ الْغُصْنَانِ رَطْبَيْنِ». قَالَ: فَأَتَيْنَا الْعَسْكَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَا جَابِرُ نَادِ بِوَضُوءٍ»، فَقُلْتُ: أَلاَ وَضُوءَ، أَلاَ وَضُوءَ، أَلاَ وَضُوءَ؟ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا وَجَدْتُ فِى الرَّكْبِ مِنْ قَطْرَةٍ، وَكَانَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يُبَرِّدُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَاءَ فِى أَشْجَابٍ لَهُ عَلَى حِمَارَةٍ مِنْ جَرِيدٍ، قَالَ: فَقَالَ لِىَ: «انْطَلِقْ إِلَى فُلاَنِ بْنِ فُلاَنٍ الأَنْصَارِىِّ، فَانْظُرْ هَلْ فِى أَشْجَابِهِ مِنْ شَىْءٍ»؟ قَالَ: فَانْطَلَقْتُ إِلَيْهِ، فَنَظَرْتُ فِيهَا، فَلَمْ أَجِدْ فِيهَا إِلاَّ قَطْرَةً فِى عَزْلاَءِ شَجْبٍ مِنْهَا، لَوْ أَنِّى أُفْرِغُهُ لَشَرِبَهُ يَابِسُهُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى لَمْ أَجِدْ فِيهَا إِلاَّ قَطْرَةً فِى عَزْلاَءِ شَجْبٍ مِنْهَا، لَوْ أَنِّى أُفْرِغُهُ لَشَرِبَهُ يَابِسُهُ، قَالَ: «اذْهَبْ فَأْتِنِى بِهِ»، فَأَتَيْتُهُ بِهِ، فَأَخَذَهُ بِيَدِهِ، فَجَعَلَ يَتَكَلَّمُ بِشَىْءٍ

لاَ أدْرِي مَا هُوَ، وَيَغْمِزُهُ بِيَدَيْهِ، ثُمَّ أعْطَانِيهِ فَقَالَ: «يَا جَابِرُ نَادِ بِجَفْنَةٍ»، فَقُلْتُ: يَا جَفْنَةَ الرَّكْبِ، فَأُتِيتُ بِهَا تُحْمَلُ، فَوَضَعْتُهَا بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ فِي الْجَفْنَةِ هَكَذَا فَبَسَطَهَا وَفَرَّقَ بَيْنَ أصَابِعِهِ ثُمَّ وَضَعَهَا فِي قَعْرِ الْجَفْنَةِ وَقَالَ: «خُذْ يَا جَابِرُ فَصُبَّ عَلَيَّ وَقُلْ: بِاسْمِ اللَّهِ»، فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ، وَقُلْتُ: بِاسْمِ اللَّهِ، فَرَأَيْتُ الْمَاءَ يَتَفَوَّرُ مِنْ بَيْنِ أصَابِعِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، ثُمَّ فَارَتِ الْجَفْنَةُ وَدَارَتْ، حَتَّى امْتَلأَتْ، فَقَالَ: «يَا جَابِرُ نَادِ مَنْ كَانَ لَهُ حَاجَةٌ بِمَاءٍ»، قَالَ: فَأَتَى النَّاسُ فَاسْتَقَوْا حَتَّى رَوَوْا، قَالَ: فَقُلْتُ هَلْ بَقِيَ أحَدٌ لَهُ حَاجَةٌ؟ فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ مِنَ الْجَفْنَةِ وَهِيَ مَلأَى.

وَشَكَا النَّاسُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْجُوعَ، فَقَالَ: «عَسَى اللَّهُ أنْ يُطْعِمَكُمْ»، فَأَتَيْنَا سِيفَ الْبَحْرِ فَزَخَرَ الْبَحْرُ زَخْرَةً فَأَلْقَى دَابَّةً، فَأَوْرَيْنَا عَلَى شِقِّهَا النَّارَ، فَاطَّبَخْنَا وَاشْتَوَيْنَا، وَأَكَلْنَا حَتَّى شَبِعْنَا، قَالَ جَابِرٌ: فَدَخَلْتُ أنَا وَفُلاَنٌ وَفُلاَنٌ حَتَّى عَدَّ خَمْسَةً فِي حِجَاجِ عَيْنِهَا مَا يَرَانَا أحَدٌ، حَتَّى خَرَجْنَا فَأَخَذْنَا ضِلَعًا مِنْ أضْلاَعِهِ فَقَوَّسْنَاهُ، ثُمَّ دَعَوْنَا بِأَعْظَمِ رَجُلٍ فِي الرَّكْبِ وَأَعْظَمِ جَمَلٍ فِي الرَّكْبِ وَأَعْظَمِ كِفْلٍ فِي الرَّكْبِ، فَدَخَلَ تَحْتَهُ مَا يُطَأْطِئُ رَأْسَهُ} . {الحديث: ٧٤٣٧ = ٧٤٧٢ فم} :

عوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: منو باوکم دەرچووینو ڕۆیشتین بۆ ناو هۆزی یاریدەدەران (ئەنصار) هەتا نەمردوونو ماون لێیانەوە فێری عیلمو زانست ببین، یەکەم کەس کە تووشی بووین ئەبول یەسەر بوو، کە هاوڕێی پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەو بێ) خولامێکی خۆیی لەگەڵدا بوو، خولامەکە پڕ بەقولێ تۆمارو پەڕە کاغەزی لوول دراوی پێ بوو، ئەبول یەسەر خۆی عابایەکی میلدارو مەعافیرییەکی لەبەردا بوو، کە جۆرە کوتاڵێ بوو، لە گوندی مەعافیر دروست دەکرا، خولامەکەشی هەروەها، دوو پارچەی لەو جۆرەی لەبەردابوو، جا باوکم پێی گوت: ئەی مامە! دەتبینم تووڕە دیاریت، گوتی: ئا، تووڕەم، چەردەیێ ماڵم لەسەر فیساری کوڕی فیساری ئەلحەرامی بوو، چووم بۆ ماڵیانو سڵاوم کردو گوتم: فیسارە

کەس لەماڵە؟ گوتیان: نەء، منالێکی هەراشی هەبوو هاتە دەرەوە، لێم پرسی: باوکت لەکوێیە؟ گوتی: گوێی لەدەنگی تۆ بوو خۆی کرد بە تەختە بەندەکەی دایکماو لەناو کولێنەکەدا خۆی حەشارداوە!

منیش گوتم: وەرە دەرەوە دەزانم لەکوێی، خۆت مەشارەوە! ئەویش هاتە دەرەوە، گوتم: بۆچی خۆتم لێ دەشاریتەوە؟ گوتی: بەخودا بەبێ درۆ راستت پێ دەڵێم، بەخودا لەوە ترسام نەبادا قسەت بۆ بکەمو درۆزن دەرچمو بەڵێنت پێ بدەمو بۆم نەچێتە سەر، ئەمە لەکاتێکا کەتۆ هاوڕێی پێغەمبەر بوویتو شتی وا لەگەڵ تۆدا زۆر ناشایستە! سوێندم بەخودا دەستیشم کورتەو قەرزاریشمو نەدارام، گوتی: گوتم توخوا ئەمە وایە؟ گوتی: بەخودا وایە، گوتم: توخودا؟ گوتی: بەخودا، گوتم: توخودا؟ گوتی: بەخودا، سێجار ئاوا سوێندمدا، گوتی: ئیتر ئەبول یەسەر قەواڵەی قەرزەکەی دێنێو قەرزەکەی بەدەستی خۆی دەکوژێنێتەوەو پێی دەڵێ: ئەگەر بووت بمدەرەوە، دەنا گەردنت ئازاد بێ، جا ئەبول یەسەر دوو پەنجەی نایە سەر هەردوو چاوی خۆیو گوتی: گەواە و شایەتی دەدەم کە بەم دووچاوەی خۆم چاوم لە پێغەمبەر بوو، وەبەم دوو گویچیەی خۆم گوێم لێی بوو، وە دەستی برد بۆ سەربەندی دڵیو گوتی: وە بەم دڵەی خۆم بەباشی لێی حاڵی بووم، لەو کاتەدا کە دەیفەرموو: (هەرکەسێ مۆڵەتی قەرزارێکی نەدارابدا، یا شتێ لە قەرزەکەی سەری دابشکێنێ بۆی، خودا دەیباتە بەر سێبەری رەحمەتی خۆی!).

گوتی: منیش پێیم گوت: ئەی مامە! خۆزگە تۆ عابا میلدارەکەت لە خولامەکەت دەسەندو مەعافیرییەکەی خۆتت دەدابەو، یا بەپێچەوانەوە، هەتا هەرکەسەتان سەرو دەستێ بەرگی لەیەك رەنگی لەبەردا بووایە؟! ئەویش دەستی هێنا بەسەرماو گوتی: خودایە! پیتو فەڕت تێ کەوێ، ئەی برازای خۆم! بەم دوو چاوانەی خۆم چاوم لێ بوو، وە بەم دوو گوێچکانەی خۆم گوێم لێ بوو، وە بەم دڵەی خۆم دڵە لەلای بوو، وە لەم کاتەدا بەدەستی هێمای کرد بۆ بەندی دڵی خۆی، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەهەمان شت کەخۆتان دەیخۆنو لەهەمان

جل‌و بەرگ کە بۆ خۆتانی دەکەن، نان‌و جل‌و بەرگیش بکەن بۆ بەندەو خولامەکانتان، بۆیە منیش ئەوەم پێ باشترە کە لەپڕو پاتالی جیهان بەشی بدەم، نەوەکوو لەرۆژی قیامەتا لەچاکەو خێرو خێراتم لەباتی ئەوە ببا بۆ خۆی.

لەپاشا چووینە لای جابیری کوڕی عەبدوللا، لەمزگەوتەکەی خۆی بوو، لەو کاتەدا لەیەك لۆ جلدا نوێژی دەکرد، ئنالاندبووی بەخۆیەوە، جامنیش بەناو خەلکەکەدا هەنگاوم نا هەتا چووم لەبەینی ئەوو لەبەینی قیبلەدا، دانیشتم‌و گوتم: بەر رەحمەتی خودا کەویت! چۆن بەیەك لۆ جلەوە نوێژ ەکەی، ئەمە لەکاتێکا کە ئەوە بالا پۆشەکەتە لەلاتا، گوتی: جا ئەویش چەمۆلەیەکی نا لەسینگم‌و گوتی: مەبەستم ئەوەیە کە گەوجێکی وەك تۆ بێت بۆ لام‌و ببینێ کەمن چی دەکەم، تا ئەویش ئاوا بکا، لەم مزگەوتەی حازریەدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلامان دارکی هێشووە خورمایەکی ئیبنو طالبی بەدەستەوە بوو، بەرووی رۆگەی مزگەوتەکەوە کلمێکی بینی، جا بەنووکی لاسکی هێشووە خورماکە چلمەکەی کڕاند، ئەوجا رووی کردە ئێمەو فەرمووی: (کێتان پێی خۆشە کە خودا رووی لێ وەرگێڕێ؟) گوتی: ئێمەیش سەرمان کزکردو سامامان لێ نیشت، دیسان فەرمووی: (کێتان پێی خۆشە کە خودا رووی لێ وەرگێڕێ؟). گوتی: دیسان سەرمان کزکردو سام دایگرتین، بۆ جاری سێیەم دیسانەوە فەرموویەوە: (کێتان پێی خۆشە کە خودا رووی لێ وەرگێڕێ؟)

جا گوتمان: کەسمان، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دەی کاتێ یەکێ لەئێوە هەلدەستێ بۆ نوێژ ئەوە خودای گەورەو پیرۆز روو بەروویەتی‌و بەرەو روویەتی، کەواتە تف رۆنەکاتە بەردەمی خۆی، وە هەروەها نەشیکاتە لای راستی خۆی، با لەلای چەپیەوە تف بکاتە ژێر پێی چەپی، وە ئەگەر لەناکاو، تفێ، بەلغەمێ، چلمێ، زۆری بۆهێنا، با بەلایەکی جلەکەی ئاوایەکی لێ بکا، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) جلەکەی نووشتانەوەو ولی بەیەکا، واتە: ئاوای لێ بکا. ئەنجا فەرمووی: (هەنێ عەبیر، واتە: بۆنی خۆشم، بۆ بهێنن). جا کوڕێکی لاو لەناو

خەڵکەکەدا هەڵسا، بە هەڕاکردن چوو لەماڵەوە، لەناو لەپیا هەنێ خەلووقی بۆ هێنا، کە خەلووق شتێکی زۆر بۆن خۆشە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی وەرگرتو داینا لەسەر نووکی لاسکی هێشووە دارخورماکەو شوێنی کلمەکەی پێ سواخ ا، جابیر دەیگوت: ئا لەمەوەیە کە ئێستا ئێوە دەچن بۆنی خۆشەویستی دەدەن لە مزگەوتەکانتان!

لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چووین بۆ غەزای بەطنی بوواط، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگەڕا بۆ مەجدیی کوڕی عەمری ئەل-جوهەنی، لەو غەزایەدا، تاقە وشترێکی ئاوکێش پێنج کەس، یا شەش کەس، یا حەوت کەس، بەسەرە، بەنۆرە، بەرودوای یەکتری سواری ئەو تاقە وشترە دەبوون، جا پیاوێکی یاریدەدەر (واتە: ئەنصار) وشترێکی خۆی هەبوو، سەرە هاتە سەر کەسواربێ، وشترەکەی پیخ داو سواری بوو، کە ویستی هەڵی سێنێتەوە وشترەکە ساوە ساوی دەکرد، ئەویش گوتی: هەچچە، لەعنەتی خودات لێ بێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە کێ بوو لەعنەت لە وشترەکەی دەکا؟) ئەنصارییەکە گوتی: من بووم، ئەی پێغەمبەری خودا!

فەرمووی: (دابەزە لێی، لەگەڵ لەعنەتو نەفرین لێکراوا هاوڕێتی ئێمە مەکە، نزای خراپ لەخۆتانو لە ماڵو منالتان مەکەن، مەبادا رێکەوتی ئەوکاتانە بکەن کە هەرچی لەخودا داوابکرێ، لەو کاتانەدا، خودا پێتانی دەدا!).

جا رۆیشتین لەخزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا دەمەو ئێوارەیێ، لە ئاوێ لە ئاوەکانی عەرەب نزیك بووینەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چی پیاوێ لەپێش ئێمەوە دەڕوا، ئەستێڵەکە سواخ دەداو ئامادەی دەکاو بەریانەکەی دەگرێ، تا ئاوەکە ئەوق دەبێتەوەو پەنگ دەخواتەوەو ئەستێڵەکە پڕدەبێ، هەم خۆشی ئاو دەخواتەوەو هەم ئاو بۆ ئێمەیش ئامادە دەکا). جابیر گوتی: منیش هەڵسامو گوتم: قوربان! من دەچم. فەرمووی: (کێی تر دەچێ لەگەڵ جابیردا؟) جەبباری کوڕی صەخر هەڵسا گوتی: من. جا منو ئەو تێمان تەقان هەتا

چووینە سەر بیرەکەو سەتڵێ دوو سەتڵ ئاومان هەڵگۆستو ئەستێڵی بەردەم بیرەکەمان سواخ داو رێکمان خستو ئینجا ئاومان لەبیرەکە هەڵکێشا، هەتا ئەستێرەکەمان لێیان لیپ کرد لە ئاو، جا یەکەم کەس کەهاتو سەری هەڵدا بۆ لامان، پێغەمبەر خۆی بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەیارمەتی ئێوە؟). عەرزیمانکرد: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! ئیتر جڵەوی شل کرد بۆ وشترەکەی، وشترەکەی تێر ئاوی خواردەوە، ئەنجا جڵەوەکەی توند کردەوەو وشترەکە کەڵێ پان کردەوەو گمێزی کرد، ئەوجا وشترەکەی لادا لەسەر ئاوەکەو پێخی داو پاڵی خست. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی هاتەوە بۆسەر گۆمیلکەکەو دەستنوێژی لێ گرتو منیش هەڵسامو چووم لەشوێن جێ دەستنوێژەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستنوێژم گرت، جەباری کوڕی صەخریش چوو دەست بەئاو بگەیەنێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا نوێژبکا، منیش یەك عابای میلدارم لەبەردا بوو، ویستم دوو چمکەکەی راستو چەپ بکەم، پیاما نەگەیشتەوە، عاباکە هەنێ ریشوو گێزو گوڵنگەی پێوە بوو، سەر بەرەو خوارم کردەوەو ئەنجا لەژێر هەردوو باڵمەوە هەردوو چمکەکەیم راستو چەپ کردو لەسەر سینگم گرێم دانو ملم کووڕ کردەوە بەسەریاو بە ملیشم گرتم تا بەرنەبێتەوە ئەنجا چووم لەلای چەپی پێغەمبەرەوە راوەستام، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرتمو سووڕاندمیەوەو بردمی لەلای راستی خۆیەوە رایوەستاندم، لەپاشدا جەبباری کوڕی صەخریش هاتەوەو دەستنوێژی گرتو هات لەلای چەپی پێغەمبەرەوە وەستا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی هەردوکمانی گرتو پاڵی پێوەناین بۆ دواوە هەتا رێك لەپشتی خۆیەوە ریزی کردینو رایوەستانین، ئاگام لێ نەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرەنجی منی دەدا، لەپاشا کە هەستم پێی کرد بەدەستی ئاوای کرد، واتە: ناو قەدت ببەستە، جا کاتێ کەڵێ بووەوە فەرمووی: (ئەی جابیر!). گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ئەگەر جلەکە فەرەح بوو، دوو چمکەکەی راستو چەپ بکە، بەڵام ئەگەر تەسك بوو بیبەستە بە کەمەرتەوە).

جا رۆیشتین لەخزمەتی حەزرەتدا (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی کە ئادەمیزاد پێی بژی خۆراکی هەر پیاوێ لەئێمە هەر رۆژەی یەك قل خورما بوو! جاماوەیێ دەیمژی‌و لەپاشا گرێی دەدا لە قەراخێکی جلەکەیدا، وە بەکەوانەکانیشمان گەڵا دەوەران‌و دەمان خوارد، ئەوەندە گەڵا دارمان خواردبوو لالغاوەمان تەرەکی بوو، وە بوو بوو بەزام! سوێندم بەخودا رۆژێ پیاوێکمان بە هەڵە لەبیرچوو بوو، دەنکە خورماکەی نەدابوو پێی، ئێمە لەبەر بێ هێزی چووینە ژێر باڵی‌و بەلارەو لارو لەقە لەق بردمان‌و شایەتیمان بۆیدا کە وەری نەگرتووە، ئەوجا دەنکە خورماکەی داپێی، ئەویش هەڵسا وەری گرت، لەگەڵ پێغەمبەردا کەوتینە رێ‌و رۆیشتین، هەتا گەیشتینە دۆڵێکی پان‌و پۆڕو بەرین‌و لەوێ لاماندا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چوو دەست بەئاو بگەیەنێ، منیش بە مەتارەیێ ئاوەوە شوێنی کەوتم، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەماشای کرد هیچی نەدی کەخۆی لەپاڵدا حەشاربدا، لەوپەڕی شیوەکەوە دوو درەخت هەبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆ لای یەکێکیان‌و لقێکی لێ گرت‌و بە درەختەکەی فەرموو: (بەفەرمانی خودا شوێنم کەوەو وەرە لەگەڵما، ئیتر وەك وشتری قەمتەرکراوی، کەڵەمە لە لووت کە چۆن مامە حەمەیی دەکا بۆ جڵەو کێشەکە، ئەو درەختەیش ئاوا بە ملکەچی شوێنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەوت، رۆیشت تا چووە لای درەختەکەی ترو پەلێکی لەویش گرت‌و بەویشی فەرموو: (بەفەرمانی خودا تۆیش وەرە لەشوێنم!) ئەویش بەهەمان چەشن شوێنی کەوت، جارۆیی هەتا گەیشتە ناوەڕاستی نێوانی هەردوو لایان، لەوێ درەختەکانی نووساند بە یەکەوەو فەرمووی: (بە فەرمانی خودا بنووسێن بەیەکەوەو حەشارگەیەکم بۆ بکەن!).

درەختەکانیش لکان بەیەکەوەو پاڵیاندا بەیەکەوەو بوون بە پەردەو حەسار بۆی هەتا سەراوەکەی تەواوکرد، جابیر گوتی: منیش بەغار دوورکەوتمەوە، نەبادا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەست بکا کەمن نزیك کەوتوومەتەوەو ئەو دوورتر بکەوێتەوە، یا زیاتر دوور بکەوێتەوە، ئینجا دانیشتم‌و لەبەرخۆمەوە بیرم لەمە

دەكردەوەو سێی‌و دووی دڵی خۆمم دەكرد، جا كە ئاوڕم دایەوە تەماشام كرد وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دێت بەرەو من، وە درەختەكانیش لەیەك جوێ بوونەوەو هەریەكەی لەسەر بنكی خۆی وەستاوەو چاوەنواڕی فەرمانی پێغەمبەر دەكا! تەماشام كرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێستێكی كردو بەسەری ئاوایەكی كردو ئەوجا درەختەكان چوونەوە بۆ جێگەی خۆیان، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتەوە، كە گەیشتەوە لای من، فەرمووی: ئەی جابیر! ئەم پایەی منت بینی؟) عەرزیمكرد: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا!. فەرمووی: (دەبچۆ مبۆلای ئەو دوو درەختە، لەهەر یەكەیان پەلێ ببڕەو بیهێنە، تا دەگەیتە شوێنەكەی من، لەوێوە لقێكیان لەڕاستی خۆتەوەو ئەو لقەكەی تریان لەلای چەپتەوە ڕەوانە بكە). جابیر گوتی: جا منیش هەڵسامو بەردێكم هێناو شكاندمو دەمەكەیم تەنك كردو تا تەواو بوو بەدەمو تیژبوو، چووم بۆلای درەختەكان‌و لە هەریەكەیان لقێكم بڕی‌و بەشوێن خۆما بەكێشم كردن هەتا گەیشتمە شوێن پایەكەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێوە، وەك حەزرەت فەرمانی پێ كردم، لقێكیانم لە ڕاستمەوەو ئەو لقەكەی تریانم لەلای چەپمەوە ڕەوانە كردو خۆم چوومەوە بۆ خزمەتی‌و گوتم: قوربان! وەك فەرمووت وام كرد، ئەمە بۆچی بوو؟ فەرمووی: (من بەلای دوو گۆڕدا تێ پەڕیم ئەشكەنجەو سزا دەدران لەبەرئەوە حەزم كرد كە بەهۆی تكای منەوە سزاو ئازاریان سووك ببێ، تا ئەو دوو لقە تەڕاییان تیا دەمێنێ. گوتی: جا چووینەوە هۆردووگاكە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی جابیر! ئاو پەیداكە بۆ دەستنوێژ). منیش دەستم كرد بە بانگەواز: كێ بێ ئاوی لەلا هەبێ بۆ دەستنوێژ، ئەرێ كێ بێ ئاوی لەلابێ بۆ دەستنوێژ... تاد).

گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! یەك دڵۆپ ئاو چییە لەناو كاروانەكەدا دەستم نەكەوت! پیاوێكی ئەنصاری هەبوو لەچەند كوندە كۆنێكی ڕەقەڵهاتوودا، ئاوی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سارد دەكرد. لەسەر كۆندەڵانێ لەداركی پەلكە خورما. گوتی: فەرمووی: (تێ تەقێنە بۆلای فیساری كوڕی فیساری ئەنصاری بزانە

هیچ ئاو هەیە لە کوندەکانیدا. گوتی: کەچووم تەماشام کرد تۆزێ ئاو هەبوو، لە هەنگڵی کوندەیەکا بوو، ئەوەندە کەم بوو ئەگەر دایم بکردایە لاوشکەکەی کوندەکە خۆی هەڵی دەمژی!

چوومەوە بۆ خزمەتیو حاڵەکەم عەرزی کرد، فەرمووی: (بڕۆ ئەو چۆڕە ئاوەم بۆ بێنە). چووم بۆیم هێنا، گرتی بەدەستیەوەو دەستی کرد بە نزاو دۆعا خوێندن، بەڵام نەمزانی لە دۆعاکەدا دەفەرموێ چی، وە بەدەستیشی کوندەکەی هەڵ دەگوشی، ئینجا دایەوە دەستمو فەرمووی: (بانگەواز هەڵدە بۆ سوێنەیەکی گەورە، منیش جاڕمدا: کێ بێ سوێنەیەکی گەورەی وای هەبێ کە بەشی ئەم بڕکە سوارە ئاو بگرێ. جا بەکۆڵ سوێنەیەکی وایان بۆم هێنا، تا لەبەردەمی حەزرەت خۆیدا دامنا، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی ئاوای کرد، لەناو سوێنەکەدا: لەپی پان کردەوەو پەنجەکانی بڵاو کردەوەو دەستی لەناو بنی سوێنەکەدا دانا، فەرمووی: ئەی جابیر! ئەو تۆزە ئاوەی کەوا لەکوندەکەدا بیکە بەسەر دەستی مندا، کەوا لەناو سوێندەکەداو بڵێ: باسم الله: بە پیرۆزیی ناوی خودا) منیش وامکردو گوتم: باسم الله، ئیتر چاوم لێ بوو کە قوڵ قوڵ ئاو لەنێوانی پەنجەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەڵ دەقوڵی، ئەوجا سوێنەکە وەك کانی تەقیو ئاوی تێزا هەتا پڕ پڕ بوو، فەرمووی: (ئەی جابیر! جاڕبدە کێ کاری بەئاو هەیە بابێ ئاو ببا بۆخۆی). گوتی: جەماوەرەکە هاتن ئاویان خواردەوە تا تێراوو پاراو بوون، گوتی: گوتم: ئەرێ کەس ماوە کاری بەئاو هەبێ؟ دیاربوو کەس نەمابوو، هەرکەسەیان بەشی خۆی ئاوی بردبوو، ئیتر حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی لە سوێنەکە دەرهێنا، هێشتا سوێنەکە لیپان لیپ بوو لەئاو.

خەڵکەکە لەخزمەتی حەزرەتدا سکاڵایان لەدەستنتی برسێتی کرد، فەرمووی: (هیوا وایە کە خودا خۆی خواردەمەنیتان بۆ بڕەخسێنێ!). جا چووینە قەراخ دەریا، لەوێ دەریاکە شەپۆلێکی داو شەپۆلەکە لەگەڵ خۆیا نەهەنگێکی فڕەدایە دەرەوەو لەپاڵیا ئاگرمان کردەوەو دەستمان کرد بە کوڵاندنو برژاندن لە

گۆشتەکەی‌و دەستمان کرد بە خواردن تا تێرمان خوارد. جابیر گوتی: من‌و فیسارو ئەو فیسارو ئەو فیسار، هەتا پێنج کەسی ژمارد، کە هەموومان ئەم پێنج کەسە لەناو کالانەی چاویدا دانیشتین، لە دەرەوە دیارنەبووین‌و کەس چاوی لێمان نەبوو تا خۆمان هاتینە دەرەوە!

پەراسوویەکیشمان چەمانەوەو راستمان کردەوەو لەسەر نووکەکەی رامان گرت، زلترین زەلامی کاروانەکە، بەسواری زەبەللاحترین نێرە وشتری ناو وشترەکان، کە قەبەترین زین‌و کۆپان بەسەر پشتیەوە بوو، بەژێریدا رۆیی‌و لەژێریەوە رەت بوو، بەبێ ئەوەی کەسەری دانەوێنێ). {بڕوانە: ژمارە: ١٣٢٦ مختصر صحيح مسلم کە لەپێشەوە رابورد = ٤٩٧٤ صحيح مسلم + تاج/٣، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٣١٨٥ ج/٤}.

## ١٢٠٠) باسی موعجیزەی لەتبوونی مانگ. (٧٠٠٢ - ٧٠١٠)

## بَابٌ: فِي إِنْشِقَاقِ الْقَمَرِ

١٥٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمِنًى إِذَا انْفَلَقَ الْقَمَرُ فِلْقَتَيْنِ، فَكَانَتْ فِلْقَةٌ وَرَاءَ الْجَبَلِ، وَفِلْقَةٌ دُونَهُ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اشْهَدُوا». {الحديث: ٧٠٠٣ = ٧٠٢٨ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٤٧ = ٣٦٣٦، ٣٨٦٩، ٣٨٧١، ٤٨٦٤، ٤٨٦٥}:

عەبدوللای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەمینا لەخزمەتی حەزرەتدا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) مانگ بوو بەدوو کەرتەوە، کەرتێکیان کەوتە پشت کێوەکەوەو ئەو کەرتەکەی تریشیان کەوتە ئەو دیویەوە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئێمەی فەرموو: (تەماشاکەن‌و بەشایەت بن کە ئەم موعجیزە گەورەیەتان بەچاوی خۆتان لەمن بینی!). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٤١٣٧ ج/٤}.

١٥٣٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً، فَأَرَاهُمُ انْشِقَاقَ الْقَمَرِ مَرَّتَيْنِ. {الحديث: ٧٠٠٧ = ٧٠٣٢ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خەڵکی مەککە داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، وە لەناو خۆیانا ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە موعجیزەکەیان کە داوای دەکەن لە پێغەمبەر کە ئەنجامی بدا، لە مانگا دەربکەوێ، جا شەوێکیان بڕیارداو لەو شەوەدا کۆبوونەوەو حەزرەت هاتو بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی کرد بۆ مانگو مانگ دوو لەت بوو، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دووجار لەتبوونی مانگی پێشانی خەڵکی مەککەدا). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٤١٣٦، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

موعجیزە چییە؟ موعجیزە کارێکی زۆر گرنگە، کە پێغەمبەران ئەنجامی دەدەن، هەتا ببێ بە بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرا لەسەر داوای پێغەمبەرایەتی، کە ئەو جۆرە کارە گرنگو سەر سوڕهێنەرە بە هیچ شێوەیێ لە توانای کەسی تردا نییە، بێجگە لە خودای گەورە بۆ نموونە: حەزرەتی عیسا، بۆ بەڵگە لەسەر ڕاستیی داواکەی، کە پێغەمبەری خودایە، ئەم موعجیزانە، لەسەر دەستی ئەودا ڕووی داوە:

١- لە بێشکەدا قسەی کردووە.

٢- لەگەڵ لەدایك دەبێ لەگەڵ دایکیدا دەست دەکا بە گفتوگۆ.

٣- لە قوڕ باڵندەی دروسمت دەکردو دەفڕی.

٤- مردووی زیندوو دەکردەوە.

٥- گولی و بەڵەکی چاك دەکردەوە.

٦- خەبەری لە غەیب دەدا.

## ١٢٠١) پاراستنی پێغەمبەر لە ئازاری ناحەزانی. (٦٩٩٦)

## بَابٌ: مَنعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِمَّنْ هَمَّ بِأَذَاهُ

١٥٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: هَلْ يُعَفِّرُ مُحَمَّدٌ وَجْهَهُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟ قَالَ: فَقِيلَ: نَعَمْ، فَقَالَ: وَاللاَّتِ وَالْعُزَّى، لَئِنْ رَأَيْتُهُ يَفْعَلُ ذَلِكَ لأَطَأَنَّ عَلَى

رَقَبَتِهِ، أَوْ لأُعَفِّرَنَّ وَجْهَهُ فِي التُّرَابِ، قَالَ: فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهُوَ يُصَلِّي، زَعَمَ لِيَطَأَ عَلَى رَقَبَتِهِ، قَالَ: فَمَا فَجِئَهُمْ مِنْهُ، إِلاَّ وَهُوَ يَنْكِصُ عَلَى عَقِبَيْهِ، وَيَتَّقِي بِيَدَيْهِ، قَالَ: فَقِيلَ لَهُ: مَا لَكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ بَيْنِي وَبَيْنَهُ لَخَنْدَقًا مِنْ نَارٍ وَهَوْلاً وَأَجْنِحَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لَوْ دَنَا مِنِّي لاَخْتَطَفَتْهُ الْمَلاَئِكَةُ عُضْوًا عُضْوًا»، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ - لاَ نَدْرِي فِي حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ أَوْ شَيْءٌ بَلَغَهُ -: (كَلاَّ إِنَّ الإِنْسَانَ لَيَطْغَى. أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى. أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى. عَبْدًا إِذَا صَلَّى. أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَى أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى. أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى). - يَعْنِي أَبَا جَهْلٍ - (أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى. كَلاَّ لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ. نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ. فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ. سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ. كَلاَّ لاَ تُطِعْهُ) في رواية قَالَ: «وَأَمَرَهُ بِمَا أَمَرَهُ بِهِ». في رواية: (فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ) يَعْنِي قَوْمَهُ. {الحديث: ٦٩٩٦ = ٧٠٢١فم. تجريد البخاری/٤، رقم: ١٧١٨ = ٤٩٥٨ فتح الباری}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو جەهل گوتی: ئەرێ موحەممەد بووە بەو پیاوە کە بەبەرچاوی ئێوەوە، بوێرێ بەناوی نوێژەوە، لنگەو تلوور بکەوێ، یا لەپەو روو بکەوێو بەناوی کوڕنووش‌و سەجدەوە تەوێڵی لەسەر خاك‌و خۆڵ دابنێ‌و رووی خۆی خولاوی بکا؟

گوتیان: بەڵێ، ئاوا دەکا. وتی: بەلات‌و بە عوززا، بەدوو خودا مەزنەکەی قوڕەیش! ئەگەر ببینم شتی وابکا، بەپێوە لەناو کوڕنووشدا دەچمە سەر بۆتەقەی ملی، یا روخساری لەناو خۆڵا دەگەوزێنم. فەرمووی: جا جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی دەکرد، لەوکاتەدا ئەبو جەهل چوو بۆ گیانی، هەتا کار بەسوێندەکەی بکاو دەستدرێژی لێ بکات لەناو نوێژەکەیدا. بەڵام خەڵکەکە هەر ئەوەندەیان زانی کە ئەبو جەهل پاشەو پاش دەکشێتەوەو وەك کەسێ شتێ شالاوی بۆ هێنابێ، بەهەردوو دەست پاسی خۆی دەکا. فەرمووی: کاتێ پێیان گوت: ئەوە چیتە بۆ وادەکەیت؟ گوتی: خەندەکێکی پڕ لەئاگرو شتگەلێکی زۆر سامناك‌و کۆمەڵێ باڵ، لە غەیبەوە لەبەینی من‌و لەبەینی ئەودا پەیدا بوون!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر زیاتر لێم نزیك ببوایەتەوەو وازی لەو دەستدرێژییەی نەهێنایە، بەرلەوەی کە ئەو دەستدرێژی لەمن بکا، فریشتە پەل پەلیان دەکردو پارچە پارچە دەیان فڕاند).

ڕاوی دەفەرموێ: جا نازانین کە باسی هاتنی ئەم ئایەتانەی دواوەیش بەشێ بوو لەم فەرموودەیەی ئەبو هورەیرەو ئەبو هورەیرە ئەمەیشی فەرمووە، یا شتێ بوو گەیشتووە بەراویو ئەو فەرمووی: جا خودای بالاّ دەستو خاوەن شکۆ، بەم بۆنەیەوە، ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە:

{كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى، أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى، إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى، أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى، عَبْدًا إِذَا صَلَّى، أَرَأَيْتَ إِن كَانَ عَلَى الْهُدَى، أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى، أَرَأَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّى، أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى، كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ، نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ، فَلْيَدْعُ نَادِيَه، سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ، كَلَّا لَا تُطِعْهُ - سورة العلق، الآيات: ٦ - ١٩}.

کورتەی واتاکەیانو مەبەست لێیان:

(مرۆڤی نەزانی دوور لەخوا، بەدەنکە جۆیێ دەزەڕێ، بە کەمترین نازو نیعمەت لەخۆی دەگۆڕێ، وای لێ دێ گاڵتەی بە ئایینو رەفتاری بەرزدێ، رێ لەبەرنامەی ئایین دەگرێ، نازانێ کە خودا ئاگای لەهەموو شتێ هەیە هیچی لێ ون نابێ، رۆژێ بە کەساسی دێتەوە بەردەستی خودا، خودا تۆڵەی بەرودوای لێ دەستێنێ).

### ١٢٠٢) پاراستنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەستدرێژی کەسێ کە ویستوویەتی بیکوژێ. (٥٩٠٩ - ٥٩١١)

### بابٌ: منع النبيِّ (صلَّى اللهُ عليه وسلم) ممَّنْ أرادَ قتلَهُ

١٥٤١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) غَزْوَةً قِبَلَ نَجْدٍ، فَأَدْرَكَنَا رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضَاهِ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَعَلَّقَ سَيْفَهُ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا، قَالَ: وَتَفَرَّقَ النَّاسُ فِي الْوَادِي يَسْتَظِلُّونَ بِالشَّجَرِ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى

اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ رَجُلاً أَتَانِي وَأَنَا نَائِمٌ فَأَخَذَ السَّيْفَ، فَاسْتَيْقَظْتُ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِي، فَلَمْ أَشْعُرْ إِلاَّ وَالسَّيْفُ صَلْتًا فِي يَدِهِ فَقَالَ لِي: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قُلْتُ: اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّانِيَةِ: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ، قَالَ: فَشَامَ السَّيْفَ، فَهَا هُوَ ذَا جَالِسٌ»، ثُمَّ لَمْ يَعْرِضْ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). {الحديث: ٥٩٠٩ = ٥٩٠٥ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٥٥٧ = ٤١٣٥، ٢٩١٣، ٤١٣٤، ٤١٣٦}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە غەزایەکا لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەر بێ) بەرەو نەجد رۆیشتین بۆ غەزایێ، لە قرچەی نیوەڕۆدا، لە شیوێکی دڕکەزیاویدا، بۆ سەرخەو شکاندنی نیوەڕۆ لاماندا، خەڵکەکە بەناو شیوەکەدا بڵاو بوونەوەو چوونە سێبەری دارەکانەوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) لەبن سێبەری دار سەمۆرەیەکا دابەزیو شمشێرەکەی پیادا هەڵواسیو خەوت، کاتێ خەبەری دەبێتەوە دەڕوانێ وا پیاوێ لەلای دایە، کە هاتووە حەزرەت هەستی پێی نەکردووە، فەرمووی: جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئێمەی بانگ کردو فەرمووی: (ئەم پیاوە شمشێرەکەی منی هەڵکێشابوو، بە رووتی گرتبووی بەدەستیەوە بەدیار سەرمەوە راوەستابوو، دەیگوت پێم: کێ رزگارت دەکات لەدەستم؟ منیش گوتم: خودا، دیسانەوە بۆ جاری دووەم گوتی: کێ رزگارت دەکات لەدەستم؟ منیش گوتم: خودا، جا شمشێرەکەی نایەوە ناو کێلانەکەی، وا ئەوەتانێ بۆ خۆی دانیشتووە) ئیتر پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) تۆڵەی لە پیاوەکە نەسەندو هیچی لێی نەکرد). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٤٤٤٣}.

## ١٢٠٣) گۆشتی زەهراوی مەڕ دەرخواردی پێغەمبەر دراوە. (٥٦٦٩ - ٥٦٧٠)

## بَابٌ: في السم وأكل الشاة المَسْمُومَة

١٥٤٢- عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ امْرَأَةً يَهُودِيَّةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا، فَجِيءَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَتْ: أَرَدْتُ لأَقْتُلَكَ! قَالَ: «مَا كَانَ اللَّهُ لِيُسَلِّطَكِ عَلَى ذَاكِ». قَالَ: أَوْ قَالَ:

«عَلَيَّ». قَالَ: قَالُوا: أَلاَ نَقْتُلُهَا؟ قَالَ: «لاَ»، قَالَ: فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث: ٥٦٦٩ = ٥٦٦١ فم. بخاري. هبة: ٢٦١٧}:

ئەنەس (ڕەزای خوادای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنێکی جوولەکە مەڕێکی زەهراوی دانا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەندێکی لێی خوارد، ئینجا ژنەکەیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ مەسەلەی مەڕە زەهراوییەکە لێی پرسی؟ کە بۆچی ئەمەی کردووە؟ گوتی: ویستم بتکوژم، فەرمووی: خودا کارێکی واناکا کە ئەوە بەتۆ بکرێ). یا فەرمووی: (خودا شتی وا ناکا کەتۆ بەسەر مندا زاڵ بکا). گوتیان: بۆ نەیکوژین؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (مەیکوژن!).

ئەنەس فەرمووی: هەتا کاتی مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەثەرو ماکی ئەو خواردنە زەهراوییە بە زمانە بچکۆلەو مەلاشوی پێغەمبەرەوە مابوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٢٩٥١، ٢٩٥٢، ٢٩٥٣، ٢٩٥٠} + {بخاري. طب: ٥٧٧٧، ٢٤٢٨ + تجريد البخاري/٤، ژمارە: ١٦٢١ هەتا ژمارە: ١٦٢٨}.

## ١٢٠٤) لە خەمڵکردندا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێکاویەتی. (٥٩٠٠ - ٥٩٠٨)

## بَابٌ: فِي إِصَابَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الخَرْصِ

١٥٤٣- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَزْوَةَ تَبُوكَ، فَأَتَيْنَا وَادِيَ الْقُرَى عَلَى حَدِيقَةٍ لاِمْرَأَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اخْرُصُوهَا»، فَخَرَصْنَاهَا، وَخَرَصَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَشْرَةَ أَوْسُقٍ، وَقَالَ: «أَحْصِيهَا حَتَّى نَرْجِعَ إِلَيْكِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ». فَانْطَلَقْنَا حَتَّى قَدِمْنَا تَبُوكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سَتَهُبُّ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَلاَ يَقُمْ فِيهَا أَحَدٌ مِنْكُمْ، فَمَنْ كَانَ لَهُ بَعِيرٌ فَلْيَشُدَّ عِقَالَهُ، فَهَبَّتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَقَامَ رَجُلٌ، فَحَمَلَتْهُ الرِّيحُ حَتَّى أَلْقَتْهُ بِجَبَلَيْ طَيِّئٍ، وَجَاءَ رَسُولُ ابْنِ الْعَلْمَاءِ صَاحِبِ أَيْلَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِكِتَابٍ وَأَهْدَى لَهُ بَغْلَةً بَيْضَاءَ فَكَتَبَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ)، وَأَهْدَى لَهُ بُرْدًا، ثُمَّ أَقْبَلْنَا حَتَّى قَدِمْنَا وَادِيَ الْقُرَى، فَسَأَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَرْأَةَ عَنْ حَدِيقَتِهَا كَمْ بَلَغَ ثَمَرُهَا؟ فَقَالَتْ: عَشَرَةَ أَوْسُقٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنِّي مُسْرِعٌ، فَمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ فَلْيُسْرِعْ مَعِيَ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيَمْكُثْ»، فَخَرَجْنَا حَتَّى أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: «هَذِهِ طَابَةُ، وَهَذَا أُحُدٌ وَهُوَ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ»، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ خَيْرَ دُورِ الأَنْصَارِ دَارُ بَنِي النَّجَّارِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي سَاعِدَةَ، وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ»، فَلَحِقَنَا سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أَلَمْ تَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيَّرَ دُورَ الأَنْصَارِ فَجَعَلَنَا آخِرًا؟ فَأَدْرَكَ سَعْدٌ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ خَيَّرْتَ دُورَ الأَنْصَارِ فَجَعَلْتَنَا آخِرًا؟ فَقَالَ: «أَوَلَيْسَ بِحَسْبِكُمْ أَنْ تَكُونُوا مِنَ الْخِيَارِ».

**{الحديث: ٥٩٠٧ = ٥٩٠٣ فم. تجريد/٢/١٢٥، رقم: ٧١٣ = ١٤٨١، ١٨٧٢، ٣١٦١، ٣٧٩١، ٤٤٢٢. أبو داود. خراج: ٣٠٧٩ + تجريد/٤، رقم: ١٤٨٧}:**

**ئەبو حومەیدی ئەلساعیدی** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەرچووین بۆ غەزای تەبووك، کە گەیشتینە وادیلقورا، ژنێ لەناو باخێکی خۆیدا بوو، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەم باخە بخەمڵێنن). ئێمەیش هەرکەسە بەجۆرێ خەمڵاندمان، وە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **خۆی خەملاندی بە دە وەسقو بە ژنەکەشی فەرموو: (تۆ هەڵی ژمێرە تا بەپشتی خوا دەگەڕێینەوە بۆلات). ئەنجا رۆیشتین هەتا چووینە تەبووك، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەم شەو بایەکی سەخت هەڵ دەکا لێتان، کەستان لەوکاتەدا هەڵمەسن، هەر کەسەش وشتری هەیە، با توند توند پێوەندی بکا). جا بایەکی سەختی وا هەڵی کرد، پیاوێ لەوکاتەدا هەڵسا، بایەکە هەڵی گرتو لەلای دوو کێوەکەی طەییا لەوێ تووڕی دا، فروستادەی ئیبنو عەلمای شای ئەیلە نامەیەکی لە ئیبنو عەلماوە هێنا بۆ پێغەمبەر، لەگەڵ هێسترە ماچەیەکی سپیدا بەدیاریی.**

**پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **نامەیەکی بۆی ناردو عابەیەکیشی بەدیاری بۆ نارد، جا کەهاتینەوە بۆ وادیلقورا، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بۆ باخەکە لە ژنەکەی پرسی: (باخەکەت بەرەکەی چەند وەسق دەرچوو؟). گوتی: دە وەسق.**

ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من بەزوویی دەڕۆمەوە بۆ مەدینە، جا ئەوەی حەزدەکا لەگەڵ مندا بێ، ئەوە کەیفی خۆیەتیو ئەوەیشی حەزدەکا کە لێرە بمێنێتەوە، ئەوە با بمێنێتەوە).

ئەوجا کەوتینە ڕێ، کاتێ لەدوورەوە مەدینەمان لێ دەرکەوت فەرمووی: (ئەمە طابەیە، واتە: خۆشو خاوێنو سازگارە، وە ئەوەش چیای ئوحودە، ئەم کێوە ئێمەی خۆش دەوێو ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ!).

لەپاشا فەرمووی: (باشترین گەڕەكو خانەی یاریدەدەران (ئەنصار) گەڕەكو خانەکانی بەنی نەجارن، لەپاش ئەوان گەڕەكو خانەکانی بەنی عەبدول ئەشهەلن، لەپاش ئەوان گەڕەكو خانەکانی بەنی ساعیدەن، وە گەڕەگو خانووەکانی یاریدەدەران (ئەنصار) هەموویان خێردارو باشو خاسن!).

لەپاشا کە سەعدی کوڕی عوبادەمان پێ گەیشت، ئەبو ئوسەید پێی گوت: ئاگات لێیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باشێتیی گەڕەكو خانەکانی یاریدەدەرانی دیاری کردو پلەی باشیو بەڕێزیی بۆ دانان، کەچی ئێمەی خستە دواوە، کە بنەماڵەی بەنی ساعیدەین!

سەعدیش چوو بۆلای پێغەمبەرو عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! باشێتیی گەڕەكو خانەکانی یاریدەدەرانت دیاری کردووەکەچی ئێمەت لەپلەی دواوە داناوە کە بنەماڵەی بەنی ساعیدەین؟! فەرمووی: (بەس نییە کە ئێوەیش بەردەستەی چاکان کەوتوون!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٣١٦٨ ج/٤} . بۆ ژیاننامەی ئەبو حومەید بڕوانە پاش ژمارە: ١٥٤٧ لەدواوە.

**١٢٠٥) فەرمایشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): من کەمەرم گرتوون کە نەکەونە ناو ئاگر.** (٥٩١٣ - ٥٩١٧)

**بَابُ: قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَا آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ**

١٥٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَثَلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا، فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهَا، جَعَلَ الْفَرَاشُ وَهَذِهِ

الدَّوَابُّ الَّتِي فِي النَّارِ يَقَعْنَ فِيهَا، وَجَعَلَ يَحْجُزُهُنَّ وَيَغْلِبْنَهُ فَيَتَقَحَّمْنَ فِيهَا، قَالَ: فَذَلِكُمْ مَثَلِي وَمَثَلُكُمْ، أَنَا آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ، هَلُمَّ عَنِ النَّارِ، هَلُمَّ عَنِ النَّارِ، فَتَغْلِبُونِي تَقَحَّمُونَ فِيهَا». {الحديث: ٥٩١٦ = ٥٩١٢ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٣٦٤ = ٣٤٢٦، ٦٤٨٣. تحفة الأشراف: ١٤٧٧١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وێنەی منو وێنەی ئێوەی ئومەتی من، ئەی نەتەوەی ئیسلام! وەك وێنەی پیاوێ وایە کە ئاگرێکی کردبێتەوە، جانەوەرو پەپوولەیەکی زۆری تێ ورووکابنو پەیتا پەیتا بکەونە ناوی‌و بسووتێن، پیاوەکە هەردەیەوێ بەریان لێ بگرێ‌و نەهێڵێ بکەونە ناو ئاگرەکە، بەڵام جانەوەرو پەپوولەکان کوێرانە بەرەو ئاگرەکە هەر ئەزنەك دەدەن‌و لەبەر زۆری خۆیان پیاوەکە دەرەقەتیان نایەت‌و سەرەنجام دەسەپێنە ناو ئاگرە سوورەکەوە، دەی ئەمە رێك وێنەی منو وێنەی ئێوەیە: ئەوەتانێ من کەمەرم گرتوون‌و بەزۆر دوورتان دەخەمەوە لە ئاگری دۆزەخ‌و بەدەم پێتان دەڵێم: وەرن بۆلای بەرنامەی جوانی ئیسلام‌و دووربکەونەوە لە ئاگری دۆزەخ، کەچی ئێوە بەزۆر خۆتان لەدەستم رادەپسکێنن‌و دەرەقەتتان نایەم‌و سەرەنجام خۆتانی تێ فڕێ دەدەن!). {تاج/١/٤٧، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٦٦ + ریاض/١/١٥١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١٦٣/٨ چاپی دووەم}.

**١٢٠٦) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەموو کەسێ، لەگەلی ئیسلام، باشتر خودا دەناسێ‌و زیاتریش لێی دەترسێ. (٦٠٦٢ - ٦٠٦٤)**

**بَابٌ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً**

١٥٤٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي أَمْرٍ، فَتَنَزَّهَ عَنْهُ نَاسٌ مِنَ النَّاسِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَغَضِبَ، حَتَّى بَانَ الْغَضَبُ فِي وَجْهِهِ، ثُمَّ قَالَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْغَبُونَ عَمَّا رُخِّصَ لِي فِيهِ؟! فَوَاللَّهِ لأَنَا أَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ، وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً». {الحديث: ٦٠٦٤ = ٦٠٦٥ فم. بخاري. أدب: ٦١٠١، ٧٣٠١}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرمووێ: بۆ کارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەپێی مۆڵەتی شەرعی کاریکرد، بەباری ئاسانیدا ئەنجامی دا، نەوەك بەباری قورسیو گرانیدا، هەندێ کەس لە خەڵکەکە پارێزیان لەوەکرد، کە وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوکارە بەپێی مۆڵەتی شەرعی بەبارە سووکەکەیدا بیکەن، گوتیان: ئێمە لەکوێو پێغەمبەر لەکوێ، ئەو خوای گەورە لە گوناهی بەرودوای خۆش بووە، پێویستی بەخۆڕەنجاندن نییە وەك ئێمە!!

کاتێ هەڵوێستو قسەی ئەمانە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تووڕە بوو، لەپاشا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە بۆچی کەسانێ وا پەیدابوون، پارێز دەکەن لەهەندێ کاری وا کەمن بەپێی ئەو مۆڵەتە شەرعییە دەیکەم، کە خودا رێگەی ئەو مۆڵەتەی پێمداوە؟! دەی سوێندم بە خودای گەورە من گەلێ باشتر لەوان خودا دەناسم وەلەوان زیاتریش لێی دەترسم، دەی ئەوە رێگەی ئەوەم لێ ناگرێ کە کار بە مۆڵەتی شوەرعی بکەم لەهەندێ کاردا). {بڕوانە: ریاض/١٣٤/١، ژمارە: ١٤٣/٢، زنجیرە: ١٤، ١٤٩/٨ + تاج/١، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٧٧، ٧٨، ٨٠. ج/٤ = چاپی چوارەم لاپەڕە: ٥٣} + {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٣٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**١٢٠٧) دوورگرتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەتاوانو تۆڵە سەندنیشی بەس لەبەر رەزای خودای گەورە بووەو بەس.** (٥٩٩٩ - ٦٠٠٥)

**بَابٌ: بعد النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِن الآثام وقيامه لمحارم الله تعالى**

١٥٤٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلاَّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا، فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِنَفْسِهِ إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. {الحديث: ٥٩٩٩ = ٦٠٠٠ فم. تجريد البخاري/٤/١٠٨، رقم: ١٤٢٣ = ٣٥٦٠، ٦١٢٦، ٦٧٨٦، ٦٨٥٣ فتح الباري. أبو داوود. أدب: ٤٧٨٥. تحفة مالأشراف: ١٦٥٩٥}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموویـ: هەرکاتێ پێغەمبەر خۆی بکرایە بەسەرپشك لەنێوانی دوو کاردا، کە یەکێکیان لەوی تریان ئاسانتر بووایە، هەمیشە ئاسانەکەیانی هەل دەبژاردو ئەوەیانی دەکرد، بەمەرجێ ئەو کارە گوناه نەبوایە، ئەگینا لەهەموو کەسێ زیاتر لێی دوور دەکەوتەوە، هەرگیزیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەقو تۆڵە سەندنێ، کە پەیوەندی تایبەتی بەخودی خۆیەوە هەبوایە، نەیدەسەند بەڵکوو کابرای دەبەخشی، مەگەر کەسێ قەدرو ڕێزی شەریعەتی خودای گەورەو مەزنی بشکاندبایە، ئەوە تۆڵەی ئەوەی لێ دەسەند). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٣١ + ریاض/١٧٦/٢، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٦٤٤ چ/٢ = چاپی دووەم}.

### ١٢٠٨) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە لەشەو نوێژا ڕاوەستابوو، هەردوو پێی پەنەما بوو. (٧٠٥٥ - ٧٠٥٧)

**بَابُ: صَلاَت النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدمَاهُ وَقَوْلُهُ: أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا**

١٥٤٧- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: أَتَكَلَّفُ هَذَا وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ قَالَ: «أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا». {الحديث: ٧٠٥٥ = . تجريد البخاري/١، رقم: ٥٦٣ = ١١٣٠، ٤٨٣٦، ٦٤٧١. ترمذي. صلاة: ٤١٢. نسائي. صلاة: ١٤١٩. تحفة الأشراف: ١١٤٩٨}:

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموویـ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە لەشەو نوێژدا بەپێوە ڕاوەستابوو، هەردوو قاچی، یا هەردوو لاقی پەنەما بوون!

یاران (ڕەزای خودایان لێ بێ) عەرزیان کرد: ئەی خۆشەویستی خودا! بۆچی ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەی، خۆ تۆ خودا لە گوناهی بەرودوات خۆش بووە، کەواتەبۆ وا لەخۆت دەکەی؟ ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویـ: (ئەدیی نابێ کەمنیش

بەندەیەکی ستایشکارو عەبدێکی سوپاس گوزاربم؟). {تاج/١، زنجیرە: ١٨١، ژمارە: ٩٧١. چاپی چوارەم} + {ریاض/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٩٨}.

**روونکردنەوە:**

ئەبو حومەیدی ئەل-ساعیدی (رەزای خودای لێ بێ) هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، ناوی عەبدورەحمانی کوڕی سەعدە، ئەنصارییە، خەڵکی مەدینەیە، ئامادەی جەنگی ئوحودو مەڵبەندو شەڕگاکانی دوای ئوحود بوو، لەخزمەت پێغەمبەردا، لەدژی بێباوەڕان، لەپیاوانی صەحیحەینە، واتە: لەو صەحابانەیە کە گێڕانەوەیان لە صەحیحی بوخاریو لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، لەکۆتایی جێنشینی موعاوییەدا فەوتی کردووە (رەزای خودای لێ بێ).

**١٢٠٩) فەرمایشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): من پێشەنگی ئێوەم لەسەر حەوزی کەوپەر.** (٥٩٢٤ - ٥٩٥٨)

**بَابٌ: قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ**

١٥٤٨- عَنْ جُنْدَبْ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ». {الحديث: ٥٩٢٤ = ٥٩٢١ فم. بخاري. رقاق: ٦٥٨٩. تحفة الأشراف: ٣٢٦٥}:

جوندوب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (من پێشڕەوی ئێوەم بۆسەر حەوزی کەوثەر، هەتا بەرلەوەی کەئێوە بێن بۆ ئەوێ من رێکی بخەم بۆتان). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٥٦٧٥، ٥٦٧٦}.

**١٢١٠) حەوزەکەی پێغەمبەرو باسی گەورەییەکەیو رۆیشتنی نەتەوەی ئیسلام بۆسەری.** (٥٩٢٤ - ٥٩٥٨)

**بَابٌ: فِي حَوْضِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِظَمِهِ وَوُرُدُ أُمَّتِهِ**

١٥٤٩- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ، وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ وَمَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ الْوَرِقِ،

وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلاَ يَظْمَأُ بَعْدَهُ أَبَدًا»، قَالَ: وَقَالَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنِّي عَلَى الْحَوْضِ حَتَّى أَنْظُرَ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، وَسَيُؤْخَذُ أُنَاسٌ دُونِي فَأَقُولُ: يَا رَبِّ مِنِّي وَمِنْ أُمَّتِي، فَيُقَالُ: أَمَا شَعَرْتَ مَا عَمِلُوا بَعْدَكَ، وَاللَّهِ مَا بَرِحُوا بَعْدَكَ يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، قَالَ: فَكَانَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ أَنْ نَرْجِعَ عَلَى أَعْقَابِنَا أَوْ أَنْ نُفْتَنَ عَنْ دِينِنَا). {الحديث: ٥٩٢٨ = ٥٩٢٧ فم. بخاري. رقاق: ٦٥٩٣، ٧٠٤٨. تحفة الأشراف: ١٥٧١٩}:

داوود فەرمووی: نافیعی کوڕی عومەر فەرمووی: ئیبنو ئەبی مولەیکە فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لە خۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حەوزی کەوثەرم پانییەکەی یەك مانگە ڕێیە، هەروا درێژییەکەی چونکە نێوانی گۆشەکانی یەکسانە بەیەکتری، ئاوەکەی لەزیو سپیترە، بۆنی لەبۆنی میسك خۆشترە، ژمارەی سوراحییەکانی سەری کە موسوڵمانان ئاویان پێ نۆش دەکەن وەك ژمارەی ئەستێرەی ئاسمان وان، هەرکەسێ لێی نۆش بکا، هەتا هەتایە توونی نابێ).

ئیبنو ئەبی مولەیکە، ئەم فەرموودەیەی تریشی لەبارەی حەوزی کەوثەرەوە، لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە گێڕاوەتەوەو فەرمووی: ئەسماء فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆ خۆم لەسەر حەوزی کەوثەر چاوەڕوانتان دەکەم، هەتا بزانم کامانەتان دێن بۆلامو دەبن بەمیوانم لەسەر ئەو حەوزە، بۆ نۆشکردنی ئاوەکەی، کەسانێ لەمن دائەبڕێنو جیایان دەکەنەوە لە میوانەکانمو ناهێڵن لە ئاوەکەی نۆش بکەن، منیش عەرزی خودای گەورە دەکەمو دەڵێم: ئەی پەروەردگاری گەورەم! خۆ ئەمانە لەمنن و لە ئۆمەتی منن، ئیتر بۆچی فریشتەکان ڕێگەیان پێ نادەن کەبێن بۆسەر حەوزەکەمو لە ئاوەکەی بخۆنەوە؟ لە وەڵاما پێم دەگوترێ: ئەدیی تۆ نازانی ئەمانە لەپاش تۆ چی کارێکی ناشیرینیان کردووە: بەخودا ئەمانەی کەوا ڕێگەیان پێ نادرێ کەبێن بۆ خزمەتت، بۆسەر حەوزی

کەوثەر، بۆ نۆشکردن لە ئاوەکەی کەدەبێ بە کلیلی رزگاری هەتا هەتایی، ئەمانە لەپاش مەرگی تۆ یەکسەر پاشگەز بوونەتەوەو لە ئایین هەلگەڕاونەتەوە).

راوی دەفەرموێ: جاران لەکاتی گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا لەدوایەوە ئیبنو ئەبی مولەیکە دەیفەرموو: خودایە! ئێمە پەنا دەگرین بە پەنای تۆ، کە خوا نەخواست لە ئایینی پیرۆزیی ئیسیلام پاشگەز ببینەوە، یا تووشی ئاژاوەو سەر لێشێوانی ئایینی ببین). {تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٦٩ + تاج/٤، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٤٢٢٨ هەتا ٤٢٣١} + {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٦٠، ژمارە: ٥٦٧٥ هەتا ٥٦٨٩} + {تجريد/٥/٢٩٥، رقم: ٢٠٤١ = ٦٥٨٧ فتح الباری}.

١٥٥٠- عَنْ حَارِثَةَ بْنُ وَهب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «حَوْضُهُ مَا بَيْنَ صَنْعَاءَ وَالْمَدِينَةِ»، فَقَالَ لَهُ الْمُسْتَوْرِدُ: أَلَمْ تَسْمَعْهُ قَالَ: «الأَوانِي»؟ قَالَ: لاَ، فَقَالَ الْمُسْتَوْرِدُ: تُرَى فِيهِ الآنِيَةُ مِثْلَ الْكَوَاكِبِ. {الحديث: ٥٩٣٨ = ٥٩٣٧ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٤٢ = ٦٥٩١ فتح الباري. تحفة الأشراف: ٣٢٨٧}:

حاریثەی کوڕی وەهب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (حەوزی کەوثەری من لە صەنعای یەمەنەوە هەتا مەدینە دەبێ).

موستەوریدی کوڕی شەددادی کوڕی عەمر، کەخۆیو باوکی هاوەڵی پێغەمبەر بوون فەرمووی پێی: ئەی لێت نەبیستووە کەباسی پەرداخو پیاڵەو سوراحییەکانی سەری بکات؟ حاریثە فەرمووی: نەء. موستەورید فەرمووی: (دەی بەقەد ئەستێرەی ئاسمان قاپو دەفری وا لەسەر). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ٥٦٨١ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٥٥١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ أَمَامَكُمْ حَوْضًا مَا بَيْنَ نَاحِيَتَيْهِ كَمَا بَيْنَ جَرْبَا وَأَذْرُحَ». وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَسَأَلْتُهُ – يَعْنِي نَافِعاً – فَقَالَ: قَرْيَتَيْنِ بِالشَّامِ، بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ ثَلاَثِ لَيَالٍ، وَفِي رِوَايَةٍ:

ثلاثَةِ أيَّامٍ. {الحديث: ٥٩٤١ ، ٥٩٤٢ = ٥٩٤٠، ٥٩٤١ فتح الملهم = فم = ف.م، تجريد البخاري/ الترجمة الكردية المجلد/٥، رقم: ٢٠٣٩ = ٦٥٧٧ فتح الباري}:

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (حەوزێ لەدەرگای بەهەشتا وا لەپێشتانەوە، لە جەربائەوە هەتا ئەزروح دەبێ) لە گێڕانەوەیەکا: (حەوزەکەی من لەدەرگای بەهەشتا وا لەپێشتانەوە لە جەربائەوە هەتا ئەزووح دەبێ). لە گێڕانەوەیەکا: عوبەیدوڵڵا فەرمووی: لە نافیعم پرسی: ئەم دوو شارە لەکوێن؟ فەرمووی: (دوو ئاواییین وان لەشام، نێوانیان سێ شەو ڕێگایە، لە گێڕانەوەیەکا: سێ ڕۆژە ڕێیە). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ٥٦٨٠}.

١٥٥٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «ألاَ إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، وَإِنَّ بُعْدَ مَا بَيْنَ طَرَفَيْهِ كَمَا بَيْنَ صَنْعَاءَ وَأَيْلَةَ، كَأَنَّ الأَبَارِيقَ فِيهِ النُّجُومُ». {الحديث: ٥٩٥٧ = ٥٩٥٧ فم}:

**جابیری کوڕی سەموورە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بیداربن! کەمن پێشڕەوی ئێوەم لەسەر حەوزی کەوثەر، دووریی نێوانی ئەم کەناری هەتا ئەو کەناری، وەك دووریی نێوانی صەنعاو ئەیلەوایە، سوراحییەکانی سەری لەزۆریدا دەڵێی ئەستێرەی ئاسمانن). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ٥٦٨٢ ج/٤}.

١٥٥٣- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا آنِيَةُ الْحَوْضِ؟ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِنْ عَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ وَكَوَاكِبِهَا، أَلاَ فِي اللَّيْلَةِ الْمُظْلِمَةِ الْمُصْحِيَةِ آنِيَةُ الْجَنَّةِ مَنْ شَرِبَ مِنْهَا لَمْ يَظْمَأْ، آخِرَ مَا عَلَيْهِ يَشْخُبُ فِيهِ مِيزَابَانِ مِنَ الْجَنَّةِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهُ لَمْ يَظْمَأْ، عَرْضُهُ مِثْلُ طُولِهِ مَا بَيْنَ عَمَّانَ إِلَى أَيْلَةَ مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ». {الحديث: ٥٩٤٥ = ٥٩٤٤ فم}:

**ئەبو زەڕ** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی:** گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! قاپو قاچاخی سەر حەوزەکەی تۆ چییە؟ فەرمووی: (سوێندم بەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە، ژمارەی ئەو قاپو قاچاخو سوراحیو پیاڵەو جامو پەرداخانەی کەوان

لەسەری، لە ژمارەی ئەستێرەی ئاسمان زیاترە، لە تاریکە شەودا، کە ئاسمان سایەقەی سامالٚ بێ، هەموو حاجەتی بەهەشتن، لەبەرئەوە هەرکەسێ پێیان بخواتەوە، ئیتر هەتا هەتایە جارێکی تر تینووی نابێ، لە بەهەشتەوە دوو پلووسك دەڕژێتە ناوی، پانییەکەی بەقەد درێژییەکەیەتی، لە عەممانەوە تا ئەیلە دەبێ، ئاوەکەی لەشیر سپی ترەو لە هەنگوین شیرینترە). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ٥٦٨٢ ج/٤}.

١٥٥٤- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنِّي لَبِعُقْرِ حَوْضِي أَذُودُ النَّاسَ لأَهْلِ الْيَمَنِ، أَضْرِبُ بِعَصَايَ حَتَّى يَرْفَضَّ عَلَيْهِمْ»، فَسُئِلَ عَنْ عَرْضِهِ؟ فَقَالَ: «مِنْ مَقَامِي إِلَى عَمَّانَ»، وَسُئِلَ عَنْ شَرَابِهِ؟ فَقَالَ: «أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، يَغُتُّ فِيهِ مِيزَابَانِ، يَمُدَّانِهِ مِنَ الْجَنَّةِ، أَحَدُهُمَا مِنْ ذَهَبٍ، وَالآخَرُ مِنْ وَرِقٍ». {الحديث: ٥٩٤٦ = ٥٩٤٥}:

**ثەوبان** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (بەخودی خۆم لەبەرپانی حەوزەکەمدا رادەوەستم، گورێ گورێ لەو خەڵکە دەکەمو بەدار دووریان دەخەمەوەو دڕیان پێ دەدەم، لەبەر خاتری خەڵکی یەمەنو نۆرە بڕیان بۆ دەکەم، هەتا لەپێشا ئەوان لێی بخۆنەوە، لەپاداشی ئەوەدا، کە لەجیهانا لەپێش پێشەوە باوەڕیان هێناوە، لێی پرسیار کرا: ئەو حەوزەی تۆ چەندە پانە؟ فەرمووی: (لێرەوە تا عەممان دەبێ). لەبارەی چۆنیی ئاوەکەشیەوە لێیان پرسی؟ فەرمووی: (لەشیر سپیی ترە، لە هەنگوین شیرینترە، دوو پلوسکی لە بەهەشتەوە تێ دەڕژێ، یەکێکیان لەزێڕە، یەکێکیان لەزیوە، لەئاوی بەهەشت ئەو دوو پلوسکە ئاو بۆ حەوزی کەوثەری من دێنن). {تاجم٥، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ٥٦٨٥}.

١٥٥٥- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلاَتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: «إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِيَ الآنَ، وَإِنِّي قَدْ أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الأَرْضِ، أَوْ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ، وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي

وَلَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَتَنَافَسُوا فِيهَا». {الحديث: ٥٩٣٢ = ٥٩٣١ فم. تجريد البخاري = الترجمة الكردية/٢، رقم: ٦٤١ = ١٣٤٤، ٣٥٩٩، ٤٠٤٢، ٤٠٨٥، ٦٤٢٦، ٦٥٩٠}:

عوقبەی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش هەشت ساڵ، لەشەهیدبوونی شەهیدانی جەنگی ئوحود، لەماڵ دەرچوو، رۆیشت نوێژی مردووی لەسەر شەهیدانی غەزای ئوحود کرد، لەپاشا گەڕایەوە بۆ مەدینە، رۆیشتە سەر دوانگەکەو، وەك خواحافیزی لە زیندوان و مردوودان بکا، فەرمووی: (خۆم بەرایی و پێشڕەوتانم، لەپێش گەلی ئیسلامی خۆمەوە دەڕۆم، تا ئەوان دێن خۆم حەوزی کەوثەریان بۆ ئامادە دەکەم خۆم چاودێرم بەسەرتانەوە، لەهەردوو جیهاندا کردەوەکانی ئێوەم پێ نیشان دەدرێ و لە قیامەتیشا شایەتیتان بۆ دەدەم، سوێندم بەخودا من ئێستاکە لەم چرکە ساتەدا، حەوزی کەوثەر، کە حەوزی تایبەتی خۆمەو ژوانگەی خۆم و ئۆمەتمەو پێشوازیی ئوممەتمی لەبەهەشتا لەسەر دەکەم، ئائێستا ئەو حەوزەم وا لەبەرچاوم و، بەچاوی سەر تەماشای دەکەم، بێگومان کلیلەکانی گەنجینەکانی زەوی هەمووی خەڵات کراون بەمن) یا فەرمووی: (کلیلەکانی زەوی دراون بەمن، کەواتە: زوو یا درەنگ گەلی ئیسلام دەست دەگرن بەسەر ئەو وڵاتانەدا، بەخودا تازە من مەترسیم لەوە نەماوە کە ئێوە، خوا نەخواست، لەپاش مەرگی من بچنەوە سەر بتپەرستی و فرە خودایی و شتی تری واو دەست بکەنەوە بە بتپەرستی، بەپشتی خودا شتی وا تازە لە تێکڕای ئۆمەتم روونادات، تاك و تەرایش ئەو بایەخەی نییە، بەڵام مەترسی ئەوەم لێتان هەیە کە ئێوەیش وەك نەتەوەکانی تری پێشین، کە لەسەر پڕو پیتی جیهان، لەناو خۆتانا خۆتان بخۆنەوەو بچن بەگژی یەکتریداو تێك بەربن و لەناوبچن، وەك چۆن ئەوان لەسەر شتی وا فەوتان و لەناوچوون!).

عوقبە فەرمووی: ئەمە لەئاخر ساڵی ژیانیدا بوو، وە ئەو جارە دواجار بوو کە پێغەمبەر لەسەر مینبەر ببینم). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٥٦٧٦ ج/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٣١٨٧}.

## ١٢١١) باسی سیفەتو نیشانەو هاتنو تەمەنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). (٦٠٣٨ - ٦٠٤٦)

## بَابٌ: فِي صِفَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَبْعَثِهِ وَسِنِّهِ

١٥٥٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ، وَلاَ بِالْقَصِيرِ، وَلَيْسَ بِالأَبْيَضِ الأَمْهَقِ، وَلاَ بِالآدَمِ، وَلاَ بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ وَلاَ بِالسَّبِطِ، بَعَثَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ). {الحديث: ٦٠٤٢ = ٦٠٤٤ فم}:

ئەنەسی کوڕی ملیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی دەستەی مام ناوەندی بوو، نەزۆر درێژو نەزۆر کورت بوو، رەنگی سپیو سوور بوو، بەڵام نەك سپییەکی سادەی بێ تام، سەوزەیش نەبوو، قژیشی نە لوولێکی کرژبوو، وە نەخاوێکی تەواو خاویش بوو کە خودا کردی بە پێغەمبەرو سرووش (وەحی)ی بۆ نارد، تەمەنی چل ساڵ بوو، دە ساڵ مایەوە لە مەککە لەو ماوەیەدا سرووشی بۆ دەهات، وە لەمەدینەیش هەروەها دە ساڵی تر مایەوەو سرووشی بۆ دەهات، وە کاتێ کە گیانی پاکی سپارد، تەمەنی شەست ساڵ بوو، هەمووی بیست مووی سپی لەسەرو ریشیا نەبوو!). {بڕوانە: ژمارە: ١٥٩٥ + ژمارە: ١٥٩٢ لەم پەڕاوە کەوا لەدواوە، لەزنجیرە: ١٢٣٦دا}. {تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٣٠٨٤ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٥٥٧- عَنْ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً مَرْبُوعًا بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، عَظِيمَ الْجُمَّةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ، عَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، مَا رَأَيْتُ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث: ٦٠٨١ = ٦٠١٩ فم. تجريد/٤/١٠٤، رقم: ١٤١٨ = ٣٥٥١، ٥٨٤٨، ٥٩١٠. أبو داود. لباس: ٤٠٧٢. ترمذي. أدب: ٢٨١١م. نسائي. الزينة: ٥٢٤٧. تحفة الأشراف: ١٨٦٩}:

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باڵا ناوەندی بوو، نە قووچێکی ناقۆڵاو نە کورتە بنەیەکی بێ تام بوو، سینگو ناوشانی پان بوو، قژە

سەری زۆرو پڕبوو جاری وادەبوو قژی دەیدا لەنەرمەی هەردوو گوێچکەی! جاری دیم دەستێ جلی سووری لەبەردا بوو، هەرگیز لەژیانی خۆما شتێکم نەدیوە، یا کەسێکم نەبینیوە کە ئاوا وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جوانو نازدار بێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٣٠٨٥ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- قسەی ڕاست ئەوەیە، کە کاتێ پێغەمبەر وەفاتی کردووە تەمەنی شەستو سێ ساڵ بووە، نەك شەست ساڵ.

٢- ماوەی ڕیسالەکەیو پێغەمبەرایەتییەکەی بیستو سێ ساڵ بووە، نەك بیست ساڵ.

١٥٥٨- عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَا عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ رَجُلٌ رَآهُ غَيْرِي، قَالَ فَقُلْتُ لَهُ: فَكَيْفَ رَأَيْتَهُ؟ قَالَ: كَانَ أَبْيَضَ مَلِيحًا مُقَصَّدًا. قَالَ مُسْلِمُ بْنُ الْحَجَّاجِ: مَاتَ أَبُو الطُّفَيْلِ سَنَةَ مِائَةٍ، وَكَانَ آخِرَ مَنْ مَاتَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث: ٦٠٢٥ = ٦٠٢٦ فم}:

ئەبو طوفەیل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەر ڕووی زەوی بێجگە لەخۆم کەسی تر نەماوە لەسەر ڕووی زەوی، کە پێغەمبەری دیبێ (دروودی خودای لەسەر بێ). گوتیان: تۆ کەدیوتە، بۆمان باس بکە کە ڕەنگو ڕوو شێوەی چۆن بووە؟ فەرمووی: سوورو سپییەکی نازداری شێوە شیرین بوو، لەشو لارێکی ناسكو نازداری ڕێكو پێکی ئاسایی هەبوو). ئیمامی موسلیمی کوڕی حەججاج کە دانەری صەحیحی موسلیمە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەبو طوفەیل ساڵی سەدی کۆچی مردووە، وە دواترین کەس بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر کەمردووە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٣٠٨٨}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو طوفەیل ناوی عامیری کوڕی واثیلە بوو، بەخزمەت پێغەمبەر گەیشتووە، چەند فەرموودەیێ لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، کە ئەم فەرموودەیەی ئێرە

یەکێیانە، لە ئیستیعابدا دەفەرموێ: ساڵی غەزای ئوحود لەدایك بووە، هەشت ساڵان بووە کە پێغەمبەر مردووە، لە کووفە نیشتەجێ بوو، هەوا خوای ئیمامی عەلی بوو، لەهەموو شەڕگاکانی عەلیدا لەگەڵ عەلی بوو، ساڵی سەدی کۆچی لە مەککە مردووە، تەمەنی سەد ساڵ بووە، هەندێ دەڵێن: لەسەد تێپەڕیوە، هەستیار (شاعیر)ێکی جوان بوو، پیاوێکی ڕێزداری مەزن بوو، حازر وەڵام بوو، زۆر هۆشمەند بوو، لەدەستەو هەوا خوای ئیمامی عەلی بوو، باوی عەلی دەدا بەسەر ئەبوبەکرو عومەردا، بەڵام مەدحی جوانی ئەبوبەکرو عومەری دەکرد، ڕەحمەتی دەنارد بۆ عوثمان (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ).

## ١٢١٢) مۆری پێغەمبەرایەتی. (٦٠٢٨ - ٦٠٣٧)
## بَابٌ: فِي خَاتَمِ النُّبُوَّةِ

١٥٥٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدْ شَمِطَ مُقَدَّمُ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، وَكَانَ إِذَا ادَّهَنَ لَمْ يَتَبَيَّنْ، وَإِذَا شَعِثَ رَأْسُهُ تَبَيَّنَ، وَكَانَ كَثِيرَ شَعْرِ اللِّحْيَةِ. فَقَالَ رَجُلٌ: وَجْهُهُ مِثْلُ السَّيْفِ، قَالَ: لاَ، بَلْ كَانَ مِثْلَ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ، وَكَانَ مُسْتَدِيرًا، وَرَأَيْتُ الْخَاتَمَ عِنْدَ كَتِفِهِ مِثْلَ بَيْضَةِ الْحَمَامَةِ يُشْبِهُ جَسَدَهُ). {الحديث: ٦٠٣٧ = ٦٠٣٩ فم} :

جابیری کوڕی سەمموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێشەسەرو چاڵی چەناگەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەنێ بۆز بوو بوون، بەڵام کە چەوری دەکرد بۆ زییەکەی پێوە دیارنەبوو، بەڵام کە قژەکەی دەژاکا، مووە سپییەکان دەردەکەوتن، مووی ریشی پڕبوو، پیاوێ گوتی: ڕووی وەك شمشێر ئاوا بریقەدارو درێژو جوان بوو؟ فەرمووی: نەء، وەك شمشێر نەبوو، بەڵکوو گەلێ لەوەیش جوانتر بوو، وەك خۆرو مانگ واخڕو گەش‌و جوان بوو! مۆری پێغەمبەرایەتیم بینی، بەناو شانییەوە بوو، وێنەی هێلکەی کۆتر وابوو، لەڕەنگی جەستەی بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ٣٠٩٦ + زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٣١٣٨، ٣١٣٧، ٣١٣٩ چاپی چوارەم} .

١٥٦٠- عَنِ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ذَهَبَتْ بِى خَالَتِى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنَ أُخْتِى وَجِعٌ، فَمَسَحَ رَأْسِى، وَدَعَا لِى بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتِمِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثْلَ زِرِّ الْحَجَلَةِ. {الحديث: ٦٠٤٠ = ٦٠٤٢ فم. تجريد البخارى، الترجمة الكردية/١، رقم: ١٤١ = ١٩٠، ٣٥٤٠، ٣٥٤١، ٥٦٧٠، ٦٣٥٢}:

سائیبی کوڕی یەزید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پوورم خوشکی دایکم، بردمی بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم خوشکەزایەم نەخۆشە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی هێنا بەسەر سەرمداو دوعاو نزای پیتو فەڕی بۆ کردم، ئەنجا دەستنوێژی گرتو لەئاوە چۆڕی دەستنوێژەکەیم بۆ مووفەڕك خواردەوە، ئەوجا لە پشتیەوە ڕاوەستامو سەیری مۆری پێغەمبەرایەتیم کرد، کە بەناو شانیەوە بوو، وەك دوگمەی پەردە کوللە وابوو، یاخود وەك هێلکەی کەو وابوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٣١٣٧}.

١٥٦١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَأَكَلْتُ مَعَهُ خُبْزًا وَلَحْمًا (أَوْ قَالَ: ثَرِيدًا) قَالَ فَقُلْتُ لَهُ: أَسْتَغْفَرَ لَكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟ قَالَ: نَعَمْ وَلَكَ، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: (وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ)، قَالَ: ثُمَّ دُرْتُ خَلْفَهُ، فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ عِنْدَ نَاغِضِ كَتِفِهِ الْيُسْرَى جُمْعًا عَلَيْهِ خِيلاَنٌ، كَأَمْثَالِ الثَّآلِيلِ. {الحديث: ٦٠٤١ = ٦٠٤٣ فم}:

عاصم لە عەبدوڵلای کوڕی سەرجیسەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆم پێغەمبەرم دیوە (دروودی خودای لەسەر بێ) وە نانو گۆشتیشم لەگەڵیدا خواردووە، یا گوتی: نانو تریتم لەگەڵدا خواردووە. عاصیم گوتی: پێیم گوت: ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پاڕاوەتەوە بۆت؟ فەرمووی: بەڵێ، بۆ تۆیشو بۆ هەموو موسوڵمانێکی تریش پاراوەتەوە، ئەوجا بۆ پشتیوانی قسەکەی خۆی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ – محمد – ٤٧/١٩}.

واته: داوای لێبوردنو تاوان پۆشی لەخودا بکە، هەم بۆ خۆتو هەم بۆ هەموو موسوڵمانێ، بۆ نێرو مێیان).

عەبدوڵلا فەرمووی: ئینجا لە پشتیەوە سووڕامەوە چاوم کەوت بە مۆری پێغەمبەرایەتی، بەناو شانیەوە بوو، لەشێوەی دەستی نووقاو وابوو، خاڵێکی زۆری پێوە بوو لە چەشنی وردە بالووکە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٣١٣٩ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- عەبدوڵلای کوڕی سەرجیس (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە پیاوان (رِجَال)ی صەحیحی موسلیمە، لە هاوەڵە بچکۆلەکانی پێغەمبەرە، لە بەصرە دائەنیشت، چەند فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، یەکێ لەفەقێ ناودارەکانی عاصیمی ئەحوەلە. ئیمامی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە ئیصابەدا دەفەرموێ: (صَحَابيٌّ صَحِيحُ السَمَاعِ = هاوەڵی پێغەمبەرە، بەشێوەی دروست فەرموودەی لە پێغەمبەر بیستووەو گێڕاویەتەوە).

### ١٢١٣) شێوەی دەمو چاوو پاژنەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ). (٦٠١٦ - ٦٠٢٧)

### بَابٌ: صِفَةُ فَمِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَعَيْنَيْهِ وَعَقِبِهِ

١٥٦٢- عَنْ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) ضَلِيعَ الْفَمِ، أَشْكَلَ الْعَيْنِ، مَنْهُوسَ الْعَقِبَيْنِ. قَالَ: قُلْتُ لِسِمَاكٍ: مَا ضَلِيعُ الْفَمِ؟ قَالَ: عَظِيمُ الْفَمِ، قَالَ: قُلْتُ: مَا أَشْكَلُ الْعَيْنِ؟ قَالَ: طَوِيلُ شَقِّ الْعَيْنِ. قَالَ: قُلْتُ: مَا مَنْهُوسُ الْعَقِبِ؟ قَالَ: قَلِيلُ لَحْمِ الْعَقِبِ). {الحديث: ٦٠٢٤ = ٦٠٢٥ فم}:

جابیری کوڕی سەموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەمی گەورە بوو، کە نیشانەی ڕەوانبێژییە، چاوەکانی قەوی‌و نەخشین‌و جوان بوو، پاژنەی پێی کەم گۆشت بوو. شوعبە دەفەرموێ: عەرزی سیماکی کوڕی حەربم کرد: ضەلیعول فەم واتای چییە؟ فەرمووی: دەم گەورە، وتم: ئەی ئەشکەلول عەین

واتای چییە؟ فەرمووی: کالانەی چاوی درێژبێ، گوتم: ئەی مەنهووسول عەین واتای چییە؟ فەرمووی: گۆشتی پاژنەی کەم بێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٣٠٨٩ چ/٤} .

**روونکردنەوە:**

زاناکان بەکۆی دەنگ ئەم راڤەیەی سیماك بۆ (أَشْكَلُ العَيْن) بە هەڵەیەکی ئاشکرا دائەنێن، بەڵکوو دەفەرموون: شوکلەت لەچاودا خاڵی سوورە لە سپینەی چاودا، کەشتی وا لەناو عەرەبا زۆر پەسەندە.

**١٢١٤) شێوەی ریشی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ). (٦٠٢٨ - ٦٠٣٧)**
**بَابٌ: فِي صِفَةِ لِحْيَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**

١٥٦٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: يُكْرَهُ أَنْ يَنْتِفَ الرَّجُلُ الشَّعْرَةَ الْبَيْضَاءَ مِنْ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، قَالَ: وَلَمْ يَخْتَضِبْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، إِنَّمَا كَانَ الْبَيَاضُ فِي عَنْفَقَتِهِ، وَفِي الصُّدْغَيْنِ، وَفِي الرَّأْسِ نَبْذٌ. {الحديث: ٦٠٣١ = ٦٠٣٢ فم}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ناباشە (واتە: مەکرووهە) کە پیاو مووی سپی لەسەرو ریشی بژار بکا. ئەنەس دەیفەرموو: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) مووی خۆی بۆیە نەدەکرد، واتە: بەهیچ رەنگێ رەنگی نەدەکرد، هەندێ مووی سپی بەچاڵی چەناگەیەوە بوو، وە هەروەها چەند موویێ پرژو بڵاو لەهەردوو لاجانگیو لەسەریدا هەبوو!).

**١٢١٥) مووی سپی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ). (٦٠٢٨ - ٦٠٣٧)**
**بَابٌ: فِي شَيْبِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**

١٥٦٤- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبْيَضَ، قَدْ شَابَ، كَانَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) يُشْبِهُهُ. {الحديث: ٦٠٣٤ = ٦٠٣٦ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤، رقم: ١٤١٣ = ٣٥٤٤، ٣٥٥٣. ترمذي. أدب: ٢٨٢، ٢٨٢٧. تحفة الأشراف: ١١٧٩٨}:

ئەبو جوحەيفە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم دیوە، پیاوێکی سوورو سپی بوو، سەری بۆز بوو بوو، حەسەنی کوڕی عەلی شێوەی تەواو لە پێغەمبەر دەچێ).

**١٢١٦) شێوەی مووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).** (٦٠١٦ - ٦٠٢٧)

**بَابٌ: صِفَةُ شعر النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**

١٥٦٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَضْرِبُ شَعَرُهُ مَنْكِبَيْهِ. {الحديث: ٦٠٢٢ = ٦٠٢٣ فم. بخاریز لباس: ٥٩٠٣، ٥٩٠٤، نسائی. زینة: ٥٢٥٠}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار قژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیدا لەهەردوو سەر شانەکانی). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢٨٦٣ چ/٤}.

١٥٦٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ شَعَرُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ). {الحديث: ٦٠٢٣ = ٦٠٢٤ فم}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار درێژیی مووی سەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا نیوەی هەردوو گوێچکەی بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢٨٦٤ چ/٤}.

**١٢١٧) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەلێ جار مووی سەری شۆڕ دەکردەوەو گەلێ جار جیای دەکردەوە بەملاو لای سەریدا.** (٦٠١٦ - ٦٠٢٧)

**بَابٌ: فِي سَدْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَعْرَهُ وَفَرْقِه**

١٥٦٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَسْدُلُونَ أَشْعَارَهُمْ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُءُوسَهُمْ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ بِهِ، فَسَدَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَاصِيَتَهُ ثُمَّ فَرَقَ بَعْدُ). {الحديث: ٦٠١٦ = ٦٠١٧ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٢١ = ٣٥٥٨، ٣٩٤٤، ٥٩١٧. أبو اود. ترجّل: ٤١٨٨. نسائی. زينة: ٥٢٥٣. ابن ماجة. لباس: ٣٦٣٢. تحفة الأشراف: ٥٨٣٦}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ هەرشتێ کە خودا فەرمانی پێ نەکردایە، کە چۆنی بکا، حەزی دەکرد کە موافەقەی خاوەن نامەکان بکا، خاوەن نامەکان چۆن ئەو شتە ئەنجام دەدەن ئەویش ئاوا ئەنجامی دەدا، خاوەن نامەکانیش دەستووریان وابوو قژی خۆیانیان بە دەوری سەریانا شۆڕ دەکردەوە، بەڵام هاوبەش پەیداکەرەکان (موشریکەکان) دەستووریان وابوو قژی خۆیانیان لەناوەڕاستی سەریاندا دەکرد بەدوو بەشەوەو لایان دەدا بەم لاو لای سەریاندا، جا لەپێشدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر دەستووری خاوەن نامەکان پێشە سەری خۆی شۆڕ دەکردەوە بەبێ لەتکردن، بەڵام لەدواییدا، قژی خۆی دەکرد بەدوو لەتەوەو لای ەدا بەملاو بەولای سەریدا). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢٨٦٥ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- بەپێی دەقی ئەم فەرموودەیە، دروستە کە ڕەفتاری جوانو باوی پەسەندی ناو کۆمەڵی خاوەن نامەکان، بکرێن بەسەر مەشقو پێشینەو چاویان لێ بکرێو پەیڕەوی بکرێن، بەمەرجێ کە لەبارەی ئەو شتەوە دەقێکی ڕۆشن نەبێ لە یاسا نامەی خۆمانا، کە بە پێچەوانەی ئەو شتەوەبێ، کەواتە زۆر لە ڕەفتارو باوی کۆمەڵایەتی جوانی ناو کۆمەڵگاکانی ناو ڕۆژئاوای ئەم سەردەمە، ئەگەر بکرێن بەسەر مەشقو پێشینەو پەیڕەو بکرێن کارێ پەسەندە.

٢- لەهەمان کاتا، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوە: (کە پاراستنو زیندوو کردنەوەی باوو نەریتو خووی باشی ناو کۆمەڵگای خۆت، با پەیوەندی بە ئاینیشەوە نەبێ کارێ ڕەوایە) ئەوەتانێ پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ گەلی عەرەبی خۆی هەموو موسوڵمان بوونو ڕێزیان نەما بۆ ئایینی بتپەرستی گەڕایەوە سەر باوی دامەزراوی ناو کۆمەڵگای خۆی، کە عەرەبی سەردەمی خۆی بوونو موافەقەی قەومەکەی خۆی پێ باشتر بووە لە موافەقەی خاوەن نامەکان، تەنانەت ئەگەر ئەم گەڕانەوەی پێغەمبەرە، بۆسەر دەستووری جارانی گەلەکەی، بە

وەحیو سرووشیش بێ، هەر بەڵگەیە لەسەر ئەوە پەیڕەوی پێشینان لەکاری ڕەوادا کارێ ڕەوایە.

بۆ پشتیوانی ئەم قسەیە، ئەمەتان عەرزدەکەم:

(لەیاسا نامەی خوادا، چەند بنەمایێ بۆ بڕیاری شت چەسپاوە، وەك عورفو باوی جوانی ناو کۆمەڵو پەیڕەوی پێشینانی باش.... تاد). جا ئالەم ڕوانگەیەوە کە لە ئیسلامدا، وەك لە فیقهی ئاسانا دەفەرموێ: (یاسای سەرەکی بۆ ئەم بڕیارە ئەم دەستوورەیە کە دەڵێ: هەر گیانلەبەرێ عەرەب بەپاکی بزانی، حەلاڵە، مەگەر شەرع بەحەرامی دابنێ!!).

هەروا لە فیقهی ئاسانا، لەقازی حوسەینەوە ڕاگوێز دەکا، کە مەبەست لە عەرەب کام عەرەبەیە، دەڵێ: قازی حوسەین دەفەرموێ: (مەبەست لەوە کەهەر گیانلەبەرێ عەرەب بەپاکی بزانێ پاکەو حەلاڵەو هەر گیانلەبەرێ عەرەب بە پیسی بزانێ پیسە، مەگەر ڕای شەرع بە پێچەوانەوە بێ، مەبەست لەم عەرەبانە، کە دەگەرو بایەخ بۆ بڕیارەکانیان هەیە عەرەبی سەردەمی پێغەمبەر خۆیەتی).

{بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٣٦٣، لاپەڕە: ٩٨١ هەتا ٩٨٤}.

**١٢١٨) چۆنێتی زەردەخەنەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). (٥٩٨٩)**
**بابٌ: في تبسُّمِ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**

سەبارەت بەم بابەتە بڕوانە فەرموودەکەی جابیری کوڕی سەموورە، کە لەنامەی نوێژدا، لە زنجیرە: ٢٥٧دا، لەژمارە: ٣٦٢دا لەپێشەوە ڕابورد. {تاج/٣، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٣١٠٦ ج/٤}.

**١٢١٩) شەرمو شکۆی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). (٥٩٨٦ - ٩٨٨)**
**بابٌ: كَانَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا**

١٥٦٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئًا عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ).

{الحديث: ٥٩٨٦ = ٥٩٨٧ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٤٢٥ = ٣٥٦٢، ٦١٠٢، ٦١١٩}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ شەرمو شکۆ لە گەورە کچی ناو پەردە بەشەرمو شکۆتر بوو، تەنانەت ئەگەر حەزی لەشتێ نەبوایە، شەرمی دەکرد کەباسی بکا، بە ڕوویا دەمانزانی کە حەزی لێی نییە). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١١٦ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

بەڵام ئەگەر ئەو شتەی کە حەزی لێی نەبوو، پێویستی بەراگەیاندن بووایە، ئەوە بەپێی ئایەتی: {وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ - الأحزاب – ٣٣/٥٣} بە شێنەیی و بە هێمنانە رایدەگەیاند.

**١٢٢٠) بۆنی خۆشی پێغەمبەرو نەرمو نۆڵی جەستەی. (٦٠٠٦ - ٦٠٠٨)**

**بَابٌ: طِيبُ رَائِحَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلِينُ مَسِّهِ**

١٥٦٩- عَنْ أَنَسِ بْنُ مَالِك (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَزْهَرَ اللَّوْنِ، كَأَنَّ عَرَقَهُ اللُّؤْلُؤُ، إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ، وَلاَ مَسِسْتُ دِيبَاجَةً وَلاَ حَرِيرَةً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَلاَ شَمَمْتُ مِسْكَةً وَلاَ عَنْبَرَةً أَطْيَبَ مِنْ رَائِحَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). {الحديث: ٦٠٠٨ = ٦٠٠٩ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٤٢٤ = ٣٥٦١ = تجريد/٥٦٩ = ١١٤١ فتح البارى}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕەنگی پێغەمبەر سپیو سوور بوو، گەشو نوورانی بوو، کە ئارەقی دەکرد، ئارەقەکەی دەتگوت گۆی مرواریيە، لەکاتی ڕۆییندا کە دەڕۆیشت کەمێ بەبەردا دەینواند، دەتگوت لەسەرەو خوارکەوە دادەپەڕێ!

وە هەرگیزاو هەرگیز دەستم لەهیچ شتێ نەداوە، نە دیباجو نە ئاورێشمو نەشتی تر، کە وەك دەستو جەستەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا نەرمو شلو ناسكو نازدار بێ!

وە قەت قەت، بۆنی هیچ شتێکم نەکردووە، نەمیسكو نە عەنبەرو نەهیچی تر، کە بۆنی لەبۆنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشتر بووبێ!). {تاج/٣، زنجیرە:

٨٥، ژمـاره: ٣٠٩٧} + {تـاج/٣، زنجـيره: ٨٣، ژمـاره: ٣٠٩٢، ٣٠٩١ + تـاج/٣، زنجـيره: ٨٣، ژماره: ٣٠٨٤}.

١٥٧٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) صَلاَةَ الأُولَى، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أَهْلِهِ وَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَاسْتَقْبَلَهُ وِلْدَانٌ، فَجَعَلَ يَمْسَحُ خَدَّيْ أَحَدِهِمْ وَاحِدًا وَاحِدًا، قَالَ: وَأَمَّا أَنَا فَمَسَحَ خَدِّي، قَالَ: فَوَجَدْتُ لِيَدِهِ بَرْدًا أَوْ رِيحًا كَأَنَّمَا أَخْرَجَهَا مِنْ جُؤْنَةِ عَطَّارٍ). {الحديث: ٦٠٠٦ = ٦٠٠٧ فم}:

جابيرى كورِى سەمووره (رەزاى خوداى لىَ بىَ) فـەرمووى: لەگـەڵ پێغەمبـەردا (دروودى خوداى لەسەر بێ) نوێژى نيوەڕۆم بە كۆمەڵ (بە جەماعەت) كـرد، ئـەنجا پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) ڕۆيشـتەوه بـۆ ماڵـەوەىو منـيش لەگـەڵيا چوومەوه، جـا منـداڵان هـاتن بـە پيريەوه، پێغەمبەريش (دروودى خوداى لەسەر بێ) يەكـە يەكـە دەسـتى دەهێنـا بەڕوومـەتيانا، دەستى هێنا بە ڕوومەتى منيشا. فەرمووى: دەستى وا فێنكو بۆنى وا خۆشەويستى بـوو دەتگـوت كردوويـەتى بـە قوتـوى گـوڵاو فرۆشـا، يـا لەشووشـەى گـوڵاوى هەڵكيشاوه). {تاج/٣، زنجيره: ٨٥، ژماره: ٣٠٩٩ ج/٤}.

**١٢٢١) تەنانەت لەكاتى سەرماو سۆڵەشدا كە سرووش (وەحى) دەهات بۆ پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) چۆڕاوگەى ئارەق بەناو چاوانيدا خوڕ خوڕ دەهاتە خوارەوه.** (٦٠٠٩ - ٦٠١٦)

**بَابٌ: عرق النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) في البَرْدِ حِين يَأْتِيهِ الوَحْيُ**

١٥٧١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: إِنْ كَانَ لَيُنْزَلُ عَلَى رَسُولِ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي الْغَدَاةِ الْبَارِدَةِ ثُمَّ تَفِيضُ جَبْهَتُهُ عَرَقًا. {الحديث: ٦٠١٢ = ٦٠١٣ فم. تجريد/١، رقم: ٢ = ٢، ٣٢١٥. ترمـذى. مناقـب: ٣٦٣٤. نسـائى. إفتتـاح: ٩٣٣، ٩٣٤. تحفة الأشراف: ١٦٨٤٩}:

عائيشـه (رەزاى خوداى لىَ بىَ) دەفـەرمووێ: بـەخودا خـۆم پێغەمبـەرم ديـوه، لـەڕۆژى سەرماو سۆڵەدا، كـە سـرووش (وەحـى) دەهاتـە خـوارەوه بـۆى، وا شـەكەتى دەكـرد،

لەوکاتەدا کە حاڵەتی سرووشەکە بەری دەدا، چۆڕاوگەی ئارەق بەناو چاوانیدا خوڕ خوڕ دەهاتە خوارەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٣١٤٤ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٥٧٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ: «أَحْيَانًا يَأْتِينِي فِي مِثْلِ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ، وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ ثُمَّ يَفْصِمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُهُ، وَأَحْيَانًا مَلَكٌ فِي مِثْلِ صُورَةِ الرَّجُلِ، فَأَعِي مَا يَقُولُ». {الحديث: ٦٠١٣ = ٦٠١٤ فم. تجريد/١، رقم: ٢ = ٢، ٣٢١٥ فتح الباري}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حاریثی کوڕی هیشام لە پێغەمبەری پرسی، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! سرووشت چۆن بۆ دێ؟ فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ): (گەلێ جار بەوێنەی زرنگەی زەنگ بۆم دێ، ئەم جۆرەیان سەختترین شێوەیەتی لەلام، جا کە فریشتەی سرووش، یان سرووشەکە خۆی، بەرم دەداو باری لەشم سووک دەبێو بارو دۆخی دابەزینو هاتنی سرووش تەواو دەبێ، ئیتر فریشتەکە هەرچی فەرمووە پێم دێتە بەرمو ڕەوانمەو باش باش دەیزانمو لێی تێ دەگەم. زۆر جارانیش فریشتەکە (واتە: جوبرائیل) لەشێوەی پیاوێکا وەك دەحیەی کەلبی خۆی دەردەخا بۆمو قسەم لەگەڵ دەکاو هەرچی دەفەرموێ: وەری دەگرمو دێتە بەرمو ڕەوانی دەکەم). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٣١٤٤ ج/٤}.

## ١٢٢٢) باسی بۆنی خۆشی ئارەقی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ).
(٦٠٠٩ - ٦٠١٦)

## بَابٌ: طِيبُ عَرَقِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٥٧٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: عِنْدَنَا، فَعَرِقَ، وَجَاءَتْ أُمِّي بِقَارُورَةٍ فَجَعَلَتْ تَسْلُتُ الْعَرَقَ فِيهَا، فَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: «يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا هَذَا الَّذِي تَصْنَعِينَ»؟ قَالَتْ: هَذَا عَرَقُكَ، نَجْعَلُهُ فِي طِيبِنَا وَهُوَ مِنْ أَطْيَبِ الطِّيبِ. {الحديث: ٦٠٠٩ = ٦٠١٠ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ ماڵمان، لەوێ سەرخەوی نیوەڕۆی شکان، کە خەوی لێ کەوت ئارەقی دەردا، جا دایکم شووشەیەکی هێناو بەدەستی ئارەقەکەی دائەلێسایە ناوی، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) خەبەری بۆوە، فەرمووی: (ئەی دایکی سولەیم! ئەوەچی دەکەی؟) فەرمووی: ئەمە ئارەقی تۆیە، دەیکەینە ناو گوڵاوی خۆمانەوە، ئەم لە گوڵاو گەلێ بۆنی خۆشترە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٣١٠٠ چ/٤}.

## ١٢٢٣) خۆ مووفەڕك كردن بە ئارەقی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ). (٦٠٠٩ - ٦٠١٦)

## بَابٌ: التَّبَرُّكُ مِنْ عَرَقِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٥٧٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْخُلُ بَيْتَ أُمِّ سُلَيْمٍ فَيَنَامُ عَلَى فِرَاشِهَا، وَلَيْسَتْ فِيهِ. قَالَ: فَجَاءَ ذَاتَ يَوْمٍ فَنَامَ عَلَى فِرَاشِهَا فَأُتِيَتْ، فَقِيلَ لَهَا: هَذَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَامَ فِي بَيْتِكِ عَلَى فِرَاشِكِ، قَالَ: فَجَاءَتْ وَقَدْ عَرِقَ وَاسْتَنْقَعَ عَرَقُهُ عَلَى قِطْعَةِ أَدِيمٍ عَلَى الْفِرَاشِ، فَفَتَحَتْ عَتِيدَتَهَا فَجَعَلَتْ تُنَشِّفُ ذَلِكَ الْعَرَقَ فَتَعْصِرُهُ فِي قَوَارِيرِهَا، فَفَزِعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: «مَا تَصْنَعِينَ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ»؟ فَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ نَرْجُو بَرَكَتَهُ لِصِبْيَانِنَا. قَالَ: «أَصَبْتِ». {الحديث: ٦٠١٠ = ٦٠١١ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران گەلێ جار، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەهات بۆ ماڵی ئوممو سولەیمی دایکم، کە هاوسەری ئەبو طەلحەی زڕبابم بوو، گەلێ جار کە دایکم لەسەر نوێنەکەی خۆی نەبوایە، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەسەر نوێنەکەی دایکم دەخەوت، ڕۆژێ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ ماڵمان، دایکم لەماڵ نەبوو، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەسەر نوێنەکەی دایکم خەوت، چوون بەدایکمیان گوت: ئەی ئوممو سولەیم! پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هاتووە، بۆ ماڵتان، لەماڵی ئێوە لەسەر نوێنەکەی تۆ نووستووە، فەرمووی: جا ئوممو سولەیم هاتەوە، تەماشای کرد پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ)

ئارەقێکی زۆری دەرداوە، چۆڕاوەتە سەر پارچەیێ چەرم لەسەر نوێنەکە، جا دایکم هەبگەکەیی کردەوەو شووشەیەکی لێ دەرهێناو ئەو ئارەقەی بەشتێ هەڵ دەمژیو دەیگوشییە ناو شووشەکانییەوە. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەوەکەی راچەنیو فەرمووی: (ئەوە خەریکی چیت ئەی دایکی سولەیم!) دایکم فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بە ئومێدی پیرۆزیو مووفەڕکی بۆ مناڵەکانمان ئەم ئارەقەی تۆ کۆدەکەینەوە! فەرمووی: (پێکاوتە ئافەریم بۆ خۆت!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٣١٠٠}.

**روونکردنەوە:**

یەکەم:- بۆ وەڵامی چەند پرسیارێكو تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە بڕوانە ئەم جێگەیانە:

أ- تاجی کوردی بەرگی سێیەم، زنجیرە: (٤٣)، لاپەڕە: ٦٨٥، چاپی چوارەم، ژمارە: ٣٤٤٧، ٣٤٤٨ + لاپەڕە: ٧٠٤، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٣٤٨٥، ٣٤٨٦، ٣٤٨٧، ٣٤٨٨، ٣٤٨٩، ٣٤٩٠، ٣٤٩١ + لاپەڕە: ٧٠٠، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٣٤٧٧، ٣٤٧٨.

ب- تەجریدی بوخاری، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٣٢٤، ژمارە: ١٢٠٠ = ٢٩٢٤ ژیاننامەی ئوم حەرام پووری ئەنەسی کوڕی مالیك + بەرگی/١، لاپەڕە: ٣٤، ژمارە: ١٣ ژیاننامەی ئەنەسی کوڕی مالیك + بەرگی/٢، لاپەڕە: ٤٤، ژمارە: ٦١٧ ژیاننامەی ئەبو طەلحە.

ج- موختەصەری صەحیحی بوخاری، ژمارە: ٢٢، ژیاننامەی ئەنەسی کوڕی مالیك.

دووەم:- کۆمەڵێ فەرموودەو شوێنەوارو بیسراوی زانایان هەیە کە دەگەنە رادەی تەواتور، ئەوە دەچەسپێنن کە خۆ پیرۆزکردنو خۆ مووفەڕککردن بە پاشماوەو شوێنەوارو ئاساری پێغەمبەرانو پیاوچاکان، کارێ رەواو پەسەندە، بەمەرجێ کە ئەوە سەرنەکێشێ بۆ هاوەڵ داناو شیرك بۆ خودا.

## ١٢٢٤) نزيكى پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) لەخەڵك و پيرۆزيى وەرگرتن ليێى. (٥٩٩٦ - ٥٩٩٨)

### بَابٌ: فِي قُرْبِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنَ النَّاسِ وَتَبَرُّكِهِمْ بِهِ

١٥٧٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِذَا صَلَّى الْغَدَاةَ، جَاءَ خَدَمُ الْمَدِينَةِ بِآنِيَتِهِمْ فِيهَا الْمَاءُ، فَمَا يُؤْتَى بِإِنَاءٍ إِلاَّ غَمَسَ يَدَهُ فِيهَا، فَرُبَّمَا جَاءُوهُ فِي الْغَدَاةِ الْبَارِدَةِ فَيَغْمِسُ يَدَهُ فِيهَا. {الحديث: ٥٩٩٦ = ٥٩٩٧ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) کە نوێژی بەیانی دەکرد، ئیتر راژەکەران و ئاوکێشەکانی مەدینە حاجەت و دەفرەکانیان بە ئاوەکەوە دەهێنا بۆی، ئەویش بۆ موفەرك و پیرۆزیی دەستی پیادەکردن، گەلێ جاربەیانیان زۆر ساردیش بوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشا هەردەستی دەکرد بەناو ئاوەکەداو نائومێدی نەدەکردن و دڵی رادەگرتن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٢٨ چ/٤}.

١٥٧٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَالْحَلاَّقُ يَحْلِقُهُ، وَأَطَافَ بِهِ أَصْحَابُهُ، فَمَا يُرِيدُونَ أَنْ تَقَعَ شَعْرَةٌ إِلاَّ فِي يَدِ رَجُلٍ}. {الحديث: ٥٩٩٧ = ٥٩٩٨ فم}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی، سەرتاش سەری دەتاشی، یارانی خەرمانەیان لێ دابوو، هەر تەڵەموویەك بەردەبۆوە، یاران دەیان قۆستەوەو دەکەوتە ناو دەستی یەکێکیانەوە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٢٩ چ/٤}.

١٥٧٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ امْرَأَةً كَانَ فِي عَقْلِهَا شَيْءٌ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً، فَقَالَ: «يَا أُمَّ فُلاَنٍ انْظُرِي أَيَّ السِّكَكِ شِئْتِ حَتَّى أَقْضِيَ لَكِ حَاجَتَكِ»، فَخَلاَ مَعَهَا فِي بَعْضِ الطُّرُقِ، حَتَّى فَرَغَتْ مِنْ حَاجَتِهَا}. {الحديث: ٥٩٩٨ = ٥٩٩٩ فم}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێ هەبوو، لەکاتی خۆیدا شانەکار (ماشیطة)ی دایکە خەدیجەی ژنی پێغەمبەر بوو، تۆزێ هۆشی تەواو نەبوو، جارێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فرمانێکی نهێنیم پێت هەیە، فەرمووی: ئەی دایکی فیسار! کوێت پێ خۆشە بچۆ بۆ ئەوێ تا بێم کارەکەتت بۆ جێبەجێ بکەم، ئیتر لەسەر ڕێیەکا دوو بەدوو کۆبوونەوە هەتا ژنەکە ئیشەکەی تەواو بوو، نهێنییەکەی خۆی عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٣٠ ج/٤}.

**١٢٢٥) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەحمترین کەسە بۆ منداڵ و خاوو خێزان.** (٥٩٧٩ - ٥٩٨٥)

**بَابُ: كَانَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرْحَمَ النَّاسِ بِالصبيانِ وَالْعِيَالِ**

١٥٧٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَانَ أَرْحَمَ النَّاسْ بِالْعِيَالِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَانَ إِبْرَاهِيمُ مُسْتَرْضِعًا لَهُ فِي عَوَالِي الْمَدِينَةِ، فَكَانَ يَنْطَلِقُ وَنَحْنُ مَعَهُ فَيَدْخُلُ الْبَيْتَ وَإِنَّهُ لَيُدَّخَنُ وَكَانَ ظِئْرُهُ قَيْنًا فَيَأْخُذُهُ فَيُقَبِّلُهُ، ثُمَّ يَرْجِعُ. قَالَ عَمْرٌو: فَلَمَّا تُوُفِّيَ إِبْرَاهِيمُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ إِبْرَاهِيمَ ابْنِي وَإِنَّهُ مَاتَ فِي الثَّدْيِ، وَإِنَّ لَهُ لَظِئْرَيْنِ تُكَمِّلَانِ رَضَاعَهُ فِي الْجَنَّةِ». {الحديث: ٥٩٨٠ = ٥٩٨١ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کەسم نەدیوە کەئاوا وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەزەیی بێتەوە بەخێزانا، گوتی: لەگوندێ لە گوندەکانی دەوروبەری مەدینە، ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) درابوو بەدایەن، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچوو بۆلای، ئێمەیش لەخزمەتیا دەچووین، مێردی دایەنەکەی ئیبراهیم (واتە: باوکە شیرییەکەی) ئاسنگەربوو، ئاسنگەریی دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەدەچووە ژوورەوەماڵەکە پڕبوو لەدووکەڵ و بۆچڕووك و، خانووەکە قانگ درابوو، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیبراهیمی کوڕی هەڵ دەگرت و تێر تێر ماچی دەکردو بۆنی دەکردو ئینجا دەگەڕایەوە، کاتێ کە ئیبراهیم مرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیبراهیم کوڕی منە، مەمکە

خۆره بوو كەمرد، لەبەرئەوه لەبەهەشتا دوو دایەنی هەیە، مەمكی پێ دەدەن، هەتا لەمەمك دەبڕێتەوه!). {تاج/١، زنجیره: ١٩٧، ژماره: ١٠٣٥ ج/٤ = چاپی چوارەم} + {تاج/٣، زنجیره: ٩٠، ژماره: ٣١٢٥، ٣١٢٦ + تجرید/٢، لاپەڕه: ٥١، رقم: ٦٢٦}.

١٥٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ أَبْصَرَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُقَبِّلُ الْحَسَنَ فَقَالَ: إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنَ الْوَلَدِ، مَا قَبَّلْتُ وَاحِدًا مِنْهُمْ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّهُ مَنْ لاَ يَرْحَمْ لاَ يُرْحَمْ». {الحديث: ٥٩٨٢ = ٥٩٨٣ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٢٠ = ٥٩٩٨ فتح الباري}:

ئەبو هورەیره (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەقرەعی كوڕی حابیس چاوی لێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەسەنی كوڕی عەلی ماچ دەكرد، كه كچەزای بوو، كوڕی فاطیمەی كچی بوو، ئەقرەع وتی: من دەمنداڵم هەیە، تا ئێستا كەسیانم ماچ نەكردووه! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەسێ رەحمی نەبێ رەحمی پێ ناكرێ!). {تاج/٣، زنجیره: ١٩٧، ژماره: ١٠٣٥ + تاج/١، زنجیره: ١٩٧، ژماره: ١٠٣٥، ١٠٣٦ + تاج/٣، زنجیره: ٩٠، ژماره: ٣١٢٦ ج/٤}.

**١٢٢٦) میهرەبانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ژنان، فەرمانی دەكرد بە وشترەوانەكان كه وشتری ژێر ژنان بەهێواشی لێ خوڕن.** (٥٩٩٠ - ٥٩٩٥)

**بَابٌ: رَحْمَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) النِّسَاءَ وَأَمْرُهُ السُّوَّقَ بِهِنَّ بِالرِّفْقِ**

١٥٨٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ وَغُلاَمٌ أَسْوَدُ يُقَالُ لَهُ أَنْجَشَةُ يَحْدُو، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «يَا أَنْجَشَةُ رُوَيْدَكَ سَوْقًا بِالْقَوَارِيرِ». {الحديث: ٥٩٩٠ = ٥٩٩١. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية/٥/٢٢٥، رقم: ١٩٠٦ = ٦٢٠٢، ٦١٤٩، ٦١٦١، ٦٢٠٩، ٦٢١٠، ٦٢١١. تحفة الأشراف: ٣٠٠ ء ٩٤٩}:

١- له تاجول ئوصولدا دەفەرموێ:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وشترەوانێكی دەنگخۆشی هەبوو، ناوی ئەنجەشه بوو، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر

بێ) تووشی بوو، بەهۆرە بەدەنگە خۆشەکەی وشترەکانی ژێر هاوسەرە پاکیزەکانی پێغەمبەری لێ دەخوری‌و وشترەکان بەتەکانا دەڕۆیشتن، جا پێی فەرموو: (ئەی ئەنجەشە! تۆزێ هێواش، باریان شووشەیە مەیشکێنە!). واتە: ئافرەت وەك مینا ناسکە، بەرگەی ئەم هەڵبەز هەڵبەزو خێراییە ناگرێ).

٢- لە تەجریدا دەفەرموێ:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ ژن، کە یەکێکیان ئوم سولەیمی دایکم بوو، بەسواری وشتر لەسەفەرێکا، لەناو بارو بنەکەدا بوون، ئەنجەشە کە نۆکەری پێغەمبەر بوو، بەدەنگە خۆشەکەی خۆی، بەهۆرە، وشترەکانی ژێر ئافرەتەکانی لێ دەخوڕی، وەك زانراوە وشتر ئەگەر بەدەنگی خۆشەویستی هۆرەی بۆ بکرێ تەواو خێرا دەبێ، هەروەك چۆن ران بەدەنگی شمشاڵی خۆش باش دەلەوەڕێ ئاوا! جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆئەوەی کە ئەنجەشە پێی لێ هەڵنەبڕێ‌و بەئاسایی وشترەکان لێ بخوڕێ، پێی فەرموو: ئەی ئەنجەشە! هێواش لەسەرەخۆبە، ولاخەکان بەهێواشی لێ بخوڕە، چونکە باریان ئافرەتە، کە وەك شووشەو مینا ناسکن‌و بەرگەی ئەم هەڵبەز هەڵبەزە ناگرن!). {تجریدی بوخاری/٢٢٥/٥/٥، ژمارە: ١٩٦٠ = ٦٢٠٢ + تاج/٣، لاپەڕە: ٤١٨، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٢٧ + تاج/٥، لاپەڕە: ٥٠٦ چاپی/٤، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٥٤٦٠}.

**١٢٢٧) دلێری پێغەمبەرو لەپێشەوە بوونی بەرەو جەنگ.** (٥٩٦١ - ٥٩٦٣)

**بَابٌ: فِي شَجَاعَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَقَدُّمُهُ إِلَى الْحَرْبِ**

١٥٨١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحْسَنَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدَ النَّاسِ، وَكَانَ أَشْجَعَ النَّاسِ، وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَانْطَلَقَ نَاسٌ قِبَلَ الصَّوْتِ، فَتَلَقَّاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَاجِعًا، وَقَدْ سَبَقَهُمْ إِلَى الصَّوْتِ وَهُوَ عَلَى فَرَسٍ لأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ فِي عُنُقِهِ السَّيْفُ، وَهُوَ يَقُولُ: «لَمْ تُرَاعُوا، لَمْ تُرَاعُوا». قَالَ: «وَجَدْنَاهُ بَحْرًا، أَوْ إِنَّهُ لَبَحْرٌ»، قَالَ: وَكَانَ فَرَسًا يُبَطَّأُ).

{الحديث: ٥٩٦١ = ٥٩٦١ فم. تجريد البخاري/٣/٣٠٩، رقم: ١١٨٠ = ٢٨٥٧، ٢٨٢٠،

٢٨٧٢، ٢٨٦٦، ٢٨٦٧، ٢٩٠٨، ٢٩٦٨، ٢٩٦٩، ٢٠٤٠، ٦٠٣٣، ٣٢١٢. ترمــــــذی. جهاد: ١٩٨٧}:

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبــەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لەهـەموو کەسـێ چـاکتر بـوو، وە لەهـەموو کەسـێ سـەخیترو بەخشـندەتر بـوو، وە لەهەموو کەسێ ئازاترو دلێرتر بوو، شەوێ شاری مەدینە شەڵەژاو مـەردوم هـەموو تۆقین، قـاوەو شـەڵەژانێو تـرس‌و تۆقینـێ روویـدا، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) بـۆ سۆراخی ئـەم هەواڵە، ئەسپێکی پشت رووتـی بـێ جل‌و زینـی لـە ئـەبو طەلحەی زڕبـابم خواسـت نـاوی مەنـدووب بـوو، بەسـواری ئـەو ئەسـپە چـوو بـۆ سـۆراخی رووداوەکە، چەند کەسێکی تـریش بـەرەو ئـەو دەنگـە چـوون کـە بـوو بـوو بـەهۆی شێرزە بوونی خەڵکی شارەکە لەولاوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بـەرەنگاریان بـوو شمشێرەکەی لە ملیدا بوو، بەسواری ئەسپەکە دەگەڕایـەوە لـە سۆراخی هەواڵەکـەو دەیفەرموو: (مەشەڵەژێن، مەشەڵەژێن، هیچی وامـان نـەدی کـەببێ بـەهۆی تـرس‌و بیم‌و نا ئارامی) وە فەرمووی: (بەڵام بەڕاستی ئەم ئەسپە وەك شەپۆلی دەریا وایـە، ئەوەندە گورج‌و گۆڵ‌و خێرایە!).

ئەنــەس فـەرمووی: خێرایـی‌و گـورج‌و گـۆڵی ئەسـپەکە لـەو هەڵمەتـەدا بـە موعجیزەی پێغەمبەر بوو، دەنا ئەسپەکە خۆی ناسـراو بـوو بـە تەمـەڵی‌و سستـی‌و تەوەزەلی!!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٢٢}.

**١٢٢٨) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) رەفتاری لەهەموو کەس بەرزترو رەوشتی لەهەموو کەس جوانتر بوو. (٥٩٦٦ = ٥٩٧١)**

**بَابٌ: كَانَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ خُلُقًا**

١٥٨٢- عَنْ أَنَسٌ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كَـانَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) مِـنْ أَحْسَنِ النَّاسِ خُلُقًا، فَأَرْسَلَنِي يَوْمًا لِحَاجَةٍ فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لاَ أَذْهَبُ، وَفِي نَفْسِي أَنْ أَذْهَبَ لِمَا أَمَرَنِي بِهِ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَخَرَجْتُ حَتَّى أَمُرَّ عَلَى صِبْيَانٍ، وَهُمْ يَلْعَبُـونَ فِي السُّوقِ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) قَـدْ قَـبَضَ بِقَفَـاىَ مِـنْ وَرَائِـى، قَـالَ:

فَنظَرْتُ إِلَيْهِ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقَالَ: «يَا أُنَيْسُ! أَذَهَبْتَ حَيْثُ أَمَرْتُكَ»؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، أَنَا أَذْهَبُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ أَنَسٌ: وَاللَّهِ لَقَدْ خَدَمْتُهُ تِسْعَ سِنِينَ مَا عَلِمْتُهُ قَالَ لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ: «لِمَ فَعَلْتَ كَذَا وَكَذَا»، أَوْ لِشَيْءٍ تَرَكْتُهُ: «هَلاَّ فَعَلْتَ كَذَا وَكَذَا». {الحديث: ٥٩٧٠ = ٥٩٧٠، ٥٩٧١ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەموو کەس ڕەوشتی جوانتر بوو، ڕەفتاری تا بڵێیت بەرزو جوان بوو، ڕۆژێ ناردمی بۆ کارێ پێیم گوت: بەخودا ناچم. بەڵام لەدڵەوە نیازم هەبوو کەبچم بۆی. جا ڕۆیشتم لەڕێ، تووشی تاقمێ منداڵ بووم یارییان دەکرد لەناو بازاڕدا، منیش چوومە ناویان، جا کاتێکم زانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپشتەوە، پشتە ملی گرتم، کە سەیرم کرد پێ دەکەنی، فەرمووی: (ئەنەسەکە! چووی بۆ ئەوەی کە پێم گوتیت؟ منیش گوتم: بەڵێ، وا دەڕۆم بۆی ئەی پێغەمبەری خودا! ئینجا چووم!

ئەنەس فەرمووی: سوێندم بەخودا، نۆ ساڵ خزمەتی ئەو زاتەم کردووە، چ لەماڵەوەو چ لەڕێگەو سەفەردا، لەبیرم نایێ کە شتێکم کردبێ، یا شتێکم نەکردبێ، پێمی فەرمووبێ: بۆ ئەمەت واکردووە، یا بۆ ئەوەت وانەکردووە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٢٤، ٣١٢٣}.

## ١٢٢٩) چۆنێتی قسەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). (٧٤٣٤ - ٧٤٣٥)
## بَابٌ: صفة حديث النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٥٨٣- عَنْ عروة بن الزبير قَالَ: كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُ وَيَقُولُ: اسْمَعِي يَا رَبَّةَ الْحُجْرَةِ، اسْمَعِي يَا رَبَّةَ الْحُجْرَةِ، وَعَائِشَةُ (رضوان الله عليها) تُصَلِّي، فَلَمَّا قَضَتْ صَلاَتَهَا قَالَتْ لِعُرْوَةَ: أَلاَ تَسْمَعُ إِلَى هَذَا وَمَقَالَتِهِ آنِفًا؟ إِنَّمَا كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَدِّثُ حَدِيثًا لَوْ عَدَّهُ الْعَادُّ لأَحْصَاهُ. {الحديث: ٧٤٣٤ = ٧٤٦٩ فم}:

عوورەی کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموودەی پێغەمبەری بۆ مەردومەکە دەگێڕایەوە، عائیشە لەوکاتەدا نوێژی

دەکرد، لەناو هۆدەکەی خۆیدا، ئەبو هورەیرە ئاگای لەوە نەبوو کە لەوکاتەدا عائیشە نوێژ دەکا، بۆ پشتیوانی گێڕانەوەکەی خۆی، بەدەنگی بەرز، دەیفەرموو: ئەی عائیشە! ئەی خاوەنی ئەم هۆدەیەی تەنیشتمان تۆش گوێت لێ بێ، ئەگەر هەڵەیەکم کرد بۆمی راست بکەرەوە، جا کاتێ عائیشەی پوورم نوێژەکەی تەواوکرد، بەمنی وت، کە عوروەی خوشکەزای عائیشەم: سەیری ئەم کابرا ناکەی کردوویەتی بەچی گاڵە گاڵێ لەم کاتەدا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا لەسەر خۆو بەشێنەیی‌و بەروونی فەرمایشتی دەفەرموو، ئەگەر کەسێ قسەکانی ئەوی بژماردایە وشە بەوشە دەیژمارد، نەك وەك ئەم یەك لەدوایەك هەڵیڕێژێ!).
{تاج/٣، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٣١٠٢ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**١٢٣٠) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەمێ‌و ئامۆژگاری لەسەر شێوەیەکی مەیانەکار دەکردین. (٧٠٥٥ - ٧٠٥٧)**

**بَابٌ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ**

١٥٨٤- عَنْ شَقِيقٍ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُذَكِّرُنَا كُلَّ يَوْمِ خَمِيسٍ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّا نُحِبُّ حَدِيثَكَ وَنَشْتَهِيهِ، وَلَوَدِدْنَا أَنَّكَ حَدَّثْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ، فَقَالَ: مَا يَمْنَعُنِي أَنْ أُحَدِّثَكُمْ إِلاَّ كَرَاهِيَةُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الأَيَّامِ كَرَاهِيَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا). {الحديث: ٧٠٥٨ = ٧٠٨٣ فم. تجريد البخاري/١/٨٧. مجلد/١، رقم: ٦١ = ٦٨، ٧٠، ٦٤١١ فتح الباري. ترمذي. أدب: ٢٨٥٥. تحفة الأشراف: ٩٢٥٤}:

شەقیق ناسراو بە ئەبو وائیل فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) دەستووری وابوو، هەموو رۆژی پێنج شەموانێ، تەمێ‌و ئامۆژگاریی دەکردین‌و وەعزی دەخوێندەوە بۆمان، رۆژێ پیاوێ پێی گوت: ئەی باوکی ئەورەحمان! خۆزگەم هەموو رۆژێ ئەم پەندو ئامۆژەت بۆمان دەخوێندەوە، چونکە ئێمە حەزمان لەم فەرمایشتانەی تۆیەو ئەم قسانەی تۆمان پێ خۆشە، فەرمووی: ئەدیی من لەبەرئەوە واناکەم چونکە حەزناکەم بەوەعزی زۆر وەڕستان بکەم، منیش وەك

جـارانی پێغەمبـەر خـۆی دەکـەم، ئـەو جـاران نـاو بـەناو پەنـدی ئێمـەی دادەداو ئامۆژگاری‌و فەرمایشتی بـۆ دەخوێندینـەوە، نـەبادا ئەگـەر هـەموو رۆژێ پەنـدمان دابـداو وەعزمـان بـۆ بخوێنێتـەوە جاڕس ببین، منـیش ئێستا لەگـەل ئێـوەدا ئـاوا دەکەم‌و چاو لەو دەکـەم). {ریـاض/٢، لاپـەڕە: ٢١٩، زنجیـرە: ٩١، ژمـارە: ٦٩٩/١ چاپی دووەم}.

## ١٢٣١) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ بەخشندەیی‌و پیاوەتی‌و خێرخوایی لە وێنەی نەبوو. (٥٩٦٤ - ٥٩٦٥)

## بَابٌ: كَانَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ

١٥٨٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كَـانَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكَانَ أَجْـوَدَ مَـا يَكُـونُ فِـى شَـهْرِ رَمَضَـانَ، إِنَّ جِبْرِيـلَ عَلَيْـهِ السَّلاَمُ كَانَ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ سَنَةٍ فِي رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ، فَيَعْرِضُ عَلَيْهِ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) أَجْـوَدَ بِـالْخَيْرِ مِـنَ الـرِّيحِ الْمُرْسَـلَةِ). {الحـديث: ٥٩٦٤ = ٥٩٦٤ فـم. تجريـد البخـاری. الترجمـة الكردية/١، لاثقرِة: ٢٠، رقم: ٦ = ٦، ١٩٠٢، ٣٢٢٠، ٣٥٥٤، ٤٩٩٧}:

ئیبنـو عـەبباس (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـۆ بەخشـندەیی‌و پیـاوەتی‌و چـاکە خـوازی مانەنـدی نـەبوو! لـە رەمەزانانیشـا، کـە جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) دەهات بۆلای، لەهەموو کاتێکی تر زیاتر خێری دەکـردو شـتی دەبەخشـی‌و بەخشـندەتر بـوو، جـوبرائیلیش (سـلاوی خـودای لەسـەر بـێ) دەستووری وابوو، هەموو سالێ، لەمانگی رەمەزانا، هەتا مانگ تەواو دەبوو، هـەموو شـەوێ دەهـات بـۆ خزمـەتی، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەو ماوەیـەدا، دەوری قورئـانی بـۆی دەکـردەوە، هـەتا بەباشـی رەوانـی بکـاو لـەیادی نەچـێتەوە. جـا لـەم کاتەدا، کە جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) دەهات بۆ خزمەتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ بەخشندەیی‌و خێرخوایی سەری پێوە نەبوو، وە بۆ ئەمە ئەوەندە خێرا بـوو، وە ئەوەنـدە بەهـەر چـوار لادا شـتی دەبەخشـی، دەتگـوت بـای هـەلکراوە، سـۆزەی

بەهەموو لایەکا دەگات!). {تاج/٢، لاپەڕە: ٩٨، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ١٣٤٤ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٢٣٢) نەبووە کەشتێ لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوا بکرێو بڵێ: نا. (٥٩٧٢ - ٥٩٧٨)

## بَابٌ: مَا سُئِلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسلَمَ) شَيْئًا قَطُّ فَقَالَ: لاَ

١٥٨٦- عَنِ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: مَا سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) شَيْئًا قَطُّ فَقَالَ: لاَ. {الحديث: ٥٩٧٢ = ٥٩٧٣ فم. تجريد البخاری بالکوردی/٥، لاپەڕە: ٢١٢، رقم: ١٩٣٥ = ٦٠٣٤ فتح الباری}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: هەرگیز نەبووە کەشتێ لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوا بکرێو بڵێ: نا!!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١١٩ ج/٤}.

**روونکرنەوە:**

لەچەند دەقێکا لە قورئانو لە سوننەتدا چەسپاوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وشەی (لا = نا)ی بەکارهێناوە، وەك ئایەتی: {لاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ}. وەك ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەشعەرییەکانی فەرموو: {وَاللهِ لاَ أَحْمِلُكُمْ}. {بڕوانە: ژمارە: ١٢٠٥ = ٤٦٥٩ کە لەپێشەوە رابورد}.

وەڵامی لەبار بۆ ئەم پرسەیە: مەبەست ئەمەیە، بەشێوەی گشتی پێغەمبەر کە داوای شتێکی لێ دەکرا، جێبەجێی دەکرد، مەگەر کاتێ کە مەهانەیەکی رەوای ببوایە، وەك ئەم نموونانەی سەرەوەی کۆمەڵێ نموونەی تر، کە شارەوانین لەلای کەسی خۆی.

١٥٨٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) غَنَمًا بَيْنَ جَبَلَيْنِ، فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ، فَأَتَى قَوْمَهُ فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ أَسْلِمُوا، فَوَاللَّهِ إِنَّ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لَيُعْطِي عَطَاءً مَا يَخَافُ الْفَقْرَ، فَقَالَ أَنَسٌ: إِنْ كَانَ الرَّجُلُ لَيُسْلِمُ مَا يُرِيدُ

إلاَّ الدُّنْيَا، فَمَا يُسْلِمُ حَتَّى يَكُونَ الإِسْلاَمُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا). {الحديث: ٥٩٧٥ = ٥٩٧٦ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مێگەلێ ئەوەندە زۆر بوو لەبەینی دوو شاخابوو، پیاوێ داوای ئەو ڕانەی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە خەلاتی دای پێی، جا پیاوەکە کاتێ ڕۆیشتەوە ناو هۆزەکەی، گوتی: ئەی خزمینە! تازووە ئیسلام ببن، سوێندم بەیەزدانی پاك، موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بە چەشنێ خەلات دەدات و بەخشیش دەبەخشێ وادیارە لەبەرئەوەی کە پشتی بەخودای خۆی ئەستوورە، مەترسی لەهەژاری نییە. ئەنەس دەیفەرموو: گەلێ جار وادەبوو پیاو هەبوو، کە موسولمان دەبوو، لەپێشدا بۆ پڕوپاتاڵ و پڕوپیتی جیهان ئیسلام دەبوون، بەلام هەر لەگەل ئیسلام دەبوو، ئیتر وا ئەم ئیسلامەتییە دەچووە ناو دلیەوە، وا تێکەلی خوێن و مۆخی دەبوو، ئیسلامی خۆشتر دەویست لەهەموو ماڵ و موڵك و سامانی جیهان!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٢٠ چ/٤}.

**١٢٣٣) خەلاتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەم گەورە بوو، هەم زۆر بوو. (٥٩٧٢ - ٥٩٧٨**

**بَابٌ: فِي عَطَاءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِظَمِهِ وَكَثْرَتِهِ**

١٥٨٨- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: غَزَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَزْوَةَ الْفَتْحِ فَتْحِ مَكَّةَ، ثُمَّ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَاقْتَتَلُوا بِحُنَيْنٍ، فَنَصَرَ اللَّهُ دِينَهُ وَالْمُسْلِمِينَ، وَأَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَئِذٍ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ مِائَةً مِنَ النَّعَمِ، ثُمَّ مِائَةً، ثُمَّ مِائَةً، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَنَّ صَفْوَانَ قَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ أَعْطَانِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا أَعْطَانِي وَإِنَّهُ لأَبْغَضُ النَّاسِ إِلَيَّ، فَمَا بَرِحَ يُعْطِينِي حَتَّى إِنَّهُ لأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ). {الحديث: ٥٩٧٦ = ٥٩٧٧ فم}:

زوهـری ئیبنـو شـەهاب (رەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ شاری مەککەی ئازاد کردو لەدەستی بێباوەڕان رزگاری کرد، ئـەوجا خۆیو سوپاکەی دەرچوون، لەحونەین لەگەڵ بێباوەڕاندا پێك هەڵپڕژان، لەئەنجاما خودای مەزن ئایینی خۆیو سوپای موسوڵمانانی سەرخست، لەو رۆژەدا پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەد وشتری دا بەصەفوانی کوڕی ئومەییە، لەپاشا سەدی تریشی داپێی، لەپاشا دیسان سەدی تریشی داپێی. زوهری (ئیبنـو شـەهاب) دەیفـەرموو: سـەعیدی کوڕی موسەییەب گێڕایەوە بۆم کە صەفوان دەیگوت: سوێندم بـەخودا لەسـەرەتاوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەو خەڵاتانەی دەکردم، لەهەموو کەسێ زیاتر رقم لێی بوو، بـەڵام بـەرە بـەرە هـەر خـەڵاتی دەکـردم، هـەتا وام لێهات کـە پێغەمبـەرم لەهەموو کەسێکی تر لەلا خۆشەویستتر بـوو. {بڕوانـە: تـاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمـارە: ٣١٢١ + تاج/٤، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٥٢٠، ٤٥١٩ + ژمـارە: ١١٨٩و ١١٩٠و ١١٩١ کـە لەپێشـەوە لە زنجیرە: ٩٤٧ی ئەم پەڕاوی پوختەی صەحیحی موسلیمەدا رابوردن}.

## ١٢٣٤) باسی بەڵێنەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ).

(٥٩٧٢ - ٥٩٧٨)

## بَابٌ: فِي عِدَاتِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٥٨٩- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَوْ قَدْ جَاءَنَا مَالُ الْبَحْرَيْنِ، لَقَدْ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا»، وَقَالَ بِيَدَيْهِ جَمِيعًا، فَقُبِضَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلَ أَنْ يَجِيءَ مَالُ الْبَحْرَيْنِ، فَقَدِمَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) بَعْدَهُ فَأَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى: مَنْ كَانَتْ لَهُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِدَةٌ أَوْ دَيْنٌ فَلْيَأْتِ، فَقُمْتُ فَقُلْتُ: إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لَوْ قَدْ جَاءَنَا مَالُ الْبَحْرَيْنِ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا». فَحَثَى أَبُو بَكْرٍ مَرَّةً، ثُمَّ قَالَ لِي: عُدَّهَا، فَعَدَدْتُهَا فَإِذَا هِيَ خَمْسُمِائَةٍ، فَقَالَ: خُذْ مِثْلَيْهَا). {الحديث: ٥٩٧٧ = ٥٩٧٨ فـم. تجريد البخاري بالكوردي/٣، رقم: ١٠١١ = ٢٢٩٦، ٢٥٩٨، ٢٦٨٣، ٣١٢٧، ٣١٦٤، ٤٣٨٣. تحفة الأشراف: ٢٦٤٠}:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەگەر ماڵ (سەرانە: جزیە)ی بەحرەین هات، ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەت پێ دەدەم). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی خۆی كرد بەمستو ئاماژەی پێیان كرد، كە سێ مستی ئاوا لەوپارەی سەرانەی بەحرەینەت پێ دەبەخشم.

ئیتر چارەنووسی خودایی وابوو، سەرانەی بەحرەین هەر نەهات هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گیانی پاكی سپارد، بەڵام كاتێ ئەو سامانە گەیشت، ئەبوبەكر (ڕەزای خودای لێ بێ) بوو بوو بەجێنشین، فەرمانی فەرموو جاڕچی جاڕیدا: هەركەسێ بەڵێنێ، یا قەرزێكی هەیە لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بابێ بۆلای ئێمە. منیش چووم بۆلایو عەرزیم كرد: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (ئەگەر سامانەكەی بەحرەین گەیشت سێ مشتی ئاوا وات پێ دەدەم).

ئەویش مشتی لە سامانەكەی پێمدا، بەمشتی خۆیو فەرمووی: ئادەی بیژمێرە، كە ژماردم پێنج سەد پارە بوون فەرمووی: دوو ئەوەندەی تریش هەڵبگرە بۆ خۆت كە هەمووی كردیە هەزارو پێنج سەد پارە). {ریاض/٢، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٦٩١ ج/٢ = چاپی دووەم}.

## ١٢٣٥) ژمارەی ناوەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

(٦٠٥٨ - ٦٠٦١)

## بَابٌ: فِي عَدَدِ أَسْمَاءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٥٩٠- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ لِي أَسْمَاءً، أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمَيَّ، وَأَنَا الْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ أَحَدٌ»، وَقَدْ سَمَّاهُ اللَّهُ رَءُوفًا رَحِيمًا. {الحديث: ٦٠٥٩ = ٦٠٦٢ فم. تجريد/كوردی/٤، لاپەڕە: ٩٦، رقم: ١٤٠٦ = ٣٥٣٢، ٤٨٩٦. ترمذی. أدب: ٢٨٤٠. تحفة الأشراف: ٣١٩١}:

**جوبەیری کوڕی موطعیم** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من کۆمەڵێ ناوم هەیە: من ناوم موحەممەدە، کە بەواتا بەردەوام سوپاسکراوە، من ناوم ئەحمەدە، کە بەواتا بەردەوام سوپاسی خوا دەکا، زیاتر لەهەموو کەس، من ناوم (الماحی)یە، واتە: ناوم قەلاچۆکەرە، واتە: ئەو کەسەم کە خودا بەهۆی منەوە کوفرو بێ باوەڕی دەسرێتەوەو قەلاچۆی دەکاو قڕی تێ دەخا، من ناوم (الحاشر)ە، واتە: کۆکەرەوە، ئەو کەسەم کە هەموو نەوەی ئادەم کۆدەکەمەوەو بەشوێن مندا دێنو دەچین بۆ مەحشەرو کۆدەبینەوە لەدەشتی کۆبوونەوە، من ناوم (العاقب = پاشەبەرە)یە، واتە: دواهەمین پێغەمبەرم).

زوهری دەیفەرموو: بێگومان کە خودای گەورەیش لە قورئانا، لەکۆتایی سوورەتی بەقەرەدا، ناوی ناوە (ڕەئووف)و (ڕەحیم) وەك دەفەرموێ: {لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ – التَّوْبَة – ٩/١٢٨}:

واتە: ئەی نەتەوەی موسوڵمانان! خودا پێغەمبەرێکی بۆتان ناردووە، کە لەخۆتانەو ئەویش وەك ئێوە ئادەمیزادە، کە دارای کۆمەڵێ ڕەوشی بەرزی وایە، کە هاندەرن بۆئەوەی کە باوەڕی پێ بهێنن.

یەکەم سیفەتی باشی ئەوەیە: لە ڕەگەزی خۆتانەو ئەویش ئادەمیزادە.

دووەم: پەرۆشە بۆتانو هەرکاتێ تووشی ڕەنجو مەینەتو سەراسێ ببن هەوڵ دەدا کە ڕزگارتان بکا.

سێیەم: خەمخۆرتانەو بەدڵ حەزدەکا دەرگای هەموو خێرێکتان لێ بکاتەوە.

چوارەم: بۆ موسوڵمانانو بڕواداران زۆر بەسۆزو دڵسۆزو میهرەبانە).

١٥٩١- عَنْ أَبِی مُوسَى الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُسَمِّي لَنَا نَفْسَهُ أَسْمَاءً فَقَالَ: «أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَحْمَدُ، وَالْمُقَفِّى، وَالْحَاشِرُ، وَنَبِىُّ التَّوْبَةِ، وَنَبِىُّ الرَّحْمَةِ». {الحديث: ٦٠٦١ = ٦٠٦٤ فم}:

ئەبو مووسنای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەندێ لەناوەکانی خۆی باس دەکرد بۆمان، دەیفەرموو: من ناوم موحەممەدە، وە ناوم ئەحمەدە، وە ناوم: دواهەمینە، چونکە پاشە بەرەو دوایین پێغەمبەرم، وە ناوم کۆکەرەوەیە، وە ناوم پێغەمبەری تەوبەیە، چونکە خودا بەهۆی منەوە دەرگای تەوبەی بۆ خەڵك کردۆتەوە، وە ناوم پێغەمبەری رەحمەتە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٣٠٨٣ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٢٣٦) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشێوەی پێغەمبەر چەندێ لە مەککەو لەمەدینە بووە. (٦٠٤٧ - ٦٠٥٧)

## بَابٌ: كَمْ أَقَامَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَكَّةَ وَالمَدِينَةَ

١٥٩٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَكَّةَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ سَنَةً يُوحَى إِلَيْهِ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرًا، وَمَاتَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ سَنَةً. {الحديث: ٦٠٥٠ = ٦٠٥٢ فم}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: تەمەنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چل ساڵ بوو، کە خودا کردی بە پێغەمبەر، ئەوکاتە لەشاری مەککە بوو، جا لەمەککە سیازدە ساڵ مایەوە، لەو ماوەیەدا نیگا (وەحی = سرووش)ی بۆ دەهات، ئەوجا خودا فەرمانی پێکرد کە لە مەککەوە کۆچو بارو رەو بکا بۆ شاری مەدینەی نازدار، ئیتر کۆچی کرد بۆ ئەوێو لەوێش دە ساڵ مایەوە، لەوێش سرووشی بۆ دەهاتو سەر گەرمی پەخشی پەیامەکەی بوو، کاتێ مەرگیش بوو بە میوانیو مرد تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٣١٥، ٣١٥٤}. بڕوانە: ژمارە: ١٥٥٦ لە زنجیرە: ١٢١١ کە لەپێشەوە رابورد + ژمارە: ١٥٩٥ کە لەدواوە دێت.

١٥٩٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَكَّةَ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، يَسْمَعُ الصَّوْتَ، وَيَرَى الضَّوْءَ سَبْعَ سِنِينَ، وَلاَ يَرَى شَيْئًا، وَثَمَانَ سِنِينَ يُوحَى إِلَيْهِ، وَأَقَامَ بِالْمَدِينَةِ عَشْرًا). {الحديث: ٦٠٥٧ = ٦٠٦٠ فم}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەتەمەنی چل ساڵیدا کە خودا کردی بە پێغەمبەر پازدە ساڵ لە مەککە مایەوە، حەوت ساڵیان، گوێی لە دەنگی فریشتەکە بوو، کە لەغەیبەوە بانگی دەکردو هەروا ڕووناکیو نووری فریشتەکەو نووری ئایاتی خودای دەبینی، بەلاّم خودی فریشتەکەی نەدەبینی، هەشت ساڵیشیان وەحی بۆ دەهاتو لەو کاتەدا فریشتەکەی دەبینی. وە دەساڵیش لەمەدینە مایەوە).

## ١٢٣٧) پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەتەمەنی چەند ساڵیدا گیانی سپاردو کۆچی دوایی کرد. (٦٠٣٨ - ٦٠٤٦)

## بَابٌ: كَمْ سِنُّ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ قُبِضَ

١٥٩٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ ابْنُ ثَلاثٍ وَسِتِّينَ، وَأَبُو بَكْرٍ الصديق وَهُوَ ابْنُ ثَلاثٍ وَسِتِّينَ، وَعُمَرُ وَهُوَ ابْنُ ثَلاثٍ وَسِتِّينَ). {الحديث: ٦٠٥٣ = ٦٠٥٥ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کردو خوا بردیەوە بۆلای خۆی تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو، ئەبوبەکریش کەمرد هەر تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو، عومەریش کە کوژرا هەر تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٣١٥٤}.

١٥٩٥- عَنْ عَمَّارٍ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ: كَمْ أَتَى لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ مَاتَ. فَقَالَ: مَا كُنْتُ أَحْسِبُ مِثْلَكَ مِنْ قَوْمِهِ يَخْفَى عَلَيْهِ ذَلِكَ، قَالَ: قُلْتُ: إِنِّي قَدْ سَأَلْتُ النَّاسَ فَاخْتَلَفُوا عَلَيَّ، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَعْلَمَ قَوْلَكَ فِيهِ. قَالَ: أَتَحْسُبُ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: أَمْسِكْ أَرْبَعِينَ بُعِثَ لَهَا خَمْسَ عَشْرَةَ بِمَكَّةَ، يَأْمَنُ وَيَخَافُ، وَعَشْرَ مِنْ مُهَاجَرِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ. وقد تقدم حديث أنس أنه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) توفي وهو ابن ستين سنة). {الحديث: ٦٠٥٣ = ٦٠٥٥ فم}:

عەمماری ئازادکراوی بەنی هاشم فەرمووی: لە ئیبنو عەبباسم پرسی: تەمەنی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) چەند بوو، کاتێ کەمرد؟ فەرمووی: باوەڕم وانەبوو، کە

وێنـەی تـۆ لـەناو هـۆزی خۆیـدا، شـتی وانـەزانیو ئـەم پرسـەی لـەلا پـەنهان بـێ، فەرمووی: عەرزیم کرد: من لەم بارەیەوە پرسیارم لەخەڵکی کردووە، وەڵامـەکانیان جیا جیایە، هەرکەسێ شتێ دەڵێ، لەبەرئـەوە حەزدەکەمو پێم خۆشـە رای تـۆش بزانم لەم بارەیەوە. فەرمووی: ژمارە دەزانی؟ گوتم: بـەڵێ. فـەرمووی: لەپێشا چل بگـرە بـە دەسـتەوە، کـە لەتـەواوی چـل ساڵیدا خـودا رەوانـەی کـردو کـردی بـە پێغەمبەر، ئەوە چل، پازدە ساڵیش لە مەککە مایـەوە، کـە لەوماوەیـەدا لەلایەکـەوە لـەخۆی ئـەمین بـوو، لەلایەکیشـەوە دەترسـا، چـلو پـازدە ئەمـە پـەنجاو پێـنج، دەساڵیش لەمەدینـە مایـەوە لـەو رۆژەوە کـە لەمەککەوە کۆچـی کـرد بـۆ مـەدینـە، کەواتـە: چـلو پـازدەو دە، هـەمووی دەکاتـە شەسـتو پێـنج ساڵ: تـەواوی تەمـەنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

بڕوانە فەرموودەکەی ئەنەسی کوڕی مالیك کە لەپێشەوە لـە ژمـارە: ١٥٥٦دا، لـە زنجیرە: ١٢١١دا رابورد، کە ئەنەس دەفەرموێ: (کاتێ پێغەمبەر خودا بردیەوە بۆلای خۆی تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو).

## ١٢٣٨) خوای گەورە ئەگەر خواستی خێری هەبێ بە نەتەوەیێ ئەوە لەپێش خۆیانەوە گیانی پێغەمبەرەکەیان دەکێشێ. (٥٩٢٣)

## بَابٌ: إِذَا رَحِمَ اللهُ أُمَّةً قَبَضَ نَبِيَّهَا قَبْلَهَا

١٥٩٦- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا أَرَادَ رَحْمَةَ أُمَّةٍ مِنْ عِبَادِهِ، قَبَضَ نَبِيَّهَا قَبْلَهَا، فَجَعَلَهُ لَهَا فَرَطًا، وَسَلَفًا بَيْنَ يَدَيْهَا، وَإِذَا أَرَادَ هَلَكَةَ أُمَّةٍ عَذَّبَهَا وَنَبِيُّهَا حَيٌّ، فَأَهْلَكَهَا وَهُوَ يَنْظُرُ، فَأَقَرَّ عَيْنَهُ بِهَلَكَتِهَا حِينَ كَذَّبُوهُ وَعَصَوْا أَمْرَهُ». {الحديث: ٥٩٢٣ = ٥٩٢٠ فم}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (خـودای گـەورەو سـەروەر، ئەگـەر خواسـتی خێـرو نیـازی باشـی بـە نەتـەوەیێ هـەبێ، لـە بەنـدەکانی خـۆی، ئـەوە لـەپێش خۆیانـەوە گیـانی پێغەمبەرەکـەیان دەکێشـێو دەیکـا بـە بـەرایی و پێشـەنگیانو لـەپێش ئەوانـەوە

ڕەوانەی دەکا هەتا لە بەهەشتا پێشوازییان لێ بکا، ئاوا مەرگی پێغەمبەرەکەیان وەك حاڵی ژیانی بۆیان دەبێ بەمایەی ڕەحمەتو خێرو خۆشی، بەڵام ئەگەر خودا ویستی نەتەوەیێ لەناوبدا، ئەوە لەژیانی پێغەمبەرەکەیانا، ئەو نەتەوە لەناو دەبا، وە بەوە چاوو دڵی ئەو پێغەمبەرە ڕۆشن دەکاتەوە، لەسەرئەوەی کە بەدرۆیان دەخستەوەو بێگوێییان دەکرد). {تاج/٣، زنجیرە: ٩١، ژمارە: ٣١٣٦ چاپی چوارەم}.

## ١٢٣٩) باسی فەرمایشتی خودای گەورە: {فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ} الآية {٦٠٦٥}

## بَابٌ: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ) الآية

١٥٩٧- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): حَدَّثَهُ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الْمَاءَ يَمُرُّ، فَأَبَى عَلَيْهِمْ، فَاخْتَصَمُوا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِلزُّبَيْرِ: «اسْقِ يَا زُبَيْرُ، ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ»، فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ، فَتَلَوَّنَ وَجْهُ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، ثُمَّ قَالَ: «يَا زُبَيْرُ اسْقِ ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ». فَقَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللَّهِ إِنِّي لأَحْسِبُ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ) الآية. {الحديث: ٦٠٦٥ = ٦٠٦٨ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: زوبەیری باوکم و پیاویکی ئەنصاری لە خزمەتی پێغەمبەردا، لەسەر سەرەی ئاو، کە لە ئاوەڕۆکانی ئەلحەررەوە دەهات، کە باخە خورمایان پێ ئاودەدا، بوو بەهەرایان، پیاوە ئەنصارییەکە بە زوبەیری گوت: ئاوەکە بەردە، بابڕوا بۆ ناو باخەکانی ئێمەیش، زوبەیریش ڕازی نەبوو، بە پێشنیارەکەی ئەو، جا بۆ ناوبژیو دادگایی کردن چوونە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ). حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە زوبەیری فەرمووو: (ئەی زوبەیر! مەزراکەت ئاوبدەو ئەوسا ئاوەکە بەرەڵا بکە بۆ دراوسێی

باخەکەت). کابرای ئەنصاریش تووڕە بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە پوورزای خۆتە، بۆیە بەلای ئەودا دەیبەی!

جا رووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گۆڕاو رەنگی زویری لێ نیشتو فەرمووی: (ئەی زوبەیر! باخەکەت ئاوبدە، هەتا دێراوەکانیان تەواو پڕدەبن و ئاوەکە دەدا لە قەدیان ئەوجا ئاوەکەیش بگرەوە!).

زوبەیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: وادەزانم کە ئەم ئایەتە لەم بارەیەوە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: {فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ}.

واتە: رووداو وانییە، کەوەك ئەوان گومان دەبەن، بەو کەسەی کە وا پەروەردگاری تۆیە، ئەو ناپاکانە باوەڕناهێنن هەتا بە ئارەزووی دڵ، تۆ دەکەن بە حەکەمو بە فەرمانڕەوا، لەو کێشەو بەرنانەدا کە روو دەدەن لەناویانا، وە لەگەڵ ئەوەیشا بەو بڕیارو حوکمە رازی ببن، کەتۆ دەیدەیت بەبێ چەن و چۆن و پێناخۆش بوون). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٣، ژمارە: ١٩٢٤ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٢٤٠) باسی پەیڕەویی پێغەمبەرو فەرمایشتی خودای گەورە: {لا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ}. {٦٠٦٦ - ٦٠٧٨}

**بَابُ: فِي اتباع النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسلَم) وَقَوْلُهُ تَعَالَى: {لا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ}**

١٥٩٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَلَغَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنْ أَصْحَابِهِ شَيْءٌ، فَخَطَبَ فَقَالَ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ فِي الْخَيْرِ وَالشَّرِّ، وَلَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا»، قَالَ: فَمَا أَتَى عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمٌ أَشَدُّ مِنْهُ، قَالَ: غَطَّوْا رُءُوسَهُمْ وَلَهُمْ خَنِينٌ، قَالَ: فَقَامَ عُمَرُ بن الخطاب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَقَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، قَالَ: فَقَامَ ذَاكَ الرَّجُلُ فَقَالَ: مَنْ أَبِي؟ قَالَ: «أَبُوكَ فُلاَنٌ»، فَنَزَلَتْ هذه الآيَة: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ). {الحديث: ٦٠٧٢ = ٦٠٧٥ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤، رقم: ١٦٥٨ = ٤٦٢١، ٩٣، ٥٤٠، ٧٤٩، ٦٣٦٢، ٦٤٦٨، ٦٤٨٦، ٧٠٨٩، ٧٠٩٠، ٧٠٩١، ٧٢٩٤، ٧٢٩٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەتەرەف هاوەڵانیەوە شتێ گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزی لەو جۆرە شتە نەبوو، جا وتارێکی دڵهەژێنی دا، فەرمووی: (ئەمڕۆ لەناو ئەم نوێژەدا کە بەجەماعەت بۆم کردن، بەهەشتو دۆزەخیان هێنایە بەرچاوم، ئەو نازو بەهرەو خێرو خۆشییەی کە ئەمڕۆ لە بەهەشتدا بینیم هەرگیزاو هەرگیز شتی وام نەدیوە، وەکی تریش ئەو ناخۆشیو سزاو ئێشو ئازارەی کە ئەمڕۆ لە دۆزەخدا بینیم قەت قەت شتی وا ناخۆشم نەبینیوە!

دەی ئەوە کەمن دەیزانم، لە هەواڵو باسی سزاو تۆڵەی خودا، ئەگەر ئێوە دەتانزانی، سامو ترسو بیم دایدەگرتنو، کەم پێ دەکەنینو زۆر دەگریان).

فەرمووی: جا ڕۆژی وا سەختو ناخۆش لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی نەداوە، فەرمووی: جا هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی خۆیان داپۆشیو دایان لەپرمەی گریان، فەرمووی: جا عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) هەستاو بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودامان بە پەروەردگاری خۆمان قەبووڵەو ئیسلامامان بە ئایینی خۆمان قەبووڵەو موحەممەدمان بە پێغەمبەر قەبووڵە. پیاوێ هەبوو ناوی عەبدوڵلای کوڕی حوزافە بوو، کە لەگەل یەکێکا دەمی تێ دەگیرا، بەرابەرەکەی تانەی زۆڵی لێ دەداو پێی دەگوت: تۆ کوڕی باوکی خۆت نیت، جا پیاوە بۆ ساخکردنەوەی رشتەی بنەچەی خۆی، عەرزی حەزرەتی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باوکی من کێیە؟ فەرمووی: (تۆ کوڕی باوکی خۆتیو باوکی تۆ حوزافەیە!). جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ – المائدة – ٥/١٠١}:

واتە: ئەی موسوڵمانینە! پرسیاری وا لە پێغەمبەری خۆتان مەکەن کە بەدەردتان نەخواو ئەرکی سەرشانتان گرانتر بکا، بەتایبەتی پرسیاری وا ئەگەر وەڵام بدرێتەوە راستی رووداوەکەتان بۆ دەردەکەوێو زۆر جار وادەبێ بە

پێچەوانەی خواستی ئێوەوە دەبێ، لەکاتی وادا تووشی تەریقیو شەرمەزاریو ناخۆشیو دڵتەنگی دەبن!!). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٣١٩٥ چ/٤ + تاج/٤، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٨٤٢ + تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٧٩ + ریاض/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٤٠١ + ریاض/٢، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٤٤٧}.

١٥٩٩- عَنْ سَعْدِ بْنُ أَبِي وَقَاص (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ أَعْظَمَ الْمُسْلِمِينَ فِي الْمُسْلِمِينَ جُرْمًا مَنْ سَأَلَ عَنْ شَيْءٍ لَمْ يُحَرَّمْ عَلَى الْمُسْلِمِينَ فَحُرِّمَ عَلَيْهِمْ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ». {الحديث: ٦٠٦٩ = ٦٠٧٢ فم. بخاري. إعتصام: ٧٢٨٩}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەناو موسوڵمانانا تاوانبارترین موسوڵمان ئەو کەسەیە، کە لەشتێ بەبێ پێویستی زۆر، بکۆڵێتەوەو پرسیاری زۆری لەبارەوە بکا، شتەکە خۆی هێشتا حەرام نەکرابێ، بەڵام بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە حەرام ببێ، لە موسوڵمانانی تریش). {تاج/٤، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٨٤٥ چ/٤}.

١٦٠٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيْنَ أَبِي؟ قَالَ: «فِي النَّارِ». قَالَ: فَلَمَّا قَفَّى دَعَاهُ فَقَالَ: «إِنَّ أَبِي وَأَبَاكَ فِي النَّارِ». {الحديث: ٤٩٩ = فم}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ عەرزی پێغەمبەری کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم لەسەردەمی نەزانیدا مردووە، لەپێش هاتنی ئایینی پیرۆزیی ئیسلاما، جێگەی کوێیە: بەهەشتییە، یان دۆزەخی؟ فەرمووی: (باوکت دۆزەخییە، وا لەناو ئاگردا). راوی دەفەرموێ: جا کابرا کەپشتی هەڵکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردەوە فەرمووی: (باوکی منو باوکی تۆیش لەبەرئەوەی کە لە ئەهلی فەترەتن دۆزەخینو وان لەئاگری دۆزەخدا). {تاج/٥، زنجیرە: ١١، لاپەڕە: ٣٦٤، ژمارە: ٥١٧٦ = مَا وَرَدَ فِي أَهْلِ الفَتْرَةِ}. لەم شوێنەدا لە تاجول ئوصولدا، روونکردنەوەیەکی جوانم نووسیوە لەبارەی جێگەی دوارۆژی باوکی پێغەمبەرەوە، تکایە بفەرموو بیخوێنەرەوە.

**١٢٤١) وازهێنان لەهەرشتێ کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهیی لێ بکاو خۆ پاراستن لە پێچەوانەی فەرمانی ئەو. (٦٠٦٦ - ٦٠٧٨)**

**بابٌ: في الإنتهاءِ عمَّا نهى عنْهُ النَّبيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وترك الإختلاف عليْه في المسْألة**

١٦٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ، وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَافْعَلُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ، كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ، وَاخْتِلاَفُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ». {الحديث: ٦٠٦٦ = ٦٠٦٩ فم. بخاري. إعتصام: ٧٢٨٨} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: گوێم لە پێغەمبەر بوو دەیفەرموو: (ئەوەی کە گوتم پێتان مەیکەن توخنی مەکەون، وە ئەوەی کە گوتم پێتان بیکەن، چەندەی لە تواناتانا هەیە بیکەن، چونکە نەتەوەکانی پێش ئێوە لەبەرئەوە فەوتان‌و لەناوچوون، چونکە پرسیاری زۆریان لە پێغەمبەرەکانیان دەکردو لەدژیان دەوەستان‌و چەندو چوونیان لەگەڵدا دەکردن). {ریاض/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١٥٦} .

**١٢٤٢) جیاوازی هەواڵ‌و فەرمانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی کاروباری ئایینەوە، لەگەڵ رای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەکاروباری دنیایی. (٦٠٧٩ - ٦٠٨١)**

**بابٌ: فيما أخبرَ به النَّبيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) منْ أمْرِ الدِّين والفرْقُ بيْنهُ وبيْن الرَّأي للدُّنْيا**

١٦٠٢- عَنْ طَلْحَةَ بْنُ عبيدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقَوْمٍ عَلَى رُؤُوسِ النَّخْلِ، فَقَالَ: «مَا يَصْنَعُ هَؤُلاَءِ»؟ فَقَالُوا: يُلَقِّحُونَهُ: يَجْعَلُونَ الذَّكَرَ فِي الأُنْثَى فَيَلْقَحُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا أَظُنُّ يُغْنِي ذَلِكَ شَيْئًا»، قَالَ: فَأُخْبِرُوا بِذَلِكَ فَتَرَكُوهُ، فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِذَلِكَ، فَقَالَ: «إِنْ كَانَ يَنْفَعُهُمْ ذَلِكَ فَلْيَصْنَعُوهُ، فَإِنِّي إِنَّمَا ظَنَنْتُ ظَنًّا، فَلاَ تُؤَاخِذُونِي بِالظَّنِّ، وَلَكِنْ إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنِ اللَّهِ شَيْئًا فَخُذُوا بِهِ، فَإِنِّي لَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ». {الحديث: ٦٠٧٩ = ٦٠٨٢ فم} :

طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: لەخزمەتی پێغەمبەردا، دامان بەلای کۆمەڵێکا، بەسەر دارخورماوە بوون، خەریکبوون موتوربەیان دەکرد،

**پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەمانە چی دەکەن؟) عەرزیان کرد: ئەوە پەیوەندو موتوربەی دەکەن، تۆوی خورما نێرەکە دەتەکێننە ناو بۆڵی خورمای مێیەکە، کەوا لەناو کیفێکا، ئیتر موتوربە دەبێ‌و دەبێ بەخورما!**

**پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (گومان نابەم شتی وا کەڵکی هەبێ!).**

**فەرمووی: جا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **باسکرا بۆ ئەو کۆمەڵە، ئەوانیش وازیان لە موتوربە کردنەکە هێنا، جا هەواڵ درا بە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کە کۆمەڵەکە، بەهۆی فەرمایشتەکەی تۆوە، وازیان لەخورما موتوربەکردنەکە هێناوە، ئەویش فەرمووی: (ئەگەر ئەو موتوربە کردنە سوودی هەیە بۆ بەروبوومی باخەکانیان، وە بە ئەزموون‌و تەجرەبە ئەوە چەسپاوە، باوازی لێ نەهێنن‌و وەك جاران دارە خورماکانیان موتوربە بکەن، ئەوەی کەمن گوتم لەم بارەیەوە بە گومانی خۆم گوتم، نەوەك بە وەحی‌و لەلای خوداوە ئەوەم پێ گوترابێ، واتە: ئەوە رای تایبەتی خۆم بوو، لەکارێکا کە پەیوەندی بە راگەیاندنی ئاینییەوە نییە، کارێکی دنیایی رووتە، دەی ئەو جۆرە گومان‌و رادەربڕینی خۆمە مەکەن بەرەخنە لەسەرم، منیش وەك ئێوە هەر ئادەمیزادم خۆ غەیب زان نیم، بگرە خۆتان لەکاروباری جیهانی خۆتان باشتر دەزانن، بەلام هەرکاتێ شتێکم پێتان گوت، کە بەفەرمانی خودا پێتانم راگەیاند، ئەوە کاری پێ بکەن‌و جێبەجێی بکەن، چونکە من قەت قەت بەدەم خوداوە درۆناکەم‌و قسەی خودا هەمیشە راست دەردەچێ‌و هەڵەی تیانابێ!).** {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٣١٦٩. چاپی چوارەم} + {ژمارە: ٣١٦٨ تاج/٣} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٣١٥٩}.

**روونکردنەوە:**

**گوتارو کردارو ئاکاری پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەبن بەدوو بەشی سەرەکییەوە:**

**١- ئەوەی کە پەیوەندی بەکاروباری ئایینەوە بێ، وەك: نوێژو رۆژوو، وەك کردارەکانی حەج‌و عەمرە، وەك: یاساو دەستوورەکانی حەلال‌و هاوسەری‌و تەلاق‌و**

ظيهار، وەك: فەرمانكردن بەچاكەو ریگرتن لەخراپە، وەك: ئەو هەموو باس‌و بابەتانەی كە لەپەڕاوەكانی شەریعەتدا باسكراون ئەوەی كەلەم بابەتە بیّ، ئەوە لەخوداوەیەو هەمووی راست‌و دروستەو قەبوولی هەڵە ناكات‌و پەیڕەوی كردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) دائەنریّ بە پەیڕەوی فەرمانەكانی خودای گەورە، جا یا واجبە، یا حەرامە، یا مندوبە، یا مكروهە، یا موباحە، هەركامیّ لەمانە بەمەرجی خۆی.

٢- ئەوەی كە كردەوەی تایبەتی پێغەمبەر خۆی بیّ، یا گوتەی ئەوبیّ، كە پەیوەندی بە بابەتی ئایینەوە نەبیّ، یا رای تایبەتی پێغەمبەر خۆی بیّ، وەك ئەم نموونەیەی ئێرە، ئەوە وەك كردارو گوتارو رای خەڵكی تروایە، گەلیّ جار راست‌و دروست دەردەچیّ، جاری وایش هەیە، لەوانەیە كە نەیپێكیّ، وەك زۆر لەو شتانەی كە رۆژانە كردوونی، یا گوتوویانی، لەسەر شێوەی عادەت، نەك لەسەر شێوەی عیبادەت، یا لەسەر شێوەی رێكەوت‌و ئیتیفاق، نەك لەسەر شێوەی مەبەست‌و قەصد.

٣- ئەمەیش چەند نموونەیەكە كە لەبابەتی دووەمی كردارو گوتارو ئاكاری پێغەمبەرن، كە لەشێوەی عادەت‌و رای تایبەتن، نەك لەشێوەی ریساڵەت‌و عیبادەت:

١- فەرموودەی ژمارە: ١١٥٨ كە لەزنجیرە: ٩٢٤دا لەم پوختەی صەحیحی موسلیمەدا رابورد.

٢- فەرموودەی ژمارە (٢٦٦ = ١٣٦٦ مسلم) لەپێشەوە لە زنجیرە (١٦٧)دا رابورد.

٣- فەرموودەی ژمارە: (٢٧٦) + (٣٠٨) + (٣٢٠) + (٣٤٢) + (٣٥٢) + (٣٥٥) +

٤- {تاج/١، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٦٤٠ + ٦٤١ + ٦٤٢ + ٦٤٣ + ٦٤٤} + {تاج/٤، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣٨٨٩} .

٥- تەجریدی بوخاری ژمارە: (١٢٠٩ + ١٢٥٦ + ١٢٧٢ + ١٢٨١ + ١٢٨٣ + ١٣٠٣ + ١٣٤٩ + ١٣٦٠ + ١٣٦٢).

**١٢٤٣) خۆزگە خواستن بۆ بینینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەچاوی سەرو شەیدابوونی ئەوە. (٦٠٨٢)**

**بَابٌ: تَمَنِّى رُؤْيَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَالحِرْصُ عَلَيْهِ**

١٦٠٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ فِي يَدِهِ لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أَحَدِكُمْ يَوْمٌ وَلاَ يَرَانِى، ثُمَّ لأَنْ يَرَانِى أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ مَعَهُمْ». قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ (يعني إبراهيم بن سفيان): الْمَعْنَى فِيهِ عِنْدِى لأَنْ يَرَانِى مَعَهُمْ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ ثم لا يراني، وَهُوَ عِنْدِى مُقَدَّمٌ وَمُؤَخَّرٌ}.
{الحديث: ٦٠٨٢ = ٦٠٨٥ فم. تجريد/٤، نالبخاری، الترجمة الكردية، رقم: ١٤٣١ = ٣٥٨٩}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێندم بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەسە، کەخۆی کەسی هەموو کەسە، دیارە کە خودای گەورەو سەروەرە، ئێوە دەکەونە رۆژێکی واوە لەپاش مەرگی من، حەزدەکەن کە سەرو ماڵی خۆتان بەخت بکەنو لەباتی ئەوە یەك چرکەسات من ببینن، ئیتر ئەگەر لەوەدوایش نەم بینن بەو دەمە کەمەو بەو تاقە چاوپێکەوتنە قاییل دەبنو بەستان دەکا). (مامۆستا ئیبراهیم کوڕی موحەممەد کوڕی سوکفیانی نەیسابووری کە شاگردی ئیمامی موسلیمە، کە صەحیحی موسلیم لە ئیمامی موسلیمەوە گێڕانەوە – ریوایەت – دەکا، کە ناسراوە بە ئەبو ئیسحاق دەفەرموێ: لە رستەکانی ئەم فەرموودەیەدا پێشو پاش هەیە بەلای منەوە، بەم شێوەیە: دەقەکە خۆی ئاوایە: (وَلاَ يَرَانِى لأَنْ يَرَانِى أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ مَعَهُمْ). لەسەر فەرمایشتی ئەبو ئیسحاق ئەم دەقە لەپێشا ئاوا بووە: «وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ فِى يَدِهِ لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أَحَدِكُمْ يَوْمٌ وَلاَ يَرَانِى، ثُمَّ لأَنْ يَرَانِى {مَعَهُمْ} أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ» جا وشەی (مَعَهُمْ) دواخراوەو براوەتە دوا دواوە.

**روونكردنەوە:**

ئـەوەوی (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: مەبەسـت لـەم فەرموودەیـە ئەوەیـە کـە هاوەڵان هانبدا لەسەر ئامادە بوونی کۆڕی زانسـتی پێغەمبـەر، لەماڵەوە، لەسـەفەر، بە مەبەستی فێربوونی یاسانامەو لەبەرکردنی فـەرموودەکانیو راگەیانـدنیان بـە پەیوەندیداران وە ئەوەشینان پێ رابگەیەنێ، ئەگەر لـەم لایەنـەوە درێغـیو کۆتـایی بکەن رۆژێ دەبێ پەشیمان دەبنەوە، وەك ئیمامی عومەر لەم لایەنەوە دەیفـەرموو: (هاموشـۆی بـازاڕو سـەرقاڵیم بـە مامەڵـەوە دووری خسـتمەوە لـە کـۆڕی زانسـتی پێغەمبەر).

**١٢٤٤) کەسانێ ئاوات دەخوازن، کە کەسوکارو ماڵو منداڵیان بکەن بەقوربانی یەك دەم بینینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)**

**بَابٌ: فِيمَنْ يَوَدُّ رُؤْيَةَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِأَهْلِهِ وَمَالِهِ**

١٦٠٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «مِنْ أَشَدِّ أُمَّتِى لِى حُبًّا نَاسٌ يَكُونُونَ بَعْدِى، يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ رَآنِى بِأَهْلِهِ وَمَالِهِ». {الحديث: ٧٠٧٤ = ٧١٠١ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (بەشێکن لەو کەسانەی نەتەوەی ئیسلامی من، کە منیان زۆر خۆش دەوێ، کەسـانێ کـە لـەپاش مـەرگی مـن دێنـە دنیـاوە، ئاواتیانـە کـە بەسـەرو مـاڵو منـاڵ بـبن بـە قوربانی یەك دەم کەمنی تیادا ببینن!).

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٠- نامەی یادی پێغەمبەرانو باسی پایە بەرزییان
## كِتَابُ ذِكْرِ الْأَنْبِيَاءِ وَفَضْلِهِمْ

### ١٢٤٥) باسی سەرەتای دروستكردنی ئادەم (سڵاوی خودای لەسەر بێ). (٦٩٨٥)
### بَابٌ: في ابتداء خلق آدم عَلَيْهِ السَّلَامْ

١٦٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِي فَقَالَ: «خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ التُّرْبَةَ يَوْمَ السَّبْتِ، وَخَلَقَ فِيهَا الْجِبَالَ يَوْمَ الأَحَدِ، وَخَلَقَ الشَّجَرَ يَوْمَ الاثْنَيْنِ، وَخَلَقَ الْمَكْرُوهَ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ، وَخَلَقَ النُّورَ يَوْمَ الأَرْبِعَاءِ، وَبَثَّ فِيهَا الدَّوَابَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ، وَخَلَقَ آدَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ بَعْدَ الْعَصْرِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، فِي آخِرِ الْخَلْقِ وَفِي آخِرِ سَاعَةٍ مِنْ سَاعَاتِ الْجُمُعَةِ، فِيمَا بَيْنَ الْعَصْرِ إِلَى اللَّيْلِ». {الحديث: ٦٩٨٥ = ٧٠٠٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرتمو فەرمووی: (خودای گەورەو مەزن لەرۆژی شەممەدا زەوی دروستكردو، لەرۆژی یەك شەممەدا چیاكانی لەزەویدا دروسمت كردو، لەرۆژی دووشەممەدا دارو درەختی دروست كردو لەرۆژی سێ شەممەدا بەدیو خراپەو ناخۆشی دروست كردو، لەرۆژی چوار شەممەدا نوورو رووناكی دروسمت كردو، لەرۆژی پێنج شەممەدا زیندەوەرانی دروست كردو پەخشو بڵاوی كردنەوە، بەناو زەویدا، وە لەدوا دوایی دروستكراوانا ئادەمی دروست كرد، لەپاش عەصری رۆژی هەینی، لەدوا كاژێریدا، لە كاژێرەكانی رۆژی هەینی). {تاج/٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٦٩٠ چ/٤}.

### ١٢٤٦) باسی گەورەیی ئیبراهیمی خەلیل (سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ). (٦٠٩٠ - ٦٠٩٧)
### بَابٌ: فِي فَضْلِ إِبْرَاهِيمَ الْخَلِيلِ عَلَيْهِ السَّلاَمُ

١٦٠٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: يَا خَيْرَ الْبَرِيَّةِ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «ذَاكَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ». {الحديث: ٦٠٩٠ = ٦٠٩٤ فم}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پیـاوێ هاتـە خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی كرد: ئـەی چاكترین دروستكراوەكان! پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە ئیبراهیمە كە چاكترینی هەموو دروستكراوانە).

## ١٢٤٧) خۆ سوننەتكردنی ئیبراهیم. (٦٠٩٠ - ٦٠٩٧)

## بَابٌ: إِخْتِتَانِ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَامُ

١٦٠٧- عَنْ أَبِى هُرَيْـرَةَ (رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـه (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ): «اخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ النَّبِيُّ عَلَيْهِ السَّـلَامُ وَهُـوَ ابْـنُ ثَمَـانِينَ سَـنَةً بِالْقَـدُومِ». {الحديث: ٦٠٩٣ = ٦٠٩٧ فم. بخاری (تجريد البخـاری = مختصـر صـحيح البخـاری. المجلّـد الرّابـع، رقم: ١٣٤٨ = ٣٣٥٦، ٦٢٩٨ فتح الباری. لاپەڕە: ٢٥، چاپی: ١٠١٠ز)}:

ئەبو هـورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (حەزرەتی ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەر بێ) بەفەرمانی خودا، لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا، لـە گوندی قەددوم كەوا لەشام، بە تەشوێ خۆی بەدەستی خۆی سـوننەتكرد). {تـاج/٣، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٣٢٠٣ چ/٤}.

## ١٢٤٨) باسی فەرمایشتی ئیبراهیم (سڵاوی خودای لەسەر بێ): (رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْيِى الْمَوْتَى) وە باسی لووتو یووسف (دروودی خودایان لەسەر بێ). (٦٠٩٠ - ٦٠٩٧)

## بَابٌ: قَوْلِ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَامُ: (رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْيِى الْمَوْتَى) وَذِكر لُوطِ وَ يُوسُفَ عَلَيْهِمَا السَّلَامُ

١٦٠٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَـالَ: «نَحْنُ أَحَقُّ بِالشَّكِّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ، إِذْ قَالَ: (رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْيِى الْمَوْتَى، قَالَ: أَوَلَمْ تُـؤْمِنْ، قَالَ: بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِى)، قَالَ: «وَيَرْحَمُ اللَّهُ لُوطًا، لَقَدْ كَانَ يَأْوِى إِلَى رُكْـنٍ شَـدِيدٍ، وَلَوْ لَبِثْتُ فِـى السِّجْنِ طُـولَ لَبْـثِ يُوسُـفَ لأَجَبْـتُ الـدَّاعِىَ». {الحديث: ٦٠٩٤ = ٦٠٩٨ فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ٤٠ چاپی/١٠١٠ز، رقم: ١٣٥٥ = ٣٣٧٢، ٣٣٧٥، ٣٣٨٧، ٤٥٣٧، ٤٦٩٤، ٦٩٩٢}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گریمـان مـن لەفـەرزی مەحاڵـدا، گومـانم لەزینـدوو بوونـەوەدا هـەبێ، حـەزرەتی

ئیبراهیم شتی وای نەبووەو گومانی وای بەدڵدا نەهاتووە، بەڵام ئەم گفتوگۆی ئیبراهیمە، کە لەم ئایەتەدا خودا باسی فەرمووە بۆمان، تەنیا بۆ ئەوە بووە کە بەهۆی دیتن بەچاوی سەرەوە، تەواو دڵ ئەستوورو دڵنیابێ، وەکوو چۆن ئێمە بە بیستن بۆمان دەرکەوتووە، کە دەریای گەورە گەورە هەیە، بەڵام کاتێ بەچاوی سەر ئەو دەریایانە دەبینین، هەرچەند زانستو عیلمە کۆنەکەمان، کە لە ڕێگەی ژنەوتنەوە بووە، هیچ پتر نابێ، بەڵام پتەوترو دامەزراو تر دەبێ، تەنانەت ئەگەر یەکێ لەوەدوا بڵێ دەریا هەبوونی نییە، ئێمە بڕوای پێ ناکەین.

ئایەتی گوفتوگۆکە ئەمەیە: {رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ: أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ: بَلَى وَلَكِن لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي – البقرة – ٢/٢٦٠}:

واتە: ئیبراهیم فەرمووی: پەروەردگاری من! ئەی خاوەنی هەردوو جیهان! نیشانم بدە ئەم خەڵکە کە دەمرنو ساڵەهای ساڵ دەبنەوە بە خاکو ئەندامەکانی لەشیان دەڕزێنو دەبن بەخۆڵو خاشاكو بای ڕۆژگار، بە ئارەزووی خۆی، شەنو کەویان دەکاو، پەخشو پرشیان دەکا لە وولاتا، چۆن چۆنی تۆ لەقیامەتا زیندوویان دەکەیتەوەو، بەچی شێوەیێ ئەو پارچە پەرتو پرژو بڵاوانە یەك دەخەیتەوە؟!

خودا لە وەڵامی ئەم پرسیارەی ئیبراهیمدا فەرمووی: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ هێشتا باوەڕت نەهێناوە بەوە کەمن دەتوانم مردوو زیندوو بکەمەوە؟ عەرزی کرد: با، بەخودا زۆر باش ئەوە دەزانمو باوەڕم بەوە هەیە، بەڵام دەمەوێ کە دڵم ئاو بخواتەوەو وەها دابمەزرێ، کە ئیتر دڵە ڕاوکێو ڕێگەی سووسەی سووسەبای وەسواسو ڕاڕاییو دوو دڵی نەفسو دەروون، لەدڵو ناخی مندا نەمێنێو، ئەوەی کە بەدڵ باوەڕم پێی کردووە، بەچاوی سەریش ببینم!!

خودای مەزن بۆ خۆی دەیزانی کە ئیبراهیم ئەمە دەزانی، وەلێ بۆیە ئەم پرسیارەی لێ کرد، تا بیسەران وەڵامەکەی ئیبراهیم ببیستن!). {تاج/٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٧٤٥ ج/٤}.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: ڕەحمەتی خودا لە پێغەمبەر لووط بێ، لەسەر چی بیرو باوەڕێ فەرموویەتی: {لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ}. واتە: حەزرەتی لووط پێغەمبەر، کاتێ هۆزەکەی پەلاماری میوانەکانیان داو، ویستیان دەستدرێژی لە نامووسیان بکەنو، هەوڵی لەگەڵیاندا دا، کە وازبێننو دەست لەدەستدرێژی نامووسی لەگەڵ میوانەکانی هەڵبگرنو روو زەردی بەسەر خۆیو میوانەکانی نەهێننو هەوڵەکەی سوودی نەبوو، پاش ئەمە فەرمووی: کاشکی یاخۆم هێزێکم ببوایە، هەتا چارەی ئەم بێ شەرمیو نامەردیو دەستدرێژییەی ئێوەم پێ بکردایە، یاخۆم هێزێکی ئاوەهام ببوایە، یاخود لەپەنای زاتێکی تەواناو بەهێزدا بوومایە، تا ئەو چارەسەری ئەم بێ شەرمییەی ئێوەی بکردایە!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لووط چۆن وا دەفەرموێ، خۆ ئەو، واتە: حەزرەتی لووط، لەڕاستیدا لەپەنای زاتێکی تەواناو بەهێزدا بوو، کە خودای تەوانایە، ئیتر چۆن وا دەفەرموێ). حەزرەت فەرمووی: (لەلایەکی تریشەوە ئافەریم بۆ حەزرەتی یووسف، بۆ خۆیو بۆ ئارامو بۆ سەبریو بۆ خۆگرتنی، بەڕاستی مەردو بەسەبرو ئازاو بە پشوو بوو، ئەوە بوو پاش ئەو هەمکە حەپسو زیندانییە، کاتێ پاشا ناردی بەشوێنیدا، کە بچێ بۆلای، ئەو نەچوو، وە ویستی لەپێشدا بیسەلمێنێ کە ئەو بەناڕەوا بەندکراوە، بۆیە بە فروستادەکەی پاشای فەرموو، بڕۆ عەرزی پاشا بکە، فەرمان بدا، ئەو ژنانە کەدەستی خۆیان لەتو پەت کرد، لەگەڵ ژنی وەزیردا، لەکاتی دەعوەتەکەدا، کۆیان بکاتەوەو لێیان بپرسێ، حاڵی ئەوان چۆن بووەو حاڵی منیش چۆن بووە؟ تا پاكو پیس دەربکەوێ بۆ هەموو لایێ، ئەوسا من دێم بۆلای پاشا، وەڵێ ئەگەر من لەجێگەی یووسف بوومایەو ئەوەندەی ئەو، وازۆر لە بەندیخانەدا بمایەتەوە، هەر کەدەهاتن بەدوامدا، گورج بەبێ چەندو چوون دەچووم لەگەڵیان بۆ لای پاشا). {تاج/٤، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٣٩٢٣ ج/٤}.

**١٢٤٩) فەرمایشتی ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەر بێ): (إِنِّي سَقِيمٌ)، وە (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا) هەروەها فەرمایشتەکەی ئیبراهیم سەبارەت بە سارای ژنی (ئەمە خوشکمە). (٦٠٩٠ - ٦٠٩٧)**

**بَابٌ: فِي قَوْلِ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ: (إِنِّي سَقِيمٌ)، وَ(بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا) وفي سارة (هي أختي)**

١٦٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ النَّبِيُّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ قَطُّ، إِلاَّ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ، ثِنْتَيْنِ فِي ذَاتِ اللَّهِ: قَوْلُهُ (إِنِّي سَقِيمٌ)، وَقَوْلُهُ: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا)، وَوَاحِدَةً فِي شَأْنِ سَارَةَ، فَإِنَّهُ قَدِمَ أَرْضَ جَبَّارٍ، وَمَعَهُ سَارَةُ وَكَانَتْ أَحْسَنَ النَّاسِ، فَقَالَ لَهَا: إِنَّ هَذَا الْجَبَّارَ إِنْ يَعْلَمْ أَنَّكِ امْرَأَتِي يَغْلِبْنِي عَلَيْكِ، فَإِنْ سَأَلَكِ فَأَخْبِرِيهِ أَنَّكِ أُخْتِي، فَإِنَّكِ أُخْتِي فِي الإِسْلاَمِ، فَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ فِي الأَرْضِ مُسْلِمًا غَيْرِي وَغَيْرَكِ، فَلَمَّا دَخَلَ أَرْضَهُ رَآهَا بَعْضُ أَهْلِ الْجَبَّارِ، أَتَاهُ فَقَالَ: لَهُ لَقَدْ قَدِمَ أَرْضَكَ امْرَأَةٌ لاَ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تَكُونَ إِلاَّ لَكَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَأُتِيَ بِهَا، فَقَامَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ إِلَى الصَّلاَةِ، فَلَمَّا دَخَلَتْ عَلَيْهِ لَمْ يَتَمَالَكْ أَنْ بَسَطَ يَدَهُ إِلَيْهَا، فَقُبِضَتْ يَدُهُ قَبْضَةً شَدِيدَةً فَقَالَ لَهَا: ادْعِي اللَّهَ أَنْ يُطْلِقَ يَدِي، وَلاَ أَضُرُّكِ، فَفَعَلَتْ، فَعَادَ، فَقُبِضَتْ أَشَدَّ مِنَ الْقَبْضَةِ الأُولَى، فَقَالَ لَهَا مِثْلَ ذَلِكَ، فَفَعَلَتْ، فَعَادَ، فَقُبِضَتْ أَشَدَّ مِنَ الْقَبْضَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، فَقَالَ: ادْعِي اللَّهَ أَنْ يُطْلِقَ يَدِي، فَلَكِ اللَّهَ أَنْ لاَ أَضُرَّكِ، فَفَعَلَتْ، وَأُطْلِقَتْ يَدُهُ، وَدَعَا الَّذِي جَاءَ بِهَا فَقَالَ لَهُ: إِنَّكَ إِنَّمَا أَتَيْتَنِي بِشَيْطَانٍ، وَلَمْ تَأْتِنِي بِإِنْسَانٍ، فَأَخْرِجْهَا مِنْ أَرْضِي وَأَعْطِهَا هَاجَرَ، قَالَ: فَأَقْبَلَتْ تَمْشِي، فَلَمَّا رَآهَا إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ انْصَرَفَ فَقَالَ لَهَا: مَهْيَمْ؟ قَالَتْ: خَيْرًا، كَفَّ اللَّهُ يَدَ الْفَاجِرِ، وَأَخْدَمَ خَادِمًا). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَتِلْكَ أُمُّكُمْ يَا بَنِي مَاءِ السَّمَاءِ). {الحديث: ٦٠٩٧ = ٦١٠١ فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ٢٦، رقم: ١٣٤٩ = ٩٩٢، تجريد/٣ = ٢٢١٧ فتح الباري. ساڵی چاپ: ١٠١٠ز}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیبراهیم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەرگیز درۆی نەکردووە، تەنیا سێ درۆ نەبێت، ئەو سێ درۆیەیش دوانیان ساخ لەبەر ڕەزای خودا بووە: یەکێ لەو دووە ئەوە بووە کە فەرموویەتی: (إِنِّي سَقِيمٌ): من نەخۆش و دەردەدارم. کە مەبەستی حەزرەتی ئیبراهیم لەم قسەیە ئەوە بووە کە لەگەڵ هۆزەکەی دەرنەچێ بۆ کارێکی

ناشايسته، ئەوەكەی تریشیان ئەوە بووە كە فەرموویەتی: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا).
واتە: كاتێ هۆزەكەی گەڕانەوە بۆ بوتخانەكەو روانیان هەموو بتەكانیان شكاوە، تەنیا گەورەكەیان نەبێ، ئیبراهیمیان گومانبار كرد كە ئەم كارەی كردبێ، ئەویش فەرمووی: ئەم بتانە من نەم شكاندوون، بەڵكوو گەورەكەیان ئەوەی كردووە، درۆكەی تریشیان لەبارەی خاتوو سارەی خێزانیەوە بووە، جارێ ئیبراهیم سارەی پێ دەبێ دەگاتە پادشایەكی زۆرداری ملهوڕ، سارە بۆ جوانی لەوێنەی نابێ، لەبەرئەوە پێی فەرموو: ئەگەر ئەم زۆردارە زەبردارە ملهوڕە پێ بزانێ كە تۆ ژنی منی، زەوتت دەكا لێم، خۆشم دەكوژێ تا نەڵێن: ئەم پادشایە ئەوەندە خوا نەناس‌و بێ رەزاو بێ ویژدان‌و بێ رەوشتە ژن بەمارەو تەڵاقەوە زەوت دەكا، جا ئەگەر پرسیاری لێ كردی مەڵێ مێردمە، پێی بڵێ: كە تۆ خوشكی منی، لەڕاستیدا تۆ بەپێی ئایینی ئیسلامەتی، تۆ خوشكی ئایینیی منیت‌و موسوڵمان براو خوشكی یەكترین، لەم سەر زەمینەشدا جگە لەخۆم‌و لەخۆت موسوڵمانێكی تر گومان نابەم، كاتێ ئیبراهیم دەڕواتە ناو وڵاتی زۆردارەكەوە، هەندێ لە دەستوپای پادشا ملهووڕەكە چاویان بەسارە دەكەوێ، جا دەچێ بۆلای‌و پێی دەڵێ: ئافرەتێ هاتۆتە قەڵەمڕەوی تۆوە هەر قابیل بەخۆتە! پادشاش دەنێرێ بەشوێن سارەداو دەیبەن بۆی، ئیبراهیم هەڵ دەستێ‌و دەچێ بەلای نوێژەوە، بە ئومێدی ئەوە كە خودا نامووسی بپارێزێ لەدەمی گلاوی ئەو سەگە هارەو خودا بەتوانایی خۆی وەك سەگ سنكی بكات. جاهەر كە سارە دەچێتە ژوورەوەو دەیبەن بۆ زۆردارەكە، زۆردارەكە خۆی پێ راناگیرێ‌و دەستی بۆ دەبا، بەڵام لەلایەنی خوداوە توند دەستی رەق دەبێ! جا پادشا بەسارە دەڵێ: لەخودا داوابكە كە دەستم چاك بكاتەوە وازت لێ دەهێنم‌و زیانم بۆت نابێ، ئەویش دەپاڕێتەوەو دەستی چاك دەبێتەوە، كەچی دیسانەوە كابرای زۆردار دەستی بۆ دەباتەوە، وەلێ ئەمجارە دەستی لەجاری یەكەم زیاتر رەق دەبێ، دووبارە داوای لێ دەكاتەوە كە هەمدیسانەوە بۆی بپاڕێتەوە، ئەویش دیسان بۆی دەپاڕێتەوە، كەچی هەمدیسانەوە دەستی بۆ دەباتەوە كە دەستدرێژیی

نامووسی لێ بکا، ئەمجارە دەستی لەهەردوو جارەکەی پێشوو زیاتر وشك دەبێ، ئەنجا پێی دەڵێ: لەخودا بپاڕێرەوە کە دەستم چاك بکاتەوە، سوێندت بۆ دەخۆم بە خودای گەورە، کەئیتر زیانم نابێ بۆت، ساراش (سلاَوی خودا لەخۆی و لەمێردیو لەنەوەی پیرۆزی خۆی و مێردی) وادەکاو دەستی پادشا چاك دەبێتەوە، جا ئەوجا پادشا ئەو کابرایە بانگ دەکا کەخاتوو سارەی هێنابوو بۆی، وەپێی دەڵێ: تۆ شەیتانت بۆمن هێناوە، نەوەکوو ئادەمیزاد، خەریك بوو دەستم لێ بوەشێنێ، ئەم ژنە لە وڵاتی من دەربکەو بیکەرە دەرەوەی قەڵەمڕەوی وڵاتی منو هاجەرەشی پێ بدە کە خزمەتی بکا).

فەرمووی: (ئینجا سارە پاش ئەوە خودا نامووسی پاراست، بەپێ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ئیبراهیم کەچاوی پیی کەوت نوێژەکەی تەواوکردو پێی فەرموو: چی بوو؟ سارە خاتوون فەرمووی: سوپاس بۆ خودا، باش بوو، بەدڵی خۆمان بوو) خودا لەباڵی ئەو بەدکارەی داو ڕێگەی دەستی نەداو ئەم کارەکەرەیشی رەخساند بۆمان، کەناوی هاجەرەیە).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەی ئەی گەلی عەرەب! کە لەسەر ئاوی باران دەژینو لەم ڕوانگەوە ناسراون بە (بەنی ماء السَّماء = نەوەی ئاوی ئاسمان) ئەم ژنە واتە: خاتوو هاجەرە، دایکە گەورەی ئێوەیە، چونکە دایکی حەزرەتی ئیسماعیل پێغەمبەرە، کە بابا گەورەی پێغەمبەرەو ئێوەیش لەنەوەی ئەون! {تاج/٣، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٣٢٠٤ ج/٤ + تاج/٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٧٠١ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١ - ئەم فەرموودەیە ڕوونکردنەوەیەکی چاکی دەوێ، لەپێشا بڕوانە ئەم سەرچاوانە، بۆ حاڵیبوونی تەواو لە کوڕۆك و ناوەڕۆكو مەبەست لەم فەرموودەیە. عەینی/١١، ص٣٠ + فتح الباری، ژمارە: ٢٦٣٥، ٣٣٥٧، ٣٣٥٨، ٥٠٨٤، ٦٩٥٠.

٢ - هاجەر، یا ئاجەر، ناوێکی سەریانییە، دەڵێن: باوکی یەکێ بووە لە پادشایانی قیبط، خەڵکی گوندی حەفنە لە میصر، لە صەعیدی میصر، کە ئێستا شوێنەواری لێ ماوە.

٣ - لە گێڕانەوەکانی ئەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێ: کە دەسنوێژو نوێژو دووعاو نزا، لەناو نەتەوە موسوڵمانەکانی تری پێش ئێمەدا بوون.

٤ - نوێژو نزاو پاڕانەوەو دەستنوێژو یادی خوداو پشت بەستن بەخوداو هەنا بردن بۆ خوداو خودا کردن بەشایەت لەسەر کردەوەی چاك، ئەم جۆرە شتانە هەمیشەو هەموو کاتێك باشترین چەکی دەستی مرۆی موسوڵمانن، بەتایبەتی لەکاتی لێقەومانو کەساسیو داماویو بێ دەرەتانیدا.

٥ - فێڵە شەرعانەو حیلە شەرعو درۆو سوێنی درۆ تەورییەو شوێنە ونێ، لەکاتی وادا دروستە، تەنانەت تەڵاق خواردنو ظیهار کردنیش، لەکاتی وادا دروستەو نە تەڵاقەکە دەکەوێو نە ظیهارەکە دادەمەزرێ، بەمەرجێ بۆ بەرژەوەندییەکی رەوای وابێ کە شایستەی کردن یان گوتنی ئەم شتانە بێ، کردنو گوتنی ئەم جۆرە شتانە لە حوکمو بڕیاری ئیکراهدان، بەمەرجێ کردنو گوتیان بۆ پاراستنو رزگارکردنی سەرو ناموسو سامانی بێ، کە شایستەی ئەوەبێ، بەڵکوو هەندێ جار سوننەتن بگرە جاری وادەبێ پێویستن واتە: واجبن. بەڵام دەبێ هەموومان ئەوە بزانین، کە رەوابوونی ئەم جۆرە شتانە، بەهیچ شێوەیێ پەیوەندی نییە، بە تەقیەوە کە شیعە دەیکەنو دایدەنێن بەنیوەی ئایین.

٦ - وشەی (ئیبراهیم) لەسەر فەرمایشتی عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) ناوێکی سەریانییە، واتە: (إبراهیم = أبٌ رحیم = باوکی دڵسۆز = باوکی میهرەبان).

٧ - زۆرجار خودای گەورە پیاو چاکانو ئافرەتە باشەکان تاقی دەکاتەوەو تووشی دەردو بەڵاو کێشەو بەرەو تەنگو چەڵەمەو سەختڵەتی دەروونیو جەستەییو سامانیو منداڵو کەسوکارییان دەکا، تا بزانێ پلەی صەبرو ئارامو خۆگرییان

چەندەو چۆنە، مەبەست لەو ئەزموون‌و تاقیکردنانەوەیە رەفعی دەرەجات‌و پایە بەرزییانە، هەروەك مەبەست ئەوەیشە كە ببن بەسەر مەشق‌و پێشەوا، لەخۆشی‌و ناخۆشیداو لە تەنگانەو فەرحانەدا، بۆ موسوڵمانان، بەشێوەی گشتی كە لەكاتی وادا بڵێن: خۆ من لە حەزرەتی ئیبراهیم زیاتر نیم.

**١٢٥٠) باسی پێغەمبەر مووسا (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمایشتی خودای گەورە: (فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهًا). {٦٠٩٨ - ٦١١٠}**

**بَابٌ: فِي ذِكْرِ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَقَوْلِهِ تَعَالَى: (فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهًا)**

١٦١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ رَجُلاً حَيِيًّا، قَالَ: فَكَانَ لاَ يُرَى مُتَجَرِّدًا، قَالَ: فَقَالَ بَنُو إِسْرَائِيلَ: إِنَّهُ آدَرُ، قَالَ: فَاغْتَسَلَ عِنْدَ مُوَيْهٍ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ، فَانْطَلَقَ الْحَجَرُ يَسْعَى، وَاتَّبَعَهُ بِعَصَاهُ يَضْرِبُهُ: ثَوْبِي حَجَرُ، ثَوْبِي حَجَرُ! حَتَّى وَقَفَ عَلَى مَلإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، وَنَزَلَتْ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهًا). {الحديث: ٦٠٩٩ = ٦١٠٣ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٢١٥، چاپی/١٠١٠ز، رقم: ١٩٢ = ٢٧٨، ٣٤٠٤، ٤٧٩٩}:

ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولدا ئاوایە دەیكەین بە راڤەو شەرح بۆ ئەم گێڕانەوەی ئێرە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مووسا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) پیاوێكی زۆر بە شەرم‌و شكۆ بوو، هەمیشە خۆی باش دادەپۆشی، بە رەنگێكی وا پێستی لەشی هیچ نەدەبینرا، جا هەندێ كەس لەنەوەی ئیسرائیل، بەم جۆرە قسانە، ئازاری دڵی مووسایان دەداو دەیانگوت: مووسا بۆیە بەم شێوەیە خۆی دادەپۆشێ دیارە نەنگێ بە لەشیەوە هەیە، سایا بەڵەكە، یا دەبەو قوڕە، یا دەردێكی تری هەر هەیە. جا خودای گەورەو سەروەر ویستی ئەم قسەو باسەی ئەوانە بەدرۆ بخاتەوەو پاكی‌و بێ نەنگی مووسا دەربخات، جا بۆیە رۆژێ مووسا (درووودی خودای لەسەر بێ) بەتەنیا خۆی لەوان كلا كردو رۆیشت بۆ چۆڵییەك

خۆی بشۆرێو جلەکانی خۆیی لەبەر داکەندو لەسەر بەردێ داینان، جا کاتێ کەخۆی شۆردو لێبۆوە چوو بۆلای جلەکانی هەتاکوو لەبەریان بکاتەوە، بەلاّم بە فەرمانی خودای گەورە بەردەکە جلەکەی مووسای فڕاند!!

مووسایش داردەستەکەی خۆی هەلگرتو بەڕاکردن نیشتەسەر بەردەکەو رایکرد بەشوێنیاو بانگی دەکرد: بەردەکە! جلەکانم دانێ! بەردەکە! جلەکانم دانێ!! بەردەکەیش رۆیشت، مووسایش لەشوێنی رۆیشت، هەتا گەیشت بەکۆمەلێ لەنەوەی ئیسرائیلو هەموو تەماشای لەشی مووسایان کرد، بەرووتو قووتیو بەچاوی خۆیان دییان کە لەشو لار لەوە جوانترو پاکترو بێ نەنگ تر نابێو زۆر دوورە لەو درۆیانەی کە ئەوان دەیانلێن!!

جا ئەوجا بەردەکە رەق راوەستاو مووسایش جلەکانی هەلگرتەوەو دەستی کرد بەلێدانی بەردەکەو بەگۆچانەکەی چەن کوتەکێکی باشی لێدا!!

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سوێندم بە خودای گەورە، مووسا وا بەتوندیو بەزەبرو بەهێزو نهێم، بەدار دەستەکەی بەردەکەی داپلۆسی بوو، سێ یاچوار، یا پێنج خالێ لێکرد بوو، وەك جێگە برین، ئەمە ئەو داستانەیە کە خودای گەورە بەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکاو دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهًا – الأحزاب – ٣٣/٦٩}:

واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هەیە بەخوداو بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام! ئێوە وەکوو ئەوانە مەبن کە ئازاری دلّی مووسایان دەدا، بەم جۆرە قسەو قسەلۆکانەی کە لە فەرموودەکەدا باس کران، تا خودای گەورە پاکیو بێ نەنگی مووسای دەرخستو قسە ناهەقەکانی ئەوانی بەدرۆ خستەوە، لەڕاستیدا مووسا لەلای خودای گەورە، گەلێ خاوەنی خاترو پایەو رێزدارو بەڕێز بوو!). {تاج/٤، لاپەڕە: ٤٢٩، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٠٥٤ ئایەتی: (٦٩) لەسوورەتی ئەحزاب، کە ژمارەکەی لەناو سوورەتەکانی قورئاندا (٣٣)یە}.

لەبـــەر خـــاتری ســـوورەتی ئـــەحزاب
خـــودا لامانـــدا لەشـــەڕی ئـــەحزاب

## ١٢٥١) داستانی حەزرەتی مووسا لەگەڵ حەزرەتی خدری زیندە (سڵاوی خودایان لێ بێ). (٦١١٣ - ٦١١٨)

## بابٌ: في قصة موسى مع الخضر عليهما السلام

١٦١١- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ نَوْفًا الْبِكَالِىَّ يَزْعُمُ أَنَّ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ صَاحِبَ بَنِى إِسْرَائِيلَ، لَيْسَ هُوَ مُوسَى صَاحِبَ الْخَضِرِ! فَقَالَ: كَذَبَ عَدُوُّ اللَّهِ، سَمِعْتُ أُبَىَّ بْنَ كَعْبٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «قَامَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ خَطِيبًا فِى بَنِى إِسْرَائِيلَ، فَسُئِلَ: أَىُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا أَعْلَمُ، قَالَ: فَعَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: أَنَّ عَبْدًا مِنْ عِبَادِى بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ، قَالَ مُوسَى: أَىْ رَبِّ كَيْفَ لِى بِهِ؟ فَقِيلَ لَهُ: احْمِلْ حُوتًا فِى مِكْتَلٍ فَحَيْثُ تَفْقِدُ الْحُوتَ فَهُوَ ثَمَّ، فَانْطَلَقَ، وَانْطَلَقَ مَعَهُ فَتَاهُ، وَهُوَ يُوشَعُ بْنُ نُونٍ، فَحَمَلَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ حُوتًا فِى مِكْتَلٍ، وَانْطَلَقَ هُوَ وَفَتَاهُ يَمْشِيَانِ حَتَّى أَتَيَا الصَّخْرَةَ، فَرَقَدَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ وَفَتَاهُ، فَاضْطَرَبَ الْحُوتُ فِى الْمِكْتَلِ حَتَّى خَرَجَ مِنَ الْمِكْتَلِ فَسَقَطَ فِى الْبَحْرِ، قَالَ: وَأَمْسَكَ اللَّهُ عَنْهُ جِرْيَةَ الْمَاءِ، حَتَّى كَانَ مِثْلَ الطَّاقِ فَكَانَ لِلْحُوتِ سَرَبًا، وَكَانَ لِمُوسَى وَفَتَاهُ عَجَبًا، فَانْطَلَقَا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمَا وَلَيْلَتِهِمَا وَنَسِىَ صَاحِبُ مُوسَى أَنْ يُخْبِرَهُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ قَالَ لِفَتَاهُ: (آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا). قَالَ: وَلَمْ يَنْصَبْ حَتَّى جَاوَزَ الْمَكَانَ الَّذِى أُمِرَ بِهِ، قَالَ: (أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِى الْبَحْرِ عَجَبًا). قَالَ مُوسَى: (ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِى فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا). قَالَ: يَقُصَّانِ آثَارَهُمَا، حَتَّى أَتَيَا الصَّخْرَةَ فَرَأَى رَجُلاً مُسَجًّى عَلَيْهِ بِثَوْبٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ مُوسَى، فَقَالَ لَهُ الْخَضِرُ: أَنَّى بِأَرْضِكَ السَّلاَمُ؟ قَالَ: أَنَا مُوسَى، قَالَ: مُوسَى بَنِى إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: إِنَّكَ عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ عَلَّمَكَهُ اللَّهُ لاَ أَعْلَمُهُ، وَأَنَا عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ عَلَّمَنِيهِ لاَ تَعْلَمُهُ، قَالَ لَهُ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ: (هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِى مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا، قَالَ: إِنَّكَ لَنْ

تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا، وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا. قَالَ: سَتَجِدُنِى إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلاَ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا). قَالَ لَهُ الْخَضِرُ: (فَإِنِ اتَّبَعْتَنِى فَلاَ تَسْأَلْنِى عَنْ شَىْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَانْطَلَقَ الْخَضِرُ وَمُوسَى يَمْشِيَانِ عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ، فَمَرَّتْ بِهِمَا سَفِينَةٌ فَكَلَّمَاهُمْ أَنْ يَحْمِلُوهُمَا، فَعَرَفُوا الْخَضِرَ فَحَمَلُوهُمَا بِغَيْرِ نَوْلٍ، فَعَمَدَ الْخَضِرُ إِلَى لَوْحٍ مِنْ أَلْوَاحِ السَّفِينَةِ فَنَزَعَهُ، فَقَالَ لَهُ مُوسَى: قَوْمٌ حَمَلُونَا بِغَيْرِ نَوْلٍ عَمَدْتَ إِلَى سَفِينَتِهِمْ فَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا، (قَالَ: أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا، قَالَ: لاَ تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ وَلاَ تُرْهِقْنِى مِنْ أَمْرِى عُسْرًا). ثُمَّ خَرَجَا مِنَ السَّفِينَةِ فَبَيْنَمَا هُمَا يَمْشِيَانِ عَلَى السَّاحِلِ إِذَا غُلاَمٌ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ، فَأَخَذَ الْخَضِرُ بِرَأْسِهِ فَاقْتَلَعَهُ بِيَدِهِ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ مُوسَى: (أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَاكِيَةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا). قَالَ: (أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا). قَالَ: - وَهَذِهِ أَشَدُّ مِنَ الأُولَى — (قَالَ: إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَىْءٍ بَعْدَهَا فَلاَ تُصَاحِبْنِى قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّى عُذْرًا. فَانْطَلَقَا، حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا، فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ). يَقُولُ: مَائِلٌ، قَالَ: الْخَضِرُ بِيَدِهِ هَكَذَا فَأَقَامَهُ. قَالَ لَهُ مُوسَى: قَوْمٌ أَتَيْنَاهُمْ فَلَمْ يُضَيِّفُونَا وَلَمْ يُطْعِمُونَا وَ (لَوْ شِئْتَ لَتَخِذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا. قَالَ: هَذَا فِرَاقُ بَيْنِى وَبَيْنِكَ، سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَرْحَمُ اللَّهُ مُوسَى لَوَدِدْتُ أَنَّهُ كَانَ صَبَرَ حَتَّى يُقَصَّ عَلَيْنَا مِنْ أَخْبَارِهِمَا». وَقَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «كَانَتِ الأُولَى مِنْ مُوسَى نِسْيَانًا». قَالَ: «وَجَاءَ عُصْفُورٌ حَتَّى وَقَعَ عَلَى حَرْفِ السَّفِينَةِ ثُمَّ نَقَرَ فِى الْبَحْرِ. فَقَالَ لَهُ الْخَضِرُ: مَا نَقَصَ عِلْمِى وَعِلْمُكَ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ مِثْلَ مَا نَقَصَ هَذَا الْعُصْفُورُ مِنَ الْبَحْرِ». قَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ: وَكَانَ ابن عباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) يَقْرَأُ: (وَكَانَ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ صَالِحَةٍ غَصْبًا). وَكَانَ يَقْرَأُ: (وَأَمَّا الْغُلاَمُ فَكَانَ كَافِرًا). {الحديث: ٦١١٣ = ٦١١٩ فم. تجريد البخارى/١، چاپى/١٠١٠ز، رقم: ١٠١ = ١٢٢، ٧٨، ٢٢٦٧، ٢٧٢٨، ٣٢٧٨، ٣٤٠٠، ٣٤٠١، ٤٧٢٥، ٤٧٢٦، ٤٧٢٧، ٦٦٧٢، ٧٤٧٨ز ترمذى. تفسير القرآن: ٣١٣٠. أبو داود. السنة: ٤٧٠٥. تحفة الأشراف: ٣٩} :

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بە ئیبنو عەبباسم گوت: کە نەوف بەککالی دەڵێ: ئەو مووسایە کە هاوڕێی خدری زیندە بووەو داستانەکەیان لە قورئاندا باسی کراوە، ئەو مووسا مەشهوورە نییە کە پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل بووە!

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەو دوشمنی خودایە درۆ دەکا (ئەو لای خۆی پیاوی باشەو زانایەکی پایە بەرزە چۆن هەڵەی وا گەورە دەکا) چونکە من ئوبەییەی کوڕی کەعب خۆی قسەی بۆم کرد، فەرمووی: بەگوێی خۆم بیستم لەزاری پیرۆزی خۆشەویست (درروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (مووسا پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایەوە لەناو نەوەی ئیسرائیلدا وتارێکی دا (نەوەی ئیسرائیل واتە: نەتەوەی یەعقووب) لێیان پرسی: کێ لەهەموو کەسێ زاناترە؟ فەرمووی: من! خودای گەورەیش (لەبەرئەوەی کەزانینی ئەم باسەی هەواڵە نەکرد بە عیلمی خودا) گلەیی لەمووسا کردو سرووشو نیگای نارد بۆی: ئەی مووسا! بەندەیەکی من هەیە ئەو لەتۆ زاناترە، ئێستا وا لە مەجمەعول بەحرەین (واتە: لەدواوانی دوو دەریای فارسو ڕۆم، کە ئێستا پێیان دەگوترێ: دەریای سوورو دەریای سپی، کە ئێستە ئەو جەمسەرە پارچەیە زەوییە لە وڵاتی میسرە، وا لەنێوانی کیشوەری ئاسیاو کیشوەری ئەفریقادا، کەناڵێکی گەورەی لێ هەڵکەنراوە بەناوی کەناڵی سویسو بووە بەڕارەوی پاپۆڕی گەورە، لەدەریای سوورەوە بەرەو دەریای سپیو بە پێچەوانەشەوە).

مووسا فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! جا ئەوە چۆن خۆم بگەیەنمە لای؟ فەرمووی: ماسییەك ببرژێنەو لەگەڵ خۆتدا لە زەمیلەیەکا بیبە، جا لەکوێدا ئەو ماسییەت وون کرد، ئەو بەندەیە وا لەوێدا، جا لەزەمیلەیەکا ماسییەکی هەڵگرتو خۆیو یوشەعی کوڕی نوون، کە هەم سوختەی بوو، هەم خوشکەزای بوو، کەوتنەڕێو ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە لای تاوێرەکەی قەراخ دەریاکە، کە خدری زیندە لەوێ بوو، ئیتر لەوێ سەریان نایەوەو خەوتن، ماسییەکەیش لەزەمیلەکەدا

راپەڕیو هاتە دەرەوەو کەوتە ناو دەریاکەوە، وە بەناو نێرینەی ئاوی دەریاکەدا خەندەکێکی بۆ خۆی دروست کردو ڕێگەی خۆی گرتە بەرو کەوتەڕێ، خودای گەورەیش شڵپاوی ئاوەکەی کە بەڕۆیشتنی ماسییەکە شەق دەبوو، وەك تاقی سەردەرگاو پەنجەرە کرد بە توونێل لەژێر ئاوەکەدا!

لە گێڕانەوەیەکا: لەبن ئەو گا بەردەدا کانیاوێ هەیە ناوی ئاوی کانی ژیانەو ناسراوە بەئاوی حەیات، هەرچی شتێ لەو ئاوەی لێ بکەوێ، زیندوو دەبێتەوە، جا ماسییەکە لەئاوی ئەو کانیەی لێ دەکەوێو دەجوولێتەوەو رادەچەنێو لە زەمیلەکە دەردەپەڕێو دەچێتە ناو دەریاکەوە، کە مووسا (دروودی خودای لەسەر بێ) خەبەری دەبێتەوە، یووشەعی هاوڕێی لەبیر نابێ باسی ئەم حاڵەی ماسییەکەی بۆ بکا، جاماوەی ئەو رۆژەو شەوێکی تەواو هەتا بەیانی دەڕۆن، تا بۆ سبەینێ مووسا بە یووشەع دەفەرموێ: نانی بەیانیمان بۆ بهێنە، بەڕاستی لەم سەفەرەماندا تووشی ماندوویی بووین! فەرمووی: هەتا لەو شوێنە رەت نەبوون کە خودا کردبووی بە نیشانە بۆی، هەستی بەماندوویی و کفتیو شەکەتی نەکرد، خزمەتکارەکەی عەرزیکرد: {أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا – الكهف – ١٨/٦٣}:

واتە: قوربان! پێم ناڵێی بۆچی وام بەسەرهات؟ دەزانی کاتێ گەیشتینە لای بەردەکەو تۆ نووستیت، من شتێکی سەیرم دی تەماشام کرد وا ماسییە برژاوەکەمان لەناو زەمیلەکە دەرپەڕیو خۆی فڕەدایە ناو دەریاکەوەو لەسەر شێوەیەکی زۆر سەیرو سەر سوڕهێنەر بەناوی ئاوەکەدا دەستی کرد بەڕۆیشتن، من لەبیرم چوو ئەم رووداوەت بۆ بگێڕمەوە، دیارە شەیتان ئەوەی لەبیر بردمەوە، بەهۆی خەیاڵی دڵەوە، فەرمووی: ئەو تونێلەی کە بۆ مووساو شاگردەکەی سەر سووڕهێنەر بوو، کە بۆ ماسییەکە لە غەمو قومووش بوو، وەك بۆشایی ناو بۆری وابوو، بەڵام بۆ مووساو شاگردەکەی سەرسوڕهێنەر بوو. مووسا بە یووشەعی فەرموو: {قَالَ ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا - الكهف – ١٨/٦٤}:

واتە: دەی ئێمە بۆئەمە دەگەڕێین، کەتۆ دیوتە، ئیتر رێك بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە، فەرمووی: بەشوێنی خۆیاندا رێك گەڕانەوەو شوێنەواری خۆیانیان دەقاو دەق هەلگرتەوە تا گەیشتنەوە لای تاوێرەکە، تەماشایانکرد وا پیاوێ بەنوێنی خۆی داپۆشیوە، جا مووسا سلاوی لێکرد، خضریش (سلاوی لێ بێ) فەرمووی: لەکوێ لەم ولاتی تۆیە ئەم جۆرە سلاوو رۆژباشییە هەیە! فەرمووی: من مووسام. خدری زیندە فەرمووی: مووسای پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل؟ فەرمووی: بەلێ ئەوم، هاتووم بولای تۆ کە لەم عیلمو زانستە نایابەی کە لەلای خوداوە فێرکراوی، هەندێکم فێربکەی، کە ببێ بەهۆی گەییشتنم بە رەزای خودا، خدر فەرمووی: تۆ ناتوانی لەگەلْ مندا، خۆت بگریو صەبر بکەی، ئەی مووسا! من خودا لە عیلمو زانستی خۆی، بازە عیلمو زانستێکی وای فێرکردووم، تۆ بەتەواوی نایزانیتو وەك من شارەزاییەکی تەواوت نییە لەو بابەتەدا، کەپێی دەگوترێ: عیلمی حەقیقەت، یا عیلمی لەدوننی، یا زانستی بەهرەیی (عِلْمِي لَدُنِّي) وە هەروەها تۆیش خوای مەزن لە عیلمو زانستی خۆی بازە عیلمو زانیارییەکی فێرکردووی، کە برێتییە لە شەریعەتو عیلمی ظاهیر، من وەك تۆ نایزانم، کەوابوو وازبێنە تۆ بەرێگەی خۆتو من بەرێگەی خۆم. مووسا فەرمووی: {سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا - الكهف – ١٨/٦٩}.

واتە: خودا یاربێ ئەگەر رێگەم بدەی لە خزمەتتابم، دەبینی بەباشی ئارام دەگرمو سەرپێچی لە فەرمانت ناکەم، خدریش فەرمووی: {فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا – الكهف – ١٨/٧٠}.

واتە: باشە، بەلام بەمەرجێ لەشت زۆر مەکۆلەرەوە، هەرچیم کرد قسەمەکەو هەقت بەسەرمەوە نەبێ، هەتا خۆم تێت دەگەیەنم.

فەرمووی: پاش ئەوە کە لەسەر ئەم مەرجە رێکەوتن، هەردوکیان لەقەراخی دەریاکەوە کەوتنە رێ، تا پاپۆرێ هات، قسەیان لەگەلیان کرد، کە هەلیان بگرن، خدریان ناسی، بەبێ کرێ بەخۆڕایی هەلیان گرت، کەسواری پاپۆڕەکە بوون، لەپڕ

لەناكاو مووسا چاوی لێ بوو كەوا خدر بە تەشوێ تەختەيەكی لە تەختەكانی پاپۆڕەكە هەڵكەند، مووسا پێی فەرموو: ئەوە چيت كرد! لای خۆی ئەم پياوانە پياوەتييان لەگەڵمان كردو بە بەلاش ئێمەيان سوار كردووە، كەچی تۆ دەچيت پاپۆڕەكەيان كون دەكەی، تاكوو سەرنشينەكانی نوقم بكەی‌و لەئاودا بخنكێن! بەڕاستی تاوانێ گەورەو ناهەموارت كرد.

خدر فەرمووی: ها! ئەدی من پێم نەگوتيت كەتۆ لەگەڵ مندا هەڵناكەيت‌و ناتوانی ئۆقرە بگری؟ مووسا فەرمووی: لەبيرم نەبوو، لێم مەگرەو هاوڕێيەكی باش بەو چاو پۆشيم لێ بكە، با نەبيت بە مايەی باری زەحمەت بۆم. فەرمووی: ئەم جاری يەكەمەيان مووسا لەيادی نەبوو، فەرمووی: لەوكاتەدا چۆلەكەيێ هات لەسەر لێواری پاپۆڕەكە نيشتەوەو دەندووكێكی ژەند بەئاوی دەرياكەدا، خدر پێی فەرموو: زانياری من‌و زانياری تۆ لەچاو زانياری خودادا وەك دەنووك ژەندنی ئەم چۆلەكەيە وايە بەم دەريايەدا، ئەوجا لە پاپۆڕەكە هاتنە دەرێ‌و هەردوكيان بەكەناری دەرياكەدا دەستيانكرد بە ڕۆيشتن، لەناكاو خدر چاوی كەوت بە كوڕێكی منالكار لەناو منداڵاندا ياری دەكرد، يەكسەر پڕی كرد بەسەرياو بەدەست وەك بەچكە چۆلەكە سەری هەڵكەندو ملی هەڵكێشاو بەبێ قسەو پرسيارو چەندو چوون كوشتی!! مووسا پێی فەرموو: {أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا – الكهف – ١٨/٧٤}.

واتە: ئەو منداڵە بێ تاوان‌و گيانە پاكەت بەناهەق چۆن كوشمت، بەبێ ئەوەی كەسێكی كوشتبێ، لەخۆتەوە كوشتت؟! بەڕاستی كارێكی زۆر نارەوات كردو كاری وا ناشيرين كەس پەسەندی ناكا.

لە غايەتولەئموولی شەرحی تاجول ئوصولدا دەفەرموێ: دەگێڕنەوە خدر لەم وەڵامی مووسايە زۆر تووڕە دەبێ، دەچێ دەفەی شانی چەپی منالەكە دەردەهێنێ‌و گۆشتەكەی لێ دادەماڵێ، سەيردەكەن لێی نووسراوە، لەخواييەوە: ئەم كوڕە كافرە،

قەت ئیمانو باوەڕ ناهێنیٚ! ئیتر مووسا هێواش دەبێتـەوە. خـدر دەفـەرمویٚ: {قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ صَبْرًا – الكهف – ١٨/٧٥} :

واتـە: کوڕە! مـن پـێم نـەگوتی کـەتۆ لەگـەل منـدا هەڵناکـەیو نـاتوانی خـۆت بگرىو سەر لەکاری من دەرناکـەی، لەبەرئـەوە خـۆت پـیٚ نـاگیریٚو هـەڵ دەدەیتـیٚ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (رەددی ئەم جارەی خـدر تونـدو تیـژتر بـوو، لـە رەددی جـاری یەکـەمی). مووسـا فـەرمووی: {إِن سَـأَلْتُكَ عَـن شَـيْءٍ بَعْـدَهَا فَلَـا تُصَاحِبْنِي، قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا – البقرة – ١٨/٧٦} :

واتـە: ئەگـەر جـارێکی تـر پـاش ئـەمجارە هەڵـەی وام کـردو لەمـەرجی خـۆم دەرچووم ئیتر هاوڕێتیم مەکە، ئیتر بیانوو مەهانەت بڕیوم.

فەرمووی: پاش ئەوە کەوتنەوە رێو رۆیشتن هـەتا چونە ئاوەدانییـەك (شـاری ئـەنطاکییـە) لـەویٚ داوای نـانو ئاویـان لەهـەموو خـەڵکی ئـەو ئاوەدانیـە کـرد کـە بیخۆن، بەڵام کەسیان قاییل نەبوون کە میوانداارییان بکەنو بەنائومێدی رۆیشـتن، دیوارێکیان بینی خەریك بوو هەرەس بهێنیٚو بڕووخیٚ، خدر دەستێکی پیادا هێناو راسـتی کـردەوە. مووسا پێـی فـەرموو: خـەڵکی ئـەم شـارە بـیٚ ویـژدانو چـرووكو پیسکەن، ئـەم هۆزە لای خـۆیٚ ئێمـە بـووین بـەمیوانیان، کەچـی نـەنانو ئاوێکیـان پێمانـداو نـە میوانـدارییان پـیٚ کـردین، ئەگـەر ئـارەزووت ببوایـە کرێـت لیٚ وەردەگرتنو بەکریٚ دیوارەکەت راسمت دەکردەوە بۆیان.

خدر فەرمووی: {هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْـهِ صَـبْرًا – الكهف – ١٨/٧٨}.

واتـە: ئەمـە کـاتی لەیـەك جیابوونـەوەی مـنو تۆیـە لەیـەکتری، بـەزوویی ئـەو شتانـەت بـۆ روون دەکەمـەوەو نهێنییەکەیانت پـیٚ دەڵـێم کـەتۆ خـۆت بـۆ رانـەگیرا بەرابەریان. پێغەمبەری خۆمان، حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (خۆزگەم مووسا زیاتر ددانی بەخۆیدا بگرتبایە، هەتا خودا زیاتر داستانی ئەم دوو زاتەی باس بکردایە بۆمان!

سەعیدی کوڕی جوبەیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) ئەم ئایەتەی بەم قیرائەتە دەخوێندەوە: {وَكَانَ أَمَامَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا} وە ئەم ئایەتەی تریشی بەم قیرائەتە دەخوێندەوە: {وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ}. {تاج/٤، لاپەرشە: ٣٤٠، چاپی چوارەم، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٩٧٤}.

## ١٢٥٢) فەرمایشتی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ): باوی هیچ پێغەمبەرێ مەدەن بەسەر پێغەمبەرێکی تردا. (٦٠٩٨ - ٦١١٠)

## بَابٌ: فِي قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ تُفَضِّلُوا بَيْنَ أَنْبِيَاءِ اللَّهِ

١٦١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا يَهُودِيٌّ يَعْرِضُ سِلْعَةً لَهُ أُعْطِيَ بِهَا شَيْئًا كَرِهَهُ، أَوْ لَمْ يَرْضَهُ، (شَكَّ عَبْدُ الْعَزِيزِ) قَالَ: لاَ وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ عَلَى الْبَشَرِ. قَالَ: فَسَمِعَهُ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَلَطَمَ وَجْهَهُ قَالَ: تَقُولُ: وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ عَلَى الْبَشَرِ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ أَظْهُرِنَا، قَالَ: فَذَهَبَ الْيَهُودِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ إِنَّ لِي ذِمَّةً وَعَهْدًا، وَقَالَ: فُلاَنٌ لَطَمَ وَجْهِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لِمَ لَطَمْتَ وَجْهَهُ»؟ قَالَ: قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ عَلَى الْبَشَرِ، وَأَنْتَ بَيْنَ أَظْهُرِنَا. قَالَ: فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى عُرِفَ الْغَضَبُ فِي وَجْهِهِ، ثُمَّ قَالَ: «لاَ تُفَضِّلُوا بَيْنَ أَنْبِيَاءِ اللَّهِ، فَإِنَّهُ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ، فَيَصْعَقُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ. قَالَ: ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ بُعِثَ أَوْ فِي أَوَّلِ مَنْ بُعِثَ، فَإِذَا مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ آخِذٌ بِالْعَرْشِ فَلاَ أَدْرِي أُحُوسِبَ بِصَعْقَتِهِ يَوْمَ الطُّورِ، أَوْ بُعِثَ قَبْلِي، وَلاَ أَقُولُ: إِنَّ أَحَدًا أَفْضَلُ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى عَلَيْهِ السَّلاَمُ».

{الحديث: ٦١٠٢ = ٦١٠٧ فم. تجريد البخاری بالكوردی/٣، رقم: ١٠٥٢ = ٢٤١١، ٣٤٠٨، ٣٤١٤، ٦٥١٧، ٧٤٧٢، ٧٤٢٨. تحفة الأشـراف: ١٣٩٣٩. أبـو داود. السـنة: ٤٦٧١. ترمذی. تفسير: ٣٢٤٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ کابرایەکی جوولەکە، شمەکێکی خۆیی دەفرۆشت، نرخێکیان پێی دابوو، پێی رازی نەبوو، جا بەم بۆنەیەوە ئاوا

سوێندی خوارد: نا، بەو كەسە كە مووسای هەڵبژاردووەو كردوویەتی بەسەر دەستەی هەموو جیهان بەو نرخە نایدەم، فەرمووی: جا پیاوێ لە موسوڵمانان، لە كۆمەڵەی یاریدەدەران، گوێی لەم قسەیەی جوولەكەكە بوو، شەقازللەیەكی لێ دەداو پێی دەڵێ: چۆن وا دەڵێی بەم قسەیەی تۆبێ، مووسا لە پێغەمبەری ئێمەیش گەورەترە؟! فەرمووی: جوولەكەكە چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیكرد: ئەی باوكی قاسم! من ذیممیمو لە ئەهلی ذیممەم، كەچی ئەوەتا فیسارە هاوەڵی تۆ لەسەر شتێكی وا شەقازللەیەكی لێ دام. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەنصارییەكەی فەرموو: (بۆچی شەپازللەت لەم كابرایە داوە؟). گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! واوا دەڵێ، شتی وایش واتای وایە كە مووسا لەتۆ گەورەترە، كە پێغەمبەری ئێمەی!

فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا تووڕەبوو، تووڕەیی بەروخساریەوە دیاربوو، پاشان فەرمووی: (لەخۆتانەوە بەبێ بەڵگەیەكی ڕۆشن باوی هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران، مەدەن بەسەر پێغەمبەرێكی تردا لە پێغەمبەران، لەڕاستیدا، لەپێش ڕۆژی قیامەتا، كەفووی یەكەم دەكرێ بەصووردا، وەك قورئان دەفەرموێ، هەرچی وا لەئاسمانەكانو هەرچی وا لەزەویدا، خورپەیان لێ دەكەوێو لەسامو بیمی نركەو نەعرەتە گەورەكە هەموو لەهۆش خۆیان دەچنو دەبوورێنەوە، مەگەر ئەو كەسانە كە بەویستو خواستی خودا، ئەم نركەو نەعرەتەیە كاریان تێ ناكا) فەرمووی: (لەپاشا كەفووی دووەم دەكرێ بە صووردا، هەموو زیندو دەبنەوە، من یەكەم كەس دەبم كە زیندوو دەبمەوە) یا فەرمووی: (لە یەكەم كەسەكان دەبم كە زیندوو دەكرێنەوە كەچی لەوكاتەدا دەبینم وا مووسا پەلاماری دامێنی تەختو بارەگای خودای داوەو بەتوندی كەمەری عەرشی گرتووە، جا نازانم مووسا بەهۆی بوورانەوەكەی كێوی طوورەوە ڕزگاری بووە لە بوورانەوەی نەفخەی یەكەم، یا ئەو لەپێش مندا هۆشی هاتۆتەوە!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من شتی وا نالێم کە بڵێم کەسێ باشترە لە یوونسی کوڕی مەتتا). {تاج/٣، زنجیرە:١١٦، ژمارە: ٣٢٠٦، ٣٢١٥ چ/٤ + تەجریدی بوخاری بەکوردی بەرگی چوارەم، چاپی دووەم، لاپەڕە: ٤٧، ژمارە: ١٣٦٢ = ٣٤١٦، ٣٤١٥، ٤٦٣١، ٤٦٠٤، ٤٨٠٥}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- مەبەست لەوە کە دەفەرموێ لەخۆتانەوە، بەبێ دەقی ڕۆشن، باوی پێغەمبەرێ مەدەن بەسەر پێغەمبەرێکی تردا، ئەوەیە: کە بەبێ پێویست ئەم جۆرە پرسە نەورووژێنرێ، یا مەبەست ئەوەیە: کە ئەو باودانە سەربکێشێ بۆ کەموکورتی پێغەمبەرێ، دەنا خودای گەورە بۆ خۆی لە قورئانا دەفەرموێ: {تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ} کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەقێکی ڕۆشنە لەسەرئەوە کە هەندێ لە پێغەمبەرەکان لەهەندێکی تریان گەورەترن!

٢- بورانەوەکەی کێوی تووری حەزرەتی مووسا، لەم ئایەتەدا، لە سوورەتی ئەعرافدا، تۆمارکراوە، کە دەفەرموێ: {وَلَمَّا جَاء مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ موسَى صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ - الأعراف – ١٤٣/٧}:

ئەوەتا لەم ئایەتەدا، بەپێی بەڵێنێ، مووسا دەچێ بۆ سەر کێوی طوور کەوا لە سارای سینا، لە وڵاتی میسری ئێستا، لەوێ لەگەڵ خوادا دەست دەکا بە گوفتوگۆ، وە داوا لەخودا دەکا کەخۆی نیشانی مووسا بدا هەتا بەچاوی سەر لەدنیادا، تەماشای بکاو زاتی خودا ببینێ!! خودایش ویستی کە تێی بگەیەنێ کە ناتوانێ ئەو ببینێ، فەرمووی: ئەی مووسا! تەماشای ئەو کێوی طوورە بکە، من ورشەیەکی خۆمی بۆ دەرئەخەم ئەگەر خۆی بۆ ڕاگیراو بەرگەی ئەو ورشە دەرخستنەی منی گرت ئەوا تۆش دەتوانی من ببینیو بەرگەی دەرکەوتنی جیلوەو ورشەی من دەگری، کە خودا خۆی پیشانی کێوەکەدا، بەجارێ کێوەکە هەپروون بوو لەگەڵ

تـەختی زەوییەکـەدا یەکسـان بـوو، جـا مووسـا لـە سـامو هەیبـەتی ئـەم رووداوە سەختو دیزوارە تۆقیو لەشوێنی خۆیدا بوورایەوەو بێ هۆش کەوت، کاتێ هۆشی هاتـەوەو هاتـەوە سـەرەخۆو لـە حاڵەکە بەباشـی حـاڵی بـوو، بـۆ عـوزر هێنانـەوە فـەرمووی: ئـەی پـەروەردگاری گـەورەم! بەڕاسـتی پـاكو پـیرۆزیو بـێ گـەردی هەمیشەیی هەر بۆ تۆیەو بەس، پەشیمانم لەم داوایەی کە لەخۆمەوە لەتۆم کرد، وەمن یەکەم باوەڕداری سەردەمی خۆمم).

٣- فووی یەکەمیش کە دەکرێ بە صووردا، لەم ئایەتـەدا روون کراوەتـەوە، کە دەفەرموێ: {وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ - الزمر - ٣٩/٦٨}.

واتە: فووی یەکەم دەکرێ بە کەڕەنا (صوور)دا، کۆتایی بـەژیانی جیهان دێنـێ، ئـیتر بەفـەرمانی خـودا، هەرچـی زینـدوو هەیـە لـە ئاسمانـەکانو زەویـدا، هـەمووی بەیـەکجار دەمـرن، مەگـەر کەسـانێ نـەبێ، کـەخودا لـەم مەرگـە سـاتە جیـای کردوونەتـەوەو خواسـتی لەسـەر ئەوەیـە کـە نـەمرن، وەك پەریـەکانی بەهەشـتو کەسانی تـر، جـا لـەپاش چـل سـاڵ فـووی دووەم دەکـرێ بـە کـەڕەنادا، ئـیتر هـەموو زینـدوو دەبنـەوەو هەرچـی مـردوو هەیـە هـەموویان لـەناو خـاك دەردەچـنو چاوەڕوانی دەکەن کەچییان لێ دەکرێ!).

### ١٢٥٣) باسی مەرگی مووسا پێغەمبەر (درووودو سلاوی خودای گەورەی لەسەر بێ). (٦٠٩٨ - ٦١١٠)

### بَابٌ: فِي وَفَاةِ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ

١٦١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «جَاءَ مَلَكُ الْمَوْتِ إِلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ، فَقَالَ لَهُ: أَجِبْ رَبَّكَ، قَالَ: فَلَطَمَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ عَيْنَ مَلَكِ الْمَوْتِ فَفَقَأَهَا، قَالَ: فَرَجَعَ الْمَلَكُ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى فَقَالَ: إِنَّكَ أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لَكَ لاَ يُرِيدُ الْمَوْتَ وَقَدْ فَقَأَ عَيْنِي، قَالَ: فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيْهِ عَيْنَهُ، وَقَالَ ارْجِعْ إِلَى عَبْدِي فَقُلِ: الْحَيَاةَ تُرِيدُ؟ فَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْحَيَاةَ، فَضَعْ يَدَكَ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ فَمَا

تَوارَتْ يَدُكَ مِنْ شَعْرَةٍ فَإِنَّكَ تَعِيشُ بِهَا سَنَةً. قَالَ: ثُمَّ مَهْ؟ قَالَ: ثُمَّ تَمُوتُ. قَالَ: فَالآنَ مِنْ قَرِيبٍ، رَبِّ أَمِتْنِي مِنَ الأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ). قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «وَاللَّهِ لَوْ أَنِّي عِنْدَهُ لأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ عِنْدَ الْكَثِيبِ الأَحْمَرِ».
{الحديث: ٦١٠٠ = ٦١٠٥ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٢، رقم: ٦٣٩ = ١٣٣٩، ٣٠٤٧، لاپەڕە: ٥٩. چاپی یەکەم، لاپەڕە: ٧٤ چاپی ساڵی/ ٢٠١٠ز}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: فریشتەی گیانکێشان بە فەرمانی خودا، لەشێوەی پیاوێکا، دەچێ بۆلای پێغەمبەر مووسا (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەڵێ: وەڵامی پەروەردگارت بدەرەوە، من بەفەرمانی خودا هاتووم کە گیانی تۆ بکێشم، تۆش وەرە بەدەنگی فەرمانەکەی پەروەردگارتەوە! مووسا شەقازللەیەکی لێ دەدا، چاوێکی قەلپووچ دەکا) فەرمووی: جا فریشتەکە دەگەڕێتەوە بۆلای خوداو پێی دەفەرموێ: تۆ منت ناردووە بۆلای بەندەیێ کەنایەوێ بمرێ، ئەوەتانێ مشتەکۆڵەیەکی دا لەچاوم، چاومی تەقاند، فەرمووی: جا خودا چاوی چاك دەکاتەوەو، پێی دەفەرموێ: بچۆرەوە بۆلای بەندەکەم کە مووسایەو پێی بڵێ: ئایا حەزت لەژیانە؟ ئەگەر حەزت لەژیانە، دەستت دابنێ لەسەر پشتی جوانەگایێ، چەند موو بوو بەژێر دەستتەوە، لەباتی هەر موویێ لەو مووانە ساڵێ تریش بژی. مووسا فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! لەپاش ئەوە چییە؟ فەرمووی: لەپاش ئەوەیش هەر مردنە، مووسا فەرمووی: کەواتە با ئێستابێ زوو بەزوو، بەڵام داوای لە خودای گەورە کرد، کەوا نزیکی بکاتەوە لەخانەی پیرۆزەوە (واتە لە بەیتولمەقدیسەوە) کە بەقەد یەك بەردە هاوێژی بمێنێ بۆیو لەوێدا بمرێو بنێژرێ).

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەخودا، ئەگەر ئێستا لەوێ بوومایە، لەو جێگەدا کە مووسای تیادا نێژراوە گۆڕەکەیم نیشان دەدان، کەوا لەتەنیشت ڕێگەکەوە، لەبن تەپۆڵکە لە سوورەکەدایە، بەردە هاوێژێکی دەمێنێ بۆ بەیتول مەقدیس). {بڕوانە: ژمارە: ١٦١٤ کە یەکسەر وا لەدوا ئەم فەرموودەوە کەواین لەخزمەتیدا + تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٣٢٠٧ = تاج/٣، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٣٢٠٨}.

**روونكردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ:

١- فریشتە دەچێتە شەکڵو شێوەی مرۆڤەوە.

٢- ئـەم جـۆرە فەرموودەیـە جـۆرە غەیبایەتییـەکی واتیـادا، بـاش وایـە بـەبێ زانیاری تەواو قسەی لێ نەکرێ.

٣- فەرموودەی پێغەمبەریش، وەك قورئـانی پیرۆز، لـەرووی دەقەكانیـەوە، دوو جـۆری هەیـە: موحكـەمو موتەشـابەهـ، ئـەوەی موحكـەم بـێ لەهـەموو روویەكـەوە (واضِحُ الدَلال)یە بەلگەی رۆشنە لەسەر مەبەست، بەڵام موتەشابەهەكەی پێویستی بەشیكردنەوەی قووڵە، لەلایەن پسپۆڕانەوە، وە ئـەم جـۆرە فـەرموودە، لـە ئـەدەبی هاوچەرخدا ناسراوە، بە رەمزییەت.

دینـــێ پـــاك و پوخـــت پـــڕ لەســـەروەری
رێكـــی هۆشـــی ســـاخ، بـــێ دەردی ســـەری
تـــەنیا ئیســـلامە، گـــەردین پـــەروەری
لەســـەری بـــژی و لەســـەری بمـــری!
دەریـــای بـــێ پـــەیی پـــڕ تەلیســـمی ژیـــن
مەلـــەی تیابكـــە بەڕابـــەری دیـــن!
بخـــۆو بخـــەوەو ســـەركە ســـەر ســـەرین
دوور بـــە لەوانـــەی كـــەوا سەرســـەرین!
بـــەبێ شـــیاوی تـــەواوی تـــەواو
لـەدەریای بـێ پـەی قـەت مـەنێ هـەنگاو
لەســـەفەری ژیـــن، شـــەقاو بەشـــەقاو
خـــەڵاتی خـــودا بنێـــرە بـــان چـــاو!
رازو نهێنـــی و تەلیســـمی نـــاو ژیـــن
هـــەروا هـــەواڵی هـــەردوو دنیـــاو دیـــن
مـــەر لـــەژێر خاكـــا پـــەیی پـــێ بـــەرین
ئێمـــە تـــا نـــەمرین زۆر بـــێ خەبـــەرین!
لەپـــەڕەی دڵـــت لەجێگـــەی دەفتـــەر
بنووســـــە بڵـــــێ: (اللّـــهُ أكبَـــرْ!!)
فەرمایشـــتی خـــوا، قســـەی پێغەمبـــەر
بـــەبێ چـــەن و چـــوون، وەک تـــاجی گەوهـــەر

دەنێمــــە سەرچـــاو، دەنێمـــە ســــەر ســــەر
بــــە پشـــتیوانی خـــودای بـــانی ســــەر
قســــەیە دەکــــەم بیکــــە بــــە پێـــوەر
لەبــــەری بـــــە وەک شـــیعری زێـــوەر:
بەقــــەد نیســـکێکە دیســـکی کۆمپیوتـــەر
بەقــــەد ســـــەد زانـــا عیلمـــی وا لەبـــەر!!

**١٢٥٤) فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): لەلای مووساوە تێپەڕیم لە گۆڕەکەیدا نوێژی دکرد.** (٦٠٩٨ – ٦١١٠)

**بابٌ: في قول النبيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَرَرْتُ عَلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ يُصَلّي فِي قَبْرِه**

١٦١٤- عَنْ أَنسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «أَتَيْتُ (وَفِي رِوَايَةِ هَدَّابٍ) مَرَرْتُ عَلَى مُوسَى لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عِنْدَ الْكَثِيبِ الأَحْمَرِ، وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي قَبْرِهِ». {الحديث: ٦١٠٧ = ٦١١٣ فم. نسائى. قِيَامُ الليل: ١٦٣١. تحفة الأشراف: ٨٨٢}:

ئەنەسی کوڕی مالیک (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو شەوە کە چووم بۆ ئیسرا، واتە: ڕۆیشتم بۆ شەو ڕەوی، لەڕێگە لەلای مووسا پێغەمبەرەوە ڕەت بووم، لەلای تەپۆڵکە لمە سوورەکەدا بوو، لەناو گۆڕەکەیدا ڕاوەستابوو بەپێوە نوێژی دەکرد). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٣٢٠٨ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- بڕوانە: تەجریدی بوخاری، وەرگەڕاوە کوردییەکەی، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٧٢، چاپی یەکەم، ژمارە: ١٥٩ = ٢١٦ فتح الباری هەتا کۆتایی ڕوونکردنەوەکە.

٢- کۆمەڵێ دەقی ڕۆشن هەیە: لەسەرئەوە کە پێغەمبەرانو شەهیدان لە گۆڕەکانیاندا زیندوون، وەگیانیان پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بە جەستەیانەوە، بەڵام مەرج نییە کە ژیانی شەهیدانو پێغەمبەرانو پیاو چاکان، لەژیانی دووهەمدا، بەتایبەتی لەژیانی بەرزەخو ناو گۆڕدا، دەقاو دەق وەك ژیانی جیهانیان وابێ، ڕەنگبێ لەزۆر ڕووەوە، ئەم سێ ژیانە جیاوازییان زۆر بێ، واتە: ژیانی

جیهان‌و ژیانی بەرزەخ‌و ژیانی دوا ڕۆژ! ئەمە بیرو باوەڕی جەماوەری زانایانی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتن.

٣- خواپەرستی‌و عیبادەت‌و پەرستشی خواناسان‌و باوەڕداران لە گۆڕو لەژیانی بەرزەخ‌و لە بەهەشتا، لەجۆری عیبادەتی تەکلیفی نین، بەڵکوو خودی ئەم عیبادەتانە خۆیان بۆ خاوەنەکانیان جۆرێکن لە بەهرەی گیانی‌و نازو نیعمەتی دوا ڕۆژیی‌و لەززەتی تایبەت.

لە فەرموودەی ساخدا، کۆمەڵێ شت لەم بابەتە چەسپاوە: وەك ئەم نوێژەی مووسا لە گۆڕەکەیدا، وەك تەوافی حەزرەتی عیسا بەدەوری بەیتا. {تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٣٢٠٩ = تجرید/٤، ژمارە: ١٣٧٠ = ٣٤٤٠ فتح الباری + مسلم. إیمان: ٤٢٤، ٤٢٥، ٧٢٨٩ شیحا}.

وەك: تەلبییەو عەمرەی مووساو یونس (بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٣٢١٤ = بخاری. حج)، (تەجرید/٢، لاپەڕە: ١٧٠ چ/١، ژمارە: ٧٤٧ = ١٥٥٥ فتح الباری. موسلیمیش لە میعراجدا گێڕاویەتەوە).

وەك بەهەشتییەکان بەیانیان‌و ئێواران سوپاس‌و حەمدو یادو زیکرو تەسبیحاتی خودای مەزن دەکەن (تاج/٥، لاپەڕە: ٧٥٢، زنجیرە: ١٤٢ أوصاف أهل الجنەز ژمارە: ٥٧٣٧، ٥٧٣٨. مسلم. جنە ونعیمها رقم: ٧٠٧٦، ٧٠٧٧، ٧٠٧٨ شیحا. تجرید البخاری/٣، ژمارە: ١٣١٢ = ٣٢٤٥ فتح الباری). وەك ئەوە قورئان خوێنەکان لەبەهەشتا قورئان دەخوێنن (بڕوانە: تاج/٤، لاپەڕە: ٧، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٣٥٩٥، ٣٥٩٦ حدیثان صحیحان عند الترمذی). وەك: خوێندنی سوورەتی تەبارەك لەناو گۆڕدا. (بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٣٦٥٦ چ/٤).

وەك: تەلبیەو حەج‌و عەمرەو تەوافی بەیت لەلایەنی پێغەمبەرانەوە، وەك نوێژکردنی مووساو نوێژکردنی عیساو نوێژکردنی ئیبراهیم، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشەوی ئیسراءدا بینیویانی نوێژیان کردووە. {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٣١٥٧ = مسلم. إیمان: ٤٢٩} لە فەتحولولهیمدا ئەم حەدیثە نەقڵ دەکا، کە بەیهەقی‌و مەناوی بە صەحیحیان داناوە: (الأَنْبِيَاءُ أَحْيَاءٌ فِي قُبُورِهِمْ يُصَلُّونَ). واتە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پێغەمبەران زیندوون لە گۆڕەکانیانا نوێژ دەکەن). شەرحی فەرموودەی ژمارە (٦١١٣ فتح الملهم = فم).

وەك: ئەوە لەشەوی ئیسراء دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی بۆ کۆمەڵێ لە پێغەمبەران دەکا. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٣١٥٧. مسلم. إیمان: ٤٢٩}.

٤- کورتو پوختو بەکوردی پەتی:

(پێغەمبەرانو شەهیدانو پیاو چاکان، لەژیانی بەرزەخدا زیندوون، وە پەیوەندییان بە جەستەکانیانو بە گۆڕەکانیانەوە هەیە، وە پەیوەندی بە یەکترییەوە دەکەن، هاموشۆی ئاسمانەکانو شوێنانی تر دەکەن، وە هەروەها بەشداری لە بۆنەو رووداوە گرنگەکانی جیهاندا دەکەن، وەك هاوبەشی لە بۆنەی حەجو عەمرەو تەوافو نوێژی جەماعەتو پێشوازی یەکتری.

لەجیهانی دووهەمیشا هەست بەخۆشیو ناخۆشی خۆیانو گەلەکانیان دەکەن، بەخۆشییو باشیی نەتەوەکانیان شادمان دەبن، بەکزیو بێ نازیو کەساسیو لاوازییان دلگران دەبن، کەیفخۆش دەبن، تووڕە دەبن، پێدەکەنن، دەگرین، ئاگایان لەحاڵی ئۆمەتیان هەیە. {تاج/٣، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٣٣٧٨ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٣١٥٥}.

لەژیانی بەرزەخا: خواپەرستیو عیبادەتو پەرستشو کاری تری جیا جیا ئەنجام دەدەن، وەك: نوێژو جەماعەتو دەستنوێژ گرتن. {ژمارە: ١٦٣٢ = ٦١٥٠ صحیح مسلم} و حەجو تەوافی بەیتو عەمرەو یادی خوداو نزای باشو ئامۆژگاری خێرو سڵاوو رۆژباشیو چاکوچۆنی لە یەکتریو وەڵامدانەوەی سڵاو، وە زۆر لە رەفتارو خوو عادەتو باوی کۆمەڵایەتی جوانی دنیایی لەناویانا دەمێنێو پەیڕەوی دەکەن، وەك ئەوە ئادەمو ئیبراهیم شانازی بەوەوە دەکەن، کە کوڕی خانەدانو پایە بەرزی وەك موحەممەدیان هەیە، وەك: گریانو خەم خواردن بۆ جێماویو کەساسی گەلی خۆیان، وەك پێشوازیو چوون بەپیر میوانو چاكو چۆنی.

هەروا مردوو دەتوانێ پەیوەندیو قسەو گوفتوگۆو چاكو چۆنیو تەفاهوم لەگەل زیندوو بكا.

وە جیاوازی زمانو رەگەزو نیشتمانو نەتەوە، نابێ بەرێگر لە تێگەیشتن لە یەكتری {بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەكوردی بەرگی چوارەم ژمارە: ١٥١٣ = ٣٨٨٧، ٣٢٠٧، ٣٣٩٣، ٣٤٣٠ فتح الباری}.

(كورتو پوخت: زۆر شت لەجیهانی دووهەما بە پێوەری ئەم جیهانی یەكەمە ناپێورێ، بەڵكوو زۆر شت لەوجیهان رێك بە پێچەوانەی پێوەرەكانی ئەم جیهانی یەكەمەیە!).

**١٢٥٥) باسی یادی یووسف پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ)**. (٦١١١)
**بَابٌ: فِي ذِكْرِ يُوسُفَ عَلَيْهِ السَّلَامُ**

١٦١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَكْرَمُ النَّاسِ؟ قَالَ: «أَتْقَاهُمْ». قَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ، قَالَ: «فَيُوسُفُ نَبِيُّ اللَّهِ ابْنُ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ خَلِيلِ اللَّهِ». قَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ، قَالَ: «فَعَنْ مَعَادِنِ الْعَرَبِ تَسْأَلُونِي؟ خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا». {الحديث: ٦١١١ = ٦١١٧ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٣٤٥ = ٣٣٥٣، ٣٣٧٤، ٣٣٨٣، ٣٤٩٠، ٤٦٨٩ز تحفة الأشراف: ١٤٣٠٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە پێغەمبەر پرسیار كرا: كام كەسێ گەورەترو بەرێزترە؟ فەرمووی: (گەورەترینو بەرێزترینیان لەلای خودای گەورە، ئەو كەسەیانە كەزۆرتر لەخودا بترسێ!). عەرزیان كرد: مەبەستمان ئەمە نییەو لەم لایەنەوە لێت ناپرسین. فەرمووی: (دەی گەورەترینو بەرێزترینیان بەرشتەی نەسەبو بنەچەو رەسەننامە: پێغەمبەر یوسوفە، كە هەم خۆی پێغەمبەری خودایە، هەم باوكی پێغەمبەری خودایە، هەم باپیرەی پێغەمبەری خودایە، هەم باپیرە گەورەیشی كە حەزرەتی ئیبراهیم خەلیلە دۆستی خودایە. واتە: (خلیل الله)یە. گوتیان: قوربان! مەبەستمان ئەمەیش نییەو پرسیاری ئەمەیشت لێ

ناکەین. فەرمووی: (دیارە لەبنەچەی بنەماڵەو خانەدانە کانی عەرەب پرسیار دەکەن، کەرێك وەك کان وان، کە هەرکانێ تایبەتمەندی خۆی هەیە، چۆن جیاوازیی‌و بەرزی‌و نزمی لەنێوان کانەکانا هەیە، بەهەمان شێوەیش لەنێوان بنەماڵەکانی عەرەبدا هەیە؟).

عەرزیان کرد: بەڵێ مەبەستمان ئەوانە. فەرمووی: (دەی بزانن کە ئەو کەسانەتان کە لەسەردەمی پێش هاتنی ئیسلامەتیدا باش بوون، ئێستاش لەسەردەمی هاتنی ئیسلامەتیدا هەر ئەوانەتان باشەکانتانن، بەڵام بەمەرجێ کە شارەزایی لە ئاییندا پەیدا بکەن‌و بەجوانی رەفتاری پێ بکەن!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٣٩٢٧ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**روونکردنەوە:**

حەزرەتی یوسف خۆی‌و باوکی‌و باپیرەی‌و باپیرە گەورەی پێغەمبەر بوون، ناوی یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە (سڵاوو دروودی خودایان لەسەر بێ). {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٣٩٢٦ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

### ١٢٥٦) باسی یادی زەکەریا (درودی خودای لەسەر بێ). (٦١١٢)
### بَابٌ: فِي ذِكْرِ زَكَرِيَّاءُ عَلَيْهِ السَّلَامُ

١٦١٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «كَانَ زَكَرِيَّاءُ نَجَّارًا». {الحديث: ٦١١٢ = ٦١١٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێغەمبەر زەکەریا (درودی خودای لەسەر بێ) دارتاش بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٣٢١٦ چ/٤}.

### ١٢٥٧) باسی یونوس (درودی خودای لەسەر بێ). (٦٠٩٨ - ٦١١٠)
### بَابٌ: فِي ذِكْرِ يُونُسَ عَلَيْهِ السَّلَامْ

١٦١٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَّهُ قَالَ: «قَالَ: يَعْنِى اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ: لاَ يَنْبَغِى لِعَبْدٍ لِى (وَقَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى لِعَبْدِى) أَنْ يَقُولَ أَنَا خَيْرٌ

مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى عَلَيْهِ السَّلاَمُ». {الحديث: ٦١٠٩ = ٦١١٥ فم. تجريد/٤، رقم: ١٣٦٢ = ٣٤١٦، ٣٤١٥، ٤٦٠٤، ٤٦٣١، ٤٨٠٥، ٤٦٣٣. تحفة الآشراف: ١٢٢٧٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (واتە: خودای گەورەو مەزن فەرمووی): بۆ هیچ بەندەیەکی من ڕەوا نییە کە لەخۆیەوە بڵێ: من باشترم لە یونسی کوڕی مەتتا). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٣٢١٥}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەدوو مامۆستای خۆیەوە دەیگێڕێتەوە، کە (ئەبوبەکری کوڕی شەیبە)و (موحەممەی کوڕی موثەننا)ن، جیاوازییەکی زۆر کەم لەیەك وشەدا هەیە، لەنێوانی گێڕانەوەی ئەبوبەکرو موحەممەدی کوڕی موثەنناددا، بەم شێوەیە: لە گێڕانەوەی ئەبوبەکرا وشەکە (لِعَبْدِلِی)یە، بەڵام لە گێڕانەوەی موحەممەدی کوڕی موثەنناددا، وشەکە (لِعَبْدِي)یە، لە وەرگەڕاوە کوردییەکەدا پاڵفتەی واتای دوو وشەکە (یا دوو لەفظەکە) ڕەچاوکراوە.

٢- مەبەست لەوە کە دەفەرموێ: بۆ هیچ بەندەیێ ڕەوا نییە، کە لەخۆیەوە بڵێ... تاد، بەڵام ئەگەر لەخۆیەوە نەبوو، وە بەپێی بەڵگەیەکی قورئانی، یا فەرموودەیی بوو، ئەوە دروستە.

## ١٢٥٨) باسی عیسا (درووودی خودای لەسەر بێ). (٦٠٨٣ - ٦٠٨٩)

## بَابٌ: فِي ذِكْرِ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلاَمْ

١٦١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ فِي الأُولَى وَالآخِرَةِ». قَالُوا: كَيْفَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ مِنْ عَلاَّتٍ، وَأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى، وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ، فَلَيْسَ بَيْنَنَا نَبِيٌّ». {الحديث: ٦٠٨٥ = ٦٠٨٦ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤، رقم: ١٣٧١ = ٣٤٤٢، ٣٤٤٣. أبو داود. السنة: ٤٦٧٥. تحفة الأشراف: ١٤٧٦٩}:

ئــەبو هــورەیرە (رەزای خــودای لێ بــێ) دەفــەرموێ: خۆشەویســت (دروودی خــودای لەســەر بــێ) دەفەرموێ: (لەهەردوو جیهانـدا مـن لەهـەموو کەسێکی تـر، لەپێشـترم بـە عیسـای کوڕی مەریەم).

عەرزیان کرد: چۆن؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (پێغەمبەرەکان هەموو بـرای یـەکترین، بـەڵام دایکیـان جیایـەو هەریـەکێ لەهەوێیـەکن، گەرچـی دایکیـان جیایە (واتە: شەریعەتەکانیان جیا جیایە) بەڵام لە بنەڕەتدا ئایینەکەیان یەکە، کە خـودا بەیـەك زانـینو یـەکتا پەرستیە، هۆی ئـەوەیش کـەمن لەپێشـتر پێغەمبـەرم بەعیسا ئەوەیە کە لەنێوانی منو لەنێوانی ئـەودا پێغەمبـەری تـر نییـە). {تـاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٣٢١٢}.

### ١٢٥٩) هەموو منداڵێ کاتێ لەدایك دەبێ شەیتان سەرە سیخورمەیەکی لێ دەدا، مەریەمو عیسای کوڕی نەبێ. (٦٠٨٣ - ٦٠٨٩)

### بَابٌ: مَسِّ الشَّيْطَانِ كُلَّ مَوْلُودٍ إِلاَّ مَرْيَمَ وَابْنَهَا عَلَيْهِ السَّلاَمُ

١٦١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا مِنْ مَوْلُودٍ يُولَدُ إِلاَّ نَخَسَهُ الشَّيْطَانُ، فَيَسْتَهِلُّ صَارِخًا مِنْ نَخْسَةِ الشَّيْطَانِ إِلاَّ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ». ثُمَّ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: (وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ). {الحديث: ٦٠٨٦ = ٦٠٨٩ فم. بخاري. تفسير: ٤٥٤٨. تحفة الأشراف: ١٣٢٧٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (هەموو منداڵێ کاتێ لەدایك دەبێ، شـەیتان سـەرە سـیخورمەیەکی لێ دەدا، بـەهۆی ئەو سەرە سیخورمەی شەیتانەوەیە کە منـداڵ هـەر کەلـەدایك دەکەوێتـە خـوارەوە، دەس بەجێ هاوارو قیژەیێ دەکـا، بـەڵام عیسـای کـوڕی مەریـەمو مەریـەمی دایکـی، بەرئەم سەرە سیخورمەیە نەکەوتوون).

ئـەبو هـورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فـەرمووی: ئەگـەر حەزدەکـەن بـۆ پشـتیوانی ئـەم فەرموودەیە ئەم ئایەتە بخوێنن:

{وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ - آل عمـران – ٣/٣٦}: واتـە: وە بەڕاستی من ئەم کچەمو نەتەوەی ئەم کچەم دەهاومـە پـەنای میهرەبـانو تـەوانایی

تۆوە، لە دەس بۆ بردنو زیان لێدانی ئیبلیسی دەرکراوی بەشبڕاو لە ڕەحمەتی تۆ!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٣٢١١ ج/٤}.

**١٢٦٠) فەرمایشتی عیسا: باوەڕم هەیە بەخوداو چاوی خۆم بەدرۆ دەخەمەوە!**
**(٦٠٨٣ - ٦٠٨٩)**

**بَابٌ: قَوْلُ عِيسَى عَلَيْهِ السَلاَمْ آمَنْتُ بِاللَّهِ وَكَذَّبْتُ نَفْسِي**

١٦٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَجُلاً يَسْرِقُ فَقَالَ لَهُ عِيسَى: سَرَقْتَ؟ قَالَ: كَلاَّ وَالَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ، فَقَالَ عِيسَى: آمَنْتُ بِاللَّهِ، وَكَذَّبْتُ نَفْسِي». {الحديث: ٦٠٨٩ = ٦٠٩٣ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٣٧٢ = ٣٤٤٤ فتح الباري}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرمویێ:** (عیسای کوڕی مەریەم (سڵاوی خودایان لێ بێ) چاوی لێ بوو، کابرایێ دزی دەکا، پێی فەرموو: تۆ دزیت دەکرد. کابراکە گوتی: نەء، بەو خودایەی کەهەر خۆی خودایە، من شتی وام نەکردووە! عیسای کوڕی مەریەمیش (دروودی خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: باوەڕم هەیە بەخوداو چاوی خۆم بەدرۆ خستەوە!!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٣٢١٣}.

**ڕوونکردنەوە:**

دەڵێن: جارێ کوێرێكو ئیفلیجێكو پیاوێكی ساخ، لەجێگەیێ دەبن، ساخەکە بڕێ پارەی پێ دەبێ، لە بنمیچی جێگەکەدا دەیشارێتەوەو دەڕوا بۆ کارێ، کەدێتەوە دەڕوانێ پارەکە نەماوە، بۆ چارەسەرو ڕاوێژ دەچێ بۆلای عیسا، عیسا دەچێ لەگەڵیا بۆ جێگەی پارە دزراوەکە، لێی دەپرسێ: کێت لەگەڵدا بوو؟ دەڵێ: منو ئەم کوێرەو ئەم ئیفلیجە بووین، دیارە ئەم کوێرە چاوی لێم نەبووەو ئەمەیش ئیفلییجە، کەواتە دزەکە ئەمانە نییە!! عیسا دەفەرموێ: (بە پێچەوانەوە، قاچی ئەم کوێرەو چاوی ئەم ئیفلییجە ئەم دزییەیانکردووە!).

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥١- نامەی گەورەیی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودای گەورە لە یاران‌و هاوەڵانی بێ)

## كِتَابُ فَضَائِلِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

{بڕوانە: تاجول ئوصول بە كوردی، بەرگی سێیەم زنجیرە: ١ هەتا زنجیرە: ٧٥ لە ژمارە: ٣٢٢١ وە هەتا ژمارە: ٣٥٨٩ لە لاپەڕە: ٥٣٠ وە هەتا لاپەڕە: ٧٨٠ ج/٤} + {مختصر صحيح البخاری المسمّی بـ(التجريد الصّريح) لە زنجيرە:٦٦ وە هەتا زنجيرە: ٦٧ لە ژمارە: ١٤٤٩ وە هەتا ژمارە: ١٥٢٢}.

### ١٢٦١) باسی بەهرەو گەورەیی ئەبوبەكری صەدیق (ڕەزای خودای لێ بێ) لەگەڵ باسی فەرمایشتی پێغەمبەر: (ئەی ئەبوبەكر گومانت چییە بەو دوو كەسە، كە خودا خۆی كەسی سێیەمیانە). (٦١١٩ - ٦١٣٦)

### بَابٌ: فَضَائِلُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَقَوْلُهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللهُ ثَالِثُهُمَا)

١٦٢١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَظَرْتُ إِلَى أَقْدَامِ الْمُشْرِكِينَ عَلَى رُءُوسِنَا وَنَحْنُ فِي الْغَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ نَظَرَ إِلَى قَدَمَيْهِ أَبْصَرَنَا تَحْتَ قَدَمَيْهِ، فَقَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا». {الحديث: ٦١١٩ = ٦١٢٥ فم. تجريد البخاری/٤، رقم: ١٥١٩ = ٣٩٢٢، ٣٦٥٣، ٤٦٦٣}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبوبەكری صەدیق (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا بووم، لەسەفەری كۆچدا، لەناو ئەشكەوتەكەی چیای سەور بووین، ئەو دەستەیەی كەلە ناموسوڵمانەكانی مەككە شوێنمان كەوتبوون، كە یا بمانكوژن، یا دیلمانبكەن، سەركەوتبوونە سەر سەربانی ئەشكەوتەكەو، بەسەر سەرمانەوە ڕاوەستابوون، كە تەماشام كردو سەرم هەڵبڕی وا قاچی ئەو دەستەیە دیارن لەمنەوە، عەرزی حەزرەتم كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ ئەگەر یەكێكیان تەماشای ژێرپێی خۆی بكا، لەبەرپێی خۆیدا دەمانبینێ‌و كەشف دەبین‌و دەمان كوژن!

فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئـەی ئەبوبـەکر! بـێ دەنگبـە، ئێمـە دوو کەسـین، خودا خۆی کەسـی سـێیەممانە، دەی گومانـت چییە بـەو دوو کەسـە کەخودا خـۆی کەسـی سـێیەمیانە. واتـە: خـەمت نـەبێ خـودای گـەورە لەگەڵمانـە، کەسـێ خـودای لەگـەڵ بـێ، کـەس زەفـەری پـێ نابـا). {تـاج/٤، زنجـیرە: ١٠، ژمـارە: ٣٩٠٣. تەفسـیری سوورەتی تەوبە}.

**١٢٦٢) فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەبوبەکر لەگشت کەس پتر پیاوەتی بەسەر منەوە هەیە).**

**بَابٌ: قَوْلُهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي مَالِهِ وَصُحْبَتِهِ أَبُو بَكْرٍ (رضي اللهُ عنهُ)**

١٦٢٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِي (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: «عَبْدٌ خَيَّرَهُ اللَّهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ زَهْرَةَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ، فَاخْتَـارَ مَـا عِنْـدَهُ». فَبَكَـى أَبُـو بَكْـرٍ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) وَبَكَـى، وَقَـالَ: فَـدَيْنَاكَ بِآبَائِنَـا وَأُمَّهَاتِنَا، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) هُـوَ الْمُخَيَّـرُ، وَكَـانَ أَبُـو بَكْـرٍ أَعْلَمَنَا بِهِ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَمَـنَّ النَّـاسِ عَلَـيَّ فِـي مَالِـهِ وَصُحْبَتِهِ أَبُو بَكْرٍ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً، لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً، وَلَكِنْ أُخُـوَّةُ الإِسْـلاَمِ، لاَ تُبْقَيَنَّ فِي الْمَسْجِدِ خَوْخَةٌ إِلاَّ خَوْخَةَ أَبِي بَكْـرٍ». {الحـديث: ٦١٢٠ = ٦١٢٦ فـم. تجريـد البخاري/١، رقم: ٢٨٦ = ٤٦٦، ٣٦٥٤، ٣٩٠٤ فتح البـاري. ترمـذي. منـاقب: ٣٦٦٠. تحفة الأشراف: ٤١٤٥}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لەسـەردوانگە دانیشـت، وتـارێکی بۆمانـدا، فـەرمووی: (خـودا بەندەیـەکی خـۆیی کـردووە بەسـەر پشـك: کـە یـا لەجیهانـدا بمێنـێو بەهرەمەنـدبێ لەخۆشـی دنیـای رازاوە، یـان ئـەو بـەشو بارەیـە هـەڵبگرێ کـە لـەلای خـودا دانـراوە بـۆی، ئـەو بەندەیەیش ئەو بەشو بارەیەی هەڵبژار کە لەلای خودایە).

فەرمووی: جا ئەبوبەکری صەدیق، کە گوێی لەم فەرمایشتەی پێغەمبـەر بـوو، دەسـتی کـرد بـەگریانو زۆر گریـا، وە فـەرمووی: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! باوكو دایکمان دەکەین بە قوربانی تۆ!

فەرمووی: ئێمە ئەم گریانەی ئەومان بەلاوە سەیر بوو!! تەنانەت من لەدڵی خۆما گوتم: ئەم پیرە مێردە بۆ دەگری؟ لەبەرئەوەی کەخودا بەندەیەکی کردووە بەسەرپشك لەنێوانی خۆشی جیهانو لەنێوانی ئەو بەشو بارەیەی کەوا لەلای خودا، وە بەندەکەیش بەشو بارەو بەهرەکەی لای خودای هەڵبژاردبێ شتی وا گریانی بۆچییە؟

تومەز ئەو بەندەیەی کەکرابوو بەسەرپشكو خاترخۆ کرابوو، لەنێوان ئەم جیهانو ئەو جیهاندا پێغەمبەر خۆی بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) وە ئەبوبەکر (ڕەزای خودای لێ بێ) لەئێمە باشتر لەمەبەستی فەرموودەکەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تێگەشتبوو. پێغەمبەر فەرمووی: (ئەی ئەبوبەکر! مەگری، بەڕاستی ئەبوبەکر لەهەموو کەس زیاتر پیاوەتی بەسەرمنەوە هەیە، چ بەگیان، چ بەسامان، ئەگەر من لە ئۆمەتم کەسێکم بگرتایە بەدۆست بۆ خۆم، ئەبوبەکرم هەڵ دەبژاردو دەمکرد بەدۆستی گیانی بەگیانی خۆم، بەڵام کەسێ لەئۆمەتم ناگرم بەدۆستو خەلیلی تایبەتی بۆ خۆم، چونکە من خودا کردوومی بەدۆستی خۆی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تا بڵێی برایەتیو دۆستایەتی ئایینی ئیسلام لەنێوانمانا پتەوو بەهێزە لەسایەی خوداوە!). هەتا ئەوکاتە گەلێ لە هاوەڵان دەرگایان لەسەر ماڵی مزگەوت بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەم بابەتە فەرمووی: (هەردەرگایێ لەسەر مزگەوتە دەبێ بگیرێ، تەنیا دەرگای ماڵەکەی ئەبوبەکر نەبێ!). {تاج/٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٢٣٤، چ/٤}.

**١٢٦٣) خۆشەویسترین کەس لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکری صەدیقە. (٦١١٩ - ٦١٣٦)**

**بابُ: أحبُّ النّاس إلى النّبيّ (صلّى اللّهُ عليْهِ وسلم) أبُو بكْر الصّدّيق (رضي اللّهُ عنْهُ) وأرْضاه**

١٦٢٣- عَنْ أَبِى عُثْمَانَ قَالَ: أَخْبَرَنِى عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بَعَثَهُ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السَّلَاسِلِ فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: «عَائِشَةُ»، قُلْتُ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: «أَبُوهَا»، قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ عُمَرُ». فَعَدَّ رِجَالاً. {الحديث: ٦١٢٧ = ٦١٣٣ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٤٥٢ = ٣٦٦٢، ٤٣٥٨}:

ئەبو عثمان فەرمووی: عەمری کوڕی عاص (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) منـی کـرد بـە فەرماندەی سوپای غـەزای زاتـو سەلاسیل، چوومە خزمـەتی، عـەرزیمکرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! کـێ زۆر خۆشەویستە لـەلات؟ فـەرمووی: (عائیشـە). وتم: ئـەی لـەپیاوان؟ فـەرمووی: (بـاوکی عائیشـە). واتـە: ئەبوبەکری صەدیق. گوتم: لەپاش ئەوان کێـی تـر؟ فـەرمووی: (عومـەر). حـەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) چەند کەسێکی تریشی ژمارد کە خۆشی دەوێن). {تـاج/٣، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٣٤١٨}.

**١٢٦٤) کۆمەڵێ کاری چاکە لە ئەبوبەکری صەدیقدا کۆبوونەتەوەو بوون بەهۆی ئەوە کە بیکەن بە بەهەشتی**

**بَابٌ: إِجْتِمَاعُ أَعْمَالِ البر للصدّيق ودخوله الجنة**

{بڕوانە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە، کە لەپێشەوە لەژمارە: (٥٤٣)دا رابورد}.

**١٢٦٥) فەرموودەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ): (منو ئەبوبەکرو عومەر باوەڕمان بەمە هەیە). (٦١١٩ - ٦١٣٦)**

**بَابٌ: فِي قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَإِنِّي أُومِنُ بِهِ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ**

١٦٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَسُوقُ بَقَرَةً لَهُ قَدْ حَمَلَ عَلَيْهَا الْتَفَتَتْ إِلَيْهِ الْبَقَرَةُ فَقَالَتْ: إِنِّي لَمْ أُخْلَقْ لِهَذَا، وَلَكِنِّي إِنَّمَا خُلِقْتُ لِلْحَرْثِ». فَقَالَ النَّاسُ: سُبْحَانَ اللَّهِ تَعَجُّبًا وَفَزَعًا! أَبَقَرَةٌ تَكَلَّمُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَإِنِّي أُومِنُ بِهِ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «بَيْنَا رَاعٍ فِي غَنَمِهِ عَدَا عَلَيْهِ الذِّئْبُ، فَأَخَذَ مِنْهَا شَاةً، فَطَلَبَهُ الرَّاعِي، حَتَّى اسْتَنْقَذَهَا مِنْهُ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ الذِّئْبُ فَقَالَ لَهُ: مَنْ لَهَا يَوْمَ السَّبُعِ؟ يَوْمَ لَيْسَ لَهَا رَاعٍ غَيْرِي». فَقَالَ النَّاسُ: سُبْحَانَ اللَّهِ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَإِنِّي أُومِنُ بِذَلِكَ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ». {الحديث: ٦١٣٣ = ٦١٣٩ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٠٢٢ = ٢٣٢٤، ٢٤٧١، ٣٦٦٣، ٣٦٩٠}.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پیاوێ ڕەشەوڵاخێکی بارکردبوو، لێی دەخوڕی، لەوکاتەدا ڕەشەوڵاخەکە ئاوڕی لێ دایەوەو گوتی: من بۆ ئەمە دروست نەکراوم، من بۆ جووتکردنو زەوی کێڵان دروست کراوم، نەك بۆ بارو سواربوون، خودا هەرشتێکی بۆ شتێ دروست کردووە: مرۆڤ بۆ خواپەرستی، گا بۆ جووتکردن!

جا خەڵکەکە لەمە سەرسام بوونو تۆقین، کە وڵاخ قسەبکاو هانایان بردەبەر یادوزیکری خوداو گوتیان: سوبحانەڵڵا! نامەخوا لەکاری خوا، ڕەشە وڵاخ قسە دەکا!!

جا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر هەندێ کەس سەرسام دەبن لەقسەکردنی ئاژەڵی بێ زمان، بەڵام من خۆمو ئەبوبەکری صەدیقو عومەری فاروق، باوەڕدەکەین بەم گفتوگۆیە، سەرسام مەبن لەشتی وا، بۆ خوا چی تێ دەچێ، ئەوکەسەی کە ئادەمیزادی هێناوەتە قسە، دەتوانێ ئاژەڵیش بهێنێتە قسە!).

ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (جارێ گورگێ مەڕێ دەفڕێنێت لەبەر شوانێ، شوانەکە شوێنی دەکەوێو دەنیشێتە سەری، هەتا لێی دەسێنێتەوە، جا گورگەکە ئاوڕ لە شوانەکە دەداتەوەو پێی دەڵێ: ئەی ڕۆژەکە کە ڕۆژ ڕۆژی دڕندەیەو، جگە لەمن شوانی تری نییە، کێ ڕزگاری دەکا لەچنگم!!

مەردومەکە گوتیانەوە: سوبحانەڵڵا، نامەخوا لەکاری خوا، چەند جوانە!

خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (منو ئەبوبەکرو عومەر باوەڕ بەمە دەکەین!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧١، ژمارە: ١٩١٩ چاپی چوارەم}.

## ١٢٦٦) هاوڕێتی ئەبوبەکری صەدیقو عومەری فاروق بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). (٦١٣٧ - ٦١٥٨)

## بابٌ: مرافقة الصدّيق والفاروق النّبيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٦٢٥- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما) قَالَ: وُضِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَلَى سَرِيرِهِ، فَتَكَنَّفَهُ النَّاسُ يَدْعُونَ وَيُثْنُونَ وَيُصَلُّونَ عَلَيْهِ قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، وَأَنَا فِيهِمْ، قَالَ: فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ بِرَجُلٍ قَدْ أَخَذَ بِمَنْكِبِي مِنْ وَرَائِي، فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ عَلِيٌّ (رَضِيَ

اللهُ عَنْهُ)، فَتَرَحَّمَ عَلَى عُمَرَ وَقَالَ: مَا خَلَّفْتَ أَحَدًا أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَلْقَى اللَّهَ بِمِثْلِ عَمَلِهِ مِنْكَ، وَايْمُ اللَّهِ إِنْ كُنْتُ لأَظُنُّ أَنْ يَجْعَلَكَ اللَّهُ مَعَ صَاحِبَيْكَ وَذَاكَ أَنِّي كُنْتُ أُكَثِّرُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «جِئْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَدَخَلْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَخَرَجْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَإِنْ كُنْتُ لأَرْجُو أَوْ لأَظُنُّ أَنْ يَجْعَلَكَ اللَّهُ مَعَهُمَا».

{الحديث: ٦١٣٧ = ٦١٤٣ فم. تجريد البخاری/٤، رقم: ١٤٥٧ = ٣٦٧٧، ٣٦٨٥}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپاش پێکانی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) کاتێ مرد، لەسەر دارە تەرمێ، تەرمی عومەریان دانابوو، خەڵکەکە دەورەیان لێی دابوو، بۆی دەپاڕانەوەو وەسپی باشیی ئەویان دەکردو نوێژیان لەسەر تەرمەکەی دەکرد، من خۆمیان تیادابووم، ئەمەیش لەپێش ئەوەدابوو کە بیبەن بینێژن، لەناکاو ئەوەندەم زانی پیاوێ لە پشتمەوە ئانیشکی دانا لەسەر سەرشانم، کە ئاوڕم لێ دایەوە، تەماشایم کرد عەلی کوڕی ئەبو طالیب بوو (رەزای خودای لێ بێ)، جا رەحمەتی نارد بۆ عومەرو فەرمووی: ئەی رەحمەتی خودات لێ بێ، کارێکی مەردانەی وات کردووە کە کەسێکی ترت نەهێشتۆتەوە، لەپاش خۆتەوە، کە حەزبکەم رەفتاری ئەو بگرمو بە مانەندی کردەوەی ئەوەوە بچمەوە دیداری خودا جگە لەخۆت، بەڕاستی بوویت بەسەر مەشقی هەرە باڵا بۆمان، سوێندم بەخودا بەڕاستی هیوام وابوو کە خودا بەسەر بەرزی شادت بکاتەوە بە دیداری هەردوو هاوڕێکانت، کە پێغەمبەرو ئەبوبەکرن، چونکە گەلێ جار من دەمژنەوت لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی پێکەوە ژیانی خۆشیی خۆیو ئێوەی بەشانازییەوە دەکردو دەیفەرموو: (منو ئەبوبەکرو عومەر چووین بۆ ئەوێ، وەمنو ئەبوبەکرو عومەر چووین بۆ ماڵەوە، وە منو ئەبوبەکرو عومەر دەرچووین بۆ فیسارە شوێن!).

ئەوجا عەلی فەرمووی: (هەمیشە من ئومێدم بە لوتفی خودا وابوو کە شادت بکا بەهەردوو هاوەڵەکەت، واتە: بە پێغەمبەرو بە ئەبوبەکر).

**١٢٦٧) دانانی ئەبوبەكری صەدیق بەجێنشین** (ڕەزای خودای لێ بێ). (٦١١٩ - ٦١٣٦)

**بَابٌ: إِسْتِخْلَافُ الصِّدِّيقِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)**

١٦٢٦- عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها)، وَسُئِلَتْ مَنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مُسْتَخْلِفًا لَوِ اسْتَخْلَفَهُ؟ قَالَتْ: أَبُو بَكْرٍ، فَقِيلَ لَهَا: ثُمَّ مَنْ بَعْدَ أَبِي بَكْرٍ؟ قَالَتْ: عُمَرُ. ثُمَّ قِيلَ لَهَا: مَنْ بَعْدَ عُمَرَ؟ قَالَتْ: أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ. ثُمَّ انْتَهَتْ إِلَى هَذَا. {الحديث: ٦١٢٨ = ٦١٣٤ فم} :

ئیبنو ئەبی مولەیکە فەرمووی: من گوێم لێ بوو، پرسیار لە عائیشە کرا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کێی دەکرد بەجێنشین ئەگەر لەپاش مەرگی جێنشینی بۆخۆی دابنایە؟ فەرمووی: ئەبوبەکری صەدیق. عەرزیان کرد: ئەی دوای ئەو کێی تری دەکرد بەجێنشینی خۆی لەپاش ئەبوبەکر؟ فەرمووی: عومەر، دیسان عەرزیکرا: ئەی دوای عومەر کێی دەکرد بەجێنشین ئەگەر جێنشینی دیاری بکردایە لەدوا عومەر؟ فەرمووی: ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراح. ئیتر عائیشە لێرەدا کۆتایی پێ هێناو باسی جێنشینی تری نەکرد لەپاش ئەبو عوبەیدە.

**ڕوونکرنەوە:**

وەك بلێیت عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەم وەڵامەی خۆی لەم فەرموودەیەوە هەڵێنجابێ، کە دەفەرموێ: لەغەزای مۆتەدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) زەیدی کوڕی حاریثی کرد بەسەرکردەی سوپاکە، لەپاشا فەرمووی: (ئەگەر زەید کوژرا ئەوا جەعفەر لەشوێنی ئەو سەرکردەیە، ئەگەر جەعفەریش کوژرا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە سەرکردەیە). {بخاری. مغازی: ٤٢٦٢. تاج/٤، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٤٦٤٠ چ/٤}.
{بڕوانە: فەرموودەی ژمارە: (١٦٢٨) کە لەپاش یەك فەرموودەی تر دێت}.

١٦٢٧- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) شَيْئًا، فَأَمَرَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ جِئْتُ فَلَمْ أَجِدْكَ. قَالَ أَبِي: كَأَنَّهَا تَعْنِي الْمَوْتَ. قَالَ: «فَإِنْ لَمْ تَجِدِينِي فَأْتِي أَبَا بَكْرٍ». {الحديث: ٦١٢٩ = ٦١٣٥ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٤٤٩ = ٣٦٥٩، ٧٢٢٠، ٧٣٦٠} :

موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موطعیم (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: ژنێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای شتێکی لێ کرد، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو شتەی نەبوو، فەرمووی پێی: جارێکی تر وەرەوە ژنەکەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر هاتمەوەو تۆم دەست نەکەوت بچم بۆلای کێ کە لەباتی خۆت بەڵێنەکەت جێبەجێ بکا بۆم؟ ژنەکە لەم پرسیارە وەك بڵێیت مەبەستی ئەوە بوو، ئەگەر من هاتمەوەو تۆ مردبووی، بۆ موراجەعە بچم بۆلای کێ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەگەر هاتیتەوەو منت دەست نەکەوت، بچۆ بۆلای ئەبوبەکر، ئەو لەباتی من کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکات). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٢٤٥٩ چ/٤}.

١٦٢٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى مَرَضِهِ: «ادْعِى لِى أَبَا بَكْرٍ أَبَاكِ، وَأَخَاكِ، حَتَّى أَكْتُبَ كِتَابًا، فَإِنِّى أَخَافُ أَنْ يَتَمَنَّى مُتَمَنٌّ، وَيَقُولَ قَائِلٌ أَنَا أَوْلَى، وَيَأْبَى اللَّهُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلاَّ أَبَا بَكْرٍ». {الحديث: ٦١٣١ = ٦١٣٧ فم. تجريد البخارى بالكوردى. المجلد/٥، رقم: ١٨٦٥ = ٥٦٦٦، ٧٢١٧}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو نەخۆشییەیدا کەتیا مرد، فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەبوبەکری باوکتو براکەتم بۆ بانگ بکە، هەتا وەصێتنامەیێ بنووسم بۆ ئەبوبەکر کە لەپاش مەرگی خۆم ئەو جێنشینم بێ، نەبادا هەرکەسە بۆ خۆی هەوڵبدا بۆ شوێنەکەمو بڵێ: جێنشینی هەقی منەو بۆ من رەواترەو بڕوبیانوو بۆ ئەمە بدۆزنەوە. بەڵام نا، پێویست بە نووسینی راسپێرینامە ناکا، چونکە نەخودا شتی وا دەکا، کە جگە لە ئەبوبەکر کەسێ ببێ بە جێگەنشینم، نە موسوڵمانانیش شتی وا قەبووڵ دەکەنو جگە لە ئەبوبەکر بەکەسی تر رازی نابن کە لەپاش خۆم ببێ بەجێنشینم).

ئەوەبوو وابوو لەپاش مەرگی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکر بە هەڵبژاردن کرا بەجێنشین!

## ١٢٦٨) باسی بەهرەو گەورەیی عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودای لیّ بیّ). (٦١٣٧ - ٦١٥٨)

## بابٌ: فَضَائِل عُمَرُ بْنُ الْخَطَّاب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)

١٦٢٩- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ علىَّ، وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ، مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ دُونَ ذَلِكَ، وَمَرَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ»، قَالُوا: مَاذَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الدِّينَ». {الحديث: ٦١٣٩ = ٦١٤٥ فم. تجريد البخاري/١، رقم: ٢٢ = ٢٣، ٣٦٩١، ٧٠٠٨، ٧٠٠٩. ترمذي. رؤيا: ٢٢٨٥. نسائي. إيمان: ٥٠٢٦. تحفة الأشرناف: ٦٧٠٠}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) فەرمووی: (نووستبووم لەخەوما ئەو خەڵکەم پیّ نیشان دران، هەموو سەرو کراسیان لەبەردا بوو، هەیان بوو کراسەکەی زۆر کورمت بوو دەگەیشتە سەر مەمکیو هەیان بوو لەوە زیاتر یا کەمتر بوو، بەلاّم کە سەرەی عومەری کوڕی خەتاب هاتو ئەو بە بەردەمما رانوێنراو رەت بوو، تەماشام کرد کراسێکی ئاودامانی لەبەردابوو لەبەر پێی دەخشا).

عەرزیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوەت بەچی خەو پەرژێن کردو بەچی لێکت دایەوە؟ فەرمووی: (بە ئایین!).

**روونکردنەوە:**

کراس لەخەوندا ئایینە، هەتا باشو داپۆشەرو تێرو تەسەل بیّ واتای وایە خاوەنەکەی ئایینی قایمترە.

١٦٣٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَهُ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ رَأَيْتُ قَدَحًا أُتِيتُ بِهِ فِيهِ لَبَنٌ فَشَرِبْتُ مِنْهُ حَتَّى إِنِّى لأَرَى الرِّيَّ يَجْرِى فِى أَظْفَارِى، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ». قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الْعِلْمِ». {الحديث: ٦١٤٠ = ٦١٤٦ فم. تجريد البخاري بالكوردي. المجلد الأوّل، رقم الحديث: ٧١ = ٨٢، ٣٦٨١، ٧٠٠٦، ٧٠٠٧، ٧٠٢٧، ٧٠٣٢}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ خەوتبووم، لەخەوما کاتێچکم زانی پیاڵەیێ شیریان هێنا بۆم، جا خۆم لێیم خواردەوە هەتا تەواو تەواو پاراو بووم و شیر لەسەری پەنجەکانمەوە سەر ڕێژی دەکردو لە لووتمەوە هاتەوە، ئەنجا پاشماوەکەی خۆمم دا بە عومەری کوڕی خەتاب، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بەچی لێك دەدەیتەوە؟ فەرمووی: (بەزانین).

لەپەڕەی دڵت لەجێگەی دەفتەر
بنووسە، بڵێ: (اللّٰهُ أَكْبَرْ)
وەك لەوحولمەحفوز نەخشەی بوونەوەر
نووسرا لە لەوحی سنگی پێغەمبەر
پەنجەی چون قەڵەم، سینگی چون دەفتەر
نووسرا لەدوو تویێی زانین سەراسەر
مەڵێ چۆن چۆنی جێی دەبێتەوە
ڕەخنەی وابخە ژێری پێتەوە!!
(گەر زەررێ شعوور وەها پێتەوە
کە گوتت خودا دەبڕێتەوە!!)
پێوەری ژێری بکە بەرابەر
شت لەگەڵ شتا بکە بەرابەر:
بەقەد نیسکێکە دیسکی کۆمپیتەر
بەقەد سەد مەلا عیلمی وا لەبەر

١٦٣١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّـهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِى عَلَى قَلِيبٍ عَلَيْهَا دَلْوٌ، فَنَزَعْتُ مِنْهَا مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ أَبِى قُحَافَةَ فَنَزَعَ بِهَا ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ وَفِى نَزْعِهِ ضَعْفٌ (وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَهُ) ثُمَّ اسْتَحَالَتْ غَرْبًا فَأَخَذَهَا ابْنُ الْخَطَّابِ، فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا مِنَ النَّاسِ يَنْزِعُ نَزْعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ». {الحديث: ٦١٤٢ = ٤١٤٨ فـم. بخارى. فضائلُ أصحاب النَّبِىِّ: ٣٦٦٤، ٧٠١٩، ٧٠٢٠، ٧٠٢١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (جارێ خەوتبووم، لەخەوما لەسەر بیرێ بووم، سەتڵێکی لەسەر بوو، چەندەی خودا حەزی

لەسەری بوو ئاوم بەو سەتڵە لێ هەڵگۆزێ، لەوکاتەدا ئەبوبەکرو عومەریش پەیدابوون، لەپاش من ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قوحافە دۆڵچە (سەتڵ)کەی هەڵگرتو بەکزێکەوە، دۆڵچەیێ، دوو دۆڵچە ئاوی هەڵکێشا، خودای گەورە بە بەخششی خۆی لێی ببورێ، ئەنجا عومەری کوڕی خەطاب لەدەستی ئەبوبەکری وەرگرتو دۆڵچەکە لەدەستی عومەردا بوو بە سەتڵێکی گەورە، کە بەقەد مەشکەیێ گاوەس ئاوبگرێ، کەسم نەدیوە لەو خەڵکە، کە ئاوا وەك عومەر بلیمەت بێو ئاوا بەهەڵپەو هەڵمەتو دەستو بردبێ، جا عومەر بەشێوەیەکی وا ئاوی زۆرکرد، هەتا خەڵکەکە لەدەوری بیرەکە پەچەیان بۆ ئاژەڵەکانیان بەست، بۆ حەوانەوەیان لەپاش پاراو بوون!). {تاج/٤، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٤٢٥١ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: زاناکان (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) دەفەرموون: ئەم خەونەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نموونەیەکی ڕوونو ئاشکرایە بۆ حاڵی ئەبوبەکرو عومەر، لەکاتی جێنشینییاندا، لەپاش پێغەمبەر، کەچۆن ئەمانیش شوێن پێی حەزرەتیان هەڵگرتووەو بە سوننەتو ڕەفتاری جوانی ئەو کاریان کردووەو بوون بەمایەی ڕەحمەتو پیتو فەڕو سوود بۆسەرجەمی خەڵك.

١٦٣٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَّهُ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ رَأَيْتُنِى فِى الْجَنَّةِ، فَإِذَا امْرَأَةٌ تَوَضَّأُ إِلَى جَانِبِ قَصْرٍ، فَقُلْتُ لِمَنْ هَذَا؟ فَقَالُوا: لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ. فَذَكَرْتُ غَيْرَةَ عُمَرَ، فَوَلَّيْتُ مُدْبِرًا». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَبَكَى عُمَرُ وَنَحْنُ جَمِيعًا فِى ذَلِكَ الْمَجْلِسِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، ثُمَّ قَالَ عُمَرُ: بِأَبِى أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعَلَيْكَ أَغَارُ؟. {الحديث: ٦١٤٨ = ٦١٥٤ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٤٥٨ = ٣٦٧٩، ٥٢٢٦، ٧٠٢٤}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خەوتبووم، وا لەخەوما وام لەبەهەشتا، تەماشام کرد وا ئافرەتێ نازدار لەپاڵ تەلارێکا دەسنوێژ دەگرێ. گوتم: ئەم کۆشكو تەلارە هی کێیە؟ گوتیان: هیی

عومەری کوڕی خەتابە، جا ویستم کە بچمە ناوی‌و لەناوەوە تەماشای بکەم، بەڵام کەیادی غیرەتی عومەرم کەوتەوە، کەچەندە بەتەنگ ناموسەوە دێت ئیتر نەچوومە ژوورەوەو بەرەو دوا گەڕامەوە).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمە هەمووومان لەو کۆڕی دانیشتنی پێغەمبەرەدا ئامادەبووین، عومەریش لەوێ بوو، لەخۆشیدا دەستی کرد بەگریان، لەپاشا عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوك‌و دایکم بەقوربانت بن، چۆن دڵ لەتۆ پیس دەکەم؟). {تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٢٤٩، ٣٢٤٨}.

١٦٣٣- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَأْذَنَ عُمَرُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَعِنْدَهُ نِسَاءٌ مِنْ قُرَيْشٍ يُكَلِّمْنَهُ وَيَسْتَكْثِرْنَهُ، عَالِيَةً أَصْوَاتُهُنَّ، فَلَمَّا اسْتَأْذَنَ عُمَرُ، قُمْنَ يَبْتَدِرْنَ الْحِجَابَ فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَضْحَكُ، فَقَالَ عُمَرُ: أَضْحَكَ اللَّهُ سِنَّكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «عَجِبْتُ مِنْ هَؤُلاَءِ اللاَّتِي كُنَّ عِنْدِي، فَلَمَّا سَمِعْنَ صَوْتَكَ ابْتَدَرْنَ الْحِجَابَ»!. قَالَ عُمَرُ: فَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يَهَبْنَ. ثُمَّ قَالَ عُمَرُ: أَيْ عَدُوَّاتِ أَنْفُسِهِنَّ أَتَهَبْنَنِي وَلاَ تَهَبْنَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟! قُلْنَ: نَعَمْ أَنْتَ أَغْلَظُ وَأَفَظُّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)! قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ قَطُّ سَالِكًا فَجًّا، إِلاَّ سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ». {الحديث: ٦١٥٢ = ٦١٥٨ فم. بخاري. بدء الخلق: ٣٢٩٤، ٣٦٨٣، ٦٠٨٥}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستەیێ لەژنانی قوڕەیش لەلای حەزرەت دەبن‌و گوفتوگۆی لەگەڵ دەکەن بەدوورو درێژی، لەبەر غەڵبەغەڵبی خۆیان دەنگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کپ دەکەن، جا لەوکاتەدا عومەر داوای رێگە دەکاو مۆڵەت دەخوازێ کەبچێ بۆلای حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ). ئیتر ژنەکان گورج هەڵ دەستن‌و خۆیان گورج دەکەنەوەو خۆیان دەپێچنەوەو دەیانەوێ بڕۆن، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگە دەدا بە عومەرو عومەر دەچێتە ژوورەوە، دەڕوانێ وا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پێ دەکەنێ، دەڵێ: ئەی

پێغەمبەری خودا! یاخودا پێکەنینی خێرت بێ، خێره وا پێدەکەنی؟ دەفەرموێ: (سەیرم هات لەم ژنانە کە لەلای منن، هەر کە گوێیان لەدەنگی تۆ بوو گورج پەلاماریاندا، خۆیان گورج کردەوەو پەچەیان گرتەوەو خۆیان گرد کردەوە! عومەر گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هەق وابوو کە ئەمانە شەرمو شکۆ لەتۆ پتر بکەن، ئەنجا عومەر بەژنەکانی فەرموو: ئەی دوژمنانی خۆتان! چۆن سام لەمن دەکەنو کەچی سام لە حەزرەت ناکەن!

گوتیان: ئاخر تۆ مۆنیتو پیاوێکی گەلێ رەقو توندو تیژیت، بەلاّم حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر بەنەزاکەتو نەرمونیانو هێدییە. جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەسە، ئەی کوڕی خەتاب! ئەم بەسەزمانانە لەکوێ دەرەقەتی تۆ دێن، تۆ شەیتان دەرەقەتت نایێ، بەوکەسە کە رەوانی منی وا لەدەسنا تۆ لەهەر رێگەیەکەوە بڕۆیت، شەیتان لەترسی تۆ بەو رێگەیەدا ناڕوات!). {تاج/٣، زنجیره: ٤، ژماره: ٣٢٤٨، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

١٦٣٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) أَنَّـهُ كَـانَ يَقُولُ: «قَدْ كَانَ يَكُونُ فِي الأُمَمِ قَبْلَكُمْ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ يَكُنْ فِي أُمَّتِي مِنْهُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ مِنْهُمْ». قَالَ ابْنُ وَهْبٍ: تَفْسِيرُ مُحَدَّثُونَ: مُلْهَمُونَ. {الحديث: ٦١٥٤ = ٦١٦٠ فم}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەپێشینان، لەنەوەی ئیسرائیل، لەهۆزی جوولەکە، گەلێ پیاوی واهەبوون، لەگەل ئەوەدا کە پێغەمبەریش نەبوون، بەلاّم قسەیان راست دەردەچوو، وەك خودا بیخاتە ناو دلّیان وابوو، یا فریشتە قسەیان بۆ بکا ئاوا، جا ئەگەر لەئۆمەتی مندا، لەم جۆرە پیاوانە هەبێ، عومەر یەکێکە لەوان!).

رشتە (سەنەد)ی ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

١- ئیمامی موسلیم.

٢- ئەبو طاهیر، کەناوی ئەحمەدی کوڕی عەمری کوڕی سەرحە.

٣- عەبدوڵڵای کوڕی وەهب.

٤- ئیبراهیمی کوڕی سەعد.

٥- لەباوکیەوە کە سەعدی کوڕی ئیبراهیمە.

٦- لە ئەبو سەلەمەوە.

٧- لە عائیشەوە.

٨- لە پێغەمبەرەوە.

جا عەبدوڵڵای کوڕی وەهب واتای (مُحَدَّثُونَ) لەدەقی فەرموودەکەدا بە (مُلْهَمُونَ) لێك دەداتەوە.

**ڕوونکردنەوە:**

زاناکان دەفەرموون: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوە کە پیاو چاکانی ئەم گەلی ئیسلامەیش وەك پیاو چاکانی گەلە پێشینەکان، ئەولیایان، تیادەبیّ و کەرامەتیان لیّ ڕوودەدا وە ئەم فەرموودەیە باشترین بەڵگەیە لەسەر هەبوونی کەرامەت. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/١/٢٩٠، ژمارە: ٢٨٥ = ٤٦٥ فتح الباری} .

١٦٣٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): وَافَقْتُ رَبِّى عَزَّ وَجَلَّ فِى ثَلاَثٍ: فِى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ، وَفِى الْحِجَابِ، وَفِى أُسَارَى بَدْرٍ. {الحديث: ٦١٥٦ = ٦١٦٢ فم. تجريد البخاري/١، رقم: ٢٥٥ = ٤٠٢، ٤٤٨٣، ٤٧٩٠، ٤٩١٦}:

درێژەی ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا ئاوەهایە:

ئیبنو عومەر فەرمووی: پێشەوا عومەر (ڕەزای خودایان لیّ بیّ) فەرمووی: لەسایەی خوداوە، لەم سیّ پرسە (مەسەلەیە)دا ڕای من لەگەڵ فەرمانی پەروەردگاری گەورەما یەکی گرت:

یەکەم: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگە مەقامی ئیبراهیممان دەکرد بەنوێژگا! واتە: ئەو شوێنەی کە لەکاتی دروستکردنی کەعبەدا ئیبراهیم تیادا ڕادەوەستا، دەمانکرد بەجێگە نوێژ، جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى - البقرة}.

واتە: لە مەقامی ئیبراهیم جێگە نوێژ وەربگرن‌و نوێژی سوننەتی تیا بکەن بۆخۆتان.

دووەم: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگە فەرمانت دەکرد بەژنەکانت بەلەچك کردن‌و خۆ داپۆشین، واتە: لەپیاوی بێگانە چارشێو بگرنەوە، یا لەپشتی پەردەوە قسەو گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەن، چونکە چاك‌و خراپ قسەیان لەگەڵ دەکەن، جا بەم بۆنەیەشەوە ئایەتی حیجاب هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: {وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ - الأحزاب — ٣٣/٣٥}.

واتە: کاتێ قسەو گفتوگۆتان لەگەل ژنەکانی پێغەمبەردا کرد، وەك ئەوە داوای ئاوێ، نانێ، روونکردنەوەیێ، پرسیارێکی شەرعتان لێ کردن، لەپشتی پەردەوە، وەك دیوارو دەرگاو پەردەی ناو بارەگا، قسەیان لەگەڵدا بکەن.

سێیەم: کاتێ کە ژنەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر هەوێباریی یەکتریی، گەلەکۆمەیان لە حەزرەت کرد، منیش پێیانم گوت: هیوا وایە ئەگەر تەلاقتان بدا خودا لەباتی ئێوە چەند ژنێکی باشتری پێ بدا) جا لەم روویەشەوە ئەم ئایەتە هات بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەقی هیواکەی منە: {عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ — التحريم/٥}.

**روونکردنەوە:**

لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: تەفصیلی ئەم فەرموودەیەی ئیمامی موسلیم لەبوخاریدا، بەم شێوەیە کە لەپێشەوە نووسرا. بەڵام ئەوەندە هەیە لێرەدا موافەقەی سێیەم ئەمەیە کە دەفەرموێ: {وَفِي أُسَارَى بَدْرٍ}. کە روونکردنەوەی ئەم برگەی سێیەمەیش لەپێشەوە، لەم پەڕاوە پیرۆزەدا، لەژمارە (١١٥٨)دا رابورد، لەزنجیرە (٩٢٤).

١٦٣٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُولَ، جَاءَ ابْنُهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَسَأَلَهُ أَنْ يُعْطِيَهُ قَمِيصَهُ أَنْ يُكَفِّنَ فِيهِ أَبَاهُ، فَأَعْطَاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ

عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَأَخَذَ بِثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتُصَلِّي عَلَيْهِ وَقَدْ نَهَاكَ اللَّهُ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَيْهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّمَا خَيَّرَنِي اللَّهُ فَقَالَ: (اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللهُ لَهُمْ)، وَسَأَزِيدُ عَلَى سَبْعِينَ». قَالَ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ). {الحديث: ٦١٥٧ = ٦١٦٣ فم. تجريد البخاری بالکوردی/٢، رقم: ٦٠٩ = ١٢٦٩، ٤٦٧٠، ٤٦٧٢، ٥٧٩٦. تحفة الأشراف: ٧٨٢٦}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول (سەرۆکی ناپاکانی مەدینە) مرد، عەبدوڵڵای کوڕی ئەم عەبدوڵڵایە، کە یەکێ بوو لە هاوەڵە راستو دروستەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلای حەزرەت، عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کراسێکی خۆتم پێ بدە، تا بیکەم بەکفن بۆ باوکم، بەڵکوو بە پیرۆزی ئەو کراسەی تۆ سزای لەسەر سووك ببێ، ئەویش کراسێکی خۆیی پێدا، لەپاشا داواشی لێ کرد کە نوێژی مردووشی لەسەر بکا. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا کەبچێ نوێژی لەسەر بکا، عومەر هەڵسا جلەکەی پێغەمبەری گرتو عەرزیکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ خودا رێگەی ئەمەی نەداویت، ئیتر نوێژی چی لەسەر دەکەیت!

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): خودا منی کردووە بەسەرپشكو خاتر خۆی کردوومو دەفەرموێ: {اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ – التوبة – ٩/٨٠}.

واتە: ئارەزووی خۆتە، داوای لێ خۆشبوون بکە بۆیان، یان مەیکە، ئێمە رێگەی ئەوەت لێ ناگرین، بەڵام ئەوە بێ سوودە، نەك جارو دووجار، ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی، خودا لێیان خۆش نابێ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی من لە حەفتا جار زیاتر داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەم!!).

عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئاخر ئەمە ناپاكو مونافیقە. قسەبەر (راوی دەڵێ: جاكاتێ كە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەری كرد، خودا ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە كە دەفەرموێ: {وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ – التوبة – ٩/٨٤}.

واتە: بەهیچ شێوەیێ، نابێ نوێژی مردوو بكەی لەسەر هیچ كامێ لەوان كاتێ كە دەمرن، وە لەسەر گۆڕەكەی رامەوەستە بۆ نزاكردن بۆی). {تاج/٤، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٩٠٧ – سوورەتی تەوبە}.

**روونكردنەوە:**

١- لە تەجریدی بوخاریدا، بەكوردی، لەژمارە: (٦٠٩ = ١٢٦٩)دا روونكردنەوەیەكی زۆر دوورو درێژم لەسەر ئەم باسەی وا لەم فەرموودەیەدا نووسیوە، ئەگەر بفەرمووی رەچاوی بكەی جێگەی خۆیەتی.

٢- عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی سەلوول (رەزای خودای لێ بێ) یەكێكە لەهاوڕێ زۆر بەڕێزەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهۆزی خەزرەجە، كە خەزرەج یەكێكە لەدوو هۆزە گەورەكەی مەدینە، كە ناسراون بە ئەوسو خەزرەج، لەپێش كۆچكردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە، ئەم دوو هۆزە كێشەی گەورەو شەڕو شۆڕی زۆرو دوورو درێژیان لەنێوانا بوو، خودا بەهۆی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە كردنی بەدۆستو برای یەكتریو ناوی نان: (أنصار: یاریدەدەران).

كەواتە: عەبدوڵڵا ئەنصارییە، لەپێشدا ناوی حوباب بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوەكەی گۆڕیو ناوی نا عەبدوڵڵا، ئامادەی غەزای بەدرو ئوحودو گشت غەزەواتەكانی تری پێغەمبەر بووە، لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا، عەبدوڵڵا یەكێ بوو لە نووسەرنانی سرووش، وە لەغەزای تەبووكا عەبدوڵڵای باوكی، كە ناودارە بە عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەیی كوڕی سەلوول، كە سەرۆكی ناپاكەكان بوو، هەڕەشەی لە

پێغەمبەر (دروودی لەسەر) کردو گوتی: (منو موحەممەد کاتێ گەڕاینەوە بۆشاری مەدینە، منو موحەممەد کاممان بەدەسەڵاتترو تواناتر بوو بەوی ترمانی چۆڵ دەکات مەدینە یابۆ من دەبێ یابۆ ئەو!).

جا کاتێك قورئانی پیرۆز، پەردەی لەسەر ئەم قسە ژەهراوییەی ئیبنو سەلوول هەڵماڵی، عەبدوڵلای کوڕی، پشتی پێغەمبەری گرتو لەدژی باوکی وەستاو بە پێغەمبەری فەرموو: (سوێندم بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! داماوو ناتەوان ئەوە، عەزیزو دلێرو توانا تۆی!

هەروەها فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر رێگەم پێ بدەی بەدەستی خۆم دەیکوژم!).

بەلام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی پێ نەداو پێی فەرموو: (بەلام بەجوانی هاوڕێتی بکە!). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر لێی رازی بوو، وە گەلێ جار پەسنو مەتحی ئەوی کردووە، لەشەڕی هەڵگەڕاوەکاندا (ئەهلی ریددەدا) لەکاتی جێنشینی ئەبوبەکری صەدیقا، لەساڵی دوازدەی کۆچیدا، لە وڵاتی یەمامە شەهید بوو.

٣- ئەم عەبدوڵلای کوڕی سەلوولە، باوکی ناوی ئوبەیی کوڕی مالیکە، سەلوول نەنکییەتی، دایکی باوکیەتی، ژنێ بوو لەهۆزی خوزاعە، ئیبنو سەلوول یەکێك بوو، لەسەرۆك هۆزەکانی هۆزی خەزرەج لەمەدینە، هۆزی خەزرەج، لەپێش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە، بڕیاریاندابوو کە ئیبنو سەلوول بکەن بە پادشای خۆیان، بەلام کە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەوڵەتی ئیسلامییان لەمەدینە دامەزراند، ئەم هەلەی لەدەست چوو لەبەرئەوە ئەم کابرایە هەتا مرد، ئەو کۆنە قینەی لەدڵدا بوو، وەرقی لە پێغەمبەر بوو، ناسراوە بە سەرۆکی ناپاکەکان، کە لەزاراوەی سزوننەتدا ناودارە بە سەرۆکی ناپاکەکان، واتە: سەرۆکی مونافیقەکان! ئیبنو سەلوول لەساڵی نۆی کۆچیدا مرد.

## ١٢٦٩) باسی بەهرەو گەورەیی عوثمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خودای لێ بێ). (٦١٥٩ - ٦١٦٦)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلُ عُثْمَانُ بْنُ عفَان (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ)

١٦٣٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مُضْطَجِعًا فِي بَيْتِي، كَاشِفًا عَنْ فَخِذَيْهِ أَوْ سَاقَيْهِ، فَاسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ كَذَلِكَ، فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانُ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَسَوَّى ثِيَابَهُ، (قَالَ مُحَمَّدٌ: وَلاَ أَقُولُ ذَلِكَ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ) فَدَخَلَ فَتَحَدَّثَ، فَلَمَّا خَرَجَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ، فَجَلَسْتَ وَسَوَّيْتَ ثِيَابَكَ، فَقَالَ: «أَلاَ أَسْتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلاَئِكَةُ». {الحديث: ٦١٥٩ = ٦١٦٥ فم = فتح الملهم شرح صحيح مسلم}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵی من ڕاکشابوو، هەردوو ڕانی، یا فەرمووی: هەردوو لاقی هەڵماڵی بوو، ئەبوبەکری صەدیق هات، مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست، حەزرەت ڕێگەی پێدا، هاتە ژوورەوە، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەزعی لەخۆی تێك نەداو لەسەر حاڵی خۆی مایەوەو دەستیان کرد بە گوفتوگۆ، لەپاش ئەو عومەر مۆڵەتی هاتنە ماڵەوەی خواستو ئەویش هەربەو شێوەیە هاتە ژوورەوەو دانیشتو دەستی کرد بە گوفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەردا، لەپاشدا عوثمانی کوڕی عەففان مۆڵەتی خواست، کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێك دانیشتو جلەکانی خۆیی ڕێك خست. موحەممەدی قسەبەر (واتە: ڕاوی لە ڕشتەی ئەم فەرموودەیەدا) دەڵێ: من ناڵێم کە ئەمە هەمووی لەیەك ڕۆژدا ڕووی داوە. ئەوجا عوسمان هاتە ژوورەوەو قسەی خۆی کرد، کە ڕۆیی، عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئەبوبەکر هاتە ژوورێ ڕووت خۆش نەبوو لەگەڵیو زۆر دەربایستی نەبووی، لەپاشا عومەریش هات بۆ ئەویش هەروەها بووی، کەچی کە عوسمان هات، هەڵسایت دانیشتیو خۆت کۆکردەوەو جلەکانی خۆتت ڕێك خست!؟ فەرمووی: (چۆن شەرمو شکۆ نەکەم لەپیاوێ کە

فریشته شه‌رم‌و شکۆی لێ دەکەن، کە عوسمانە!). لە گێڕانەوەیەکی تاجول ئوصولدا (ژماره: ٦١٦٠ صحیح مسلم): فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (عوسمان پیاوێکی زۆر شەرمنە، مەترسی ئەوەم هەبوو ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە ڕێگەی پێ بدەم کەبێتە ژوورەوە بۆلام، ئەو ئیشەی کە بەمنی هەبوو بۆی جێبەجێ نەکرێ لەشەرمانا). {تاج/٣، زنجیره: ٨، ژماره: ٣٢٧٩ ج/٤}.

١٦٣٨- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: أَخْبَرَنِى أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ تَوَضَّأَ فِى بَيْتِهِ ثُمَّ خَرَجَ فَقَالَ: لأَلْزَمَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، ولأَكُونَنَّ مَعَهُ يَوْمِى هَذَا، قَالَ: فَجَاءَ الْمَسْجِدَ، فَسَأَلَ عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالُوا: خَرَجَ وَجَّهَ هَا هُنَا، قَالَ: فَخَرَجْتُ عَلَى أَثَرِهِ أَسْأَلُ عَنْهُ، حَتَّى دَخَلَ بِئْرَ أَرِيسٍ، قَالَ: فَجَلَسْتُ عِنْدَ الْبَابِ، وَبَابُهَا مِنْ جَرِيدٍ، حَتَّى قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حَاجَتَهُ وَتَوَضَّأَ، فَقُمْتُ إِلَيْهِ، فَإِذَا هُوَ قَدْ جَلَسَ عَلَى بِئْرِ أَرِيسٍ وَتَوَسَّطَ قُفَّهَا وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ وَدَلاَّهُمَا فِى الْبِئْرِ، قَالَ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ، فَجَلَسْتُ عِنْدَ الْبَابِ، فَقُلْتُ: لأَكُونَنَّ بَوَّابَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الْيَوْمَ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ، فَدَفَعَ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، قَالَ: نعم، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ؟ فَقَالَ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ»، قَالَ: فَأَقْبَلْتُ حَتَّى قُلْتُ لأَبِى بَكْرٍ: ادْخُلْ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُبَشِّرُكَ بِالْجَنَّةِ، قَالَ: فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ، فَجَلَسَ عَنْ يَمِينِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَعَهُ فِى الْقُفِّ، وَدَلَّى رِجْلَيْهِ فِى الْبِئْرِ، كَمَا صَنَعَ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ، ثُمَّ رَجَعْتُ، فَجَلَسْتُ، وَقَدْ تَرَكْتُ أَخِى يَتَوَضَّأُ وَيَلْحَقُنِى، فَقُلْتُ: إِنْ يُرِدِ اللَّهُ بِفُلاَنٍ (يُرِيدُ أَخَاهُ) خَيْرًا يَأْتِ بِهِ، فَإِذَا إِنْسَانٌ يُحَرِّكُ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، ثُمَّ جِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، وَقُلْتُ: هَذَا عُمَرُ يَسْتَأْذِنُ؟ قَالَ: «ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ». فَجِئْتُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقُلْتُ: أَذِنَ وَيُبَشِّرُكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِالْجَنَّةِ، قَالَ: فَدَخَلَ فَجَلَسَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى الْقُفِّ عَنْ يَسَارِهِ، وَدَلَّى رِجْلَيْهِ فِى الْبِئْرِ، ثُمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ: إِنْ يُرِدِ اللَّهُ بِفُلاَنٍ خَيْرًا - يَعْنِى

أَخَاهُ - يَأْتِ بِهِ، فَجَاءَ إِنْسَانٌ فَحَرَّكَ الْبَابَ. فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ. فَقُلْتُ عَلَى رِسْلِكَ، قَالَ: وَجِئْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ، مَعَ بَلْوَى تُصِيبُهُ». قَالَ: فَجِئْتُ فَقُلْتُ: ادْخُلْ وَيُبَشِّرُكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِالْجَنَّةِ مَعَ بَلْوَى تُصِيبُكَ، قَالَ: فَدَخَلَ فَوَجَدَ الْقُفَّ قَدْ مُلِئَ، فَجَلَسَ وُجَاهَهُمْ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ. قَالَ شَرِيكٌ: فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ: فَأَوَّلْتُهَا قُبُورَهُمْ. {الحديث: ١٦٦٤ = ٦١٧٠ فم = فتح الملهم. تجريد البخاري بالكوردي/٤، رقم: ١٤٥٤ = ٣٦٧٤، ٣٦٩٣، ٣٦٩٥، ٦٢١٦، ٧٠٩٧، ٧٢٦٢. تحفة الأشراف: ٨٩٩٦} :

سەعیدی کوڕی موسەییەب فەرمووی: ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەماڵەوە دەستنوێژم گرتو دەرچووم، گوتم: دەبێ ئەمڕۆ لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جیانەبمەوە، بە هەناسە خزمەتی بەجێ نەهێڵم، فەرمووی: جا چووم بۆ مزگەوت، لەوێ پرسیاریم کرد، گوتیان: تەشریفی دەرچووە، بەرەو ئێرەوە ڕۆیشت، منیش بەشوێنیدا ڕۆیشتمو دەمپرسی، تازانیم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا لەناو باخێ لە باخەکانی مەدینەدا، خەریکە دەست بەئاو دەگەیەنێ، لەپاشا چووە ناو بیری ئەریسەوەو دەسنوێژی گرت، بیرەکە دەرگاکەی لە چەپەری پەلکە خورمابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئاخڵەی بیرەکە، لەناوەڕاستیدا دانیشتو، هەردوو لاقی بەڕووتی داهێشتنە ناو بیرەکەوە، منیش چووم بۆ خزمەتیو سڵاوم لێ کردو ئەوجا گەڕامەوە دواوە لەبەردەم دەرگای بیرەکەدا دانیشتم، بووم بەدەرکەوانی! زۆری نەخایاند ئەبوبەکری صەدیق هات، پاڵی نا بە چەپەرەکەوە کە بیکاتەوە. گوتم: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: منم ئەبوبەکرم. گوتم: هێواش بە، جا چووم، گوتم: قوربان! ئەوە ئەبوبەکرە داخوازی دەکا کەبێتە ژوورەوە؟ فەرمووی: ڕێگەی پێ بدەو موژدەی بەهەشتی پێ بدە).

منیش چوومەوە بۆلایو عەرزیم کرد: بفەرموو وەرە ژوورەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتت پێ دەدا، ئیتر ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە، لەلای ڕاستی پێغەمبەرەوە، لەسەر ئاخڵەکە دانیشت لەگەڵیداو هەردوو قاچی خۆی بەناو

بیرەکــەدا، داهــێلا دەق وەك پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەسەر بێ) هــەردوو لاقــی خۆشــی هەڵماڵی، وە سوپاسو ستایشی پــەروەردگاری کــرد، منــیش گەڕامــەوەو لەبــەردەرگا، لەشوێنەکەی پێشووم دانیشتمەوە، برایەکم هــەبوو، کــە لــەماڵ دەرچووم بڕیارمــان وابوو کە دەستنوێژ بگــرێو بێــت بــۆلای مــن، جــا لــەدڵی خــۆمــا گــوتم: ئەگــەر خــودا مــەیلی لەســەربێ کــە ئــەو برایــەم ئــەمڕۆ تووشــی خێرێکــی گــەورە ببــێ بــەزوویی دەیهێنــێ، جــا لــەم دەمــە دەمــی چاوەڕوانییەدا هەســتم کــرد کــەوا کەســێ دەرگاکــە دەبزوێنــێ. گــوتم: ئــەوە کێیــە؟ گــوتی: عومــەری کــوڕی خــەتابم، وتم: لەســەرخۆبە، تۆزێ هێواشکە با مۆڵەتت بۆ بخوازم.

ئــەوجا چــوومە خزمــەتی حــەزرەتو عــەرزیم کــرد: عومــەری کــوڕی خەتابــە مۆڵــەت دەخــوازێ؟ فــەرمووی: (ڕێگــەی پــێ بــدە بابێتــە ژوورەوەو مــوژدەی بەهەشتیشی پێ بدە. چووم پێیم گوت: بفەرموو وەرە ژوورەوە، پێغەمبەر موژدەی بەهەشتت پێ دەدا).

ئــەویش ڕۆیشــتە ژوورەوە، ســوپاسو ستایشــی خــودای کــرد، لەخزمــەت پێغەمبەردا، لە ئاخڵەی بیرەکەدا، لەلای چەپی پێغەمبەرەوە دانیشتو هەردوو پێی خۆیی بەبیرەکەدا شۆڕکردەوە، منیش دیسان چوومەوە لەشوێنی خۆم دانیشتمەوەو دیسانەوە لەبەرخۆمەوە گوتمەوە: ئەگەر خودا حــەزکا، ئــەمڕۆ فیسارە کەســی بــرام تووشــی خێــرو خۆشــی بکــا، لــەم بۆنــە جوانــەدا دەیڕەخسێنێ، جــا مرۆڤــێ هــات لــەدەرگای دا، گــوتم: ئــەوە کێیــە؟ گــوتی: عوســمانی کــوڕی عــەففانم، منــیش گــوتم: هێواشــکە، چــوومەوە بــۆ خزمــەتی پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەسەر بێ) عــەرزیم کــرد کــە عوسمانە. فەرمووی: (ڕێگەی پێ بدەو موژدەی بەهەشتی پێ بــدە، گەرچــی تووشــی قۆرتێکی گەورەش دەبێ!).

منیش چوومەوە بۆ خزمەتیو عەرزیم کرد: فەرموو وەرە ژوورەوە، پێغەمبەر (دروودی خــودای لەسەر بێ) مــوژدەی بەهەشــتت دەداتــێ، ئەگەرچــی لــەو پێنــاوەدا تووشــی مەینەتێ دەبێ! ئەویش هاتە ژوورەوە، تەماشای کرد وا سەکۆی قەراخ دەمی بیرەکە

پڕبووه، پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەری تیادا دانیشتووه، جێگەی کەسی تری تیادا نابێتەوه کە لەگەڵ ئەوانا تیادا دابنیشێت، لەبەرئەوه بەرامبەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دانیشت لەلاکەی ترەوه).

شەریکی کوڕی ئەبو نەمیر، کە لەڕشتەی ئەم فەرموودەیەدا فەقێو شاگردی سەعیدی کوڕی موسەییەبە دەڵێ: سەعیدی کوڕی موسەییەبی مامۆستام دەیفەرموو: من ئەم دانیشتنەیان لەسەر ئەم شێوەیە لەم بیری ئەریسەدا، ئاوا لێك دەدەمەوە: کە ئەمە هێماو ئاماژەیە بۆ گۆڕەکانیان، کە ئەوەتا شەیخەین: ئەبوبەکرو عومەر گۆڕیان وا لەگەڵ گۆڕی پێغەمبەردا، لەرەوضەی پیرۆزدا، بەڵام ئیمامی عوسمان گۆڕەکەی لە گۆڕستانی بەقیعە، لەگەڵ ئەوانا نییە). {تاج/٤، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٣٢٧٢ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم بیری ئەریسە وا لەنزیك قەباوە، لەمەدینە، ئەو بیرەیە کە ئەموستیلەکەی پێغەمبەر، کە لەدەستی عوسماندا بوو کەوتە ناویو گەرچی هەولێکی زۆری دا کە بیدۆزێتەوە، بەڵام نەدۆزرایەوەو رەشەڕا هات، ئیتر دوائەوە بەرە بەرە ئاشووبو فەرتەنەو ئاژاوە لەناو ریزی موسوڵمانانا سەری هەڵدا وە هەتا ئێستایش هەر بەردەوامە، هەر رۆژێ بەناوێکەوەو هەر جارێ بە جۆرێك. ئەو مەینەتەیش کە تووشی ئیمامی عوسمان بوو ئەوەبوو کە لەماڵەکەی خۆیدا، گەمارۆیاندا هەتا شەهیدیان کرد. {بڕوانە: ژمارە: ٩ لەپێشەوە لەبەرگی یەکەمدا رابورد}.

### ١٢٧٠) باسی بەهرەو گەورەیی عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ).
### (٦١٦٧ - ٦١٧٩)
### بَابٌ: فِي فَضَائِلُ عَلِيَّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)

١٦٣٩- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِى وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: خَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلِيَّ بْنَ أَبِى طَالِبٍ فِى غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تُخَلِّفُنِى فِى النِّسَاءِ

وَالْصِّبْيَانِ؟ فَقَالَ: «أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّى بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى غَيْرَ أَنَّهُ لاَ نَبِىَّ بَعْدِى». {الحديث: ٦١٦٧ = ٦١٧٣ فم. تجريد البخارى بالكوردى. المجلد الرابع رقم: ١٦١٨ = ٤٤١٦، ٣٧٠٦. ترمذى. مناقب: ٣٧٣١. تحفة الأشراف: ٣٨٥٨}:

سەعدى كوڕى ئەبو وەققاص (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: كاتێ پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەرچوو بۆ غەزاى تەبووك، عەلى كوڕى ئەبو طاليبى كرد بەجێنشينى خۆىو لەسەر شارى مەينە بەجێى هێشت بەسەر شارەوە داينا. عەلى فەرمووى: ئەى پێغەمبەرى خودا! دەمكەيت بەجێنشينو بەجێم دەهێڵى لەناو ژنانو منالاًندا؟! فەرمووى: (ئەدى تۆ بەوە رازى نابى كەتۆ بۆمن لەپايەى هاروونىدا بيت بۆ مووساى براى، وەك كاتێ مووسا دەرچوو بۆ كێوى طور، بە هاروونى براى فەرموو، وەك لە قورئانى پيرۆزدا دەفەرموێ: {وَقَالَ مُوسَى لأَخِيهِ هَارُونَ اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي وَأَصْلِحْ وَلاَ تَتَّبِعْ سَبِيلَ الْمُفْسِدِينَ — الأعراف - ٧/١٤٢}.

واتە: مووسا كاتێ رۆيشت بۆ بەجێهێنانى خواپەرستى چل رۆژەكە لەكێوى طوور، بەهاروونى براى فەرموو: لەجێگەى من دانيشەو ئيشو كارى ئايينىو دنيايى بەجێ بهێنە لەناو گەلەكەماناو با رەفتارو كردارتو هەڵسوكەوتو مامەڵەت لەگەڵيانا، بەشێوەى خۆم بێو مەبەستت رێكو پێكىو دامەزرانى ناو كۆمەڵ بێو ئاژاوە بەرپا مەكەو چاو لە ئاژاوە گێڕانو گێرە شێوێنان مەكەو دووربە لە رەفتارو كردارو كۆمەڵو كۆڕيان).

فەرمووى (دروودى خوداى لەسەر بێ): ئەى عەلى! ئەمە حاڵو پايەى منو تۆيە لەگەڵ يەكا، لەم سەفەرەى مندا بۆ ئەم غەزايە، بەلاًم ئەوەندە هەيە: جياوازى هەيە لەنێوان تۆو هاروونىدا، هاروون پێغەمبەر بووە، بەلاًم تۆ پێغەمبەر نيت، چونكە لەدواى من پێغەمبەرى تر نييەو نابێ، كەواتە: وەجهە شەبەهەكە لەنێوانى تۆو هاروونىدا، تەنيا ئەوەيە كەتۆ لەماوەى ئەم سەفەرەى منا جێنشينى منى لەسەر شارى مەدينە هەتا دێمەوە!). {تاج/٣، زنجيرە: ٩، ژمارە: ٣٢٩١ ج/٤} + {تاج/٣، زنجيرە: ٩، ژمارە: ٣٢٩٣}.

١٦٤٠- عَنْ سَهْلُ بْـنُ سَـعْدٍ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمـا): أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) قَالَ يَوْمَ خَيْبَرَ: «لأُعْطِيَنَّ هَذِهِ الرَّايَةَ رَجُلاً يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْهِ، يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُـولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ». قَالَ: فَبَاتَ النَّاسُ يَدُوكُونَ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَاهَـا، قَـالَ: فَلَمَّـا أَصْـبَحَ النَّاسُ غَدَوْا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كُلُّهُمْ يَرْجُونَ أَنْ يُعْطَاهَا، فَقَالَ: «أَيْنَ عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ؟». فَقَالُوا: هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَشْتَكِى عَيْنَيْـهِ. قَـالَ: (فَأَرْسَلُوا إِلَيْـهِ)، فَأُتِىَ بِهِ، فَبَصَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى عَيْنَيْهِ وَدَعَا لَهُ، فَبَرَأَ حَتَّى كَأَنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ وَجَعٌ، فَأَعْطَاهُ الرَّايَةَ، فَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ): يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ أُقَـاتِلُهُمْ حَتَّـى يَكُونُوا مِثْلَنَا؟ فَقَالَ: «انْفُـذْ عَلَـى رِسْلِكَ حَتَّـى تَنْـزِلَ بِسَـاحَتِهِمْ ثُـمَّ ادْعُهُـمْ إِلَـى الإِسْـلاَمِ وَأَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنْ حَقِّ اللَّهِ فِيهِ، فَوَاللَّهِ لأَنْ يَهْدِىَ اللَّهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِدًا خَيْرٌ لَـكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ». {الحديث: ٦١٧٣ = ٦١٨٠ فم. تجريد البخارى/٣، رقم: ١٢٠٧ = ٢٩٤٢، ٣٠٠٩، ٣٧٠١، ٤٢١٠ فتح البارى. تحفة الأشراف: ٤٧٧٧}:

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای خەیبەر، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سبەینێ ئەم ئاڵایە دەدەم بەپیاوێ، خوداو پێغەمبەری خودای خۆشدەوێو خوداو پێغەمبەری خودایش ئەویان خۆشدەوێ، لەسەر دەستی ئەو پیاوەدا خودا خەیبەر فەتحو ئازاد دەکا، ئیتر ئەو شەوە هەتا بەیانی خەڵکەکە هەر ڕەملیان لێ دەدا: ئاخۆ پێغەمبەر ئاڵاکە دەدا بەکامیان، وەکام لەوان ئەم شانازییە بێ مانەندەی دەست دەکەوێ. جا کەرۆژ بۆوە مەردومەکە زوو چوونە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) هەرکەسەیان لەدڵەوە بەتەمابوو کە ئاڵاکە بدرێ بەو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (عەلی کوڕی ئەبو طالیب لەکوێیە؟) عەرزیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هەردوو چاوەکانی دێشێن. فەرمووی: دەبنێرن بەشوێنیا).

کە عەلی هات، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تفی خۆی کردە ناو هەردوو چاوەکانیەوەو نزای چاکبوونەوەی بۆیکردو بۆیپاڕایەوە. ئیتر دەست بەجێ چاوەکانی واچاك بوونەوە، دەتگوت لەوەوپێش قەت چاوی نەئێشاوە!

ئەوسا ئالاكەی پێیدا، عەلی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەتا وەك ئێمەیان لێ دێو وەك ئێمە موسوڵمان دەبن هەر شەڕیان لەگەڵ بكەم؟

فەرمووی: (بەئاهیستەو هێدیو هێواشی لەگەڵ سوپاكەتا بكشێ هەتا دەچیتە مەیدان بۆیانو دەگەیتە قەراخ ماڵەكانیان، لەوێ بانگیان بكە بۆ موسوڵمان بوون، ئەوەی كە مافی خودایەو لەئایینی ئیسلاما لەسەریان پێویستە بۆیان روون بكەرەوە، جا ئەگەر ژنەوتیانو ئیسلام بوون ئەوا باشەو لێیان قەبووڵ بكە، ئەگینا ئەوسا شەڕبكە لەگەڵیان. دەسا بەوكەسە كە كەسی لەڕەنگ نییە، كە خودای گەورەیە، ئەگەر بەهۆی تۆوە، خودا تاقە پیاوێ رێنمایی بكا، رێگەی راستی ئایینی خودای پێ نیشانبدا، خێرو پاداشی باشی ئەوە لەلای خودا، بۆ تۆ باشترە لەهەرچی وشتری سوور هەیە كە نایابترینی ماڵی عەرەبە). {تاج/٣، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣٢٨٩، ٣٢٩٣ + تاج/١، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١١٣/٥} + {تاج/٣، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣٢٩٠}.

١٦٤١- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: استُعْمِلَ عَلَى الْمَدِينة رجلٌ من آل مروان، قَالَ: فَدعَا سهلَ بنَ سَعْدٍ، فَأمَرَهُ أَنْ يَشْتِمَ عَلِيًّا، قَالَ: فَأبَى سَهْلٌ، فَقَالَ لَهُ: أَمَّا إِذْ أَبيْتَ فَقُلْ: لَعَنَ اللَّهُ أَبَا التُّرَابِ! فَقَالَ سَهْلٌ: مَا كَانَ لِعَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) اسْمٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَبِى التُّرَابِ، وَإِنْ كَانَ لَيَفْرَحُ إِذَا دُعِيَ بِهَا. فَقَالَ لَهُ: أَخْبِرْنَا عَنْ قِصَّتِهِ، لِمَ سُمِّيَ أَبَا تُرَابٍ؟. قَالَ: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بَيْتَ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، فَلَمْ يَجِدْ عَلِيًّا فِى الْبَيْتِ. فَقَالَ: «أَيْنَ ابْنُ عَمِّكِ»؟ فَقَالَتْ: كَانَ بَيْنِى وَبَيْنَهُ شَيْءٌ فَغَاضَبَنِى، فَخَرَجَ فَلَمْ يَقِلْ عِنْدِى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): لإِنْسَانٍ «انْظُرْ أَيْنَ هُوَ»؟ فَجَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هُوَ فِى الْمَسْجِدِ رَاقِدٌ، فَجَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهُوَ مُضْطَجِعٌ قَدْ سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ شِقِّهِ فَأَصَابَهُ تُرَابٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَمْسَحُهُ عَنْهُ وَيَقُولُ: «قُمْ أَبَا التُّرَابِ قُمْ أَبَا التُّرَابِ». {الحديث: ٦١٧٩ = ٦١٨٦ فم. تجريد/١، رقم: ٢٧٠ = ٤٤١ فتح البارى}:

سەهلی كوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدی (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەكەسوكاری مەڕوان بوو بەسەركاری سەر شاری مەدینەی نازدار، ناردی بەشوێنما،

گوتی: وەرە جنێو بە عەلی بدە. گوتم: من شتی وا ناکەم. پێی گوتم: کە ئەوە ناکەی بڵێ: لەعنەتو نەفرینی خودا لە ئەبو توراب بێ، گوتم: من هەڵەی وا ناکەم، چونکە هیچ ناوێکی عەلی وەك ئەم ناوەی لەلای خۆش نەبوو، کە بەئەبو توراب بانگیان دەکرد کەیفخۆش دەبوو، جا پێیان گوت: بۆچی بە عەلی دەڵێن ئەبو توراب، واتە: خۆڵاوی؟ فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەڕوا بۆ ماڵی فاطیمەی کچی، کە هاوسەری عەلی بوو، دەڕوانێ عەلی لەماڵەوە نییە، دەفەرموێ: فاطیمە! ئامۆزات کوا، عەلی لەکوێیە؟) فاتیمە دەفەرموێ: شتێ لەنێوانماندا روویدا، تۆزێ عاجزی کەوتە نێوانمانو لەبەرئەوە چووەتە دەرەوەو وچانی نیوەڕۆی لەلای من نەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمرۆڤێ دەفەرموێ: (ئادەی بزانە عەلی لەکوێیە؟). کەدێتەوە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! عەلی لەمزگەوت خەوتووە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆ مزگەوت بۆلای عەلی، دەڕوانێ وا راکشاوەو پۆشاکەکەی لەلایا کەوتووەو خۆڵاوی بووە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی خۆی خۆڵەکەی لێ دەتەکێنێو خۆش خۆش پێی دەفەرموێ: (هەڵسە ئەی خۆڵاوی، هەڵسە ئەی ئەبو توراب!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣٢٩٢، ٣٢٩٣ ج/٤}.

## ١٢٧١) باسی بەهرەو گەورەیی زوبەیری کوڕی عەوام. (٦١٩٢ - ٦٢٠١)
## بابٌ: فِي فَضَائِلِ الزُّبَيْرِ بْنِ العَوَام

١٦٤٢- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: لَمْ يَبْقَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ تِلْكَ الأَيَّامِ الَّتِي قَاتَلَ فِيهِنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَيْرُ طَلْحَةَ وَسَعْدٍ. (عَنْ حَدِيثِهِمَا). {الحديث: ٦١٩٢ = ٦١٩٩ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٦٤ = ٣٧٢٢، ٤٠٦٣، ٣٧٢٣، ٤٠٦١}:

ئەبو عوثمانی نەهەدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزایێ لە غەزاکانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەگەڵ دوژمندا دەجەنگی، واتە: لە غەزای ئوحوددا، کەسی لەگەڵ نەما، بێجگە لە طەلحەو سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص.

ئەبو عوثمان کەخۆی تابیعییە دەفەرموێ: خۆمن لەوێ نەبووم‌و ئامادەی ئەم جەنگی ئوحودە نەبووم، بەڵام ئەمەی کە گوتم: قسەی طەلحەو سەعد خۆیانەو ئەم فەرموودەیەم لەوان لەخۆیان بیستووە).

**ڕوونکردنەوە:**

١- ئەم فەرموودەیە پەیوەندی بەم سەرباسەوە نییە، کە باسی بەهرەو گەورەیی زوبەیری کوڕی عەوامە. لە ئەصڵەکەدا، کە شێخی ئەلبانی تەحقیقی کردووە، لە چاپەکەی بەردەستی منا کراوە بەدواهەمین فەرموودەی سەرباسی (فضائل عَلِي بن أبي طالب) دیارە کە پەیوەندی بەو باسەیشەوە نییە.

لەهەمووی سەیرتر ئەلبانی لە پەراوێزداو لەشەرحی فەتحول مولهیمدا ضەمیری (عَنْ حَدِيثِهِمَا) بۆ طەلحەو زوبەیر دەبەنەوە، بەڵام لە فەتحولباریدا ضەمیرەکە دەباتەوە بۆ طەلحەو سەعد، کە حەقی خۆشی وەهایە. بەڵام بەزەینم لە نێوانی زنجیرە (١٢٧٠)دا کە باسی بەهرەی عەلییەو لەنێوانی زنجیرە (١٢٧١)دا، کەباسی گەورەیی زوبەیرە، سەرباسێ پەڕابێ بەناوی {فَضَائِلُ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِاللهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)}.

٢- ئەوەی کە لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: بەس طەلحەو سەعد، لەم جەنگەدا، لەدەوری پێغەمبەر مابوون، مەبەست بازێ حاڵی تایبەتە، دەنا کەسانی تریش لەم جەنگەدا پشتی پێغەمبەریان چۆڵ نەکردو لەدەوروبەری وەك شێرو پوڵەنگ دەجەنگان، لە فەتحولباریدا ناوی ئەم زاتانە دەبا، کە سەنگەری پێغەمبەریان چۆڵ نەکردووە:

١- طەلحە. ٢- سەعد. ٣- میقداد. ٤- ئەبوبەکر. ٥- عەلی. ٦- عەبدورەحمانی کوڕی عەوف. ٧- زوبەیر. ٨- ئەبو عوبەیدەو کەسانی تریش. {بڕوانە: ژمارە: ١١٦٠ کە لەزنجیرە: ٩٢٦دا لەپێشەوە رابورد + تاج/٣، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٣٤٧٧ + فەتحولباری. ژمارە: ٣٧٢٢ بەتایبەتی ژمارە: ٤٠٦٠ هەتا ٤٠٦٣}.

١٦٤٣- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: نَدَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النَّاسَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيٌّ وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ». {الحديث: ٦١٩٣ = ٦٢٠٠ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٧٤ = ٢٨٤٧ فتح البارى} :

موحەممەدی کوڕی ئەلمونکەدیر فەرمووی: جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای خەندەقا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەردومی هان دەدا لەسەر خەبات و تێکۆشان و جەنگینی شێرانە لەپێناوی بەرزی ئاڵای ئیسلامدا، یەکەم کەس کەچوو بەدەنگی پێغەمبەرەوەو ئامادەیی خۆیی عەرزیکرد زوبەیر بوو، تا سێجار حەزرەت هەر موسوڵمانەکانی هان دەدا لەسەر غەزاکردن و خەباتگێڕان و هەموو جارێ زوبەیر مەردانەو شێرانە دەچوو بەدەنگیەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو پێغەمبەرێ لەسەردەمی خۆیدا، لەکاتی ژیانیدا، یارو یاوەرو دۆستێکی گیانی بەگیانی بووە، یارو یاوەرو دۆستی گیانی بەگیانی منیش لەسەردەمی خۆما زوبەیرە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٣١٢ ج/٤}.

ئەم فەرموودەیە، هۆکەی لە بوخاریدا ئاوایە:

جابیر فەرمووی: لەڕۆژی غەزای خەندەقا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی سووسە کارێ بنێرێ، سووسەی هەواڵی دوژمنی بۆ بکا، فەرمووی: (ئای بۆ پیاوێ بچێ هەواڵی دوژمنم بۆ بهێنێ!؟) زوبەیر فەرمووی: من دەچم، دووبارە هەمان فەرمایشتی فەرموو، دیسان زوبەیر فەرمووی: (من دەچم هەواڵی دوژمنت بۆ دەزانم و بۆت دەهێنم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم هەڵوێستەی زوبەیری زۆر پێ خۆشبوو، فەرمووی: (هەموو پێغەمبەرێ لەسەردەمی خۆیدا لەکاتی ژیانیدا، یارو یاوەرو دۆستێکی گیانی بەگیانی بووە، یارو یاوەرو دۆستی گیانی بەگیانی منیش لەسەردەمی خۆما زوبەیرە).

١٦٤٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَعُمَرُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ مَعَ النِّسْوَةِ فِي أُطُمِ حَسَّانٍ، فَكَانَ يُطَأْطِئُ لِي مَرَّةً فَأَنْظُرُ وَأُطَأْطِئُ لَهُ مَرَّةً فَيَنْظُرُ، فَكُنْتُ أَعْرِفُ أَبِي إِذَا مَرَّ عَلَى فَرَسِهِ فِي السِّلَاحِ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ، قَالَ: وَأَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُرْوَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، قَالَ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لأَبِي، فَقَالَ: وَرَأَيْتَنِي يَا بُنَيَّ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ جَمَعَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَئِذٍ أَبَوَيْهِ، فَقَالَ: «فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي». {الحديث: ٦١٩٥ = ٦٢٠٢ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٦٣ = ٣٧٢٠ فتح الباري. ترمذي. مناقب: ٣٧٤٣} :

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای خەندەقا، کە پێشی دەگوترێ: غەزای ئەحزاب، منو عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە، دانرابووین بەدیار ژنەکانی پێغەمبەرەوە کە لەناو قەڵاکەی حەساندا بوون بۆ ئاگاداریو سەرپەرشتی کردنیان جارجارە ئەو پشتی دائەنەواند، من ئەچوومە سەر پشتیو لەسەر دیواری قەڵاکەوە سەرەنجی دەوروبەری قەڵاکەم دەدا، جارجارە بە پێچەوانەوە من پشتی خۆمم دەچەمانەوەو ئەو دەچووە سەر پشتمو تەماشای دەوروبەری قەڵاکەی دەکرد. جا هەموو جارێ باوکم دەناسییەوە کە بەسواری ئەسپەکەی بەچەکی تەواوەوە دەهاتو دەچوو بۆ گەڕەکی جوولەکەکانی بەنی قوڕەیظە، دوو سێ جارم بینی.

عەلی کوڕی موسهیر، هەتا ئێرە ئەم فەرموودەیە، لەهیشامی کوڕی عوروەوە، لە عوروەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە دەگێڕێتەوە، کە عەبدوڵڵا برای عوروەی کوڕی زوبەیرە. لێرە بەدواوە عەلی ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عوروەی کوڕی زوبەیرەوە، لە مامەیەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرە ئاوەها: عەلی کوڕی موسهیر دەفەرموێ: عەبدوڵڵای کوڕی عوروە دەفەرموێ: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر فەرمووی: کاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، گوتم: باوە! من تۆم دی، هەر دەهاتیو دەچووی بۆ بەنی قوڕەیزە، ئەوە خێربوو؟ فەرمووی: بۆ کوڕم! تۆ بەچاوی خۆت لەم کاتەدا منت بینی؟ گوتم: ئا، فەرمووی: ئەوە پێغەمبەر (دروودی

خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کێ دەچێ بۆ هۆزی بەنی قورەیزە دەنگوباسی ئەوانم بۆ دەهێنێ هەتا بزانین کە پەیمانەکەیان لەگەڵ ئێمە دەشکێنن‌و شەڕ لەدژی ئێمە دەکەن یانا؟).

جامن چووم‌و دەنگوباسی ئەوانم بۆیهێنایەوە، کە چوومەوە خزمەتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باوك‌و دایکی خۆی پێکەوە کرد بەقوربانم‌و فەرمووی: (باوك‌و دایکم بەقوربانت بن!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٣١٣ چ/٤}.

١٦٤٥- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: قَالَتْ لِي عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا): أَبَوَاكَ وَاللَّهِ مِنَ الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ. (وَفِي رِوَايَةٍ): أَبَا بَكْرٍ وَالزُّبَيْرِ. {الحديث: ٦١٩٩ = ٦٢٠٧ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٤٩ = ٤٠٧٧}:

عوروەی کوڕی زوبەیر فەرمووی: عائیشەی پوورم (ڕەزای خودای لێ بێ) پێی فەرمووم: بەخودا باوك‌و باپیرەی تۆ، لەو کۆمەڵەیەن کەخودا لەوەسپ‌و ستایشیاندا دەفەرموێ:

{الَّذِينَ اسْتَجَابُواْ لِلّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَاتَّقَواْ أَجْرٌ عَظِيمٌ - آل عمران – ٣/١٧٣}.

واتە: ئەو کەسانەی کە فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودایان بەجێ هێناو کەوتنە ڕێگە بەشوێنی دوژمنەکانیانا، لەپاش ئەوەی کەتووشیان بوو لەزام‌و لە کوشتار لەغەزای ئوحوودداو ئەو شەکەتی‌و زاماری‌و ئێش‌و ئازارە ساردی نەکردنەوە، بۆ ئەم کۆمەڵە دلێرە دڵسۆزە نەبەردە نەبەزە لە هاوڕێیانی تۆ، ئەی موحەممەد! کە بە بەڵگەو گفتارو کردارو ڕەفتار ساخیان کردەوەو چەسپاندیان کە خاوەن هەڵوێست‌و چاکەن‌و دارای باوەڕی ساغن‌و لەخودا ترسی ڕاست‌و دروستن بۆ ئەمانە پاداش‌و بەش‌و بارەیەکی گەورە لەهەردوو جیهاندا هەیە، خودای گەورە لەجیهاندا ثەنا خوانیانەو بەهەشتی بەرین لەو جیهانا جێگەیانە!).

لەگێڕانـەوەی ژمـارە: (٦٢٠٠)ی صـەحیحی موسـلیمدا دەفـەرموێ: مەبەسـتی عائیشە لە باوك‌و باپیرەی عوروە: زوبەیری کوڕی عەوامە کە باوکی عوروەیە‌و ئەبوبەکری صەدیقە، کە باوکی ئەسمای دایکیەتی.

**ڕوونکردنەوە:**

زوبەیری کوڕی عـەووامی کوڕی خووەیلید، قوڕەیشییە، پـورزای پێغەمبـەرە، دایکی صەفییەی کچی عەبدولموتتەلیبە، کە خوشکی عەبدوڵڵای باوکی پێغەمبـەرە، یەکێکە لـە عەشـەرەی موبەشـەرە، یەکێکە لـەو شـەش کەسـە، کـە ئیمـامی عومـەر رایسپارد لەپاش خۆی یەکێکیان لێ هەڵبژێرن بۆ جێنشین، لەتەمەنی دوازدە ساڵیدا موسوڵمان بوو، مامەی زوبەیر دەیپێچا لـە حەسیرێکەوەو بـە دووکـەڵ قـانگی دەدا، هەتا لە ئیسلام پاشگەز ببێتەوە. زوبەیر گەنم ڕەنـگ بـوو، بـاڵا مـام ناوەنـدی بـوو، ڕیشی تەنك بوو، لەوسـەردەمەدا کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پـەیمانی برایـەتی بەست لەنێوانی موسوڵمانانا لە مەککە، کردی بەبرای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، زوبەیر زاوای ئەبوبەکری صەدیق بوو چونکە مێردی ئەسمای کچی بوو، کوڕی زۆر بوو، وەك: عەبدوڵڵا و عوروەو موصعەب‌و مونذیر، زوبەیر بازرگانێکی گـەورە بـوو، زۆر زۆر دەوڵەمەند بوو، زوبەیر لەشەڕی ئەلجەمەلدا بەشـداری کـرد، بـەڵام دوایـی وازی هێنا، زەلامێ کـەناوی عـەمری کـوڕی جـەرمووز بـوو، بەنامەردانـە لەپشـتەوە ڕمێکی لێدا، ئەوجا بەکۆمەکی دوو نامەردی تر، کەناویان فوضالەی کوڕی حابیس‌و نوفەیع بوو، بەنامەردی بەتەواوی کوشتیان. ئەم ڕووداوە دڵتەزێنـە، لـەڕۆژی پێـنج شـەممەدا بـوو، لـەدەی مـانگی جومـادای یەکـەم، سـاڵی سـیی‌و شەشـی کۆچـی، وە لەهـەمان ڕۆژدا کارەساتی دڵتـەزێنی جـەنگی ئەلجەمـەل ڕوویـدا، گوتـەی بـەهێزتر ئەوەیـە کـە لەتەمـەنی شەسـت‌و حـەوت سـاڵیدا شـەهید کـراوە، لەناوچـەی زوبـەیر لەبەصرە نێژراوە، بەندە چوومەتە سەر گۆڕی پیرۆزی، زوبەیر دوو کۆچی کردووە، یەکێ بۆ حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینە، صەفییەی دایکی زوبەیر یەکێکە لـە پـوورە موسوڵمانەکانی پێغەمبەر، هەموو شەڕگاکان لە خزمـەت پێغەمبـەردا ئامادە بـووە،

سیی‌و هەشت (٣٨) فەرموودەی هەیە، دوو فەرمودەیان موتتەفەقو عەلەیهین، بوخاری بەتەنیا حەوتیانی گێڕاوەتەوە، لەناوچەیەکی بەصرە بەناوی (وادی السباع = دۆڵی دڕندە) شەهیدکرا، لەپێشا لەوێ نێژرا، لەپاشا تەرمەکەی گوازرایەوە بۆ بەصرەو لەبەصرە سپێردرا بەخاك. گۆڕەکەی لەبەصرە ناسراوەو زیارەتگایە (بۆ زانیاری تەواو سەبارەت بەم بنەماڵە خانەدانە بڕوانە: ژمارە: ٣، ١٥٣٣، ٨، ٤١، ١٨٦، ٢٣١، ١٢٣٧ لەم پەڕاوە پیرۆزە کە موختەصەری صەحیحی موسلیمە). هەروا بڕوانە {تاج/٣، زنجیرە: ١٩٨، ژمارە: ٣٣١٢، ٣٣١٣، ٣٣١٤، ٣٣١٥، ٣٣١٦، ٣٣١٧، ٣٣١٨، ٣٣١٩، ٣٣٢٤. زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٠ هەتا ٣٤٤٠} هەروا بڕوانە {تەجرید/١، ژمارە: ٣/٣ + ٧٥ = ٨٦ فەتح + ژمارە: ٧٨٤ = ١٦٤٣ فەتح} + {ریاضی الصالحین/٢، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٢/٤ چاپی دووەم، لاپەڕە: ١٨٦}.

## ١٢٧٢) باسی بەهرەو گەورەیی طەلحەو زوبەیر (رەزای خودایان لێ بێ). (٦١٩٢ - ٦٢٠١)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلِ طَلْحَةَ وَالزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)

١٦٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَانَ عَلَى جَبَلِ حِرَاءٍ فَتَحَرَّكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «اسْكُنْ حِرَاءُ فَمَا عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ»، وَعَلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، (رضى الله عنهم). {الحديث: ٦١٩٨ = ٦٢٠٥ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ کۆمەڵێکا، لەسەر چیای حیراء بوون، کێوەکە جووڵاو کەوتە لەرزە لەرز، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی کێوی حیراء! دامەزرێ، لەرزە لەرزی چیتە، ئەوانەی کە لەسەر پشتی تۆن، لەیەکێ لەم سێ جۆرە کەسە بەدەرنین: یا پێغەمبەرە، یا دۆستێکی خوای راستگۆو راستاڵە، یا شەهیدەو لەپێناوی خودادا دەکوژرێ!).

فەرمووی: لەوکاتەدا ئەم زاتانە لەسەر چیاکە دەبن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەبوبەکری صەدیق و عومەرو عوثمان و عەلی و طەلحەو زوبەیرو سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٣١٣ + تاج/٣، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٣٢٨٠، ٣٢٨٣}.

## ١٢٧٣) بەهرەو گەورەیی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ).
(٦١٨٠ - ٦١٩١)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلُ سَعْدُ بْنُ أَبِى وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ)

١٦٤٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَهِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَقْدَمَهُ الْمَدِينَةَ لَيْلَةً، فَقَالَ: «لَيْتَ رَجُلاً صَالِحًا مِنْ أَصْحَابِى يَحْرُسُنِى اللَّيْلَةَ»، قَالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ سَمِعْنَا خَشْخَشَةَ سِلاَحٍ، فَقَالَ: «مَنْ هَذَا»؟ قَالَ: سَعْدُ بْنُ أَبِى وَقَّاصٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَا جَاءَ بِكَ»؟ فَقَالَ: وَقَعَ فِى نَفْسِى خَوْفٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَجِئْتُ أَحْرُسُهُ. فَدَعَا لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، ثُمَّ نَامَ. {الحديث: ٦١٨١ = ٦١٨٨ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٨٧ = ٢٨٨٥، ٧٢٣١}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەو سەردەمەدا کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ مەدینە، شەوێ خەوی لێ زڕا، فەرمووی: (خۆزگەم ئەم شەو پیاوێکی باش لە هاوەڵانی خۆم ئێشکی دەگرتم!).

عائیشە فەرمووی: زۆری پێ نەچوو گوێمان لەخرەی چەك بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە کێیە؟). فەرمووی: منم سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصم!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (بۆچی هاتووی؟) فەرمووی: مەترسیم لە پێغەمبەر هەبوو، کەسێ دەستدرێژی لێ بکا، هاتووم ئەمشەو ئێشکت دەگرم.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پاڕایەوە بۆیو نزای باشی بۆی کردو ئەوجا بەدڵنیایی بەبێ ترسو بیم نووست. {تاج/٣، زنجیره: ١٢، ژماره: ٣٣٢٧ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٦٤٨- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) جَمَعَ لَهُ أَبَوَيْهِ، يَوْمَ أُحُدٍ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَدْ أَحْرَقَ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَم): «ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي»، قَالَ: فَنَزَعْتُ لَهُ، بِسَهْمٍ لَيْسَ فِيهِ نَصْلٌ، فَأَصَبْتُ جَنْبَهُ فَسَقَطَ، فَانْكَشَفَتْ عَوْرَتُهُ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى نَوَاجِذِهِ. {الحديث: ٦١٨٧ = ٦١٩٤ فم}:

عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: لەرۆژی غەزای ئوحوددا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باوكو دایكی خۆی پێکەوە کرد بەقوربانمو پێی گوتم باوكو دایکم بەقوربانت بن، پیاوێ لەهاوبەشپەیداکارەکان، ئاگری بەردابووە موسوڵمانەکان، ئەوەندەی لێ کوشتبوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەباوکم دەفەرموێ: (تیر تێ بگرە باوكو دایکم بەقوربانت بن!)

باوکم فەرمووی: منیش تیرێکی بێ نووکم لەو کابرایە گرت، کە ئاگری بەردابوو لە لەشکری موسوڵمانان، تیرەکە دای لەلاتەنیشتی کابرا کەوت بەلادا، شەرمگای دەرکەوتو تۆپی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخۆشی ئەوەی کەوا بەداماوی تۆپی پێکەنی، تەنانەت واپێکەنی بەچاوی خۆم تەماشای ددانەکانیم کرد).

١٦٤٩- عَنْ مُصْعَبُ بْنُ سَعْدٍ عَنْ أَبِيه (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ نَزَلَتْ فِيهِ آيَاتٌ مِنَ الْقُرْآنِ، قَالَ: حَلَفَتْ أُمُّ سَعْدٍ أَنْ لاَ تُكَلِّمَهُ أَبَدًا، حَتَّى يَكْفُرَ بِدِينِهِ، وَلاَ تَأْكُلَ وَلاَ تَشْرَبَ، قَالَتْ: زَعَمْتَ أَنَّ اللَّهَ وَصَّاكَ بِوَالِدَيْكَ وَأَنَا أُمُّكَ وَأَنَا آمُرُكَ بِهَذَا، قَالَ: مَكَثَتْ ثَلاَثًا، حَتَّى غُشِيَ عَلَيْهَا مِنَ الْجَهْدِ، فَقَامَ ابْنٌ لَهَا يُقَالُ لَهُ: عُمَارَةُ فَسَقَاهَا، فَجَعَلَتْ تَدْعُو عَلَى سَعْدٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي الْقُرْآنِ هَذِهِ الآيَةَ: (وَوَصَّيْنَا الإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا — ٩/٢٩)،

(وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلاَ تُطِعْهُمَا، وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا - ٣١/١٦). قَالَ: وَأَصَابَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَنِيمَةً عَظِيمَةً، فَإِذَا فِيهَا سَيْفٌ، فَأَخَذْتُهُ فَأَتَيْتُ بِهِ الرَّسُولَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقُلْتُ: نَفِّلْنِي هَذَا السَّيْفَ فَأَنَا مَنْ قَدْ عَلِمْتَ حَالَهُ، فَقَالَ: «رُدُّهُ مِنْ حَيْثُ أَخَذْتَهُ»، فَانْطَلَقْتُ حَتَّى إِذَا أَرَدْتُ أَنْ أُلْقِيَهُ فِي الْقَبَضِ، لاَمَتْنِي نَفْسِي، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: أَعْطِنِيهِ. قَالَ: فَشَدَّ لِي صَوْتَهُ: «رُدُّهُ مِنْ حَيْثُ أَخَذْتَهُ». قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنْفَالِ). قَالَ: وَمَرِضْتُ فَأَرْسَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَتَانِي، فَقُلْتُ: دَعْنِي أَقْسِمْ مَالِي حَيْثُ شِئْتُ، قَالَ: فَأَبَى، قُلْتُ: فَالنِّصْفَ؟ قَالَ: فَأَبَى، قُلْتُ: فَالثُّلُثَ. قَالَ: فَسَكَتَ، فَكَانَ بَعْدُ الثُّلُثُ جَائِزًا. قَالَ: وَأَتَيْتُ عَلَى نَفَرٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرِينَ فَقَالُوا: تَعَالَ نُطْعِمْكَ وَنَسْقِيكَ خَمْرًا، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ الْخَمْرُ، قَالَ: فَأَتَيْتُهُمْ فِي حَشٍّ (وَالْحَشُّ: الْبُسْتَانُ) فَإِذَا رَأْسُ جَزُورٍ مَشْوِيٌّ عِنْدَهُمْ، وَزِقٌّ مِنْ خَمْرٍ، قَالَ: فَأَكَلْتُ وَشَرِبْتُ مَعَهُمْ، قَالَ: فَذُكِرَتِ الأَنْصَارُ وَالْمُهَاجِرُونَ عِنْدَهُمْ، فَقُلْتُ: الْمُهَاجِرُونَ خَيْرٌ مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَ: فَأَخَذَ رَجُلٌ أَحَدَ لَحْيَيِ الرَّأْسِ فَضَرَبَنِي بِهِ فَجَرَحَ بِأَنْفِي، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرْتُهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيَّ - يَعْنِي نَفْسَهُ - شَأْنَ الْخَمْرِ: (إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنْصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ). {الحديث: ٦١٨٨ = ٦١٩٥ فم}:

موصعەبی کوڕی سەعد فەرمووی: باوکم فەرمووی: چەند ئایەتێ لە قورئان سەبارەت بەمن دابەزیو من هۆی هاتنیان بووم. فەرمووی: ئوم سەعدی دایکم سوێندی خوارد کە نەقسەم لەگەڵ بکاو نەنانو ئاو بخوا، تامن پەشیمان (پاشگەز) نەبمەوە لەئایینی ئیسلام، وە دایکم دەیگوت پێم: تۆ لەکن خۆت دەڵێی خودا فەرمانی پێ کردووی کەبۆ باوكو دایکت باش بیت، دەی ئەگەر ئەمە وایەو تۆ باوەڕت پێی هەیە، من دایکتمو فەرمانت پێ دەکەم کەواز بێنی لەئیسلامو بۆ ئەمە لەفەرمانی من دەرنەچیت.

فەرمووی: جادایکم سێ شەوو سێ ڕۆژ بەوحاڵە مایەوە، تامی ئاوو زادی نەکرد، تا لەبەر پەریشانی بووڕایەوە، هەتا کوڕێکی تری هەبوو، ناوی عومارە بوو، چوو

ئاوی پێدا، کە دەیانویست ئاوی بدەنێ، یانانی پێ بدەن، بەدارێ دەمی دایکمیان دادەچەقاندو بەزۆر ئاوو نانیان دەکرد بەقوڕگیا، جا ئەویش دەستی دەکرد بەنزای خراپ لەسەعد.

خودای گەورەیش لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {وَوَصَّيْنَا الإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا – العنكبوت - ٢٩/٩}:

واتە: ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردووە، کەبۆ باوكو دایکی زۆر باش بێو چاك بێ لەگەڵیانا، بەڵام لەبێ ئەمریو بێ فەرمانیی خودادا بەهیچ جۆرێ بەگوێیان مەکەن، وە ئەم ئایەتەی تریش بەم بۆنەیەوە هاتە خوارەوە:

{وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْم فَلاَ تَطْعْهُمَا، وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا – لوقمان - ٣١/١٥}:

واتە: ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردووە کەزۆر باشو فرە خاس بێ، لەگەڵ دایكو باوكو نەنكو باپیرو، چاکەی ئەوانی لەبەرچاو بێو دڵسۆزیان بێو سپڵەی بەدنمەك نەبێ، چونکە ئەوان هۆو رشتەی بوونی ئەون، ئەوەتانێ دایکی بەسەزمان بەچەرمی سك بەهەزار ئەركو ئازارو دەردی سەری نۆ مانگ هەڵی دەگرێو دوو ساڵی رەبەق شیری دەداتێو خزمەتی دەکا، هەتا دەیبڕێتەوە لەشیر، پاش ئەوەیش جۆرەها ناخۆشی لەپێناوی خۆشیی ئەودا دەکێشێو دەچێژێ، دەی سوپاسی من بکەن، کە خودای ئێوەمو دروستم کردوون لەنەبوون، سوپاسی ئەوانیش بکەنو چاکەیان بدەنەوە، ئەوەیش بزانن کەدوا ئەنجامتان لای منەو زووبێ یا درەنگ بەداماوی دێنەوە بەردەستی خۆم، بەڵام ئەگەر باوكو دایكو کەسوکارو هەرکەسێکی تر هەوڵیاندا لەگەڵتان کە هاوەڵو هاوبەشی بۆ من دابنێنو شتێ کە خۆی هەبوونی نییەو ئێوە خۆتان باوەڕتان پێی نییەو بەشیاوی نازانن بەقسەی ئەمو ئەوو تەنانەت بەزۆری زۆرداریش مەیکەن بە هاوەڵو هاوتاو هاوڕێی من، وەڵێ خودا هەقەو هەموو هەقێکی پێ خۆشە، لەدنیادا بەجوانیو بەمەردیو بە پیاوەتی رەفتاریان لەگەڵ بکەن).

سەعد فەرمووی: لەرۆژی رووداوی بەدردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تالانیو دەسکەوتی جەنگیی زۆری دەست کەوت، منیش شمشێرێکم لەماڵی تالانییەکە هەلگرتو بردم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! لەسایەی خوداوە، لەخودا بەزیادبێ، داخی دڵی خۆمم بەکافرەکان رشت، لەتۆڵەی عومەیری برامدا، سەعیدی کوڕی عاصم کوشتو ئەمە شمشێرەکەیەتی، واهێناومە بۆلای تۆ، ئەم شمشێرەم پێ ببەخشە، تۆ خۆتیش ئاگات لەحاڵی من هەیە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە نەهی منو نەهی تۆیە، بیخەرەوە سەر تالانییەکە!).

جا شمشێرەکەم برد، هەتا خەریك بووم هەڵی بدەمە سەر خەرمانی تالانییەکان، کەچی دڵم بەرایی نەداو گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەرو عەرزیمکردەوە: ئەم شمشێرەم پێ ببەخشە، بەڵام ئەمجارەیان بەدەنگێکی تیژو توندتر فەرمووی: (لەکوێت هێناوە بیبەرەوە بۆ ئەوێو لەسەر کۆگای تالانییەکان دایبنێ!

جا بەم بۆنەیەشەوە ئەم ئایەتەی تریش، هەر بەهۆی منەوە هاتە خوارەوە:

{يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأنفَالِ قُلِ الأنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بِيْنِكُمْ وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ – الأنفال – ٨/١} :

واتە: ئەی پێغەمبەر! پرسیارت لێ دەکەن، لە بڕیارو حوکمی ئەو ماڵو تالانییەی کە بەجەنگ، بەزەبری شیرو تیرو گوللەو بەهێزی بازوو، لە ناموسوڵمانەکانی وەردەگرن، دەبێ چۆن دابەش بکرێو بدرێ بەکێ، تۆ ئەی پێغەمبەر! بەفەرمانی من وەڵامیان بدەرەوەو بڵێ: ئەو ماڵە ماڵی خوداو پێغەمبەری خودایە، پێغەمبەری خودا بەفەرمانی خودا بەکێی بوێ پێی دەدا، ئێوە بەردی بناغەی ئیسلامن هەتا هەتایە دەبن بەسەرمەشقو پێشەوا، بۆ وەچەو نەوەی دوای خۆتان، کەواتە: چاوتان لەماڵی دنیا نەبێ، چاوتان لە بەرژەوەندی ئیسلام بێ، ئاشووب مەگێڕنو لەسەر چڵکی دەست ئاژاوە بەرپا مەکەنو گوێڕایەڵی

خوداو پێغەمبەر بن، ئەگەر ئێوە بەڕاستی موسوڵمانی ساغن). {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣٨٧٥ — سوورەتی ئەنفال}.

سەعد فەرمووی: جارێکیش نەخۆش کەوتم، ناردم بەشوێنی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلام، عەرزیمکرد: (ئەگەر مۆڵەتم بدەی سامانەکەم بە ئارەزووی خۆم دابەش دەکەم؟).

سەعد فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی ئەوەی پێم نەدا، گوتم: دەی مۆڵەتم پێ بدە کە سێیەکی ماڵەکەم بکەم بەخێرو راسپێری؟ سەعد فەرمووی: دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نیوەیشی پێم نەدا، گوتم: دەی مۆڵەتم پێ بدە کە سێیەکی ماڵەکەم بکەم بەخێرو وەسێت؟ سەعد فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێ دەنگ بوو، ئیتر لەوە بەدوا کردنی سێیەك بەخێر دروست بوو.

سەعد فەرمووی: جارێکیش چووم بۆناو دەستەیێ لە ئەنصارو لە موهاجیرین (لە یاریدەدەرانو لە کۆچکاران) گوتیان: وەرە لەگەڵ ئێمە بخۆو مەی بنۆشە، ئەمەش لەپێش حەرامبوونی مەیو بادە نۆشیدا بوو، فەرمووی منیش چووم، روانیم وا وان لەناو دێبەرێکا، دێبەر واتە باخ، سەری وشترێکیان برژاندووەو کوندەیێ ئارەقیان داناوە، لەو گۆشتە برژاوەیان دەخواردو لەو بادەیەیان دەکرد بەسەردا.

فەرمووی: منیش لەگەڵیانا دەستم کرد بەگۆشت خواردنو مەیخواردنەوە، جا بەسەرخۆشی دەستم کرد بەباسی یاریدەدەرانو کۆچکارانو گوتم: کۆچکاران باشترن لە یاریدەدەران! سەعد خۆی لە کۆچکارە پێشینەکان بوو، فەرمووی: جا پیاوێ لەوان تەنگە گرتیو ئێسکی لاشەویلەی کەللە سەرەکەی هەڵگرتو پیایا کێشامو لووتمی زامارکردو لووتم پڕاو چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو هەواڵەکەم بۆی شیکردەوە، جا بەم بۆنەیشەوە، سەبارەت بەمن لەم بارەیەوە، خودای گەورەو شکۆدار، ئەم ئایەتەی دابەزاند:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ – المائدة – ٥/٩٠}:

واته: ئەی موسوڵمانینه! بزانن عارەق‌و مەی‌و بادەو شەراب‌و قومارو یاری قومارو پەرستن‌و ڕێزگرتنی بتەکان‌و فالگرتنەوەو دانەگرتنەوە بە ئەزلام‌و شتی وا، ئەمانە هەموو لە کردەوەی شەیتانن، زۆر پیس‌و حەرام‌و چەپەڵن، کەوابێ خۆتانی لێ بپارێزن، تا رزگارو سەرفراز ببن لەهەردوو جیهاندا). {تاج/٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٧٣٢ چ/٤}.

١٦٥٠- عَنْ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) سِتَّةَ نَفَرٍ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): اطْرُدْ هَؤُلاَءِ لاَ يَجْتَرِئُونَ عَلَيْنَا، قَالَ: وَكُنْتُ أَنَا وَابْنُ مَسْعُودٍ وَرَجُلٌ مِنْ هُذَيْلٍ وَبِلاَلٌ وَرَجُلاَنِ لَسْتُ أُسَمِّيهِمَا، فَوَقَعَ فِي نَفْسِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقَعَ، فَحَدَّثَ نَفْسَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ). {الحديث: ٦١٩١ = ٦١٩٨ فم}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستەیەکی شەش کەسی بووین لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین: مەن‌و ئیبنو مەسعوودو پیاوێکی هوزەیلی‌و بیلال‌و دوو پیاوی تر بووین، کە نامەوێ ناویان بهێنم، هاوبەشپەیداکەرەکان بە پێغەمبەریان گوت: ئێمە پێشنیارێکمان هەیە: ئەم هەژارانە لەدەوری خۆت دەربکە، تا ئێمەیش هاموشۆت بکەین، با ئەمانە سامیان لێمان نەشکێ‌و زات نەکەن بەسەرمانا.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم لایەنەوە، ئەوەی کەخودا لەچارەی نووسیبوو هات بەدڵیاو دڵی چەکەرەی کرد، کە داواکەیان جێبەجێ بکا، بە ئومێدی ئیسلامبوونیان!

جا خودا لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ - الأنعام – ٦/٥٢}:

واتــه: ئــەی خۆشەویســت! تــۆ پێغەمبــەری خودایــت، نــەوەك پیــاوی دنیــایی‌و سیاسەتباز، کەواتە نەکەی دڵی ئەو هەزارانە بشکێنی‌و لە کۆڕو مەجلیسی خۆت، بەقسەی ئــەو بتپەرستانە دەریــان بکــەی، ئەوانــە بــەڕۆژو بەشــەو، هەمیشــە سەرگەرمی عیبادەت‌و بەندەیی ساغ‌و دروستن بۆ ڕەزای خودا، حسێب‌و لێکۆڵینــەوە لە ئیمان‌و رازی دڵی ئــەو هەزارانــە لەســەر تــۆ نییــە، تــۆ نابــێ بــاوەڕی ساغی ئــەم موسوڵمانە ساغە باشانە، بەرابــەر بەکەسبی مــەیلی ئــەو ناموسوڵمانە بەگزادانــە بخەیتە سەر سەوداو، بەتەمای ئیمانهێنانی ئەو دەوڵەمەندو دارایانە، دڵی پاکی ئەو موسوڵمانە هەزارانە بشکێنی، چونکە هــەڵ دەگــرێ ئیمــانی ئــەم هــەژارە دڵسۆزانە لەلای خودا گــەلێ مــەزنتر بــێ لــەئیمانی ئــەو بێباوەڕانــە، لەفــەرزی ئیمانهێنانیانــدا، بەڵێ گشت کەسێ حسێبی خۆی لەسەر خۆیەتی، تەنانەت ئــەم مەســەلەیە ئەوەنــدە روون‌و ئاشکراو بەڵگە نەویستە تــۆو ئــەوان تێیــدا چون یەکــەن، هــەروەك حسێبی ئەوان بەدەست تۆ نییە، حسێبی تــۆیش بەدەســت ئــەوان نییــە، کەواتــە بــۆ دەریــان دەکــەی! ئــەی خۆشەویســت! ئەگــەر پــاش ئــەم روونکردنەوەیــە کــە گرێــی دڵــی کردنــەوەو، دەفعــی ئیشــکالی کــردن شــتی وا بکــەی ئــەوا تــۆ بــەزۆردارو ســتەمگەرو ســتەمکار حســێب دەکرێیــت، دیــارە کــە لەمــەولا تــۆ شــتی وا ناکــەی، بــەڵام ئــەم روونکردنەوەیــە پایــەی بــەرزی هــەژاری بــاوەڕداری ســاغ لــەلای خــودا دەردەخــاو هەڕەشەیەکی توندە لەو کەسانەی کە لەمەولا پێشنیاری وا ناهــەق بــۆ تــۆ دەکــەن).
{تاج/٥، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٥٢٠١م، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٢٧٤) باسی بەهرەو گەورەیی ئەبو عوبەیدەی کوڕی ئەلجەرراح (رەزای خودای لێ بێ). (٦٢٠٢ - ٦٢٠٥)

## فِي فَضَائِلُ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)

١٦٥١- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ أَهْلُ نَجْرَانَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْعَثْ إِلَيْنَا رَجُلاً أَمِينًا. فَقَالَ: «لأَبْعَثَنَّ إِلَيْكُمْ رَجُلاً أَمِينًا حَقَّ أَمِينٍ، حَقَّ أَمِينٍ»، قَالَ: فَاسْتَشْرَفَ لَهَا النَّاسُ، قَالَ: فَبَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ.

{الحديث: ٦٢٠٤ = ٦٢١١ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٧٤ = ٣٧٤٤، ٤٣٨٢، ٧٢٥٥ = فتح الباري + تجريد/٤، رقم: ١٦١٠ = ٤٣٨٠ فتح الباريز تحفة الأشراف/٩٤٨}:

حوذەیفەی کوڕی یەمان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خەڵکی نەجران هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوێکی هێمنو ئەمینمان بۆ بنێرە، فەرمووی: پیاوێکی تەواو هێمنو ئەمینداری بەحەق ئەمینو دەستپاکتان بۆ دەنێرم!

فەرمووی: جا خەڵکەکە هەرکەسێ لەلای خۆیەوە، لەخۆشی ئەم نازناوە جوانە خۆی قوت کردەوەو گوێقوڵاخ بوون بۆ ئەو فەرمانە مەزنە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراحی نارد، تابێ بە ماموٚستایانو فێری ئیسلامیان بکا). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٣٣٣٣ چ/٤}.

**روونکردنەوە:**

ئەبو عوبەیدە ناوی تەواوی: عامیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەرراحە، ئەبو عوبەیدەو عوثمانی کوڕی مەظعوونو عوبەیدەی کوڕی حاریثو عەبدورەحمانی کوڕی عەوفو ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدول ئەسەد لەیەك کاتدا موسوڵمان بوون، لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماڵی ئەلئەرقەم بکا بە بارەگای نهێنی کۆمەڵەی موسوڵمانان.

دایکی ناوی ئومەیمەی کچی غەنەمە لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، ئەبو عوبەیدەدوو کۆچی کردووە، کۆچێ بۆ حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینە. ئامادەی شەڕگەی بەدرو شەڕگاکانی تری پاشی بووە، لەغەزای ئوحوددا دوو ئەڵقەی کڵاو زریەکەی پێغەمبەر چەقیبوونە روومەتی، ئەبو عوبەیدە بەددان دەری هێنان، بەهۆی ئەمەوە دوو ددانی پێشینەی کەوتنو بۆی بوون بەهۆی جوانی!!

زۆرینەی وڵاتی شام لەسەر دەستی ئەبو عوبەیدەدا ئازادکرا، فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە. ئەبو عوبەیدە پیاوێکی لەڕو لاوازبوو، ریشێکی تەنکی هەبوو، باڵا بەرزبوو، ماڵو سامانێکی وای نەبوو، گوزەرانی زۆر سادەو ئاسایی بوو،

عومەر پێی فەرموو: دەبوو هەندێ ماڵت ببوایە، فەرمووی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئەمەی هەمانە دەمانگەیەنێتە هەوار. یەکێ لە دروشمەکانی ئەم گوتەیە بوو: (خراپەی دێرین بە چاکەی شیرین بسڕنەوە!).

لە تاعونەکەی عەمواسدا بەتاعوون شەهید بوو لەشام، لەگوندێ کەناوی عەمواس بوو، لەبەینی رەملەو بەیتولەقدیسدا بوو، لەساڵی هەژدەی کۆچیدا، لەتەمەنی پەنجاو هەشت ساڵیدا، یەکێکە لەدە کەسەکەی کە موژدەی بەهەشتیان لەلایەنی پێغەمبەرەوە پێ بەخشراوە، کە ناسراون بە عەشەرەی موبەشەرە، نازناوی لەناو هاوەڵانا (ئەمینداری پێغەمبەر) بوو. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٣٣٣٢ هەتا ژمارە: ٣٣٣٤ + ژمارە: ٣٣٣٥ + ٣٣٣٨ + تاج/٣، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٢٩٤٨، ٢٩٤٥، ٢٩٤٦، ٢٩٤٧}.

## ١٢٧٥) باسی بەهرەو گەورەیی حەسەنو حوسەین (رەزای خودایان لێ بێ).

(٦٢٠٦ - ٦٢١١)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلُ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمَا)

١٦٥٢- عَنْ سلمة بن الأكوع (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: لَقَدْ قُدْتُ بِنَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَالْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ بَغْلَتَهُ الشَّهْبَاءَ حَتَّى أَدْخَلْتُهُمْ حُجْرَةَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، هَذَا قُدَّامَهُ، وَهَذَا خَلْفَهُ. {الحديث: ٦٢١٠ = ٦٢١٧ فم = فتح اللهم بِشَرْحِ صحيح الإمام مسلم. ترمذی. أدب: ٢٧٥}:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆم بەدەستی خۆم جڵەوی هێسترە بۆزی پێغەمبەرم رادەکێشا، پێغەمبەرو حەسەنو حوسەینی بەسەر پشتەوە بوون، ئەمیان لەبەردەمیاو ئەویان لەپاشکۆیا بوو، لەسەر ئەم حاڵە جڵەوی هێسترەکەم بۆیان راکێشا هەتا بردیانمە هۆدەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٣٣٦٧ چ/٤}.

**روونكردنەوە:**

ئەم هێسترە رەنگی بۆز بوو، ناوی دوڵ دوڵ بوو، موقەوقەس بەدیاری ناردی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم هێسترە ما هەتا زۆر پیربوو، هەتا هەموو ددانەکانی کەوتن، هەتا لەبەر پیریی کوێریش بوو، لەپاش مردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلی کوڕی ئەبو طالیب سواری دەبوو، لەپاش عەلیش حەسەن، لەپاش حەسەن حوسەین، لەپاش ئەویش موحەممەدی کوڕی ئەلحەنەفییە.

١٦٥٣- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِی طَائِفَةٍ مِنَ النَّهَارِ، لاَ يُكَلِّمُنِی وَلاَ أُكَلِّمُهُ، حَتَّى جَاءَ سُوقَ بَنِی قَيْنُقَاعَ، ثُمَّ انْصَرَفَ حَتَّى أَتَى خِبَاءَ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) فَقَالَ: «أَثَمَّ لُكَعُ، أَثَمَّ لُكَعُ»، يَعْنِی حَسَنًا (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَظَنَنَّا أَنَّهُ إِنَّمَا تَحْبِسُهُ أُمُّهُ لأَنْ تُغَسِّلَهُ وَتُلْبِسَهُ سِخَابًا، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ جَاءَ يَسْعَى، حَتَّى اعْتَنَقَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اللَّهُمَّ إِنِّی أُحِبُّهُ فَأَحِبَّهُ وَأَحْبِبْ مَنْ يُحِبُّهُ». {الحديث: ٦٢٠٧ = ٦٢١٤ فم. تجريد البخاري بالكردی/٣، رقم: ٩٦٠ = ٢١٢٢، ٥٨٨٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێك بەرۆژ لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووم، لەرێ نە ئەو قسەی لەگەڵ من کرد، نە من قسەم لەگەڵ ئەوکرد، تاچووینە بازاڕی قەینوقناع، کە یەکێکە لە بازاڕەکانی شاری مەدینە ئەوجا گەڕایەوەو چوو بۆ ماڵی فاطیمەی کچی، کە هاوسەری ئیمامی عەلیو دایکی حەسەنو حوسەینە، لەوێ لە حەوشەکەی ماڵی فاطیمە دانیشتو فەرمووی: (ئەرێ بچکۆل لەکوێیە؟ ئەرێ بچکۆل لەوێیە؟).

جا دایکی نەختێ بەندی کرد، وابزانم دایکی ویستی بیشواتو هەنێ حەتحەتۆکەی بۆنخۆشی لەمل بکا، زۆری پێ نەچوو کە حەسەن بەهەڕاکردن هاتو لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستیان کردە ملی یەکتریو باوەشیان کرد بەیەکاو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆش خۆش ماچی دەکرد، ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودایە! من ئەمەم خۆش دەوێ، ساتۆیش خۆشت

بـوێو ئـەو کەسەیشـت خـۆش بـوێ کـە ئـەوی خـۆش دەوێ!). {تـاج/٣، زنجـیره: ٢٠، ژماره: ٣٣٦٦}.

## ١٢٧٦) باسی بەهرەو گەورەیی فاطیمەی کچی پێغەمبەر (درووودی خودایان لەسەر بێ). (٦٢٥٧ - ٦٢٦٤)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلِ فَاطِمَةَ عَلَيْهَا السَّلَامُ بِنت رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٦٥٤- عَنْ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما): أَخْبَرَهُ أَنَّ عَلِيَّ بْـنَ أَبِـى طَالِـبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) خَطَبَ بِنْتَ أَبِى جَهْلٍ، وَعِنْدَهُ فَاطِمَةُ بِنْـتُ رَسُـولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ)، فَلَمَّا سَمِعَتْ بِذَلِكَ فَاطِمَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها)، أَتَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) فَقَالَتْ لَهُ: إِنَّ قَوْمَكَ يَتَحَدَّثُونَ أَنَّكَ لاَ تَغْضَبُ لِبَنَاتِكَ، وَهَذَا عَلِيٌّ نَاكِحًـا ابْنَـةَ أَبِـى جَهْـلٍ، قَالَ الْمِسْوَرُ: فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمِعْتُهُ حِينَ تَشَهَّدَ، ثُمَّ قَـالَ: «أَمَّـا بَعْـدُ فَإِنِّى أَنْكَحْتُ أَبَا الْعَاصِ بْنَ الرَّبِيعِ، فَحَدَّثَنِى وَصَـدَقَنِى، وَإِنَّ فَاطِمَـةَ بِنْـتَ مُحَمَّـدٍ مُضْـغَةٌ مِنِّى، وَإِنَّمَا أَكْرَهُ أَنْ يَفْتِنُوهَا، وَإِنَّهَا وَاللَّهِ لاَ تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ وَبِنْتُ عَـدُوِّ اللَّـهِ عِنْـدَ رَجُلٍ وَاحِدٍ أَبَدًا». قَالَ: فَتَرَكَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) الْخِطْبَـةَ. {الحـديث: ٦٢٦٠ = ٦٢٦٨ فم. بخاري. الجمعة: ٩٢٦، ٣١١٠، ٣٧١٤}:

میسوەری کـوڕی مەخرەمـە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: عـەلی کـوڕی ئـەبو طالیـب خوازبێنی کچێکی ئەبو جەهلی کرد بۆ خۆی، کە بەسەر فاطیمەی کچی پێغەمبـەر بیهێنێ کە ئەوکاتە فاطیمە ژنی عەلی بوو، جا کاتێ فاطیمە بەمە دەزانێ، دێت بـۆ خزمەتی باوکی، عەرزی دەکا: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! خزمـانی تـۆ قسـە لەوە دەکەن، کـە گوایـە تـۆ لەسـەر کچـەکانت ناکەیتـەوەو دەربەسـتی ئـەوەنیت کـە مێردەکانیان ژنیان بەسەر بهێنن، هەر لەم روانگەیەوە کە ئەوەتا عەلی کـوڕی ئـەبو طالیب دەیەوێ ژن بەسەر من بهێنـێو دەیـەوێ کچـەکەی ئـەبو جـەهل مارەبکا بـۆ خۆی!؟

میسوەر فەرمووی: جـا بـەم بۆنـەیـەوە پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسـەر بێ) هەڵسایەوە، وتارێکی دا، بـەگوێی خـۆم گـوێم لێ بـوو، کاتـێ شـایەتمانی هێنـا، ئـەوجا فـەرمووی:

(پاش ئەمە، من کاتی خۆی زەینەبی کچمم دا بە ئەبولعاصی کوڕی رەبیع، بەڵێنی لەم لایەنەوە پێمداو قسەی بۆکردم، بەڵێنو قسەکەی راست دەرچوو، بۆ کچەکەم زۆر باش بوو، لەڕاستیدا فاطیمەی کچم پارچەیەکە لەخۆم، هەرچی ئازاری ئەو بدا ئازاری منیش دەدا، وە ئێستایش بەهۆی ئەم خوازبێنییەی عەلییەوە، کە دەیەوێ ژنی بەسەر بهێنێ، مەترسی ئەوەم هەیە کە تووشی ئاژاوەی بکەن، دەی سوێندم بەزاتی خودا قەت شتی وانابێ: کە فاطیمەی کچم کەکچی پێغەمبەری خودایە، لەگەڵ کچی ئەبوجەهل دا، کە دوژمنی خودایە لەیەك کاتدا ژنی یەك پیاوبن کە عەلی کوڕی ئەبو طالیبە، ئەگەر عەلی دەیەوێ کچەکەی من تەڵاق بدا، ئەوسا کچی ئەوان بهێنێ!!).

فەرمووی: ئیتر عەلی (رەزای خودای لێ بێ) وازی لەخوازبێنییەکەی هێنا.

**روونکردنەوە:**

فاطیمەی زەهراء (رەزای خودای لێ بێ) کچی حەزرەتی پێغەمبەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو منداڵو هاوسەرو هاوەڵانو شوێنکەوتوانو پەیڕەوانی بێ. ئامین خودایە). فاطیمە هاوسەری ئیمامی عەلییە، یەکەم هاوسەریەتی، هەر ئەو شووەی کردووە، بەکچی شووی بەعەلی کردووە، هەتا ما ژنی عەلی بوو، عەلی ژنی تری بەسەر نەهێنا لەپاش مەرگی فاطیمە ژنی تری هێنا.

فاطیمە دایکی حەسەنو حوسەینە، نەنکە گەورەی هەموو سەیدەکانە، نەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر لەڕێگەی فاطیمەوە ماوە، لە منداڵەکانی تریەوە، پێغەمبەر نەوەو وەچەی نەماوە، بەپێی تەمەن، کچەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕێز ئەمانەن:

١- زەینەب، لەپێش بیعثەتدا، بەدەساڵ لەدایك بووە، یەکەم کچی پێغەمبەر بووە کە شووی کردووە، شوویکرد بە پورزای خۆی کە ناوی ئەبولعاص بوو، زەینەب لەگەڵ پێغەمبەردا کۆچی کرد، هەتا ما ژنی ئەبولعاص: لەقیطی رەبیع بوو،

کوڕێکی بوو ناوی عەلی بوو، لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا لەپاشکۆی پێغەمبەرەوە سوار بوو بوو، بەمێرد منالّی مرد، کچێکیشی هەبوو ناوی ئومامە بوو، ئەو کچەزایەی پێغەمبەر بوو، کە لەنوێژدا دەیکردە قەڵاندۆشکانی، کاتێ فاطیمە مرد، عەلی ئەم ئومامەیەی مارەکرد: زەینەب سەرەتای ساڵی هەشتی کۆچی مرد. {بڕوانە: ژمارە: ٣٤٦ لەپێشەوە رابورد، ژیاننامەی زەینەب}.

٢- روقییە، ساڵی سیی‌و سێ لەتەمەنی پێغەمبەر، روقییە لەدایکبووە، هاوسەری ئیمامی عوثمان بوو، کۆچی پێکرد بۆ حەبەشە، منالّێکی لە عوثمان بوو ناوی عەبدوڵلا بوو، روقییە زۆر جوان بوو، دوو کۆچی کردووە، لەغەزای بەدردا کۆچی دوایی کرد.

٣- ئوم کەلثووم (رەزای خودای لێ بێ) لەپاش مەرگی روقیەی خوشکی ساڵی سێی کۆچی شووی کرد بە عوثمان، لەساڵی نۆی کۆچی لەلای عوثمان مەرگ بوو بەمیوانی، منداڵی نەبوو لێی.

٤- فاطیمەی زەهراء، راجیایی سەبارەت بەساڵی لەدایکبوونی هەیە، هەندێ دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەمەنی چل‌و یەك ساڵ بووە کە فاطیمە لەدایك بووە، هەنێ تر دەفەرموون: تەمەنی سیی‌و پێنج ساڵ بووە کە فاطیمە لەدایك بووە، دیارە کە فاطیمەو براو خوشکەکانی، بێجگە لە ئیبراهیمیان، هەموویان لەخەدیجە بوون، کە یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بووە، فاطیمە کەشووی کرد بەعەلی تەمەنی پازدە ساڵ بوو، لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشەش مانگ فاطیمەیش دەمرێ. لەئیمامی عەلی سێ کوڕی بووە: حەسەن‌و حوسەین‌و موحسین، موحسینیان بەمنالّی دەمرێ، هەروا سێ کچیشی لێی دەبێ: روقییەو زەینەب‌و ئوم کەلثووم. {بڕوانە: ژمارە: ٧٣ ژیاننامەی خەدیجەی دایکی فاطیمە + ژمارە: ٦٩٢ ژیاننامەی عەلی کوڕی ئەبو طالیب + تاج/٣، زنجیرەك ١٩ لە ژمارە: ٣٣٥٧ وە هەتا ژمارە: ٣٣٨٠، زنجیرە: ٢٠} + {تەجریدی بوخاری بە کوردی، ژمارە: ١٤٦٢ = ٣٧٠٥، ١٢٦، ٦١٦، بڕوانە: ژمارە: ١٤٦٢ ژیاننامەی فاطیمەی کچی موحەممەد}.

١٦٥٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كُنَّ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عِنْدَهُ، لَمْ يُغَادِرْ مِنْهُنَّ وَاحِدَةً، فَأَقْبَلَتْ فَاطِمَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) تَمْشِي، مَا تُخْطِئُ مِشْيَتُهَا مِنْ مِشْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) شَيْئًا، فَلَمَّا رَآهَا رَحَّبَ بِهَا فَقَالَ: «مَرْحَبًا بِابْنَتِي»، ثُمَّ أَجْلَسَهَا عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ سَارَّهَا، فَبَكَتْ بُكَاءً شَدِيدًا، فَلَمَّا رَأَى جَزَعَهَا سَارَّهَا الثَّانِيَةَ، فَضَحِكَتْ، فَقُلْتُ لَهَا: خَصَّكِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ بَيْنِ نِسَائِهِ بِالسِّرَارِ ثُمَّ أَنْتِ تَبْكِينَ؟ فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) سَأَلْتُهَا: مَا قَالَ لَكِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟ قَالَتْ: مَا كُنْتُ أُفْشِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) سِرَّهُ. قَالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، قُلْتُ: عَزَمْتُ عَلَيْكِ بِمَا لِي عَلَيْكِ مِنَ الْحَقِّ لَمَا حَدَّثْتِنِي مَا قَالَ لَكِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَتْ: أَمَّا الآنَ فَنَعَمْ، أَمَّا حِينَ سَارَّنِي فِي الْمَرَّةِ الأُولَى، فَأَخْبَرَنِي « أَنَّ جِبْرِيلَ كَانَ يُعَارِضُهُ الْقُرْآنَ فِي كُلِّ سَنَةٍ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ، وَإِنَّهُ عَارَضَهُ الآنَ مَرَّتَيْنِ، وَإِنِّي لاَ أُرَى الأَجَلَ إِلاَّ قَدِ اقْتَرَبَ، فَاتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي، فَإِنَّهُ نِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ، قَالَتْ: فَبَكَيْتُ بُكَائِي الَّذِي رَأَيْتِ، فَلَمَّا رَأَى جَزَعِي: سَارَّنِي الثَّانِيَةَ فَقَالَ: «يَا فَاطِمَةُ أَمَا تَرْضَيْ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ سَيِّدَةَ نِسَاءِ هَذِهِ الأُمَّةِ»؟ قَالَتْ: فَضَحِكْتُ ضَحِكِي الَّذِي رَأَيْتِ. {الحديث: ٦٢٦٣ = ٦٢٧١ فم = فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. بخاري. مناقب: ٣٦٢٣. تجريد البخاري بالكوردي، المجلد الرابع، رقم: ١٦٢١ = ٤٤٣٣، ٤٤٣٤، ٣٦٢٣، ٣٦٢٥، ٣٧١٥، ٦٢٨٥، ٣٦٢٦، ٣٧١٦، ٦٢٨٦. فتح الباري بشرح صحيح البخاري. ابن ماجة. الجنائز: ١٦٢١. تحفة الأشراف: ١٧٦١٥}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەگشت هاوسەرو نەوەو یارو یاوەران‌و هاوەڵان‌و پەیڕەوانی بێ) فەرمووی: لەنەخۆشینی سەرەمەرگا، ژنەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گشتیان لەلای کۆبوونەوە، یەك ژنیان لێ کەم نەبوو، هەموویان بوون، لەوکاتەدا فاتیمە هات، شێوەی ڕۆیشتنەکەی کوتومت لەشێوەی ڕۆیشتنی پێغەمبەر خۆیی دەکرد. حەزرەت

کەچاوی پێی کەوت، بەخێرهاتنێکی گەرمی کرد، فەرمووی: (خۆش هاتی مەرحەبا لەکچی خۆم).

ئەوجا یا لەلای راستی خۆیەوە، یا لەلای چەپی خۆیەوە داینیشان، لەپاشا بەنهێنی، بەچپەو سرتە قسەیەکی بۆیکرد، فاتیمە دەستی کرد بەگریان، گریانێکی بەکوڵ، کەبینی فاتیمە وا پەشێوەو وا پەرۆشە، بەچپە قسەیەکی نهێنی تری بۆیکرد، ئەمجارە فاطیمە دەستی کرد بەپێکەنین.

عائیشە فەرمووی: لەم بارەیەوە پرسیارم لە فاطیمە کردو پێیم گوت: لەسەر ئەم هەموو ژنانەیدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەنیا قسەی نهێنیو رازی دڵی خۆی لەلای تۆ درکان، کەچی دەگریت ئەمە بۆچی؟ جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا، لە فاطیمەم پرسی: ئەوە ئەو قسە نەهێنییە چی بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیکردی؟

فەرمووی: بۆمن نەهاتووە کە نهێنی تایبەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاشکرا بکەمو زڕاندنی کاری وا لەکاتی وادا نابەجێیە.

عائیشە فەرمووی: جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گیانی پاکی سپارد، بە فاتیمەم گوت: بەو مافەی کەمن هەمە لەسەر تۆ، کەمن هاوسەری باوکتمو تۆ لەجێی کچی منی، بەجەخت داوات لێ دەکەم، کەپێم بڵێیت ئەو رۆژە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەنهێنی چی پێت گوت؟

فاتیمە فەرمووی: ئێستا پێت دەڵێم بەسەرچاو، چونکە هۆکار نەماوە بۆ نەگوتنی، جاری یەکەم قسە نهێنییەکەی ئەمە بوو، پێی فەرمووم: (کە جوبرائیل، لەمەوپێش هەموو ساڵێ یەك جار دەوری قورئانی لەگەڵدا دەکردمەوە، لەمانگی رەمەزانا گوێی لێ دەگرتمو زۆر بەجوانی پێی رەوان دەکردمو فێری تەجویدو قیرائەتەکانی دەکردم، بەڵام ئەمساڵ دووجار دەوری قورئانی لەگەڵدا کردمەوە، جا وادەزانم کە ئەمە بۆ ئەوەیە تا بەباشی قورئانەکە لەبەربکەمو بە ئوممەتی رابگەیەنم، دیارە ئەمەیش کەنیشانەی ئەوەیە ئاکامم نزیك بۆتەوەو لەم ساڵەدا

دەمرم، دەی تۆیش ئەی کچی شیرینم! ترسی خودات هەبێ، بەتایبەتی لەکاتی وادا، بێ فەرمانی خودا مەکەو لەسەر ئەم موصیبەتە صەبرو ئارام بگرە، ئەوەیش بزانە کەمن باشترین پێشەنگ‌و پێشینەم بۆتۆ). {بڕوانە: ژمارە: ١٥٨٥ لە نجیرە: ١٢٣١ دا لەپێشەوە}.

فاطیمە فەرمووی: جا ئەوەبوو منیش ئەو گریانە گریام کە بینیت جا کاتی باوکم بینیمی ئاوا پەرێشان‌و پەشێوم، بۆجاری دووەم قسەی نهێنی بۆ کردم‌و فەرمووی پێم: (ئەی فاطیمە! ئەدیی باشە تۆ رازی نابی بەوە کەتۆ خانمی گەورەی ژنە موسوڵمانەکان بیت) یا فەرمووی: (گەورە خانمی ژنانی ئەم نەتەوەی ئیسلامە بیت؟).

فەرمووی: جا ئەوەبوو منیش لەخۆشی ئەوە بەو شێوەی بینیت پێکەنیم!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٣٣٦٠، ٣٣٥٩. چ/٤}.

## ١٢٧٧) باسی بەهرەو گەورەیی کەسوکاری پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ). (٦٢٠٦ - ٦٢١١)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلُ أَهْلَ الْبَيْتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٦٥٦- عَنْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: خَرَجَ رَسُولُ اللّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ غَدَاةً، وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مُرَحَّلٌ مِنْ شَعْرٍ أَسْوَدَ، فَجَاءَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ، فَأَدْخَلَهُ، ثُمَّ جَاءَ الْحُسَيْنُ فَدَخَلَ مَعَهُ، ثُمَّ جَاءَتْ فَاطِمَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) فَأَدْخَلَهَا، ثُمَّ جَاءَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَأَدْخَلَهُ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا). {الحديث: ٦٢١١ = ٦٢١٨ فم = فتح الملهم بشرح صحيح الامام مسلم}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەر لەبەیانیانێك، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) رۆیشتە دەرەوە، باڵا پۆشێکی یەمەنی لەبەردا بوو، لەمووی رەش بوو، بەوێنەی کورتانی وشتر نەخشابوو، یا بەوێنەی مەنجەڵ‌و قازانگ‌و تیانچە نەخشابوو، حەسەنی کوڕی عەلی هات بۆلای، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) خستیە ناو باڵا

پۆشەکەوە، لەپاشا حوسەینیش هات، ئەویشی کردە ژێری‌و لەگەڵ حەسەنا داینان لەژێر باڵا پۆشەکەیدا، لەپاشا فاطیمەیش هات ئەویشی کرد بەژێر باڵا پۆشەکەیەوە، لەپاشا عەلیش هات، ئەویشی کرد بەژێر باڵا پۆشەکەیەوەو لەگەڵ حەسەن‌و حوسەین‌و فاتیمەدا لەژێر عاباکەیدا داینان‌و ئەوجا فەرمووی: {إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا – الأحْزَاب – ٣٣/٣٣} :

واتە: خودای گەورەو سەروەر کە ئەوەندە ئامۆژگاریتان دەکاو ئەوەندە دەربایست‌و بەتەنگی ئێوەوەیە، مەبەست‌و خواستی تەنیا ئەوەیە کە پاکتان بکاتەوە لەنەنگی ئاشکراو نهێنی‌و لە گەردی دنیاو دینی، چونکە ئێوە ئەی کەسوکاری موحەممەد! ئەی خانە نشینانی خانەی پێغەمبەرایەتی! چونکە ئێوە وەکوو بلووری بێگەرد وان، بەفوویێ، بەقسەیەکی سەرد، گەرد دەگرن!).

**روونکردنەوە:**

ئەمە بەشێکە لەئایەتی ژمارە سی‌و سێ لەسوورەتی ئەحزاب، کە تەواوی ئەم ئایەتی سی‌و سێیەمە دەکەوێتە نێوانی تەواوی ئایەتی سی‌و دوو، وە تەواوی ئایەتی سی‌و چوار لە سوورەتی ئەحزاب، کە تێکڕای ئایەتەکان، سەرجەمیان قسە لەوەدەکەن کە رەفتارو هەڵسوکەوتی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەبێ چۆن بێ، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم کردارە ویستی کەبیسەلمێنێ ئەم ئایەتانە مەرج نییە هەر هاوسەرەکانی بگرنەوە، بەڵکوو شمولی منداڵەکانی‌و منداڵی منداڵەکانی‌و مێردەکانیشیان دەکا.

١٦٥٧- عَنْ يَزِيدُ بْنُ حَيَّانَ قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَحُصَيْنُ بْنُ سَبْرَةَ وَعُمَرُ بْنُ مُسْلِمٍ إِلَى زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، فَلَمَّا جَلَسْنَا إِلَيْهِ، قَالَ لَهُ حُصَيْنٌ: لَقَدْ لَقِيتَ يَا زَيْدُ خَيْرًا كَثِيرًا، رَأَيْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَسَمِعْتَ حَدِيثَهُ، وَغَزَوْتَ مَعَهُ، وَصَلَّيْتَ خَلْفَهُ، لَقَدْ لَقِيتَ يَا زَيْدُ خَيْرًا كَثِيرًا، حَدِّثْنَا يَا زَيْدُ مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي وَاللَّهِ لَقَدْ كَبِرَتْ سِنِّي وَقَدُمَ عَهْدِي، وَنَسِيتُ بَعْضَ الَّذِي كُنْتُ أَعِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَمَا حَدَّثْتُكُمْ فَاقْبَلُوا، وَمَا لاَ فَلاَ تُكَلِّفُونِيهِ، ثُمَّ قَالَ: قَامَ رَسُولُ

اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمًا فِينَا خَطِيبًا بِمَاءٍ يُدْعَى (خُمًّا) بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَوَعَظَ وَذَكَّرَ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، أَلاَ أَيُّهَا النَّاسُ! فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَ، وَأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقَلَيْنِ أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللَّهِ، فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ، فَخُذُوا بِكِتَابِ اللَّهِ وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ»، فَحَثَّ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ وَرَغَّبَ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: «وَأَهْلُ بَيْتِي، أُذَكِّرُكُمُ اللَّهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي، أُذَكِّرُكُمُ اللَّهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي، أُذَكِّرُكُمُ اللَّهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي ثلاثاً». فَقَالَ لَهُ حُصَيْنٌ: وَمَنْ أَهْلُ بَيْتِهِ يَا زَيْدُ أَلَيْسَ نِسَاؤُهُ؟ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ؟ قَالَ: نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، وَلَكِنْ أَهْلُ بَيْتِهِ مَنْ حُرِمَ الصَّدَقَةَ بَعْدَهُ، قَالَ: وَمَنْ هُمْ؟ قَالَ: هُمْ آلُ عَلِيٍّ، وَآلُ عَقِيلٍ، وَآلُ جَعْفَرٍ، وَآلُ عَبَّاسٍ، قَالَ: كُلُّ هَؤُلاَءِ حُرِمَ الصَّدَقَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ. {الحديث: ٦١٧٥ = ٦٢٨٢ فم}:

یەزیدی کوڕی حەییان (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: منو حوصەینی کوڕی سەبرەو عومەری کوڕی موسلیم پێکەوە ڕۆیشتین چووین بۆلای زەیدی کوڕی ئەرقەم (ڕەزای خودای لێ بێ) کەدانیشتین لەخزمەتیدا، حوصەین عەرزیکرد: ئەی زەید! بەڕاستی خێری زۆرت دەست کەوتووە، بەچاوی خۆت پێغەمبەرت دیوەو بەگوێی خۆت گوێت لە فەرموودەی بووەو خۆت لەخزمەتی خۆیدا چوویت بۆ غەزاو لەگەڵیا غەزات کردووەو نوێژت لەپشتیەوە کردووە، ئەی زەید! بەڕاستی خێری زۆر زۆرت بەدەست هێناوە، ئەی زەید! فەرموودەیەکمان بۆ بگێڕەوە کەخۆت بەگوێی خۆت لەدەمی پێغەمبەر خۆیت بیستبێت.

زەید فەرمووی: ئەی کوڕی برام! ئەی برازای خۆم! بەخودا پیرو ئیختیار بووم، هەندێ شتم لەیاد نەماوە، لەوشتانەی کەلە پێغەمبەرم وەرگرتوون، جا هەرچی فەرموودەیەکم بۆتان گێڕایەوە وەری بگرن، ئەگینا ڕووی زیاترم لێ مەنێن!

زەید فەرمووی: ڕۆژێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئاوێ بوو، ناوی غەدیر خومم بوو، کەوا لەنێوانی مەککەو مەدینەدا، لەو کاتەدا لەحەجی ماڵ ئاوایی دەگەڕایەوە، لەمەککەوە بۆ مەدینە، لەوێ لەسەر ئەو کانیاوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایەوە وتارێکی دڵگیری بۆمان دا، سوپاسو ستایشی جوانی

خوداى كردو پەندو ئامۆژگارى كردين‌و، لەپاشدا فەرمووى: (لەپاش سوپاس‌و ستايشى خوداى گەورەو سەروەر، ئەى خەڵكينە! ئاگاداربن، بزانن كەمنيش ئادەميزاديكم وەكوو ئيوە، بەسەرهاتى ژيان‌و مردن، وەك لەئيوە روو دەدا لەمنيش روودەدا، جا هاكا رابەرى پەروەردگارم، سەرى لێ دام‌و خواى زوو، خواى درەنگ، مردن بەفەرمانى خودا يەخەم دەگرێ‌و منيش دەچم بەپيريەوەو ملى بۆكەچ دەكەم، جا لەم حاڵەدا دوو شتى سەنگين‌و گرانبەهاتان لەناودا بەجێ دەهێڵم، جا ئێوەيش بەباشى ئاگادارى ئەم دووشتە بكەن‌و هەقيان بەجێ بهێنن، يەكەميان كە نامەى خودايە، بەڕاستى بۆ رێگەى راست چرايە، جا نامەى خودا بگرن‌و بەرى مەدەن‌و بيكەن بەسەر مەشق‌و هەميشە پەيڕەوى بكەن).

ئيتر پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) گەلێ هانە هانەى دان لەسەر كاركردن‌و رەفت كردن بەنامەى خوداى گەورە كە قورئانى پيرۆزە، ئينجا فەرمووى: (وە ئەوى تريان كەسوكارەكەى خۆمە، هەميشە ترسى خواتان لەدڵدا بێ، لەهۆى كەسوكارەكەى منەوە، هەميشە ترسى خواتان لەدڵدا بێ لەهۆى كەسوكارەكەى منەوە).

سێجار لەسەر يەك، دووپاتى كردەوە: هەميشە ترسى خواان لەدڵدابێ، لەهۆى كەسوكارەكەى منەوە).

حوصەين پێى گوت: ئەديى كەسوكارى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) كێ‌و كێن؟ ئەى زەيد! ئايا ژنەكانى بەر كەسوكارى دەكەون يانا؟ فەرمووى: ژنەكانى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دادەنرێن بەكەسوكارى بەم مەعنايەى لەخێزانى ئەون‌و پاك‌و بێگەردن، بەڵام كەسوكارى تايبەتى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) ئەوانەن كە لەپاش خۆى، زەكاتيان پێ ناشێ. حوصەين عەرزى زەيدى كرد: دەى ئەوانە كێن، لەكەسوكارى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) كە زەكاتيان پێ ناشێ؟ ئەى زەيد! زەيد فەرمووى: ئەوانە لەعورفى موسوڵماندا بريتين لەنەوەى عەلى‌و لەنەوەى عەقيلى براى عەلى‌و لەنەوەى جەعفەر، كە ئەم سێ كەسە لەكوڕانى ئەبو طاليبن، وە لەنەوەى عەبباسى مامەى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ).

حوصەین فەرمووی: جا ئەی زەید! ئەمانە هەموویان زەکاتیان پێ ناشێ؟ فەرمووی: بەڵێ). {تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٣٣٤٣ چ/٤ = تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی سێیەم، زنجیرە: شازدە، فەرموودەی ژمارە: ٣٣٤٣ بەپێی ژمارە دانان بۆ فەرموودەکان لەچاپی چوارەمدا}.

**١٢٧٨) باسی بەهرەو گەورەیی عائیشە دایکی بڕواداران (ڕەزای خودای لێ بێ)، هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). (٦٢٣٣ - ٦٢٥٤)**

**بَابٌ: فِي فَضَائِلُ عَائِشَةَ أمُ المُؤمِنين (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوج النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ)**

١٦٥٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أُرِيتُكِ فِى الْمَنَامِ ثَلاَثَ لَيَالٍ، جَاءَنِى بِكِ الْمَلَكُ فِى سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَيَقُولُ هَذِهِ امْرَأَتُكَ، فَأَكْشِفُ عَنْ وَجْهِكِ، فَإِذَا أَنْتِ هِىَ، فَأَقُولُ: إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ». {الحديث: ٦٢٣٣ = ٦٢٤١ فم. بخاري. نكاح: ٥١٢٥. تحفة الأشراف: ١٦٨٥٩}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (سێ شەو لەخەوما تۆم پێ نیشاندرا، جوبرائیل (درودی خودای لەسەر بێ) وێنەی تۆی لەناو دەسماڵێکی ئاوریشما بۆم دەهێناو دەیفەرموو: ئەمە ژنی تۆیە، منیش ڕوویم هەڵ دەدایەوەو تەماشایم دەکرد، ئەوا ئێستا دەرکەوت کەخاوەنی ئەم وێنەیە تۆ بووی! ئەوکاتە کە وێنەکەی تۆم پێ نیشان دەدرا، دەمگوت: ئەم خەونە ئەگەر لەسەر باری خۆی بێو پێویستی بەلێکدانەوەو تەفسیر نەبێو وەك ڕواڵەتەکەی دەخوازێ، خەونێ بێ لەخوداوە، ئەوا خودا دەیهێنێتە دیو تۆ دەبی بەهاوسەرم، وە لەڕاستیشدا وابوو ئەوەتا تۆ بووی بەهاوسەری من). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٠}.

١٦٥٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنِّى لأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّى رَاضِيَةً، وَإِذَا كُنْتِ عَلَىَّ غَضْبَى»، قَالَتْ: فَقُلْتُ: وَمِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذَلِكَ؟ قَالَ: «أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّى رَاضِيَةً، فَإِنَّكِ تَقُولِينَ: لاَ وَرَبِّ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَإِذَا كُنْتِ غَضْبَى، قُلْتِ: لاَ وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ»، قَالَتْ: قُلْتُ: أَجَلْ وَاللَّهِ يَا

رَسُولَ اللَّهِ مَا أَهْجُرُ إِلاَّ اسْمَكَ. {الحديث: ٦٢٣٥ = ٦٢٤٣ فم. تجريد البخاری بالكوردی المجلد الخامس رقم: ١٧٨١ = ٥٢٢٨، ٦٠٧٨. تحفة الأشراف: ١٦٨٠٣} :

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (عائیشه من دەزانم كەتۆ لێم رازیت یالێم دلگیریت). گوتم: ئەوە بەچیا دەزانی؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ئەگەر لێم رازی بیت، دەڵێی: نا، یە خودای موحەممەد، بەلام ئەگەر لێم زیز بیت، دەڵێی: نا، بەخودای ئیبراهیم!).

گوتم: ئەرێ بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن دەفەرمووی وایە، زویرییەكەم لەتۆ بەس بەرواڵەتە، بەدڵ نییە، بەس ناوەكەت لەكاتی تووڕەییدا نایەت بەسەر زمانو زارما، ئەگینا خۆشەویستیی تۆ هەمیشە وا لەناو ناخی دلما). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٨ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

ئەم فەرموودەیە لەتەجریدی بوخاریدا ئاوا كراوە بەكوردی:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (من دەزانم كەتۆ، ئەی عائیشه! لەمن رازیت یانا).

گوتم: چۆن چۆنیو بەچیا دەزانی؟ فەرمووی: (بەوەدا دەزانم، كاتێ تۆ لەمن رازیت، لەكاتی گوفتوگۆدا، بەوێنە، ئاوا سوێند دەخۆیت: نا، بەخودای موحەممەد، بەلام كاتێ لەمن نیگەران بیت، لەكاتی گوفتوگۆدا، ئاوا سوێند دەخۆیت: نا، بە پەروەردگاری ئیبراهیم).

عائیشه فەرمووی: منیش عەرزیم كرد: بەڵێ چۆن دەفەرمووی وایە، ئەی پێغەمبەری خودا! بەس ناوەكەت تەرك ئەكەم، ئەویش بەدەمو بەس، بەلام لەدڵەوە هەردڵم لای تۆیە، لەكاتی ئاشتیو لەكاتی زویریدا، قەت بەدڵ لێت زویر نابم). {تەجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاری/٥، ژمارە: ١٧٨١ = ٥٢٢٨، ٦٠٧٨}.

١٦٦٠- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا كَانَتْ تَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَتْ وَكَانَتْ تَأْتِينِى صَوَاحِبِى فَكُنَّ يَنْقَمِعْنَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)

قَالَتْ فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ. {الحديث: ٦٢٣٧ = ٦٢٤٥ فم. بخاري. أدب: ٦١٣٠. أبو داود. أدب: ٤٩٣١}:

عائيشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ هاوسەری حەزرەت بووم بە بوکڵە یاریم دەکرد، گەلێ جار رێدەکەوت دەستە خوشکەکانم دەهاتن بۆلام، بووك بووکێنەمان دەکرد، کە چاویان بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکەوت شەرمیان لێ دەکردو لەئاستی ئەو خۆیان دەشاردەوە، ئەویش رێی بۆ چۆڵ دەکردن و ڕەتی دەکردن بۆلای من). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٧}.

**روونکردنەوە:**

١- بەپێی ئەم فەرموودەیە: وێنەی یارۆچکەی منالان، با قەبارە دارو بارستە داریش بێو لەسەر شێوەی پەیکەر بێ، وەك لەسەر شێوەی بووك بێ، دروستەو قەیدی نییە.

٢- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (تاجول ئوصول/٣، لاپەڕە: ٣١٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩٢٢، لەسەرەتای زنجیرەکەوە هەتا کۆتایی + ئەم ژمارانەیش کە لەپێشەوە رابووردن: ١٣٦٣ هەتا ژمارە: ١٣٧٠، لەزنجیرە: ١٠٥٢ وەوە هەتا زنجیرە: ١٠٥٧. بەتایبەتی بڕوانە ژمارە: ١٦٥٨ کە لە زنجیرە: ١٢٧٨دا لەپێشەوە رابورد، لەم کتێبە پیرۆزەدا لەو فەرموودەیشدا رێگە بەسوودو بەهرە وەرگرتنی رەوا، لەوێنە، دراوە).

١٦٦١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ النَّاسَ كَانُوا يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ يَبْتَغُونَ بِذَلِكَ مَرْضَاةَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). {الحديث: ٦٢٣٩ = ٦٢٤٧ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٠٢ = ٢٥٨١ فتح الباري}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولدا ئاوایە، دەیکەین بەڕاقەو روونکردنەوە بۆ ئەم گێڕانەوە کورتەی ئێرە:

لەسەر گێڕانەوەی بوخاریو تەرمەزی:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: موسوڵمانان کە دیارییەکیان دەبرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چاوەڕوانی ئەو رۆژەیان دەکرد، کە رۆژی سەرەی

عائیشە بێ، هەتا لەوێ دیارییەکەی بۆبەرن، چونکە دەیانزانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عائیشەی خۆش دەوێ، عائیشە فەرمووی: جا هەوێکانم لەلای ئوم سەلەمە کۆدەبنەوەو دەڵێن: ئەی ئوم سەلەمە! تۆیش وەك ئێمە هاوسەری پێغەمبەری، بەخودا خەڵکەکە کەدیاری دەبەن بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵی دەگرن هەتا رۆژی سەرەی عائیشە دێ، ئەوسا لەوێ دیارییەکەی بۆ دەبەن، دەی ئێمەیش وەك عائیشە دەمانەوێ لەو خێرو خۆشییەمان بەربکەوێ، کەوابوو تۆ عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بکە، کە بەخەڵکەکە بفەرموێ کە خۆی تەشریفی لەماڵی هەرکامێ لە ژنەکانی بێ، با لەوێ دیاری بۆ ببەنو جیاوازیی لەنێوانی ماڵی هاوسەرەکانیا لەم لایەنەوە نەکەن.

ئوممو سەلەمە فەرمووی: کە ئەمەم عەرزی حەزرەت کرد وەرامی نەدامەوە، بۆ جاری دووەم کە سەرەم هاتەوەو حەزرەت هاتو لەلای من شەوی کردەوە، دووبارە پێشنیارەکەم عەرزیکردەوە، دیسانەوە وەڵامی نەدامەوە، بەڵام لەجاری سێیەمدا کە ئەمەم عەرزیکرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی ئوم سەلەمە! لەسەر عائیشە ئازارم مەدە، چونکە بەخودا نەبووە کە لەناو نوێنی ژنێ لەئێوەدا بەو سرووشم بۆبێ جگە لەنوێنی عائیشە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٥ ج/٤}.

{بەتایبەتی بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی سێیەم، ژمارە: ١١٠٢ = ٢٥٨١ هەتا کۆتایی هەتا لە حاڵەکە تێبگەین! هەروا ژمارەی دوا ئەم ژمارەیش رەچاو بکە کە ژمارە: ١٦٦٢ وە}.

١٦٦٢- عَنْ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَتْ: أَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَيْهِ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ مَعِي فِي مِرْطِي، فَأَذِنَ لَهَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَزْوَاجَكَ أَرْسَلْنَنِي إِلَيْكَ يَسْأَلْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ وَأَنَا سَاكِتَةٌ، قَالَتْ: فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَيْ بُنَيَّةُ أَلَسْتِ تُحِبِّينَ مَا

أُحِبُّ»؟ فَقَالَتْ: بَلَى، قَالَ: «فَأَحِبِّي هَذِهِ»، قَالَتْ: فَقَامَتْ فَاطِمَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) حِينَ سَمِعَتْ ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَرَجَعَتْ إِلَى أَزْوَاجِ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَخْبَرَتْهُنَّ بِالَّذِي قَالَتْ، وَبِالَّذِي قَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقُلْنَ لَهَا: مَا نُرَاكِ أَغْنَيْتِ عَنَّا مِنْ شَيْءٍ، فَارْجِعِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقُولِي لَهُ: إِنَّ أَزْوَاجَكَ يَنْشُدْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ، فَقَالَتْ فَاطِمَةُ: وَاللَّهِ لاَ أُكَلِّمُهُ فِيهَا أَبَدًا، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَهِيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي مِنْهُنَّ فِي الْمَنْزِلَةِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَلَمْ أَرَ امْرَأَةً قَطُّ خَيْرًا فِي الدِّينِ مِنْ زَيْنَبَ، وَأَتْقَى لِلَّهِ، وَأَصْدَقَ حَدِيثًا، وَأَوْصَلَ لِلرَّحِمِ، وَأَعْظَمَ صَدَقَةً، وَأَشَدَّ ابْتِذَالاً لِنَفْسِهَا فِي الْعَمَلِ الَّذِي تَصَدَّقُ بِهِ وَتَقَرَّبُ بِهِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى مَا عَدَا سَوْرَةً مِنْ حَد كَانَتْ فِيهَا، تُسْرِعُ مِنْهَا الْفَيْئَةَ، قَالَتْ: فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَعَ عَائِشَةَ فِي مِرْطِهَا عَلَى الْحَالَةِ الَّتِي دَخَلَتْ فَاطِمَةُ عَلَيْهَا وَهُوَ بِهَا، فَأَذِنَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَزْوَاجَكَ أَرْسَلْنَنِي إِلَيْكَ يَسْأَلْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ، قَالَتْ: ثُمَّ وَقَعَتْ بِي، فَاسْتَطَالَتْ عَلَيَّ، وَأَنَا أَرْقُبُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَأَرْقُبُ طَرْفَهُ هَلْ يَأْذَنُ لِي فِيهَا، قَالَتْ: فَلَمْ تَبْرَحْ زَيْنَبُ حَتَّى عَرَفْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لاَ يَكْرَهُ أَنْ أَنْتَصِرَ، قَالَتْ: فَلَمَّا وَقَعْتُ بِهَا لَمْ أَنْشَبْهَا حِينَ أَنْحَيْتُ عَلَيْهَا، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَتَبَسَّمَ: «إِنَّهَا ابْنَةُ أَبِي بَكْرٍ». {الحديث: ٦٢٤٠ = ٦٢٤٨ فم = ف.م = فتح الملهم بشرح صحيح الامام مسلم. تجريد/٣، رقم: ١١٠٢ = ٢٥٨١ فتح البارى بشرح صحيح البخارى. نسائى. عشرة النساء: ٣٩٥٤. تحفة الأشراف: ١٧٥٩٠}:

عائيشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵو یارو یاوەرو پەیڕەوانی بێ) فەرمووی:

هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فاطیمەی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگ دەکەن‌و دەینێرن بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە عەرزی بکا: ژنەکانت گلەییەکیان هەیەو منیان ناردووە بۆلای تۆ.

جا فاطیمە کاتێ هات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ مندا، لەژێر شاڵینەکەی مندا، راکشابووین، کە فاطیمە داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی پێیدا، جا فاطیمە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنەکانت منیان ناردووە بۆلای تۆ، داوات لێ دەکەن، کە لەبەر خاتری خودا، یەکسان رەفتاریان لەگەڵدا بکەیت‌و هەموویان بەیەك چاو تەماشا بکەیت‌و جیاوازی لەنێوانی ئەوان‌و عائیشەدا نەکەی.

عائیشە فەرمووی: من لەم کاتەدا نقەم نەکردو خامۆش‌و بێ دەنگ بووم. فەرمووی: جاکاتێ فاطیمە ئەم پەیامەی هاوسەرەکانی پێغەمبەری پێی راگەیاند، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی کچی شیرینم! ئایا تۆیش ئەوەت پێ خۆش نییە کەمن پێم خۆشە؟!).

فاطیمە فەرمووی: (با، ئەوەی تۆ پێت خۆش بێ، منیش پێم خۆشە). فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەی ئەمەت وەك من پێ خۆش بێ!).

فەرمووی: جا فاطیمە کە ئەمەی لە پێغەمبەر بیست، لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵساو زوو رۆیشتەوە بۆلای هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و چی گوتبوو بە پێغەمبەرو وەڵامی پێغەمبەر چی بوو، هەمووی باسکرد بۆیان. ئەوانیش گوتیان: وادیارە هیچ سوودێکت نەبووە بۆ ئێمە، تکایە دیسان بچۆرەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و پێی بڵێ: هاوسەرەکانت منیان ناردووە بۆلای تۆ، بەجەخت تکات لێ دەکەن کە دادپەروەرانە رەفتار لەنێوانی ئەوان‌و لەنێوانی عائیشەدا بکەیت‌و هەموویان بەیەك چاو تەماشا بکەیت‌و باوی عائیشە نەدەیت بەسەر ئەواندا.

فاطیمە فەرمووی: بەخودا شتی واناکەم، قەت لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵدا ناکەم.

عائیشە فەرمووی: جا هاوسەرەکانی پێغەمبەر، لەپاش ئەمە بڕیاریاندا: کە زەینەبی کچی جەحش (رەزای خودای لێ بێ) بنێرن بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئەو بەم ئەرکە هەڵ بستێ، زەینەب خۆشی هاوسەری پێغەمبەر بوو، لەناو هاوسەرەکانی پێغەمبەردا، تەنیا زەینەبیان تیا هەبوو، کە هاوتای من بکاو، وەك من لەلای خاتری هەبێو، بەجوانیی خۆی لەلای حەزرەت نازبکاو شان لەشانی من بداو، لەپلەو پایەی منابێ لەلای، لەڕاستیدا هەرگیز ژنی وا دین قایمو پابەندی ئایینم وەك زەینەب نەدیوە، تا بڵێی لەخودا ترس، زمان پاك، قسە ڕاست، خزم دۆست، خێرکەر، تا ئەوپەڕی توانای خۆی دەرەنجانو کاری قورسی ئەنجام دەدا، هەتا شتێ پەیدا بکاو بیکا بەخێرو بەخششو خۆی لەخوداوە پێ نزیك بکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا، زوو تووڕە دەبوو، جۆرە هەڵچوونێکی تیابوو، بەڵام گورج ئاشت دەبۆوەو ڕقەکەی خۆی زوو قووت دەدایەوە!

عائیشە فەرمووی: جا کاتێ زەینەب بۆ ئەم کارە داوای مۆڵەتی کرد، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێبدا کەبچێ بۆلای، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا لەژێر باڵا پۆشەکەی مندا، لەگەڵ مندا ڕاکشابوو، وەك ئەوکاتەی کە فاطیمەی کچی هات بۆ هەمان مەبەست، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی دا، زەینەب هاتە ژوورەوە. گوتی: زەینەب کەهات قسەی ڕەق بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هاوسەرەکانت منیان ناردووە بۆلای تۆ، داوات لێ دەکەن، کە لەبەر خاتری خودا، بەیەکسان ڕەفتارو مامەڵەیان لەگەڵدا بکەیتو جیاوازی لەنێوانی ئەوانو لەنێوانی عائیشەدا نەکەیت، تا بەرە بەرە زەینەب پێی لێ هەوڵبڕیو دەنگی بەرزەوە کرد، تا گەیاندیە ئەوە قسەی بەمن وت، وە لەبارەی منەوە دەستی کرد بەدەم درێژیی.

عائیشه فەرمووی: منیش لەم کاتەدا، سەرەنجی پێغەمبەرم دەدا، بەتایبەتی سەرەنجی تیلەی چاویم دەدا، هەتا بزانم ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەم دەدا، کەمنیش وەڵامی جنێوو دەست درێژییەکەی بدەمەوە یانا؟

عائیشه فەرمووی: بەرە بەرە ئەوەندەی نەخایاند کە زەینەب هەستی کرد: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی ناخۆش نییە، کەمن لەسەر خۆم بکەمەوەو وەڵامی شیاوی ئەو بدەمەوە، عائیشه فەرمووی: جا کاتێ شاڵاوم بۆیبردو دامە بەرجمێن‌و قسەی ناشیرین، بوارەم نەدا کەدەم بکاتەوەو دەمکوتیم کرد!!

فەرمووی: پێغەمبەریش سەرنجێکی منی داو، وەك بڵێی قسەکانی منی بەدڵ بێ‌و بۆ پشتگیری شاڵاوەکەی من زەردە خەنەیەکی کردو فەرمووی:

عائیشه کچی باوکی خۆیەتی، ئەمیش وەك ئەبوبەکری باوکی دەزانێ چۆن قسە بکاو چۆن بەرامبەر دەمکوت بکات!!). {تاج/٣، زنجیره: ٣٧، ژماره: ٣٤٣٥ ج/٤} .

١٦٦٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لَيَتَفَقَّدُ، يَقُولُ: «أَيْنَ أَنا الْيَوْمَ أَيْنَ أَنا غَدًا». اسْتِبْطَاءً لِيَوْمِ عَائِشَةَ، قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمِي، قَبَضَهُ اللَّهُ بَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي. {الحديث: ٦٢٤٢ = ٦٢٥٠ فم. تجريد/٢، رقم: ٦٦٣ = ١٣٨٩، ١٩٨، ٦٦٤، ٦٦٥، ٢٥٨٨، ٣٠٩٩، ٤٤٣٨، ٤٤٤٦ فتح الباری} :

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست‌و نازدار (دروودی خودای لەسەر بێ‌و سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و دایك‌و باوك‌و هەست‌و نەست، گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) لەنەخۆشی سەرە مەرگیدا، بەسەرەو نۆرە هەر ڕۆژەی لەماڵی یەکێ لەژنەکانی دەبوو، ئەڵهای نۆرە ڕۆژی منی بوو، دەیفەرموو: (ئەمڕۆ لەکوێم، سبەینێ لەلای کێم لە هاوسەرەکانم، دوو سبەی لەلای کامیانم؟).

بۆیە وای دەفەرموو چونکە حەزی لەماڵی من بوو، جاکە سەرەی ڕۆژی من هات، ئیتر لەلای من گلی خواردەوەو لەنێوانی ماڵی هاوسەرەکانیدا، ماڵەو ماڵی نەکرد، بەپێی نۆرە ڕۆژی ژنەکانی، کە لەشەرعی پیرۆزدا پێی دەگوترێ (قەسم)

ئیتر لەو ماوەیەدا، خۆم خزمەتیم دەکرد، هەتا گیانی پاکی سپاردو شادبوو بە دیداری پەروەردگاری، جا وارێکەوت لەرۆژی نۆرە سەرەی خۆمدا، لە رۆژانی دەورو قەسمە ئەصڵییەکە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەباوشمدا بوو، پشتی پیرۆزی دابوو بەسینگو بەرۆکمەوە، کە خودای مەزن گیانی کێشاو رۆحی موبارەکی وەرگرتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٦}.

**روونکردنەوە:**

١- پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) زۆر رێزو نازی حەزرەتی عائیشەی دەگرت، لەبەر چەند هۆیەك كە گرنگترینیان ئەم دوو هۆیەن:

یەکەم: عائیشە ژنێکی ژیرو زرنگو هۆشیارو هۆشمەند بوو، هەروا زاناو داناو خانەدانو خانو مان بوو، یەکێ بوو لە بلیمەتەکانی مێژوو، لەهەمان کاتدا لەبەرئەوەی کە لەهەموو روویەکەوە هاوسەنگییەکی تەواو لەنێوانی ئەوو لەنێوانی پێغەمبەردا هەبوو، بەتایبەتی لە کەماڵو جەمالا، عائیشە پێغەمبەری زۆر خۆش دەویستو پێغەمبەریش لەبەر هەمان هۆ ئەوی زۆر خۆش دەویست. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٠، ٣٤٣٣ هەتا: ٣٤٤٠}.

دووەم: وەك لەچەند فەرموودەیەکی ساغو دروستەوە دەردەکەوێ، عائیشە رێزو قەدرو فەزڵی لەلای خودای گەورە هەبووە، وە بەسرووش (بەوەحی) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەوە ئاگادار کراوە: کە عائیشە لەهەردوو جیهاندا ژنی دەبێو لەدنیاو دوا رۆژدا سەروەریی دایکی ئیماندارانی پێ دەبڕێ، جا بەتایبەتی لەبەر ئەم دوو هۆیە، عائیشە لەلای پێغەمبەر نازدار بوو، بەڵام لەکاتی داستانی بوختیانە گەورەکەدا، کەکرا بۆ عائیشە {بڕوانە: ژمارە: ٢١٥٣ کە لەدواوە دێ + تاج/٤، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٠٠٨ ج/٤ + تەجرید/٣، ژمارە: ١١٢١ = ٢٦٦١ = داستانی هەڵاتو بوختیانە گەورەکە = حديث الإفك} بەڵام لەکاتی کردنی ئەم بوختیانەدا بۆ عائیشە، حەزرەتی عائیشە نەخۆش کەوت، وە ئاگای لەم کەینوبەینە نەبوو، کەبۆی کرابوو، جا لەم رووەوە حەزرەت وەك لەوەو پێش نازی عائیشەی نەدەکێشا،

بەڵکوو هەندێ کێشەشی بۆ دروست بوو، لەم رووەوە پرس‌و رای بەم‌و بەو کرد، تا خودای گەورە پاکانەی بۆ عائیشە کرد، بەناردنی کۆمەڵێ ئایەتی قورئانی پیرۆز. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچی لەدڵا نەماو گەڕایەوە سەرحاڵی ئاسایی لەوەوبەری.

تەنانەت لەسەرە مەرگیشدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەبەستی بوو، کە شوێنەواری ئەو رووداوە ساردو سڕە لەدڵی عائیشەدا بسڕێتەوە، بۆیە لەو ماوە ناسکەدا لەماڵی عائیشە مایەوە تا گیانی پاکی سپارد. وە لەهەمان کاتدا تا موسوڵمانانیش تێبگەیەنێ رێزو قەدری هاوسەری خۆیان بزانن‌و رێزو فەزڵی فەرامۆش نەکەن!

٢- بەندە بۆ روونکردنەوەی ئەم دوو هەڵوێستەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتوومە:

بولبول نازدەکا، لەگوڵ دەتۆرێ
بۆیە بەئەسری دەستنوێژ دەشۆرێ!

واتە:

حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست‌و نازدار (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی بوختانە گەورەکەدا، کەکرا بۆ عائیشە، کە عائیشە نەخۆشکەوت، لەو نەخۆشینەدا، حەزرەت وەك جاران نازی نەدەگرت، بەڵام لەکاتی سەرەمەرگا بۆ سڕینەوەی ئەو یادگارە ناخۆشە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەباوەشی عائیشەدا گیانی سپارد، دیارە لەو دەمەدا، عائیشە فرمێسکی زۆری بۆ حەزرەت رێژاوە، مەبەست ئەوەیە: چۆن بولبول لەشەودا، کە تاریکە دادێ، خۆی لەگوڵ دەدزێتەوە، بەڵام بەیانی زوو دەچێ خۆی هەڵدەسوێ لەبۆن‌و بەرامەی گوڵ‌و شەونمی سەر رووی گوڵ، وەك داوای چاوپۆشیی لێ بکا ئاوا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرە بەیانی ژیانی ناو بەهەشتا، دەستنوێژی بە فرمێسکی عائیشە گرتووەو ئەو گەردە کۆنەی لەدڵا سڕیوەتەوە.

٣- بەبۆنـەی ئـەم فەرموودەيشـەوە، کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لـەکۆش و باوەشی عائیشەدا، گیانی سپاردو خواحافیزی لەجیهان و کەسوکار کرد دەڵێم:

رازێکـــی ســـەیرە، پرســـی ئـــەمجارە:
داوای دۆســـت لەدۆســـت رۆحـــی نـــازدارە
دەرمـــانی دەردی: نووشـــتووی یـــەزدان بـــوو
ســـەر قەڵەمانـــەی رۆحـــی رەوان بـــوو!!
ســـپاردی گیـــانی، لەکۆشـــی یـــارا
لەگـــەڵ یارەکـــەی بـــەخودای دارا!!

١٦٦٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ قَبْلَ أَنْ يَمُوتَ وَهُوَ مُسْنِدٌ إِلَى صَدْرِهَا وَأَصْغَتْ إِلَيْهِ وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ». {الحديث: ٦٢٤٣ = ٦٢٥١ فم = ف.م = فتح الملهم بشرح صحيح الامام مسلم. تجريد/٤، رقم: ١٦٢٤ = ٤٤٤٠، ٥٦٧٤ فتح الباري. ترمذي. دعوات: ٣٤٩٦. تحفة الأراف: ١٦١٧٧}:

عائیشـە (رەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەری خۆشەویسـت و نـازدار، لەسـەرە مەرگا، سەری نابوو بەسینگەوە، لەوکاتەدا گوێم هەڵخست تا بزانم چی دەفـەرموێ، گوێم لێی بوو لەوکاتەدا دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ الْأَعْلَى}: ئەی خـودای خـۆم! لـێم خۆشبەو بـەزەییت بێتـەوە پیامـاو رەحمـم پـێ بکەو بمگەیەنە بەکاروانی یارانی ئـازیزو شـادم کـە بەدیـداریان!). {تـاج/٣، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٣١٩٨ چ/٤}.

١٦٦٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ وَهُوَ صَحِيحٌ: «إِنَّهُ لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ قَطُّ حَتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ فِي الْجَنَّةِ، ثُمَّ يُخَيَّرُ». قَالَتْ عَائِشَةُ: فَلَمَّا نَزَلَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَرَأْسُهُ عَلَى فَخِذِي غُشِيَ عَلَيْهِ سَاعَةً، ثُمَّ أَفَاقَ فَأَشْخَصَ بَصَرَهُ إِلَى السَّقْفِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى». قَالَتْ عَائِشَةُ: قُلْتُ: إِذًا لاَ يَخْتَارُنَا، قَالَتْ عَائِشَةُ: وَعَرَفْتُ الْحَدِيثَ الَّذِي كَانَ يُحَدِّثُنَا بِهِ وَهُوَ صَحِيحٌ فِي قَوْلِهِ: «إِنَّهُ لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ قَطُّ حَتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، ثُمَّ يُخَيَّرُ». قَالَتْ

عَـائِشَةُ: فَكَانَتْ تِلْكَ آخِرُ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَوْلَـهُ: «اللَّهُـمَّ الرَّفِيـقَ الأَعْلَـى». {الحـديث: ٦٢٤٧ = ٦٢٥٥ فـم. تجريـد/٤، رقـم: ١٦٢٢ = ٤٤٣٥، ٤٤٣٦، ٤٤٣٧، ٤٤٦٣، ٤٥٨٦، ٦٣٤٨، ٦٥٠٩ + ١٦٢٢م = ٤٤٣٧، ٤٤٣٥}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لەژیاندا بوو، وە لەشی ساخ بوو، دەیفەرموو: (هەرگیز هیچ پێغەمبەرێ، گیانی ناکێشرێ، هەتا جێگەی خۆی لەبەهەشتا ئەبینێ، ئەوجا خودا پێغەمبەرەکە خۆی دەکا بەسەرپشك لەنێوانی مانو نەمانا).

عائیشه فەرمووی: لەسەرەمەرگا، سەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر رانم بوو، لەوکاتەدا تاوێ بووراپەوە، لەپاشا هۆشی هاتەوەو چاوی بڕییە بنمیچەکەو فەرمووی: {اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى: ئەی خودایە! بمبەرە ناو کاروانی یارانو شادمکە بەزەواری هاودەمانی خۆم! کەوان لەبەهەشتی هەرە بالآدا!}.

عائیشه فەرمووی: کە گوێم لەم فەرمایشتەی بوو ئیتر زانیم کەئیتر حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لای ئێمە هەڵ نابژێرێو لای ئێمە نامێنێو حەزی لەژیانی جیهان نەماوەو وادیارە کە ئەمجارە ئارەزووی لای پەروەردگاری هەیە. هەروا عائیشه فەرمووی: وەزانیم کە ئەمە ئەو فەرمایشتەیەتی کە کاتێ ساخ بوو، باسی دەکرد بۆمان، کە دەیفەرموو: (هەرگیز هیچ پێغەمبەرێ، گیانی ناکێشرێ، هەتا جێگەی خۆی لەبەهەشتا نەبینێ، ئەوسا خودای گەورە پێغەمبەرەکە خۆی دەکا بەسەرپشك کەژیانی جیهان، یا جیهانی دوارۆژ هەڵبژێرێ!).

خاتوو عائیشه فەرمووی: دوا وشەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە فەرمووی ئەم گوتەیەی بوو: (اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى: خودایە! شادمکە بەهاوەڵی هەرە بالآ).

**روونکردنەوە:**

ڕاڤە نووسان دەفەرموون مەبەست لە (الرَفيـق الأعلـى = هاوڕێی هەرە بالآ) یا خودای گەورەو هەرە بالآیە، یا فریشتە نازدارەکانە، یا ئەو کەسانەن کە لەم ئایەتەدا ناو هێنراون، کە دەفەرموێ:

{وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا — النساء — ٤/٦٩}:

واته: لەگەڵ ئەو بەختەوەرانەدا، کە خودا گەورەترین بەهرەو نازو نیعمەتی پێ بەخشیونو دەستی قەدرو رێزی لێ ناون، لە پێغەمبەرانو لە پیاوە راستو دروستەکانی خوداو لە دۆستانی خوداو لە شەهیدانو لەپیاو چاکانو هەموو باشانو چاکانو خاسانی خودا، بەڕاستی ئەم چەشنە دۆستو برادەرو هاوڕێو هاوەڵانە، برادەرییان زۆر خۆشەو دۆستایەتیو ئاشنایەتی لەگەڵیانا زۆر جوانو شیرینو پەسەندو خۆشە). خوا بەنسیبمانی بکا. ئامین.

١٦٦٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِذَا خَرَجَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَطَارَتِ الْقُرْعَةُ عَلَى عَائِشَةَ وَحَفْصَةَ، فَخَرَجَتَا مَعَهُ جَمِيعًا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِذَا كَانَ بِاللَّيْلِ سَارَ مَعَ عَائِشَةَ يَتَحَدَّثُ مَعَهَا، فَقَالَتْ حَفْصَةُ لِعَائِشَةَ: أَلاَ تَرْكَبِينَ اللَّيْلَةَ بَعِيرِي، وَأَرْكَبُ بَعِيرَكِ فَتَنْظُرِينَ وَأَنْظُرُ؟ قَالَتْ: بَلَى، فَرَكِبَتْ عَائِشَةُ عَلَى بَعِيرِ حَفْصَةَ وَرَكِبَتْ حَفْصَةُ عَلَى بَعِيرِ عَائِشَةَ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِلَى جَمَلِ عَائِشَةَ وَعَلَيْهِ حَفْصَةُ فَسَلَّمَ ثُمَّ سَارَ مَعَهَا حَتَّى نَزَلُوا، فَافْتَقَدَتْهُ عَائِشَةُ، فَغَارَتْ، فَلَمَّا نَزَلُوا جَعَلَتْ تَجْعَلُ رِجْلَهَا بَيْنَ الإِذْخِرِ وَتَقُولُ: يَا رَبِّ سَلِّطْ عَلَيَّ عَقْرَبًا أَوْ حَيَّةً تَلْدَغُنِي، رَسُولُكَ، وَلاَ أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقُولَ لَهُ شَيْئًا. {الحديث: ٦٢٤٨ = ٦٢٥٦ فم. تجريد البخاری المسمّی مختصر صحيح البخاری، المجلّد الخامس الترجمة الكردية الحديث الرقم: ١٧٧٦ = ٥٢١١ من شرح فتح الباری علی صحيح البخاری للإمام العسقلانی رحمه الله تعالی. تحفة الأراف: ١٧٤٦٢}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەیویست بچێت بۆ سەفەرێ، لەنێوانی ژنەکانیدا تیرو پشکی دەکرد، پشکی هەرکامیان دەربچوایە ئەوەیانی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ ئەو سەفەرە. وارێکەوت لەسەفەرێکا پشکی عائیشەو حەفصە هەردووکیان دەرچوون، کە لەگەڵ پێغەمبەردا بچن بۆ ئەو سەفەرە، جا هەردووکیان لەگەڵیدا دەرچوون.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەشەودا کە دەکەوتنە رێ، دەهاتەوە بۆلای عائیشەو پێکەوە دەڕۆیشتن‌و دەمە تەقێ‌و قسەو گوفتوگۆیان دەکرد، حەفصە بە عائیشە دەڵێ: با ئەم شەو وشترەکانمان ئاڵوگۆڕ بکەین، تۆ سواری وشترەکەی من بەو منیش سواری وشترەکەی تۆ دەبم، دەور دەگۆڕینەوە: ئەوەی تۆ لەشەوانی پێشوودا بەسواری وشترەکەی خۆت دیوتەو من نەمدیوە منیش دەیبینم، وە ئەوەی منیش لەشەوانی پێشوودا دیومەو تۆ نەتبینیوە تۆیش دەیبینی؟

عائیشەیش دەڵێ: باشە وادەکەین، لەمەبەستی راستینەی حەفصە تێ ناگا. وەوا دەکەن‌و وشترەکان دەگۆڕنەوەو عائیشە سواری وشترەکەی حەفصە دەبێ‌و حەفصەیش سواری وشترەکەی عائیشە دەبێ، جا لەشەودا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وەك شەوانی پێشوو دەچێ بۆلای ئەو وشترە نێرەی کە عائیشە لەشەوانی پێشوودا سواری دەبوو، دەڕوانێ حەفصە سواری بووە، سڵاوی لێ دەکاو دەست دەکەن بەدەمە تەقێ‌و دەڕۆن هەتا کاتی لادان‌و دابەزین‌و وچان.

جا هەر ئەو شەوە عائیشە هەست دەکا بەدووری لە پێغەمبەرو هەستی هەوێباری زاڵ دەبێ بەسەریدا، لەبەرئەوە کە دادەبەزن، لەداخانا هەردوو قاچی خۆی دەخاتە ناو بنچکێ سووڕناتکەوە، کە زۆرینەی کات حەشارگەی جرِوجانەوەرو دەعباو گەزندەیەو نزای خراپ لەخۆی دەکاو دەڵێ: ئەی خوایە! لەتۆڵەی ئەم هەڵەدا کە کردم، کە ئەوەبوو ئەمشەو، بەهەڵەی خۆم، لەهاودەمی پێغەمبەر دابڕام‌و بێ بەشبووم، دووپشکێ، یا مارێکم بۆ بڕەخسێنە کە پێمەوە بدات!

سەبارەت بە پێغەمبەریش، کە پێغەمبەری تۆیە ئەی خوایە! لەم بارەیەوە ناتوانم هیچی دەربارە بڵێم چونکە سووچ سووچی خۆمە، سووچی کەسی تری تیادا نییە!

١٦٦٧- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ غَيْرُ مَرْيَمَ بِنْتِ عِمْرَانَ، وَآسِيَةَ

امْـرَأَةِ فِرْعَـوْنَ، وَإِنَّ فَضْـلَ عَـائِشَـةَ عَلَـى النِّسَـاءِ، كَفَضْـلِ الثَّرِيـدِ عَلَـى سَـائِرِ الطَّعَـامِ». {الحـديث: ٦٢٢٢ = ٦٢٣٠ فـم. التجريـد/٤، رقـم: ١٣٦١ = ٣٤١١، ٣٤٣٣، ٣٧٦٩، ٥٤١٨. ترمذي. مناقب: ٣٨٨٧. ابن ماجة. أطعمة: ٣٢٨١}:

ئەبو مووساى ئەشعەرى (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فـەرمووى: خۆشەویست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (زۆر كەس لەپیاوان، پیاوى تەواو تەواویان لێ دەرچووەو بوون بە پیاوى یـەكى یـەكى كەڵـە مـیرد، وەك پێغەمبـەرانو پیـاو چـاكان، بـەڵام لـەژنان بـەس مەریـەمى كچـى عیمـرانو ئاسیەى ژنـى فیرعـەون، ئـافرەتى تـەواو تـەواویان لێ دەرچووە، وە باوو فەضلو گەورەیى عائیشـە لەچـاو ژنـانى تـردا، وەك بـاوو باشـیى تریت وایە لەچاو خواردەمەنییەكانى تردا). {تاج/٣، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٧١٨ چ/٤}.

١٦٦٨- عَـنْ عَـائِشَـةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهـا) قَالَـتْ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ): «يَا عَائِشُ هَذَا جِبْرِيلُ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ». فَقَالَتْ: فَقُلْتُ وَعَلَيْـهِ السَّـلَامُ وَرَحْمَـةُ اللَّهِ، قَالَتْ: وَهُوَ يَرَى مَا لاَ أَرَى. {الحديث: ٦٢٥٤ = ٦٢٦٢ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٢٩٩ = ٣٢١٧، ٣٧٦٨، ٦٢٠١، ٦٢٤٩، ٦١٥٣. ترمـذي. مناقـب: ٣٨٨١. نسـائي. عشرة النساء: ٣٩٦٤. تحفة الأشراف: ١٧٧٦٦}:

عائیشـە (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فـەرمووى پـێم: (ئەى عائیشە! ئەمە جوبرائیلە تەشریفى هاتووە بۆلاى من سلاوت لێ دەكا).

منـیش گـوتم: (وَعَلَيْـهِ السَّـلَامُ وَرَحْمَـةُ اللَّـهِ وَبَرَكَاتُـهُ: سـلاوو ڕەحمـەتو پیـتو پیرۆزییەكانى خوداى گەورە لەسەر ئەویش بێ).

تـۆ ئـەى پێغەمبـەرى خـودا! گـەلێ شـتى وا هەیـە بـەتۆ دەبینـرێ بەئێمـە نابینرێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٣ چ/٤}.

١٦٦٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّهَا قَالَتْ: جَلَسَ إِحْدَى عَشْرَةَ امْرَأَةً فَتَعَاهَدْنَ وَتَعَاقَدْنَ أَنْ لاَ يَكْتُمْنَ مِنْ أَخْبَارِ أَزْوَاجِهِنَّ شَيْئًا، قَالَتِ الأُولَى: زَوْجِي لَحْمُ جَمَلٍ غَثٌّ عَلَى رَأْسِ جَبَلٍ وَعْرٍ، لاَ سَهْلٌ فَيُرْتَقَى، وَلاَ سَمِينٌ فَيُنْتَقَلَ. قَالَـتِ الثَّانِيَـةُ: زَوْجِـي لاَ أُبِـثُّ خَبَـرَهُ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ لاَ أَذَرَهُ، إِنْ أَذْكُرْهُ أَذْكُرْ عُجَرَهُ وَبُجَرَهُ. قَالَت الثَّالِثَةُ: زَوْجِي الْعَشَنَّقُ إِنْ أَنْطِقْ

أُطلَّقْ، وَإِنْ أَسْكُتْ أُعلَّقْ، قَالَتِ الرَّابِعَةُ: زَوْجِى كَلَيْلِ تِهَامَةَ، لاَ حرٌّ وَلاَ قُرٌّ، وَلاَ مَخَافَةَ وَلاَ سَآمَةَ. قَالَتِ الْخَامِسَةُ: زَوْجِى إِنْ دَخَلَ فَهِدَ وَإِنْ خَرَجَ أَسِدَ، وَلاَ يَسْأَلُ عَمَّا عَهِدَ. قَالَتِ السَّادِسَةُ: زَوْجِى إِنْ أَكَلَ لَفَّ، وَإِنْ شَرِبَ اشْتَفَّ، وَإِنِ اضْطَجَعَ الْتَفَّ، وَلاَ يُولِجُ الْكَفَّ لِيَعْلَمَ الْبَثَّ. قَالَتِ السَّابِعَةُ: زَوْجِى غَيَايَاءُ أَوْ عَيَايَاءُ، طَبَاقَاءُ كُلُّ دَاءٍ لَهُ دَاءٌ، شَجَّكِ أَوْ فَلَّكِ أَوْ جَمَعَ كُلاًّ لَكِ. قَالَتِ الثَّامِنَةُ: زَوْجِى الرِّيحُ رِيحُ زَرْنَبٍ وَالْمَسُّ مَسُّ أَرْنَبٍ. قَالَتِ التَّاسِعَةُ: زَوْجِى رَفِيعُ الْعِمَادِ، طَوِيلُ النِّجَادِ، عَظِيمُ الرَّمَادِ، قَرِيبُ الْبَيْتِ مِنَ النَّادِى. قَالَتِ الْعَاشِرَةُ: زَوْجِى مَالِكٌ، وَمَا مَالِكٌ؟ مَالِكٌ خَيْرٌ مِنْ ذَلِكِ، لَهُ إِبِلٌ كَثِيرَاتُ الْمَبَارِكِ، قَلِيلاَتُ الْمَسَارِحِ، إِذَا سَمِعْنَ صَوْتَ الْمِزْهَرِ أَيْقَنَّ أَنَّهُنَّ هَوَالِكُ. قَالَتِ الْحَادِيَةَ عَشْرَةَ: زَوْجِى أَبُو زَرْعٍ فَمَا أَبُو زَرْعٍ؟ أَنَاسَ مِنْ حُلِيٍّ أُذُنَيَّ وَمَلأَ مِنْ شَحْمٍ عَضُدَيَّ وَبَجَّحَنِى فَبَجِحَتْ إِلَيَّ نَفْسِى، وَجَدَنِى فِى أَهْلِ غُنَيْمَةٍ بِشَقٍّ فَجَعَلَنِى فِى أَهْلِ صَهِيلٍ وَأَطِيطٍ وَدَائِسٍ وَمُنَقٍّ، فَعِنْدَهُ أَقُولُ فَلاَ أُقَبَّحُ، وَأَرْقُدُ فَأَتَصَبَّحُ وَأَشْرَبُ فَأَتَقَنَّحُ. أُمُّ أَبِى زَرْعٍ، فَمَا أُمُّ أَبِى زَرْعٍ؟ عُكُومُهَا رَدَاحٌ، وَبَيْتُهَا فَسَاحٌ. ابْنُ أَبِى زَرْعٍ، فَمَا ابْنُ أَبِى زَرْعٍ؟ مَضْجِعُهُ كَمَسَلِّ شَطْبَةٍ. وَيُشْبِعُهُ ذِرَاعُ الْجَفْرَةِ. بِنْتُ أَبِى زَرْعٍ، فَمَا بِنْتُ أَبِى زَرْعٍ؟ طَوْعُ أَبِيهَا وَطَوْعُ أُمِّهَا وَمِلْءُ كِسَائِهَا وَغَيْظُ جَارَتِهَا. جَارِيَةُ أَبِى زَرْعٍ، فَمَا جَارِيَةُ أَبِى زَرْعٍ؟ لاَ تَبُثُّ حَدِيثَنَا تَبْثِيثًا، وَلاَ تُنَقِّثُ مِيرَتَنَا تَنْقِيثًا. وَلاَ تَمْلأُ بَيْتَنَا تَعْشِيشًا. قَالَتْ: خَرَجَ أَبُو زَرْعٍ وَالأَوْطَابُ تُمْخَضُ، فَلَقِىَ امْرَأَةً مَعَهَا وَلَدَانِ لَهَا كَالْفَهْدَيْنِ، يَلْعَبَانِ مِنْ تَحْتِ خَصْرِهَا بِرُمَّانَتَيْنِ، فَطَلَّقَنِى وَنَكَحَهَا. فَنَكَحْتُ بَعْدَهُ رَجُلاً سَرِيًّا، رَكِبَ شَرِيًّا، وَأَخَذَ خَطِّيًّا، وَأَرَاحَ عَلَيَّ نَعَمًا ثَرِيًّا، وَأَعْطَانِى مِنْ كُلِّ رَائِحَةٍ زَوْجًا، وَقَالَ: كُلِى أُمَّ زَرْعٍ، وَمِيرِى أَهْلَكِ. فَلَوْ جَمَعْتُ كُلَّ شَيْءٍ أَعْطَانِى مَا بَلَغَ أَصْغَرَ آنِيَةِ أَبِى زَرْعٍ. قَالَتْ عَائِشَةُ: قَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «كُنْتُ لَكِ كَأَبِى زَرْعٍ لأُمِّ زَرْعٍ». {الحديث: ٦٢٥٥ = ٦٢٦٣ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٧٣ = ٥١٨٩ فتح البارى. تحفة الأشراف: ١٦٣٥٤}:

عائيشـەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودا لـە پێغەمبـەرو ڕەزای خـودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵانو پـەیڕەوانی بێ) فـەرمووی: یـازدە ژن کـۆڕی قسـەی لێ

دەبەستن، وە بەڵێن بەیەکتری دەدەن‌و، پەیمان دەبەستن کە هیچ شتێ لەدەنگوباسی مێردەکانیان نەشارنەوە لەیەکتری، ژنی یەکەمیان دەڵێ:

مێردەکەی من گۆشتە لەڕکی وشترە لەڕە، وا بەسەر لووتکەی شاخێکی زۆر سەختەوە، نە شاخەکە سەرکەوتنی ئاسانەو، نە گۆشتەکەش ئەوەندە باش‌و قەڵەوە، هەتا کەسێ خۆی ماندوو بکات‌و بچێ بۆی‌و بیبات بۆ خۆی. واتە: مێردەکەی هەم رژدو چرووکەو هەم چەمووش‌و بەدخووە.

ژنی دووەمیان دەڵێ:

هەواڵی مێردەکەم بڵاو ناکەمەوە، چونکە ناوێرم ناوی بەرم، ئەگینا شەن‌و کەوی دەکەم‌و ناوی بەدیی دەزڕێنم!. واتە: نەنگی زۆرە، کەم نەنگ هەیە کەتیا نەبێ.

ژنی سێیەمیان دەڵێ:

مێردەکەی من قووچێکی ناقۆڵای نەگریسە، ئەگەر نقەبکەم تەڵاقم دەدا، ئەگەر نقەیش نەکەم ئەوا وەك بێوەژن بەسراوەمەتەوە، نەخۆی بەمێرد دەچێ‌و، نە بەرەڵاشم دەکا، تا بۆخۆم شوویەکی تری تەڕو تازە بکەم بۆ خۆم.

ژنی چوارەمیان دەڵێ:

مێردەکەی من وەك شەوی تیهامە فێنك‌و خۆشە، نەساردەو نەگەرمە، بەبێ ترس‌و بەبێ بێزاریی، دوو بەدوو سەردەکەین بەیەکاو بۆخۆمان رادەبوێرین.

ژنی پێنجەمیان دەڵێ:

مێردەکەی من لەماڵەوە وێزە هەردەکاو دەخەوێ‌و، لەدەشت‌و دەر شێرەو ئازایەو چاو تێرەو لەشتی ناوماڵ ناپرسێتەوە!

ژنی شەشەمیان دەڵێ:

مێردەکەی من بۆ خواردن لرفەی لێ دێ‌و لەکاتی خواردنەوەدا چۆڕەی لێ هەڵ دەستێنێ‌و بەشی کەس ناداو، کە دەخەوێ خۆی گرمۆڵە دەداو دەس ناگێڕێ

بەسینگو بەرۆکا، تا لەپەژارەی دڵ تێ بگا! واتە: زۆر خۆرو بەد فەڕو رژدو دژە کردنە!

ژنی حەوتەمیان دەڵێ:

مێردەکەی من دژێکی ئێسك قورسی دژ پەڕینە! لاژگو گەوجو گێلە، هەموو دەردێ بۆ ئەو دەردەو دەردەدارەو دەغەزارەو، دەرد نییە کە تووشی نەبووبێ!

لەگەڵ ئەوەیشا هەروا بەئاسانی لەدەستی رزگارت نابێ، لەخوتو خۆڕایی یا سەرت دەشکێنێ، یا شوێنێکت دەقرنجێنێ، یا تووشی چورتومێکی گەورەترت دەکا!

ژنی هەشتەمیان دەڵێ:

مێردەکەی من نەرمو نۆڵە، وەك کەروێشك، بۆنی خۆشە وەك زەعفەرانو وەنەوشە!.

ژنی نۆیەم دەڵێ:

مێردەکەی من خانەدانو نانبدەو خاوەن خوانو دیوەخانو، جوانمەردو باڵا بەرزو شۆخو شەنگەو ئالای بەخشندەیی لێ هەڵکردووەو خانەی نزیکی یانەیەو سەردارو نازدارو خاوەن دیوەخانو میوان پەروەرو ژیرو هۆشمەندە!!

ژنی دەیەمیان دەڵێ:

مالیکی مێردی من چۆن مالیکێکە! گەلێ لەم پیاوانەی کە ئێوە دەڵێن باشترە، وشترو پەچە رانی وشتری زۆرە، بەڵام پاوانو پاکژی کەمە، چونکە وشترو ئاژەڵەکانی بۆ سەربڕین بۆ مێوان، راگرتووە نەوەك بۆ بەرهەمهێنانو بەخێوکردن، کاتێ وشترەکان کە دەنگی کەمانچە دەبیستن کە بەبۆنەی هاتنی میوانەکانەوە لێ دەدرێ، بەفیترەت هەست دەکەن کەوا سەریان دەبڕن بۆ میوانی نوێ!

ژنی یازدەهەمیان دەڵێ:

ئەبو زەرعی مێردی من چۆن ئەبو زەرعێکە! هەردوو گوێچکەی پڕکردووم لە گوارەو خشڵ، وە بازووی پڕکردووم لە گۆشتو بەز، ئەوەندە نازی گرتووم‌و ئەوەندە نازی کێشاوم تا نازدارو نازەنین بووم!

لەناو خێزانێکی هەژاری مەڕداردا بووم، لەپەنایەکا بووین، گوزەرانێکی سادەمان هەبوو، ئەو هێنامیە ناو خێزانێکی تێرو پڕی دەوڵەمەندی داراوە، کە بەچەندان ڕەوگو ڕانە وشترو مێگەلو گاگەلو خەلەو خەرمانو مشتاخیان هەبوو، کە قسەم دەکرد لەگەڵیا، بەدڵ گوێی لێ دەگرتم، کەس نەیدەدایەوە بەدەمماو قسەی پێ نەدەبڕیم، بەشەو کە دەخەوتم لەباوەشیا، تابەیانی لەخەو هەڵ نەدەسام، چونکە کارەکەرو نۆکەری زۆرم هەبوو، ئەوان ئیشی ناوماڵیان دەکرد، وەتا دەمتوانی لە جۆرەها خواردنەوەو شەرابی نایاب دەمخواردەوە!

دایکی ئەبو زەرع، کە خەسووم بوو، چۆن ژنێکی شاهانە بوو، چۆن خانو مانێ بوو!

هەبگەو خورجەکانی هەمیشە پڕبوونو هەم قەبەو هەم کەشخە بوونو هەموو کاتێ پڕبوون لە گەوهەرو زێڕو زیوو جلی ئالاو والا، وە ماڵەکەی پانو پۆرو بەرین بوو، وە بۆ هیچ شتێ دانەدەما!

کوڕەکەی ئەبو زەرع چۆن کوڕێك بوو، کەڵەگەتو ناوقەد باریك، پاکخۆرو کەمخۆر، بەژنو باڵای ئەوەندە ڕێكو پێكو شووشو قەڵەمی بوو، لەشوێن تلێشی پەلکە خورمایەکا، جێگەی دەبۆوە، لەبەر کەمخۆری لەدەستی کارژەڵەیێ لەبەری دەمایەوە!

کچەکەی ئەبو زەرع چۆن کچێك بوو! گوێڕایەڵو فەرمانبەرو کارمەند بوو، لەفەرمانی باوكو دایکی دەرنەدەچوو، بۆ جوانی وێنەی نەبوو، خرپنەو خڕو خەپانو خەپە تۆڵە بوو، لەبەر شۆخو شەنگیو ناسكو نازداریو داوێنپاکی هەوێکەی ڕقەی لێ دەکێشاو، بوو بوو بەچقڵی چاوی ناحەزی!

کەنیزەکەکەی ئەبو زەرع چۆن کەنیزەکێك بوو!! نە قسەمانی دەبردە دەرەوەو، نە ئازووقەو دانەوێڵەی دەپژاندینو نە ناوماڵی پڕدەکردین لەپووشکەو پەلاش، زمان پاكو دڵسۆزو پاكو تەمیزو ئیش جوان بوو.

ئوم زەرع گوتی:

مەشکە دەژەنرا، کات گەرمەی بەهار بوو، بەهارێکی خۆش، رۆژێ ئەبو زەرع دەرچوو بۆ دەشتو دەر، تووشی ئافرەتێ دەبێ، دوو کوڕی خۆیی بەبەرەوە دەبێ، وەك دوو بەچکە وێز، مەمکە هەنارییەکانی دایکیان دەمژن، کەوەك دوو هەنار وادەبن، خڕو نەرمو نۆڵو پڕ بەدەست دەبن، ئیتر ئەبو زەرع منی تەلاق داو ئەوی مارە کرد، بەهیوای ئەوەی کە منالی وەجاخ زادەی لێ ببێ، وەك ئەو دوو منالە کە لەبەچکە وێزیان دەکرد، ئەوەندە نەشمیلەو خنجیلە بوون!

ئینجا منیش، لەدوا ئەبو زەرع، شوومکردەوە بە پیاوێکی خانەدانی داراو دەولەمەندو جوامێر، سواری ئەسپێکی نایابی خۆشڕۆ بوو، وەرمێکی چاکی هەلگرت، وە سەر لەئێوارێ ئاژەڵێکی زۆری بێ شوماری هێنایەوە بۆم، وە لەهەموو چەشنێ سەرو جووتی پێمدا، وە گوتی: ئەی ئوم زەرع! لەهیچ دەست مەگرەوە، نە لەخۆتو نە لەکەسوکارت درێغی مەکە!

ئوم زەرع گوتی: بەلام ئەم هەموو نازو نیعمەتەی کە ئەم مێردە تازەیەم دەیدا بەمن، نادات لە گوێچکەیێ نانی ئەبو زەرع، چی جای ئەو هەموو خێرو بێرەی کەهەی بوو!

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم:

(ئەی عائیشە! ئەبو زەرع چۆن بوو، بۆ ئوم زەرع، منیش بۆ تۆ وام، بەلام لەنازگرتنو قەدر زانیندا، نەوەك لەجیابوونەوەو تەلاق داندا). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٢١٧٠ چ/٤}.

**روونکردنەوە:**

کۆمەڵێ بەهرەو کەڵك لەم فەرموودەیەدا هەیە:

١- بە بۆچوونی بەندەی هەژار، ئەم فەرموودەیەو چەندین فەرموودەی تری لەم بابەتە، جۆرێکن لە ئەدەبی رەمزی، هەروەك شێوەیەکی بەرزن لە مەقاماتی جوان، وەك مەقاماتی حەریریو هەمەدانی.

٢- لەم فەرموودەدا ڕێزگرتنی ژن، ئایا هاوسەر بێ، یا کچ بێ، یا خوێیی بێ، یا بیانی، بەباشی دیاریکراوە، وە گوزەرانی خۆش لەگەڵیدا زۆر پەسەندە، فەمانکراوە بە حوسنی موعاشەرەی، وە زۆر لەرەفتاری بەرزی مێرد لەگەڵ ژنی خۆیداو، ژن لەگەڵ مێردی خۆیدا دیاریکراوەو پەسەندکراوە، هەروەك بەئاشکرا، ئەم جۆرە بڕیارە شەرعییەشیان لێ وەردەگیرێ، وەك ڕاڤە نووسەکان ئاماژەیان بۆ دەکەن بەتایبەتی ئیمامی عەسقەلانی.

٣- تەمسیلو نمایشو شانۆگەریو چیرۆك دانانو چیرۆك گێڕانەوە دروستن، بەمەرجێ لەپەردەی شەرمو شکۆ دەرنەچنو، سوودو بەرژەوەندی کۆمەڵیان تیادا بێو، ببن بەهۆی پێشکەوتنی زمانو بەرەودان بەوێژەو ئەدەبو وێڵی جوان، تەنانەت دروستە ڕۆمانو چیرۆكو حیکایەتو ڕۆمانی دەستهەڵبەست بۆ ئەم جۆرە شتانە دابنرێنو داستانو سەرگوزەشتەی نەتەوە پێشینەکان بکرێن بەسەر مەشقو نموونەو چاویان لێ بکرێو بکرێن بەفیلمو ڕۆمانو شتی واو، لەهۆکارەکانی ڕوونکردنەوەدا، وەك ڕادیۆو ڕۆژنامەو گۆڤارو شتی واداو، پەخش بکرێنەوە، دارشتنی گفتوگۆ لەم بوارەدا دانانرێ بەدرۆ.

٤- گفتوگۆی خۆشو گاڵتەو سوعبەتو قسەی نەستەق کردنو قسەی ڕەوا، بەهەر شێوەیێ بێ، دروستەو هیچی تیا بەستە نییە.

٥- واباشو پەسەندە، قسەو گفتوگۆو گێڕانەوەو ئاخاوتن، بە وشەی ناسكو ڕستەی هەست بزوێنو گوتەی دڵهەژێنو بەقسەی نەستەق بێو بەپەندی بەرزی ڕەوانو بەدەر بڕینی جوانی پڕلە ڕەوانبێژی برازێتەوە، بەسەجعو هاو سەروایی جوان بنەخشێنرێن.

٦- چەند برگەیێ لە فەرمایشتەکانی مامۆستای عەسقەلانی، بەعەرەبی، سەبارەت بەسوودو بەهرەی ئەم فەرموودەیە، لەپاشەوە ڕاگوێز دەکەین، بۆ پشتیوانی ئەم خاڵانەی پێشەوە، عەسقەلانی دەفەرموێ:

{في هذا الحديثِ منَ الفَوائِد: حُسْنُ عُشْرةِ المرْءِ أهْلَهُ، والمُحادَثَةُ بالْأُمُورِ المُباحَةِ. وَفِيهِ المُزاحُ أحْياناً وَبَسْطُ النَّفْسِ، وَفِيهِ الحَديثُ عَنِ الْأُمَمِ الخَالِيَةِ، وَضَرْبُ الأمْثَالِ بِهِمْ اعْتِبَاراً، وَجوازُ الْانْبِساطِ بِذِكْرِ طُرَفِ الْأَخْبَارِ وَمُسْتَطَابَاتِ النَّوادِرِ، وَتَنْشِيطاً لِلنُّفُوسِ، وَجَوازُ المُبالَغةِ، وَفِيهِ جَوازُ التَّأسّي بِأهْلِ الفَضْلِ مِنْ كُلِّ أمَّةٍ ... وَفِيهِ جَوازُ الكَلامِ بِالْألفاظِ الغَرِيبَةِ، واسْتِعْمَالِ السَّجْعِ ... وَفِي كَلامِهِنَّ مِنْ فُنُونِ التَّشْبِيهِ وَالاسْتِعارَةِ وَالكِنايَةِ وَالمُوازَنَةِ والتَّرْصِيحِ وَالإشَارَةِ وَضَرْبِ المَثَلِ، وَاللّهُ يَمُنُّ عَلَى مَنْ يَشَاءُ بِمَاشَاءَ...}.

٧- ئەم كۆمەڵە ژنە لەنەتەوەكانی پێش ئیسلام بوون.

**١٢٧٩) باسی بەهرەو گەورەیی خاتوو خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵو پەیڕەوانی بێ). (٦٢٢١ - ٦٢٣٢)**

**بَابُ: فَضَائِلُ خَدِيجَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**

١٦٧٠- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ جَعْفَرٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) بِالْكُوفَةِ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ». قَالَ أَبُو كُرَيْبٍ: وَأَشَارَ وَكِيعٌ إِلَى السَّمَاءِ وَالأَرْضِ. {الحديث: ٦٢٢١ = ٦٢٢٩ فم. تجريد/٤، رقم: ١٣٦٥ = ٣٤٣٢، ٣٨١٥ فتح}:

عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی ئیمامی عەلی كوڕی ئەبو طالیبم بیست (رەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (باشترینی ژنانی جیهان مەریەمی كچی عیمران بوو لەكاتی خۆیدا، لەم سەردەمەی ئێمەیشدا باشترینی ژنانی جیهان خەدیجەی كچی خووەیلیدە). {تاجول ئوصول بەكوردی، بەرگی سێیەم، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٣٤٢٧} . لەم گێڕانەوەی پێشەوا موسلیمدا (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ) لەكۆتاییەكەیدا ئەمەی پترە:

ئیمـامی موسـلیم دەفـەرموێ: ئـەبو کـورەیبی مامۆسـتام فـەرمووی: وەکیعـی مامۆستام بە ئاماژە فەرمووی: واتە لەنێوانی ئـەرزو ئاسمانـا، لـەم دوو ژنـەی باشـتر تیانەبووە، هەرکەسەیان لەسەردەمی خۆیدا.

١٦٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَى جِبْرِيـلُ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ أَتَتْكَ مَعَهَا إِنَاءٌ فِيهِ إِدَامٌ أَوْ طَعَامٌ أَوْ شَرَابٌ، فَإِذَا هِيَ أَتَتْكَ فَاقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلاَمَ مِنْ رَبِّهَا عَـزَّ وَجَـلَّ وَمِنِّـي، وَبَشِّـرْهَا بِبَيْـتٍ فِـي الْجَنَّـةِ مِـنْ قَصَبٍ، لاَ صَخَبَ فِيهِ وَلاَ نَصَبَ. {الحديث: ٦٢٢٣ = ٦٢٣١ فم. تجريد/٤، رقـم: ١٤٩٩ = ٣٨٢٠، ٧٤٩٧}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: جوبرائیـل (سـڵاوی خـودای لێ بـێ) لـە ئەشکەوتی حیراء، لەو سەردەمەدا کە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەوێ ئیعتیکـافی دەکردو خەڵوەی دەکێشا، دێت بۆلای‌و پێی دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە خەدیجـەی هاوسـەرتە، وابـەڕێوە واهـات بـۆلات، دەفرێکـی پێیـە، پێخـۆری واتیـادا، هێناویەتی بۆت، یا فەرمووی: خۆراك، یـا خواردنـەوەی تیـادا هێنـاوە بـۆت، جـا کـە گەیشتە لات، لەلایەنی خودای گـەورەو سـەروەرەوەو لەلایـەنی منیشـەوە، سـڵاوی لێ بکـەو، مزگێنـی‌و مـوژدەی ئەوەیشـی پـێ بـدە: کـە خـودا لەبەهەشـتا تـەلارێکی بـۆ داناوە، لە مرواری هوڵوڵ دروست کراوە، نەدەنگە دەنگ‌و نـەقرە قـڕی واتیـاداو، نـە نارەحەتی‌و شەکەتی‌و ماندوو بوونی واتیادا). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٣٤٢٦}.

١٦٧٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: مَا غِرْتُ عَلَى نِسَاءِ النَّبِيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِلاَّ عَلَى خَدِيجَةَ، وَإِنِّي لَمْ أُدْرِكْهَا. قَالَتْ: وَكَـانَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) إِذَا ذَبَحَ الشَّاةَ فَيَقُولُ: «أَرْسِلُوا بِهَا إِلَى أَصْدِقَاءِ خَدِيجَـةَ». قَالَـتْ: فَأَغْضَـبْتُهُ يَوْمًـا، فَقُلْتُ: خَدِيجَةَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنِّي قَدْ رُزِقْتُ حُبَّهَا». {الحديث: ٦٢٢٨ = ٦٢٣٦ فـم. تجريـد/٤، رقـم: ١٩٨ = ٣٨١٨، ٣٨١٧، ٥٢٢٩، ٦٠٠٤، ٧٤٨٤. ترمذي. بروصلة: ٢٠١٧. تحفة الأشراف: ١٦٧٨٧}:

ئەم فەرموودەیە لە بوخاریدا ئاوایە، دەیکەیمن بە ڕاقە بۆ گێڕانەوەی ئێرەی موسلیم:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رقەم نەکێشاوە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر هیچ ژنێکی، وەکوو لەسەر خەدیجەی هاوسەری رقەم لێ دەکێشاو، هەستم بەدەمارگیریی هەوێباریی دەکرد، خەدیجەشم هەرگیز نەدیوە، چونکە سێ ساڵ بەرلەوەی کە پێغەمبەر (درووی خودای لەسەر بێ) مـن بگوێزێتەوە، خەدیجە مردووە، هۆی ئەم رقە کێشانو هەوێبارییەم ئەوەبوو:

(پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر باسی خۆشەویستی خەدیجەی دەکردو زۆر ناوی دەهێنا، بگرە گەلێ جار کە مەڕێکی سەردەبڕی، پارچە پارچەی دەکردو ئەوجا دەینارد بۆ دۆستو خۆشەویستانو دەستە خوشكو ئاشناو رۆشناکانی خەدیجە، بۆ وەفاو ئەمەکداری بۆ مافو یادی خەدیجە، گەلێ جار، لەرووی رەخنەوە، عەرزی پێغەمبەرم دەکرد: ئەوە چییە ئەوەندە ناوی خەدیجە دەهێنیتو هەر دەڵێی: خەدیجە، خەدیجە، دەڵێی ئەم جیهانە کەسی تری تیادا نییە ئەو نەبێ؟!)

ئەویش دەیفەرموو (درووی خودای لەسەر بێ): (ئافرەتێکی فرەباش بوو، وەها وەها باش بوو، سەرەرای هەموو شتێکی باشیشی منالم لێی هەبوو!). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٣٤٢٥ ج/٤}.

١٦٧٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهـا) قَالَتْ: لَمْ يَتَزَوَّجِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى خَدِيجَةَ حَتَّى مَاتَتْ. {الحديث: ٦٢٣١ = ٦٢٣٩ فم}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەتا خەدیجە لەژیانا مابوو، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ژنی بەسەر نەهێنا).

١٦٧٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَت: اسْتَأْذَنَتْ هَالَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ أُخْتُ خَدِيجَةَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَعَرَفَ اسْتِئْذَانَ خَدِيجَةَ، فَارْتَاحَ لِذَلِكَ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ هَالَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ»، فَغِرْتُ. فَقُلْتُ: وَمَا تَذْكُرُ مِنْ عَجُوزٍ مِنْ عَجَائِزِ قُرَيْشٍ حَمْرَاءِ

الشِّدْقَيْنِ، هَلَكَتْ فِي الدَّهْرِ فَأَبْدَلَكَ اللَّهُ خَيْرًا مِنْهَا. {الحديث: ٦٢٣٢ = ٦٢٤٠ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٠٠ = ٣٨٢١}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هالەی کچی خووەیلیدی خوشکی خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر، داوای مۆڵەتی کرد کە بێتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەنگی ئەودا دەنگی خەدیجەی بیرکەوتەوەو وایزانی کە ئەوە، چونکە دەنگیان لەیەك دەچوو، لەبەرئەوە راچەنیو فەرمووی: (ئەی خودایە! دەی هالەی کچی خووەیلید بێ!).

منیش دەمار گرتمیو گوتم: ئەوە چییە ئەوەندە یادی ئەم پیرێژنە قورەیشییە لالفاوە سوورە ددان لەدەما نەماوەی قورەیشە دەکەیتەوە، کە سەردەمێکی دوورو درێژە لەناوچووەو مردووە، کە لەگەڵ ئەوەیشدا، خودا لەجیاتی ئەو، ژنی باشتری پێ بەخشیوی). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٣٤٢٨ چ/٤}.

## ١٢٨٠) باسی بەهرەو گەورەیی دایکی بڕواداران زەینەبی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەر هاوسەرو هاوەڵو پەیڕەوانی بێ). (٦٢٦٦)

**بَابٌ: فِي فَضَائِلِ زَيْنَبَ زَوجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)**

١٦٧٥- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَسْرَعُكُنَّ لَحَاقًا بِي أَطْوَلُكُنَّ يَدًا». قَالَتْ: فَكُنَّ يَتَطَاوَلْنَ أَيَّتُهُنَّ أَطْوَلُ يَدًا. قَالَتْ: فَكَانَتْ أَطْوَلَنَا يَدًا زَيْنَبُ، لأَنَّهَا كَانَتْ تَعْمَلُ بِيَدِهَا وَتَصَدَّقُ. {الحديث: ٦٢٦٦ = ٦٢٧٤ فم. تجريد/٢، رقم: ٦٨١ = ١٤٢٠}:

عائیشە دایکی ئیمانداران (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەندێ هاوسەرەکانی پێغەمبەر، عەرزی پێغەمبەریانکرد: قوربان! لەپاش مردنی تۆ کاممان زووتر دەمرینو لەودنیا بەخزمەتت دەگەینەوە؟! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەتان کە دەستی درێژترە زووتر دەگاتەوە بەمن!).

جا ژنەكانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەڵێ قامیشیان هێنا، باسكی خۆیان پێی پێوا، تابزانن دەستی كامیان درێژترە، بەڵام لەپاش مەرگی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەركەوت مەبەستی حەزرەت لەدەستی درێژ خێرەو مەندیو بەخشندەیی بوو، چونكە سەودەی هاوسەری، لەهەموو ژنەكانی تری باسكی درێژتر بوو، بەڵام زەینەبی هاوسەری، لەپێش هەموویانا ئەمری خودای كردو مرد، دیاربوو كە دەستدرێژییەكەی زەینەب برێتی بوو لەخێرەو مەندیو خێر خوایی، چونكە هەمیشە بەدەستی خۆی ئیشی دەكردو پارەكەی كۆدەكردەوەو دەیكرد بەخێرو ئەوەی بەدەستو پەنجە پەیای دەكرد، دەیبەخشیو دەیكرد بەخێرو چاكە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٤٤٣ = چاپی چوارەم}.

**روونكردنەوە:**

زەینەبی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ژنێكی دەست رەنگین بوو، پێستەو شتی وای دەباخ دەكردو كوندەو مەشكەو ئەمانەی پینە دەكردو دەدوورییەوەو پارەكەی دەكرد بەخێرو دەیدا بەهەژاران. {بڕوانە: ژمارە: ٨٢٤ لەپێشەوە رابورد}.

**١٢٨١) باسی گەورەو بەهرەیی ئوم سەلەمەی دایكی ئیماندارانی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لە پێغەمبەرو هەموو هاوسەرو هاوەڵو پەیڕەوانی بێ). (٦٢٦٥)**

**بَابُ: فِي فَضَائِلِ أُمِّ سَلَمَةَ زَوجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)**

١٦٧٦- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: لاَ تَكُونَنَّ إِنِ اسْتَطَعْتَ أَوَّلَ مَنْ يَدْخُلُ السُّوقَ، وَلاَ آخِرَ مَنْ يَخْرُجُ مِنْهَا، فَإِنَّهَا مَعْرَكَةُ الشَّيْطَانِ، وَبِهَا يَنْصِبُ رَايَتَهُ. قَالَ: وَأُنْبِئْتُ أَنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ أَتَى نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدَهُ أُمُّ سَلَمَةَ، قَالَ: فَجَعَلَ يَتَحَدَّثُ ثُمَّ قَامَ، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأُمِّ سَلَمَةَ: «مَنْ هَذَا»؟ أَوْ كَمَا قَالَ، قَالَتْ: هَذَا دِحْيَةُ الكلبي. قَالَ: فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: ايْمُ اللَّهِ مَا حَسِبْتُهُ، إِلاَّ إِيَّاهُ حَتَّى سَمِعْتُ خُطْبَةَ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُخْبِرُ خَبَرَنَا، أَوْ كَمَا قَالَ، قَالَ: فَقُلْتُ لأَبِي عُثْمَانَ:

مِمَّنْ سَمِعْتَ هَذَا؟ قَالَ: مِنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ. {الحديث: ٦٢٦٥ = ٦٢٧٣ فم. بخاري. مناقب: ٣٦٣٤، ٤٩٨٠ فتح الباري}:

ئەبو عوثمان فەرمووی: سەلمان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر بۆت ئەکرێ نە یەکەم کەسبە کەبچی بۆ بازاڕو نەدواهەمین کەسیشبە کە لەبازاڕ دەرچیت، چونکە بازاڕ مەیدانو شەڕگای شەیتانەو شەیتان ئالای سوپای خۆی لەوێ هەڵ دەدات. سەلمان دەیفەرموو: هەواڵم زانیوە کە جارێ جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) دێ بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەست دەکا بە گفتوگۆ لەگەڵیا، ئوم سەلەمەیش لەوکاتەدا لەخزمەتیدا دەبێ، لەپاشا جوبرائیل هەڵدەستێو دەڕوا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئوم سەلەمە دەفەرموێ: (دەزانی ئەمە کێ بوو؟) یا شتێکی ئاوای پێ دەفەرموێ، ئوم سەلەمەیش دەڵێ: ئەمە دیحیەی ئەلکەلبی بوو، ئوم سەلەمە دەیگوت: بەخوداسا لەڕاستیدا هەر بەدیحیەم دەزانی، هەتا ئەو دەمەی گوێم لەوتاری پێغەمبەر بوو، باسی ئەم هەواڵەی ئێمەی دەگێڕایەوەو باسی ئەم هاتنەی جوبرائیلی دەکرد، یاشتێکی لەم بارەیەوە فەرموو، گوتم بەئەبو عوثمان: تۆ ئەم فەرموودەیەت لەکێ بیستووە؟ فەرمووی: لە ئوسامەی کوڕی زەید). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٣٤٤٢}.

## ١٢٨٢) باسی بەهرەو گەورەیی ئوم سولەیم، دایکی ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودایان لێ بێ). (٦٢٦٩ - ٦٢٧٤)

### بَابٌ: فِي فَضَائِلِ أُمِّ سُلَيْمٍ أُمِّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)

١٦٧٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لاَ يَدْخُلُ عَلَى أَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِ، إِلاَّ أُمِّ سُلَيْمٍ فَإِنَّهُ كَانَ يَدْخُلُ عَلَيْهَا، فَقِيلَ لَهُ فِي ذَلِكَ. فَقَالَ: «إِنِّي أَرْحَمُهَا قُتِلَ أَخُوهَا مَعِي». {الحديث: ٦٢٦٩ = ٦٢٧٧ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٧٢ = ٢٨٤٤ فتح الباري}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینەی نازدار، بێجگە لەماڵی ژنەکانی خۆی، بۆ ماڵی ژنی تر نەدەچوو، بۆ

مالّى ئوم سولەيمى دايكم نەبىّ، بەلام بۆلاى ئەو دەچوو، لەمالّى خۆى دێنى ئەوى دەكرد، كە لەم لايەنەوە پرسيارى لێكرا، فەرمووى: (دروودى خوداى لەسەر بێ): (دڵم پێى دەسووتێ، بەزەييم پێيدا دێتەوە، چونكە براكەى، كە حەرامى كوڕى مەلحان بوو، لەشەڕى بيرى مەعوونەدا، لەپێناوى ئيسلاماو، لەپێناوى جێبەجێ كردنى فەرمانى منا كوژراوە). {تاج/٣، زنجيرە: ٤٣، ژمارە: ٣٤٤٧ چ/٤}.

١٦٧٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ خَشْفَةً فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذِهِ الْغُمَيْصَاءُ بِنْتُ مِلْحَانَ أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ». {الحديث: ٦٢٧٠ = ٦٢٧٨ فم}:

ئەنەسى كوڕى ماليك (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: چوومە بەهەشت، چرپەيەكم بەرگوێ كەوت، گوێم لەخشپە خشپى پێى كەسێ بوو، بە بەهەشتيەوانەكانم گوت: ئەوە كێيە؟ وا خودا ئەم بەهرە گەورەى پێ بەخشيوە؟ گوتيان: ئەوە غومەيصاى كچى ميلحانە، كە دايكى ئەنەسى كوڕى ماليكە، كە هاوسەرى ئەبو طەلحە بوو (رەزاى خودا لەهەموويان بێ). {تاجول ئوصول، بەكوردى، زنجيرە: ٤٣، ژمارە: ٣٣٤٨ چ/٤}.

**١٢٨٣) باسى بەهرەو گەورەيى ئوم ئەيمەن، ئازادكراوى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) كە دايكى ئوسامەى كوڕى زەيد بوو. (٦٢٦٦)**

**بَابٌ: فِي فَضَائِلِ أُمِّ أَيْمَنَ مَوْلاَةِ النَّبِيِّ أُمِّ سَلَمَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم جَمِيعاً)**

١٦٧٩- عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِعُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ نَزُورُهَا كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَزُورُهَا، فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْهَا بَكَتْ، فَقَالاَ لَهَا: مَا يُبْكِيكِ، مَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). فَقَالَتْ: مَا أَبْكِي أَنْ لاَ أَكُونَ أَعْلَمُ أَنَّ مَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَلَكِنْ أَبْكِي أَنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ مِنَ السَّمَاءِ، فَهَيَّجَتْهُمَا عَلَى الْبُكَاءِ، فَجَعَلاَ يَبْكِيَانِ مَعَهَا. {الحديث: ٦٢٦٨ = ٦٢٧٦ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەپاش مەرگی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکری صەدیق بە عومەری کوڕی خەتابی فەرموو: وەرە بابچین بۆ دێنی ئوم ئەیمەن، دایەنەکەی پێغەمبەر، وەك ئەوسا کە پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەر بێ) دێنیو سەردانی ئەوی دەکرد، جا کە گەیشتینە لای، دەستی کرد بەگریان، ئەوانیش پێیان گوت: بۆ دەگریت؟ لای خودا باشترە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئوم ئەیمەن فەرمووی: خۆ من لەبەرئەوە ناگریم کە ئەوە نەزانم، منیش دەزانم کەلای خودا باشترە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەلام بۆیە دەگریم چونکە ئیتر سرووش (نیگا = وەحی) لەئاسمان نایەتە خوارەوە، کەوای گوت: ئەوانیش دڵیان پڕبوو، هەردووکیان لەگەڵیا دەستیانکرد بەگریان). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ٣٤٤٦}.

### ١٢٨٤) باسی بەهرەو گەورەیی زەیدی کوڕی حاریثە (ڕەزای خودای لێ بێ). (٦٢١٢ - ٦٢١٥)

### بَابٌ: فِي فَضَائِلُ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

١٦٨٠- عَنْ ابن عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَا كُنَّا نَدْعُو زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ إِلاَّ زَيْدَ بْنَ مُحَمَّدٍ حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ: (ادْعُوهُمْ لآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ). {الحديث: ٦٢١٢ = ٦٢١٩ فم. بخاري. تفسير: ٤٧٨٢. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٠٩}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپێشا هەر بە زەیدی کوڕی حاریثەمان دەگوت: زەیدی کوڕی موحەممەد، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە قورئانا، کە دەفەرموێ: {ادْعُوهُمْ لآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ – ٥/٣٣}.

واتە: ئەو کەسانە کە کردووتانن بەکوڕی خۆتان، لەڕاستیدا کوڕی ئێوە نینو کوڕی کەسانی ترن، ئیتر بەناوی خۆتانەوە بانگیان مەکەنو بەڵکوو بەناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەنو ناویان بهێنن، چونکە ئەوە ڕێکی شەریعەتی خودایە).

ئیتر لەپاش دابەزینی ئەم ئایەتە هەرکەسە لەوانە بەناوی باوکی خۆیانەوە ناومان دەهێنان‌و بەزەیدیشمان دەگوت: زەیدی کوڕی حاریثە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ٣٣٨٦ چ/٤}.

## ١٢٨٥) باسی بەهرەو گەورەیی زەیدی کوڕی حاریثەو ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودایان لێ بێ). (٦٢١٢ - ٦٢١٥)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلُ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ وَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)

١٦٨١- عَنْ أَبْنِ عُمَرْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: «إِنْ تَطْعَنُوا فِي إِمَارَتِهِ (يُرِيدُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ) فَقَدْ طَعَنْتُمْ فِي إِمَارَةِ أَبِيهِ مِنْ قَبْلِهِ. وَايْمُ اللَّهِ إِنْ كَانَ لَخَلِيقًا لَهَا، وَايْمُ اللَّهِ إِنْ كَانَ لأَحَبَّ النَّاسِ إِلَيَّ، وَايْمُ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا لَهَا لَخَلِيقٌ (يُرِيدُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ)، وَايْمُ اللَّهِ إِنْ كَانَ لأَحَبَّهُمْ إِلَيَّ مِنْ بَعْدِهِ، فَأُوصِيكُمْ بِهِ، فَإِنَّهُ مِنْ صَالِحِيكُمْ». {الحديث: ٦٢١٥ = ٦٢٢٣ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٦٨ = ٣٧٣٠، ٤٢٥٠، ٤٤٦٨، ٤٤٦٩، ٧١٨٧، ٦٦٢٧ فتح الباري}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشکرێکی نارد بۆ غەزای مۆتە لە وڵاتی شام، زەیدی کوڕی حاریثەی کرد بەسەرکردەی سوپاکە، زەید شەهید بوو {بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی چوارەم، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٤٦٤٠} لەپاشا لەنەخۆشینی سەرە مەرگدا، ویستی لەشکرێ تر بنێرێ بۆ هەمان شوێن، وە ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثەی کرد بە سەرلەشکریان، هەندێ کەس ڕەخنەیان هەبوو، لەسەرکردەیی ئوسامەو لە سەرکردەیی باوکیشی، هەرکەسەیان لەکاتی خۆیدا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (خۆئەگەر ئێوە ئێستا تانەو تانووت لە فەرماندەیی ئوسامە بدەن، ئەوە شتێکی تازە نییە، چونکە کاتی خۆی ڕەخنەشتان لەسەرکردەیی زەیدی باوکیشی هەبوو، گوایە: دەیانگوت: زەید کۆیلەی ئازادکراوە، چۆن دەبێ ببێ بەسەر لەشکری لەشکرێ کە زوربەیان پیاوی ئازادبن!

دەسا بەهەقی خودا زەیدی باوکی شایستەی فەرمانڕەوایی بوو، دیسان بەهەقی خودا زۆر زۆریش خۆشەویست بوو لەلام، وە سوێندم بەهەقی خودا ئەم کوڕەیشی شایستەی فەرماندەییە، وە سوێندم بەخودا، لەپاش باوکی، ئوسامە خۆشەویسترین کەسە لەلام، دەی ئامۆژگاری هەموو لایەکتان دەکەم کە باشبن بۆی، چونکە لەپیاو باشانی ئێوەیە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ٣٣٨٦ ج/٤}.

**١٢٨٦) باسی بەهرەو گەورەیی بیلالی کوڕی رەباح کە بەندەی ئازادکراوی ئەبوبەکری صەدیق بوو (رەزای خودایان لێ بێ). (٦٢٦٩ - ٦٢٧٤)**
**بَابُ: فِي فَضَائِلِ بِلَالُ بْنُ رباح مولى أبي بكر الصديق (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما)**

١٦٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِبِلاَلٍ عِنْدَ صَلاَةِ الْغَدَاةِ: «يَا بِلاَلُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ عِنْدَكَ فِي الإِسْلاَمِ مَنْفَعَةً، فَإِنِّي سَمِعْتُ اللَّيْلَةَ خَشْفَ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ». قَالَ بِلاَلٌ: مَا عَمِلْتُ عَمَلاً فِي الإِسْلاَمِ أَرْجَى عِنْدِي مَنْفَعَةً مِنْ أَنِّي لاَ أَتَطَهَّرُ طُهُورًا تَامًّا فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ وَلاَ نَهَارٍ إِلاَّ صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كَتَبَ اللَّهُ لِي أَنْ أُصَلِّيَ. {الحديث: ٦٢٧٤ = ٦٢٨٢ فم. بخاري. تهجّد: ١١٤٩. تحفة الأشراف: ١٤٩٢٨}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێ لەپاش نوێژی بەیانی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی بیلال! پێم بڵێ: کام کاری باش دەکەی کە بەلاتەوە زیاتر جێگەی ئومێدبێ لەلای خودا، کە لەسەردەمی ئیسلامدا دەیکەی! چونکە ئەم وشە لەبەهەشتا لەبەردەم خۆمەوە گوێم لەچرپەی سۆڵەکانت بوو؟).

بیلال فەرمووی: ئەو کارەی کە لەکاتی ئیسلامەتیدا دەیکەمو لەلام پتر جێگەی ئومێد بێ ئەوەیە: هەرکاتێك بەشەو یا بەڕۆژ کەدەسنوێژ دەگرم، دەسنوێژێکی تەواو دەگرمو چەندە خودا لە چارەی نووسیبم نوێژ دەکەم!). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ٣٣٨٦ ج/٤}.

## ١٢٨٧) باسی بەهرەو گەورەیی سەلمانو صوهەیبو بیلال (رەزای خودایان لێ بێ)
## (٦٣٦١) (بابٌ: في فضائل سلْمان وصُهيب وبِلال (رضِيَ اللهُ عنْهُم))

١٦٨٣- عَنْ عَائِذِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ أَتَى عَلَى سَلْمَانَ وَصُهَيْبٍ وَبِلاَلٍ فِي نَفَرٍ فَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا أَخَذَتْ سُيُوفُ اللَّهِ مِنْ عُنُقِ عَدُوِّ اللَّهِ مَأْخَذَهَا، قَالَ: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَتَقُولُونَ هَذَا لِشَيْخِ قُرَيْشٍ وَسَيِّدِهِمْ؟.. فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ لَعَلَّكَ أَغْضَبْتَهُمْ؟ لَئِنْ كُنْتَ أَغْضَبْتَهُمْ لَقَدْ أَغْضَبْتَ رَبَّكَ». فَأَتَاهُمْ أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: يَا إِخْوَتَاهْ أَغْضَبْتُكُمْ؟ قَالُوا: لاَ، يَغْفِرُ اللَّهُ لَكَ يَا أُخَيَّ. {الحديث: ٦٣٦١ = ٦٣٧١ فم}:

عائیزی کوڕی عەمر (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەبو سوفیان لەپێش موسوڵمان بوونیا، لەکاتی پێکهاتن (هودنە: ئاگر بەست)ەکەی حودەیبییەدا بەلای سەلمانو صوهەیبی رۆمیو بیلالی حەبەشیو چەند موسوڵمانێکی تردا رەت دەبێ، دەڵێن: بەخودا ئەم دوژمنی خودایە هەرمایەوەو گەردنی بەر شیری قاری خودا نەکەوت!

ئەبوبەکریش دەفەرموێ: ئەوە چۆن قسەی وا بەسەر گەورەو ئاغای هەموو قوڕەیش دەڵێن؟! ئینجا ئەبوبەکر دەچێ بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەم باسو خواسەی عەرز دەکا دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی ئەبوبەکر! رەنگە تووڕەت کردبن بزانە ئەگەر ئەوانت تووڕە کردبێت ئەوە بەبێ گومان خودایشت تووڕە کردووە لەخۆت).

ئەبوبەکر (رەزای خودای لێ بێ) دەچێتەوە بۆلایان، پێیان دەڵێ: ئەی گەلی براییینە! خۆ خوانە خواستە تووڕە نەبوون لەقسەکەی من؟ دەڵێن: نەء، تووڕە نەبووین، خودا لێت خۆشبێ ئەی براله!). {تاج/٣، زنجیره: ٦، ژماره: ٣٥١٠، ج/٤}.

## ١٢٨٨) باسی بەهرەو گەورەیی ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ).
## (٦٣٢٢ - ٦٣٢٩) (بابٌ: في فضائل أنس بْنُ مالك (رضِيَ اللهُ عنْهُ))

١٦٨٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَتْ بِي أُمِّي أُمُّ أَنَسٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَقَدْ أَزَّرَتْنِي بِنِصْفِ خِمَارِهَا، وَرَدَّتْنِي بِنِصْفِهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ

اللَّهِ هَذَا أُنَيْسٌ ابْنِي أَتَيْتُكَ بِهِ يَخْدُمُكَ، فَادْعُ اللَّهَ لَهُ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ»، قَالَ أَنَسٌ: فَوَاللَّهِ إِنَّ مَالِي لَكَثِيرٌ، وَإِنَّ وَلَدِي وَوَلَدَ وَلَدِي لَيَتَعَادُّونَ عَلَى نَحْوِ الْمِائَةِ الْيَوْمَ. {الحديث: ٦٣٢٦ = ٦٣٣٣ فم}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (ڕەزای خوادای لێ بێ) **فەرمووی: دایکم نیوەی سەرپۆشەکەی خۆی وەك کراس ئالآن بەلای سەرووی لەشمەوە ئەو نیوەکەی تریشی لەباتی دەرپێ پێچای بەلای خواروی لەشمەوەو ئینجا بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی پێی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە ئەنەسەکەی کوڕمە، هێناومە خزمەتت بکات، لەخودای گەورە بپاڕێرەوە بۆی و نزای باشی بۆ بکە. فەرمووی** (درودی خودای لەسەر بێ)**: خودایە! ماڵ و منالی زۆری پێ ببەخشە).**

**ئەنەس دەیفەرموو: دەی بەخودا، لەپیت و فەڕی نزاکەی پێغەمبەرەوە، بەڕاستی ماڵم زۆرە، بۆ منالیش ئەمڕۆکە منال و وەچەو نەوەی خۆم، دەوری سەد کەس دەبن).** {تاج/٣، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٣٤٨٦ چ/٤}.

**١٦٨٥- عَنْ أَنَسُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمِعَتْ أُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ صَوْتَهُ، فَقَالَتْ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ أُنَيْسٌ، فَدَعَا لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثَ دَعَوَاتٍ قَدْ رَأَيْتُ مِنْهَا اثْنَتَيْنِ فِي الدُّنْيَا، وَأَنَا أَرْجُو الثَّالِثَةَ فِي الآخِرَةِ.** {الحديث: ٦٣٢٧ = ٦٣٣٥ فم}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **ڕەت بوو، ئوم سولەیمی دایکم گوێی لەدەنگی بوو، فەرمووی: قوربان! ئەی ڕەوانەکراوی خودا! باوك و دایکم بەقوربانت بن، ئەمە ئەنەسۆڵەی کوڕمە، نزای بۆ بکە. پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەر بێ) **سێ نزای کرد بۆم، دوانیانم بەچاوی خۆم دیوە ئەم دوانەیان هاتوونەتە دی، ئومێد دەکەم کە سێیەمیشیان لەقیامەتا بێتەدی! کە ئەوەیە خودا لەگوناهم خۆش بێ بەهۆی نزای پێغەمبەرەوە بۆم.** {تاج/٣، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٣٤٨٧ چ/٤}.

**روونكردنەوە:**

سێ نزاكەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەنەس ئەم سێ شتە بوو:

١- خودا ماڵی زۆری پێبدا، وە خۆشی وابوو ئەنەس تەواو دەوڵەمەند بوو بوو.

٢- خودا منداڵی زۆری پێ ببەخشێ، ئەمەشیان دیسان وابوو.

٣- خودا لەگوناهەكانی خۆش بێ لەبەهەشتی بەریندا جێنشینی بفەرموێ، ئەمەشیان خودا یاربێ وادەبێ.

١٦٨٦- عَنْ ثَابِتٌ عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَى عَلَيَّ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَأَنَا أَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ، قَالَ: فَسَلَّمَ عَلَيْنَا، فَبَعَثَنِي إِلَى حَاجَةٍ فَأَبْطَأْتُ عَلَى أُمِّي، فَلَمَّا جِئْتُ، قَالَتْ: مَا حَبَسَكَ؟ قُلْتُ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِحَاجَةٍ، قَالَتْ: مَا حَاجَتُهُ؟ قُلْتُ: إِنَّهَا سِرٌّ. قَالَتْ: لاَ تُحَدِّثَنَّ بِسِرِّ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَحَدًا. قَالَ أَنَسٌ: وَاللَّهِ لَوْ حَدَّثْتُ بِهِ أَحَدًا لَحَدَّثْتُكَ يَا ثَابِتُ. {الحديث: ٦٣٢٨ = ٦٣٣٦ فم. بخاري. إستئذان: ٦٢٨٩}:

ثابیتی بەنانی لە ئەنەسەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەناو منالآندا گەمەم دەكرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، سلاوی لێ كردین و منی نارد بۆ فرمانێ، لەپاشا درەنگ چوومەوە بۆلای دایكم، دایكم فەرمووی: بۆچی وا درەنگت پێ چوو؟ گوتم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردمی بۆ فرمانێ، گوتی: فرمانەكەی چی بوو؟ گوتم: شتێكی نهێنییە، فەرمووی: رازو نهێنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بكەسی تر مەڵێ: ئەنەس فەرمووی: ئەی ثابیت! بەخودا ئەم نهێنییەم ئەگەر بۆ كەسێكی تر بگێڕایەتەوە، بۆ تۆم دەگێڕایەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٣٤٨٨ ج/٤}.

**١٢٨٩) باسی بەهرەو گەورەیی جەعفەری كوڕی ئەبو طالیب و ئەسمائی كچی عومەیس (رەزای خودایان لێ بێ). (٦٣٦٠)**

**بَابُ: فِي فَضَائِلِ جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبِ وَأَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)**

١٦٨٧- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَلَغَنَا مَخْرَجُ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَنَحْنُ بِالْيَمَنِ، فَخَرَجْنَا مُهَاجِرِينَ إِلَيْهِ أَنَا وَأَخَوَانِ لِي أَنَا أَصْغَرُهُمَا، أَحَدُهُمَا

أُبو بُرْدَةَ، وَالآخَرُ أُبو رُهْمٍ، إمَّا قَالَ: بِضْعًا، وَإِمَّا قَالَ: ثَلاَثَةً وَخَمْسِينَ أَوِ اثْنَيْنِ وَخَمْسِينَ رَجُلاً مِنْ قَوْمِي، قَالَ: فَرَكِبْنَا سَفِينَةً فَأَلْقَتْنَا سَفِينَتُنَا، إِلَى النَّجَاشِيِّ بِالْحَبَشَةِ، فَوَافَقْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَأَصْحَابَهُ عِنْدَهُ، فَقَالَ جَعْفَرٌ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَنَا هَا هُنَا وَأَمَرَنَا بِالإِقَامَةِ، فَأَقِيمُوا مَعَنَا. قَالَ: فَأَقَمْنَا مَعَهُ، حَتَّى قَدِمْنَا جَمِيعًا، قَالَ: فَوَافَقْنَا جَمِيعاً رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ، فَأَسْهَمَ لَنَا، أَوْ قَالَ: أَعْطَانَا مِنْهَا، وَمَا قَسَمَ لأَحَدٍ غَابَ عَنْ فَتْحِ خَيْبَرَ مِنْهَا شَيْئًا، إلاَّ لِمَنْ شَهِدَ مَعَهُ، إلاَّ لأَصْحَابِ سَفِينَتِنَا مَعَ جَعْفَرٍ وَأَصْحَابِهِ، قَسَمَ لَهُمْ مَعَهُمْ. قَالَ: فَكَانَ نَاسٌ مِنَ النَّاسِ يَقُولُونَ لَنَا - يَعْنِي لأَهْلِ السَّفِينَةِ - نَحْنُ سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ، قَالَ: فَدَخَلَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ - وَهِيَ مِمَّنْ قَدِمَ مَعَنَا - عَلَى حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زَائِرَةً، وَقَدْ كَانَتْ هَاجَرَتْ إِلَى النَّجَاشِيِّ فِيمَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِ، فَدَخَلَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَلَى حَفْصَةَ وَأَسْمَاءُ عِنْدَهَا. فَقَالَ عُمَرُ حِينَ رَأَى أَسْمَاءَ: مَنْ هذِهِ؟ قَالَتْ: أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ. قَالَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): الْحَبَشِيَّةُ هذِهِ؟ الْبَحْرِيَّةُ هذِهِ؟ فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: نَعَمْ. فَقَالَ عُمَرُ: سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ فَنَحْنُ أَحَقُّ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْكُمْ. فَغَضِبَتْ، وَقَالَتْ كَلِمَةً: كَذَبْتَ يَا عُمَرُ، كَلاَّ وَاللَّهِ كُنْتُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، يُطْعِمُ جَائِعَكُمْ، وَيَعِظُ جَاهِلَكُمْ، وَكُنَّا فِي دَارٍ أَوْ فِي أَرْضِ الْبُعَدَاءِ الْبُغَضَاءِ، فِي الْحَبَشَةِ، وَذلِكَ فِي اللَّهِ وَفِي رَسُولِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَايْمُ اللَّهِ لاَ أَطْعَمُ طَعَامًا وَلاَ أَشْرَبُ شَرَابًا حَتَّى أَذْكُرَ مَا قُلْتَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَنَحْنُ كُنَّا نُؤْذَى وَنُخَافُ، وَسَأَذْكُرُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَسْأَلُهُ، وَوَاللَّهِ لاَ أَكْذِبُ وَلاَ أَزِيغُ وَلاَ أَزِيدُ عَلَى ذَلِكَ. قَالَ: فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ! إِنَّ عُمَرَ قَالَ: كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَيْسَ بِأَحَقَّ بِي مِنْكُمْ وَلَهُ وَلأَصْحَابِهِ هِجْرَةٌ وَاحِدَةٌ، وَلَكُمْ أَنْتُمْ أَهْلَ السَّفِينَةِ هِجْرَتَانِ». قَالَتْ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسَى وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ يَأْتُونِي أَرْسَالاً، يَسْأَلُونِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، مَا مِنَ الدُّنْيَا شَيْءٌ هُمْ بِهِ أَفْرَحُ وَلاَ أَعْظَمُ فِي أَنْفُسِهِمْ، مِمَّا قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسَى، وَإِنَّهُ لَيَسْتَعِيدُ هَذَا الْحَدِيثَ مِنِّي. {الحديث: ٦٣٦٠ =

٦٣٦٩ فم = ف.م = فتح الملهم بِشَرْح صحيح الإمام مسلم، تجريد/ ٤، رقم: ١٥٧٦ = ٤٢٣٠، ٣١٣٦، ٣٨٧٦، ٤٢٣٣، فتح الباري. تحفة الأشراف: ٩٠٥١}:

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەیەمەن بووین خەبەرمان بیست، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەککەوە کۆچی کردووە بۆ مەدینە، جا خۆمو دوو برامو پەنجاو سێ کەسی تر، یا فەرمووی: پەنجاو دوو کەسی تر لە خزمەکانم کۆچمان کرد بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) من بچووکی هەردوو براکانم بووم: کە یەکێکیان ئەبو بەردەو ئەوی تریان ئەبو رەهم بوو، سواری پاپۆڕێ بووین، لە حەبەشە لەلای نەجاشی هەڵی رشتین، وە لەوێ تووشی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیبو هاوڕێکانی بووین.

جەعفەر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێمەی ناردووە بۆ ئێرە، وە فەرمانی پێمانکردووە کە لێرە بمێنینەوە ئێوەیش لەگەڵ ئێمە بمێننەوە، ئیتر ئێمەیش لەوێ ماینەوە، لەگەڵ جەعفەردا، هەتا گشتمان پێکەوە هاتینەوە بۆ مەدینە.

وا رێکەوت کەچووینە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوکاتە بوو کە قەڵای خەیبەری ئازاد کردبوو، جا بەشە پشکی لەتالانی خەیبەر بۆ ئێمەیش دانا، یا گوتی: بەشە پشکی ئێمەشی دالێ، ئەوەی لەکاتی گرتنی قەڵای خەیبەردا لەوێ نەبووبێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشی بۆ دانەناوە، بێجگە لەئێمە، کە تاقمەی پاپۆڕەکە بووین، جگە لە جەعفەرو هاوڕێکانی بەشی ئەوانیشی دانا لەگەڵ ئەوانا، جاهی وا هەبوو پێمانی دەگوت: ئێمە لەکۆچکردندا لەپێش ئێوەوەین، ئەی دەستەی گەمێکە!

فەرمووی: رۆژێ ئەسمای کچی عومەیس کە یەکێك بوو لەدەستەی گەمێکە، دەچێ بۆ سەردانی حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە حەفصەی کچی حەزرەتی عومەرە (رەزای خودایان لێ بێ) ئەسمایش یەکێ بوو لەوانە کە کۆچیان کردبوو بۆلای نەجاشی پاشای حەبەشە، جا عومەریش دەچێ بۆلای حەفصە،

دەڕوانێ ئەسمائی والەلا، بە حەفصەی کچی دەڵێ: ئەم ژنە کێیە؟ دەڵێ: ئەسمائی کچی عومەیسە عومەر دەفەرموێ: ئەمە ئەوەیە کە لەحەبەشە بووەو لەدەریاوە گەڕاوەتەوە بەپاپۆڕ؟ ئەسماء دەڵێ: بەڵێ ئەوم. عومەر دەفەرموێ: ئێمە بۆ کۆچکردن لەپێش ئێوەوەین، کەواتە ئێمە لەئێوە لەپێشترین بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

ئەسمائیش تووڕە دەبێو دەڵێ: درۆت کرد ئەی عومەر! نەخێر، بەخودا وانییە، چونکە ئێوە لەخزمەتی پێغەمبەردا بوونو خۆی سەرپەرشتی کردوونو برسیتانی نانو ئاو داوەو نادانتانی تەمێو ئامۆژگاری کردووە، وەڵێ ئێمە لەحەبەشە بووینو لەدوورە وڵات بووینو، لەناو بێگانانو ناحەزاندا ژیاوین، ئەمەش کەبووەو قەبووڵمان کردووە، هەمووی لەپێناوی ڕەزای خوداو لەپێناوی ئایینی پێغەمبەری ئەودا بووە، جا سوێندبێ بە خودا نەنان دەخۆمو نەئاو دەخۆمەوە هەتا ئەم قسەی تۆیە نەگێڕمەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێمە ئازارو ئەشکەنجە دەدراینو تاڵاومان دەنۆشیو دەترسێنراین، وە ئەمانە هەمووی باس دەکەم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە بەباشی لێی دەپرسم، دەسا بەو خودایە ڕێكو ڕاست عەرزی دەکەم نە درۆی تیا دەکەمو نە ڕاوە ڕێویی، وە نەلێی پتر دەکەم، جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! عومەر واوا دەڵێ. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی تۆ چیت پێ گوت؟). گوتم: واوام پێ گوت.

فەرمووی: ئەو لەئێوە لەپێشتر نییە بەمن، وەبۆ ئەوو بۆ هاوڕێکانی یەك کۆچ هەیە، بەڵام بۆ ئێوە (کە دەستەی گەمێکەن، کە لەحەبەشەوە بەپاپۆڕ گەڕاونەتەوە بۆ مەدینە) دوو کۆچتان بۆ هەیە!).

ئەسماء فەرمووی: ئیتر ئەبو مووساو دانیشتوانی ناو پاپۆڕەکە دەستە دەستە دەهاتن بۆلای منو ئەم فەرموودەیەیان لێ دەپرسیمەوە، شت نییە لەم جیهانەدا کە وەك ئەم موژدەی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا شادمانیان بکاو ئاوا لەدڵیانا گەورەو دڵ خۆشکەرە بێ.

ئـەسماء فـەرمووی: (گـەڵێ جـار ئـەبو مووسـا لەخۆشـییانا ئـەم فەرموودەیـەی دووبـارەو سـێ بـارە پـێ دەگێڕامـەوە!). {تـاج/٣، زنجـیرە: ١٠٢، ژمـارە: ٣١٦٧ چـاپی چوارەم}.

## ١٢٩٠) باسی بەهرەو گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودایان لێ بێ). (٦٢١٦ - ٦٢٢٠)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرِ بْنُ أَبِي طَالِبْ

١٦٨٨- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ تُلُقِّيَ بِنَا، قَالَ: فَتُلُقِّيَ بِي وَبِالْحَسَنِ أَوْ بِالْحُسَيْنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: فَحَمَلَ أَحَدَنَا بَيْنَ يَدَيْهِ، وَالآخَرَ خَلْفَهُ حَتَّى دَخَلْنَا الْمَدِينَةَ. {الحديث: ٦٢١٩ = ٦٢٢٧ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: هـەموو جارێ، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەڕێبواریی (سەفەر) دەهاتـەوە، منـاڵانی کەسوکاری دەچوون بەپیریـەوە، جـارێ لەسـەفەرێ هاتـەوە، لەپێشـدا مـن گەیشـتم پێی، لەبەردەمی خۆیەوە سواری کردم، لەدواییدا یەکێ لەدوو کوڕەکەی فاتیمەشیان هێنا، یا حەسەن، یـا حوسـەینیان هێنـا، ئەویشـی سـواری پاشـکۆی خـۆی کـرد، ئـیتر هەرسێکمان: منو پێغەمبەرو یەکێ لە حەسەنو حوسەین، هەتا چووینە ناو شاری مەدینە، بەسواری ئەو وڵاخە لەسەر ئـەو شـێوەیە ڕۆیشـتین). {تـاج/٣، زنجـیرە: ٢١، ژمارە: ٣٣٨٤ ج/٤}.

١٦٨٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ خَلْفَهُ، فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثًا لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ. {الحديث: ٦٢٢٠ = ٦٢٢٨ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیـب (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: ڕۆژێ خۆشەویسـت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاشـکۆی خۆیـەوە سـواری کـردمو فەرموودەیـەکی بەنهێنی پێی فـەرمووم، بـۆ کەسـی ناگێڕمـەوە). {تـاج/٣، زنجـیرە: ٢٢، ژمـارە: ٣٣٨٥ ج/٤}.

## ١٢٩١) باسی بەهرەو گەورەیی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ). (٦٣١٨)

## (بَابٌ: فِي فَضَائِلِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا))

١٦٩٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَتَى الْخَلاَءَ، فَوَضَعْتُ لَهُ وَضُوءًا، فَلَمَّا خَرَجَ قَالَ: «مَنْ وَضَعَ هذَا»؟ - فِي رِوَايَةِ زُهَيْرٍ: قَالُوا - وَفِي رِوَايَةِ أَبِي بَكْرٍ قُلْتُ: ابْنُ عَبَّاسٍ. قَالَ: «اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدين». {الحديث: ٦٣١٨ = ٦٣٢٦ فم. تجريد/١، رقم: ١١٦ = ١٤٣}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشتە ناو ئاودەست، منیش ئاوی دەسنوێژم بۆیدانا، جا کەهاتە دەرەوەو ئاوەکەی دی فەرمووی: (کێ ئەم ئاوەی داناوە؟) گوتم: من. فەرمووی: (خودایە! شارەزای ئایینی ئیسلامی بفەرموو، وەبیکە بەزانایەکی گەورەی ئایین). {تاج/٣، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٣٣٨٣ چ/٤}.

## ١٢٩٢) باسی بەهرەو گەورەیی عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ). (٦٣١٩ - ٦٣٢٠)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)

١٦٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا أَقُصُّهَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، قَالَ: وَكُنْتُ غُلاَمًا شَابًّا عَزَبًا، وَكُنْتُ أَنَامُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَرَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ، فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ، وَإِذَا لَهَا قَرْنَانِ كَقَرْنَيِ الْبِئْرِ، وَإِذَا فِيهَا نَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ، فَجَعَلْتُ أَقُولُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ، قَالَ: فَلَقِيَهُمَا مَلَكٌ فَقَالَ لِي: لَمْ تُرَعْ، فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ، لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ». قَالَ

سَالِمٌ: فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بَعْدَ ذَلِكَ لاَ يَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ إِلاَّ قَلِيلاً. {الحديث: ٦٣٢٠ = ٦٣٢٨ فم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري بالكوردي، المجلد الأوّل الرقم: ٥٥٩ = ١١٢١، ١١٢٢، ١١٥٧، ٣٧٣٩، ٣٧٤١، ٧٠١٦، ٧٠٢٩، ٧٠٧١ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٥٨٠٥}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران لەژیانی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاو هەبوو خەونی دەبینیو دەیگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منیش بە عەزرەتەوە بووم کە خەونێ ببینم هەتا بیگێڕمەوە بۆی، لەوسەردەمەدا من هەرزەکار بووم ژنم نەهێنابوو، ڕەبەن بووم، لەمزگەوت دەخەوتم، جارێ لەخەوما دیم وادوو فریشتە وەك بمگرنو بمبەن بۆ دۆزەخ وابوو، ئاگرەکەیش، وەك بیری هەڵچنراو، لەناوەوە هەڵچنرا بوو، هەروا دوو شاخەی هەبوو، وەك دوو شاخەی چەرخی سەربیر، کە لەهەردوو تەنیشتی بیرەوە هەن، هەردوو سەری داری چەرخەکەیان دەخرێتە سەر، چەند کەسێکی تیادابوون ناسیمنەوە، ئیتر دەستم کرد بەگوتنی (أعوذ بالله من النَّارِ: پەنا دەگرم بەخودا لەزیانی ئاگر!).

فەرمووی: جا گەیشتین بە فریشتەیەکی تر، بەمنی فەرموو: ترست نەبێ،مەترسە،جا ئەم خەونەم گێڕایەوە بۆ حفصەی خوشکم، کەهاوسەری پێغەمبەر بوو، (درودی خوای لەسەر بێ)، حەفصەیش دەیگێڕتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (عەبدوڵڵای برات پیاوی چاکە، بریا بەشەو شەونوێژی دەکرد) سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عمر(ڕەزای خوادایان لێ بێ) دەیفەرموو: ئیتر لەوەدوا عەبدوڵڵای باوکم بە شەو نەختێك نەبێ، نەدەنوست، هەر خەریکی شەونوێژو شتی وا بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٣٣٩٨ چاپی چوارەم}.

## ١٢٩٣) باسی گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودایان لێ بێ). (٦٢١٦ – ٦٢٢٠)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)

١٦٩٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ لِابْنِ الزُّبَيْرِ: أَتَذْكُرُ إِذْ تَلَقَّيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَا وَأَنْتَ وَابْنُ عَبَّاسٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَحَمَلَنَا وَتَرَكَكَ. {الحديث: ٦٢١٢ = ٦٢٢٤فم، تجريد البخاری = مختصر صحيح البخاری بالكوردی، المجلد الثالث، الرقم: ١٢٥٤ = ٣٠٨٢. تحفة الأشراف: ٥٢٢٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو مولەیکە فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیری فەرموو: ئایا لەیادتە کە منو تۆو ئیبنو عەبباس چووین بەپیری پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەسەفەرێ دەگەڕایەوە؟ فەرمووی: بەڵێ لەبیرمە. عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر فەرمووی: ئەوەبوو ئێمەی هەڵگرتو تۆی هەڵنەگرت، چونکە منو ئیبنو عەبباس، یەکێکمانی خستە پاشکۆیو یەکێکمانی خستە بەردەمی خۆی). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٤٣٩٠}.

## ١٢٩٤) باسی گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ). (٦٢٧٥ – ٦٢٨٩)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)

١٦٩٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مسعود قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «قِيلَ لِي: أَنْتَ مِنْهُمْ». {الحديث: ٦٢٧٥ = ٦٢٨٣ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کە ئەم ئایەتە دابەزی: {لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُواْ إِذَا مَا اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّأَحْسَنُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ - المائدة – ٥/٩٣}:

واتە: گوناحو تاوان نییە لەسەر ئەو کەسانە کە باوەڕو ئیمانیان هێناوە بە ئایینی ئیسلامو کردەوەی باشیان کردووە، لەو شەرابەدا کە خواردوویانەتەوەو لەو

کردەوانەدا، کە کردوویانن، لەپێش ئەوەدا کە ئەو شتانە حەرام بن، بەمەرجی ئەوە کە ئیمڕۆ لەسەر ئەو ئیمانە مابن‌و خۆیان بپارێزن، لەو شتانە، کە ئیسلام قەدەغەی کردوون‌و، مادەم بەردەوام بن لەسەر کردنی کردەوەی چاکەو، پاش ئەوەیش لەخودا بترسن‌و پیشەو کارو کردەوەیان چاکەبێ، دیارە چاکەکەرانیش دوورن لەخراپە، خەڵاتی پیاو چاکان‌و چاکەکەرانیش ئەوەیە کە خودای گەورە خۆشی دەوێن).

فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە هات حەزرەت پێی فەرمووم: (ئەی عەبدوڵلا! پێم گوترا: کەتۆ یەکێکیت لەمانە کە لەم ئایەتەدا باسکراون). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٣٤٠٦ چ/٤}.

١٦٩٣ب- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمْتُ أَنَا وَأَخِي مِنَ الْيَمَنِ فَكُنَّا حِينًا وَمَا نُرَى ابْنَ مَسْعُودٍ وَأُمَّهُ إِلاَّ مِنْ أَهْلِ بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ كَثْرَةِ دُخُولِهِمْ وَلُزُومِهِمْ لَهُ. {الحديث: ٦٢٧٦ = ٦٢٨٤ فم. بخاري. فضائل الصحابة: ٣٧٦٣، ٤٣٨٤. ترمذي. مناقب: ٣٨٠٦، تحفة الأشراف: ٨٩٧٩}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ خۆم‌و براکەم لەیەمەنەوە کۆچمان کرد بۆ حەبەشەو لەویشەوە کۆچمان کرد بۆ مەدینە، تاماوەیەکی زۆریش، وامان دەزانی کە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودو دایکی، لەکەسوکارو خاوو خێزانی پێغەمبەرن، ئەوەندە بەگەرمی هاموشۆی ماڵی پێغەمبەریان دەکردو ئەوەندە پەیوەندیو تێکەڵییان بەهێز بوو). {بۆ ڕوونکردنەوەی تەواو، سەبارەت بە کۆچکردنی ئەبو مووساو براکانی بڕوانە ژمارە: ١٦٨٧، لەزنجیرە: ١٢٨٩ لەپێشەوە}.

١٦٩٤- عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ قَالَ: كُنَّا فِي دَارِ أَبِي مُوسَى مَعَ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ عَبْدِ اللَّهِ، وَهُمْ يَنْظُرُونَ فِي مُصْحَفٍ، فَقَامَ عَبْدُ اللَّهِ، فَقَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: مَا أَعْلَمُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَرَكَ بَعْدَهُ أَعْلَمَ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ هَذَا الْقَائِمِ. فَقَالَ أَبُو مُوسَى: أَمَا لَئِنْ قُلْتَ ذَاكَ لَقَدْ كَانَ يَشْهَدُ إِذَا غِبْنَا، وَيُؤْذَنُ لَهُ إِذَا حُجِبْنَا. {الحديث: ٦٢٨٠ = ٦٢٨٨ فم}:

ئـەبول ئـەحوەص فـەرمووی: رۆژێ لـەماڵی ئـەبو مووسـای ئەشـعەری بـووین، کۆمـەڵێ بـووین لـەهاوەڵانی عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعوود، لەوکاتـەدا موتـاڵای قورئانێکیان دەکرد، لەوکاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود هەڵسا راوەستا.

ئـەبو مەسـعوود فـەرمووی: بـەپێی زانیـاریی مـن، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لەپاش مەرگی خۆی، قورئان زانێکی تری وەك عەبدوڵڵای کوری مەسعوودی بـەجێ نەهێشتووە، کە ئێستا والەوێدا راوەستاوە!

ئـەبو مووسـایش بـۆ پشـتیوانی شـایەتییەکەی ئـەو، فـەرمووی: دەی مـادەم تـۆ وادەڵێیـت، بـامن هـۆی ئـەوەت بـۆ روون بکەمـەوە: عەبـدوڵڵا ئامـادەی خزمـەتی پێغەمبەر دەبوو، لەوکاتانـەدا کـە ئێمـە نائامـادە بـووین، هـەروا مۆڵـەتی عەبـدوڵڵا دەدرا، کەبچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر، بەڵام مۆڵەتی ئێمە نەئەدرا).

١٦٩٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مسعود أَنَّهُ قَالَ: (وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَـلَّ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ). ثُمَّ قَالَ: عَلَى قِرَاءَةِ مَنْ تَأْمُرُونِي أَنْ أَقْرَأَ؟ فَلَقَدْ قَرَأْتُ عَلَـى رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) بِضْعًا وَسَبْعِينَ سُورَةً، وَلَقَدْ عَلِمَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) أَنِّـي أَعْلَمُهُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ، وَلَوْ أَعْلَمُ أَنَّ أَحَدًا أَعْلَمُ مِنِّي لَرَحَلْتُ إِلَيْهِ. قَالَ شَـقِيقٌ: فَجَلَسْـتُ فِـي حَلَقِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَمَا سَمِعْتُ أَحَدًا يَـرُدُّ ذَلِـكَ عَلَيْـهِ أَوْ يَعِيبُـهُ. {الحديث: ٦٢٨٢ = ٦٢٩٠ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٧٢٦ = ٥٠٠٠}:

عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعوود (رەزای خـودای لێ بێ) ئـەم ئایەتـەی بەبۆنـەی ئـەوەوە کـە قورئانەکەی خۆی نەدا بە عوثمانو شاردیەوە لێـی، لـەکاتی جـەمعی قورئانـدا، بـەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ – آل عمـران – ٣/١٦١}:

واتە: وە هەرکەسێ دەست پیسی لەشتێ بکا، لەرۆژی قیامـەتا، دەینـێ بەنـەڕەی شانیەوەو دەیهێنێ بۆ مەیدانی لێپرسینەوە). {بڕوانـە: تـاج/٤، زنجیرە: ٦٨ ئایـەتی یەکەم لەپێش ژمارە: ٤٥٣٠ دا + تاج/٤، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٧٨٢ ج/٤ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٢٤٥٧ ج/٤}.

ئـەوجا عەبـدوڵلا فـەرمووى: ئێـوە دەتانـەوێ لـەمن كـە بـەپێى قیرائـەتى كـێ قورئان بخوێنم‌و شێوە قورئان خوێندنى خۆم كە لە پێغەمبـەرم وەرگرتـووە، وازى لێ بهێنم؟ دەى بـەبێ گومـان مـن حـەفتاو ئەوەنـدە سوورەتم لەخزمـەتى حـەزرەت خۆیـدا (دروودى خوداى لەسەر بێ) خوێندووە، بێگومان كـە یـاران‌و هـاوەڵانى موحەممـەد (دروودى خوداى لەسەر بێ) خۆیان باش باش دەزانـن كـەمن لەگشتیان باشـتر لـەقورئان تـێ دەگـەم‌و لەگشتیان باشتر شارەزام لە قورئانى پیرۆز كەنامەو پەڕاوى خودایـە، خـۆش ئەگـەر بشزانم كـە یـەكێك هەیـە لـەخۆم زانـاتر، كـۆچ دەكـەم بـۆ خزمـەتى، تـا لێـى فێـرى زانست ببم.

شـەقیق دەیگـوت: خـۆم لـەكۆڕى یـارانى موحەممـەددا (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) گـەڵێ دانیشتووم، نەم بیسـتووە كـە كەسـێ ئـەم قسـەیەى ئیبنـو مەسـعوود ڕەت بكاتـەوە، یاخود نەنـگ‌و خراپەى لێ بگرێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٣٤٠٨}.

١٦٩٦- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) فَذَكَرْنَا حَدِيثًا عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَقَالَ: إِنَّ ذَاكَ الرَّجُلَ لاَ أَزَالُ أُحِبُّهُ بَعْدَ شَيْءٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُهُ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ: مِنِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ، فَبَدَأَ بِهِ، وَمِنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَمِنْ سَالِمٍ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ وَمِنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ». {الحديث: ٦٢٨٥ = ٦٢٩٣ فم. تجريد/٣، رقم: ١٤٧٩ = ٣٧٥٨، ٣٧٦٠، ٣٨٠٦، ٤٩٩٩}:

مەسـرووق (ڕەحمەتى خوداى لێ بێ) فـەرمووى: لـەلاى عەبـدوڵلاى كوڕى عـەمرى كـوڕى عـاص بـووین، باسـى عەبـدوڵلاى كـوڕى مەسـعوود كـرا، فـەرمووى: ئـەوەتى ئـەم فەرمایشتەم لە پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) بیستووە ئـیتر ئـەو پیـاوەم خـۆش دەوێ، گوێم لێ بـوو خۆشەویسـت (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەیفـەرموو: (لـەلاى ئـەم چـوار كەسـە فێرى قورئان ببن‌و دەرسى قورئان بخوێنن: لەلاى عەبدوڵلاى كوڕى مەسعوود، كە ناسراوە بە (ئیبنو ئوم عەبد)و لەلاى ئوبەییەى كوڕى كەعب‌و لەلاى سالمى بەندەى ئازادكراوى ئەبو حوذەیفەو لەلاى موعاذى كوڕى جەبەل!). فەرمووى:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکەم کەس کەناوی هێنا لەم چوار کەسە، ناوی ئیبنو مەسعوودی هێنا، بۆ گرنگی پێدانی زیاتر). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٣٤٠١ چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

سالم کە ناسراوە بە (سالمی بەندەی ئازادکراوی ئەبو حوذەیفە) یەکێکە لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکان، خەڵکی إصطخر بوو، لەوڵاتی فارس، لە هاوەڵە گەورەو ناسراوەکانی پێغەمبەر بووە، مامۆستایەکی قورئان زانی گەورە بووە، لە قوباء پێشنوێژی بۆ کۆچکاران دەکرد، بەرلەوە پێغەمبەر کۆچ بکا بۆ مەدینە، لەگەڵ کۆمەڵێکا، کە یەکێکیان عومەری کوڕی خەطاب بوو، لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، لەڕێگە سالم بەرنوێژیی بۆیان دەکرد، چونکە لەهەموویان زیاتر قورئانی لەبەربوو، عومەری کوڕی خەتاب، زیادەڕەوی دەکرد لەوەسپی سالمدا، لەکاتی بەستنی پەیمانی برایەتی لەنێوان موسوڵماناندا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بەبرای موعاذی کوڕی ماعیض، ئیمامی عومەر فەرمووی: (ئەگەر سالم ئێستا بمایە، ئەوم دەکرد بەجێنشینو جێنشینیم نەدەکرد بەشوراو بەڕاوێژ).

ئەبو حوذەیفە لەپێش ئیسلاما سالمی کردبوو بە کوڕی خۆی، دوایی ئیسلام تەبەننی حەرام کرد، پێغەمبەر فەرمانی کرد بە سەهلەی ژنی ئەبو حوذەیفە کەشیر بدا بەسالم، هەتا ببێ بەکوڕی شیرییان. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٤٨ = ٥٠٨٨، ٤٠٠٠ فتح الباری}.

ئەبو حوذەیفە برازایەکی خۆی لێ مارەکرد، ناوی فاطیمەی کچی وەلید بوو، لە مەسجیدی قەباء سالم بەرنوێژیی بۆ کۆچکاران دەکرد، کە ئەبوبەکرو عومەریشیان تیادا بوو، جارێ سالم بەشەو، بە دەنگێکی خۆشی سازگار قورئانی دەخوێند، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لێ گرتو فەرمووی: (سوپاس بۆ خودا کەپیاوی وەك سالمی لە ئۆمەتی منا داناوە!).

مامۆستای عەسقەلانی لە ئیصابەدا دەفەرموێ: پیاوانی رشتەی ئەم فەرموودەیە، هەموویان جێگەی متمانەن‌و متمانەدارن.

لەڕۆژی شەڕی یەمامەدا، ئالای کۆچکاران لەلای سالم بوو، لەم لایەنەوە قسەکرا لەگەڵیا، سالم فەرمووی: (ئەگەر وەك ئەمانە دەڵێن، ئەگەر لەم جەنگەدا زۆرم بۆ هات من هەڵدێم، ئەوە واتای وایە کەمن حامیل قورئانێکی زۆر خراپم!).

جا لەکاتی جەنگیندا دەستی راستی بەشمشێر پەڕی، بەدەستی چەپی ئالاکەی هەلگرت، دەستی چەپیشی بە شمشێر پەڕی، ئالاکەی بەهەردوو قۆڵی گرتە باوەشی، کاتێ کەوتە گیانەلا، فەرمووی: ئەبو حوذەیفە کوژراوە لەم شەڕەدا، یاماوە؟

عەرزیانکرد: کوژراوەو شەهید بووە، فەرمووی: تەرمەکەم لەپاڵ تەرمەکەی ئەودا دابنێن، ساڵی دوازدەی کۆچی شەهیدبوون، لەشەڕی یەمامەدا. ئیمامی عومەر کەلەپوورو میراتەکەی نارد بۆ ئازادکەرەکەی، کەژنی ئەبو حوذەیفە بوو، کە هەوێی سەهلەی کچی سوهەیلی عامیری بوو، کەناوی ثوبەییە بوو، چونکە بەپێی یاسای وەلاو سەرداری مردوو، ئەگەر میراتبەری تری نەبوو، کەلەپوورەکەی هی ئازادکەرەکەیەتی، بەلام ثوبەییە کەلەپوورەکەی وەرنەگرت‌و فەرمووی: من بۆ خودا ئازادم کردووە، بەتەمای هیچ شتێ ئازادم نەکردووە، جا عومەر کەلەپوورەکەی سالی دا بە بەیتولمال.

بۆ ژیاننامەی ئیبنو مەسعوود {بڕوانە: ژمارە: ٣٥ لەم پەڕاوە پیرۆزە}. بۆ ژیاننامەی موعاذی کوڕی جەبەل {بڕوانە: ژمارە: ١١١٣}. بۆ ژیاننامەی ثوبەییەی کەعب {بڕوانە: ژمارە: ٢٤٢}.

## ١٢٩٥) باسی گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام (رەزای خودای لێ بێ). (٦٣٠٤ - ٦٣٠٧)

### بابٌ: في فضائل عبدِ اللّه بْنِ عُمرَ بْنُ حَرام (رضيَ اللّهُ عنهُ)

١٦٩٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: أُصِيبَ أَبِي يَوْمَ أُحُدٍ، فَجَعَلْتُ أَكْشِفُ الثَّوْبَ عَنْ وَجْهِهِ وَأَبْكِي، وَجَعَلُوا يَنْهَوْنَنِي، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَنْهَانِي، قَالَ: -

وَجَعَلَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ عَمْرٍو تَبْكِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «تَبْكِيهِ أَوْ لاَ تَبْكِيهِ، مَا زَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رَفَعْتُمُوهُ». {الحديث: ٦٣٠٥ = ٦٣١٣ فم = ف.م = فتح الملهم بشرح صحيح الامام مسلم. تجريد البخاري، الترجمة الكردية، المجلّد الثاني الرقم: ٦٠٢ = ١٢٤٤، ١٢٩٣، ٢٨١٦، ٤٠٨٠. نسائي. جنائز: ١٨٤٤. تحفة الأشراف: ٣٠٤٤}:

جابير (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای ئوحوددا باوكم كوژرا، كاتێ لاشەكەیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لووتو گوێیان كردبوو، منیش چووم سەریم هەڵدایەوەو دەستم كرد بەگریان بۆی!

خزمان نەیاندەهێشت بۆیبگریم، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەرچی ئاگای لێم بوو، بەڵام قەدەغەی لێ نەكردمو ڕێی لێ نەگرتم كە بۆی بگریم، تا فاتیمەی كچی عەمر، كە خوشكی باوكم بوو، وە پووری باوكیم بوو، هاتە سەر تەرمەكەو دەستی كرد بەگریان بۆی.

ئەوسا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆی بگریتو بۆی نەگریت ئەی فاتیمە! بۆ عەبدوڵلای برات چون یەكە، چونكە ئەو بەپایەی شەهیدیی گەیشتووە، بەپایەو شانی خۆی شادبووە، ئەو لەلای خودا ئەوەندە بەقەدرو بەڕێزە، فریشتەی ڕەحمەت بە باڵیان سێبەریان بۆی كردبوو، تا لەخۆرەتاوەكە بیپارێزنو تا لاشەكەی تێك نەچێت، وەگیانی پاكو پیرۆزی بەرزەوە بكەن بۆ ئاسمان، ئەمە حاڵیان بوو هەتا ئەوكاتەی كە لەسەر تاتەشۆڕەكە هەڵتان گرت). {تاج/٣، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٣٤٨٢ ج/٤}.

**ڕوونكردنەوە:**

عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی حەرام، باوكی جابیری كوڕی عەبدوڵلا، ئامادەی غەزای بەدر بووە، لەغەزای ئوحوددا كوژراو شەهیدكرا، كافرەكان لەشیان شێواندبوو، لووتو گوێو دەستو پایان كردبوو، لەپەیمانی عەقەبەدا یەكێك بوو لە نوقەباكان. لەپاش شەهیدبوونی كەرامەتی لێ بینراوە، لەپاش چلو شەش ساڵ،

لافاو گۆڕەکەی دەرخست، کە لاشـەکەیان گواسـتـەوە وەك خـۆی مـابوو، وەك دوێنـێ نێژرابێ وابوو، هەروا لاشەی عەمری کوڕی جەمووحیش لەگەڵ ئەودا لەیەك گۆڕدا بـوون، ئـەویش وەك خـۆی مـابوو، یـەك دەنـك نـەگۆڕابوو، یـەکێکیان لـەکاتی ناشـتنەکەیدا، دەسـتێکی لەسـەر برینەکـەی بـوو، ویسـتیان دەسـتی لابـەن لەسـەر برینەکەیو لەتەنیشتی تەرمەکەیـەوە دەسـتی رکێشـن، کـەوایان لێ کـرد، دەسـتەکە وەك جاران رۆیشتەوە سەر شوێن برینەکەیو لەوێ لەسەر برینەکە راوەستا.

**١٢٩٦) باسی گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (رەزای خودای لێ بێ).** (٦٣٣٠ - ٦٣٣٣)

**بَابٌ: فِي فَضَائِلِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)**

١٦٩٨- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ لِحَيٍّ يَمْشِي: (أَنَّهُ فِي الْجَنَّةِ إِلاَّ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلاَمٍ). {الحديث: ٦٣٣٠ = ٦٣٣٨ فم = ف.م = فتح الملهم بِشَرْحِ صحيح الامام مسلم. تجريد البخاري بالكوردي، المجلد الرّابع الرقم: ١٤٩٦ = ٣٨١٢. تحفة الأشراف: ٣٨٧٩}:

ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا بەکوردی، ئاوایـە دەیکـەین بەڕاڤـەی ئێرە:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لـە پێغەمبـەرم نەبیستووە بەکەسێ کەهێشتا لـەژیانا بـێو لەسـەر رووی زەوی بگـەڕێ، پێـی بفـەرموێ: ئـەم کەسـە بەهەشـتییە، جگـە لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی سـەلام، بـەوی فـەرموو عەبـدوڵڵا بەهەشتییە.

فەرمووی: ئەم ئایەتەیش دەربـارەی عەبـدوڵڵا هاتـە خـوارەوە، کـە دەفـەرموێ: {وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ – النساء – ٤/١٠}:

واتـە: شـایەتێکی راسـتگۆی قسـە رەوای وا کـەخودای گـەورە رێـزو بایـەخی بـۆ شـایەتییەکەی دانـاوە، کـە لەنـەوەی یـەعقوب پێغەمبـەر، کـە ناسـراون بـە بـەنی ئیسـرائیل، شـایەتی دا لەسـەرئەوە کـە ئـەم قورئانـە فـەرموودەی خودایـە، نامـەو پەڕاوی نێردراوی خودایە). {تاج/٣، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ٣٥١٦}.

١٦٩٩- عَنْ خَرَشَةَ بْنِ الْحُرِّ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا فِي حَلْقَةٍ فِي مَسْجِدِ الْمَدِينَةِ، قَالَ: وَفِيهَا شَيْخٌ حَسَنُ الْهَيْئَةِ وَهُوَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ، قَالَ: فَجَعَلَ يُحَدِّثُهُمْ حَدِيثًا حَسَنًا، قَالَ: فَلَمَّا قَامَ، قَالَ الْقَوْمُ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا، قَالَ: فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لأَتْبَعَنَّهُ فَلأَعْلَمَنَّ مَكَانَ بَيْتِهِ، قَالَ: فَتَبِعْتُهُ، فَانْطَلَقَ حَتَّى كَادَ أَنْ يَخْرُجَ مِنَ الْمَدِينَةِ، ثُمَّ دَخَلَ مَنْزِلَهُ. قَالَ: فَاسْتَأْذَنْتُ عَلَيْهِ، فَأَذِنَ لِي، فَقَالَ: مَا حَاجَتُكَ يَا ابْنَ أَخِي؟ قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: سَمِعْتُ الْقَوْمَ يَقُولُونَ لَكَ لَمَّا قُمْتَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا، فَأَعْجَبَنِي أَنْ أَكُونَ مَعَكَ، قَالَ: اللَّهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ، وَسَأُحَدِّثُكَ مِمَّ قَالُوا ذَاكَ، إِنِّي بَيْنَمَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ أَتَانِي رَجُلٌ فَقَالَ لِي: قُمْ، فَأَخَذَ بِيَدِي، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، قَالَ: فَإِذَا أَنَا بِجَوَادَّ عَنْ شِمَالِي. قَالَ: فَأَخَذْتُ لآخُذَ فِيهَا، فَقَالَ لِي: لاَ تَأْخُذْ فِيهَا فَإِنَّهَا طُرُقُ أَصْحَابِ الشِّمَالِ، قَالَ: وَإِذَا جَوَادٌّ مَنْهَجٌ عَلَى يَمِينِي، فَقَالَ لِي: خُذْ هَا هُنَا. قَالَ: فَأَتَى بِي جَبَلاً، فَقَالَ لِي: اصْعَدْ. قَالَ: فَجَعَلْتُ إِذَا أَرَدْتُ أَنْ أَصْعَدَ خَرَرْتُ عَلَى اسْتِي. قَالَ: حَتَّى فَعَلْتُ ذَلِكَ مِرَارًا. قَالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ بِي حَتَّى أَتَى بِي عَمُودًا رَأْسُهُ فِي السَّمَاءِ وَأَسْفَلُهُ فِي الأَرْضِ فِي أَعْلاَهُ حَلْقَةٌ، فَقَالَ لِيَ: اصْعَدْ فَوْقَ هَذَا. قَالَ: قُلْتُ: كَيْفَ أَصْعَدُ هَذَا وَرَأْسُهُ فِي السَّمَاءِ؟ قَالَ: فَأَخَذَ بِيَدِي فَزَجَلَ بِي. فَقَالَ: فَإِذَا أَنَا مُتَعَلِّقٌ بِالْحَلْقَةِ، قَالَ: ثُمَّ ضَرَبَ الْعَمُودَ فَخَرَّ، قَالَ: وَبَقِيتُ مُتَعَلِّقًا بِالْحَلْقَةِ حَتَّى أَصْبَحْتُ، قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَصَصْتُهَا عَلَيْهِ، فَقَالَ: «أَمَّا الطُّرُقُ الَّتِي رَأَيْتَ عَنْ يَسَارِكَ فَهِيَ طُرُقُ أَصْحَابِ الشِّمَالِ». قَالَ: «وَأَمَّا الطُّرُقُ الَّتِي رَأَيْتَ عَنْ يَمِينِكَ فَهِيَ طُرُقُ أَصْحَابِ الْيَمِينِ، وَأَمَّا الْجَبَلُ فَهُوَ مَنْزِلُ الشُّهَدَاءِ وَلَنْ تَنَالَهُ، وَأَمَّا الْعَمُودُ فَهُوَ عَمُودُ الإِسْلاَمِ، وَأَمَّا الْعُرْوَةُ فَهِيَ عُرْوَةُ الإِسْلاَمِ، وَلَنْ تَزَالَ مُتَمَسِّكًا بِهَا حَتَّى تَمُوتَ». {الحديث: ٦٣٣٣ = ٦٣٤١ فم}:

خەرەشەی کوڕی ئەلحوڕ فەرمووی: لەناو ئەڵقەیەکا، لەمزگەوتی مەدینە دانیشتبووم. فەرمووی: پیرە مێردێکی شێوە شیرین لەناویانا دانیشتبوو، کە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بوو.

فەرمووی: پیرە مێردەکە قسەی جوان جوانو فەرموودەی جوان جوانی باس دەکرد بۆیان.

فەرمووی: جا کەهەڵسا، دانیشتوانی کۆڕەکە گوتیان: هەرکەسێ حەزدەکا کە بەچاوی سەر لەجیهانا تەماشای پیاوێکی بەهەشتی بکا، با تەماشای ئەم پیرە مێردە بکا. فەرمووی: گوتم: بەخودا دەبێ شوێنی بکەوم، هەتا شوێنیماڵەکەی دەزانم، فەرمووی: جا شوێنی کەوتم، رۆیشت هەتا خەریکبوو لەمەدینە دەربچێ، تاچووە ناو ماڵەکەی.

فەرمووی: منیش مۆڵەتم خواست کەبچم بۆ خزمەتی، مۆڵەت درام. فەرمووی: ئەی برازای خۆم ئیشت بەمن هەیە، چییە بفەرموو؟ عەرزیم کرد: ئەو خەڵکەی لە کۆڕەکەدا لەخزمەتتا دانیشتبوون لەمزگەوت، کەتۆ هەڵسایتو رۆیشتیت گوتیان بەتۆ: هەرکەسێ حەزدەکا، باتەماشای ئەم پیرە مێردە بکا).

جا منیش بەم بۆنەیەوە هاتووم بۆ خزمەتت.

فەرمووی: خودا خۆی زۆر باش دەزانێ کێ بەهەشتییە، دەی باهۆی ئەوەت پێ بڵێم، کە ئەوانە بۆ وایان گوتووە: شتەکە خۆی ئاوابوو: جارێ خەوتبووم لەخەوما پیاوێ هات بۆلام، پێی گوتم: هەڵسە سەرپێ، منیش هەڵسامە سەرپێو دەستی گرتمو لەگەڵیدا رۆیشتم، تەماشام کرد واجادە گەلێك وا لەلای چەپمەوە، ویستم کە ئەو رێگەیانە بگرم، پیاوەکە فەرمووی پێم: ئەم رێگەلە مەگرەو بەو رێگەیانەدا مەڕۆ، ئەوانە رێگەی چەپڕەوانن رێگە گەلی یارانی دەستە چەپن فەرمووی: کە تەماشام کرد وا لەلای راستمەوە شەقامە رێگەیەك هەیە، لەخەوما پیاوەکەی لەگەڵما بوو فەرمووی پێم: ئالێرەوە بڕۆ بەم شەقامە رێگەیەدا کەوا لەلای راستتەوە.

فەرمووی: جابردمی بۆلای کێوێ، فەرمووی پێم: بەم کێوەدا سەرکەوە، فەرمووی: جا هەرخەریکبووم بەکێوەکەدا هەڵزنێم، کەچی دەکەوتم بەپشتاو دەخزام، فەرمووی: چەند جارێ ئەم هەوڵەم دووبارە کردەوە. فەرمووی: ئەوجا لەگەڵی رۆیشتم هەتا بردمیە لای کۆڵەکەیەك، سەری لە ئاسمان بوو، بنەکەی لەزەوی بوو، بە نووچکەکەیەوە قولفەیەك هەبوو، فەرمووی پێم: ئادەی بەم

کۆڵەکەیەدا سەرکەوە سەرێ! گوتم: چۆن بەمەدا سەرکەوم، ئەو نووچکەکەی وا لەحەوا، سەری وا لەئاسمان؟

فەرمووی: جا دەستی گرتمو هەڵی دام، کاتێکم زانی خۆم بە ئەڵقەکەدا هەڵواسیوە، دوایی دای لە کۆڵەکەکە، کۆڵەکەکە کەوت، بەڵام هەتا بەیانی لەخەوما دەستم بە قوڵفەکەوە بوو.

فەرمووی: جا چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم خەونەم بەتەواوی گێڕایەوە بۆی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ):

(ئەو ڕێگایانەی کەدیت لەلای چەپتەوە بوون، ئەوانە ڕێگە گەلی (أصحاب الشِّمَال)ن، کە لەقورئاندا ئاوا وەصفیان کراوە: {وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ - الواقعة – ٥٦/ ٤١ - ٤٢}:

ئەو ڕێگایانەیش کەدیت لەلای ڕاستتەوە بوون، ئەوانە ڕێگە گەلی (أَصْحَابُ اليَمِينَ)ن، کە لەقورئاندا ئاوا وەسپو مەدحیان کراوە: {وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ، فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ، وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ، وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ – ٥٦/ ٢٨ - ٣١}.

ئەو کێوەیش کە دیتو نەتوانی بچیتە سەری، ئەوە پلەو پایەی شەهیدییە، تۆ نایگەیتیو بەمردنی خودا دەمریت، ئەو کۆڵەکەیەیش ستوونی ئیسلامە، ئەو قوڵفەی کە بەسەر سەری کۆڵەکەکەوە بوو، ئەوە قوڵفەی قایمی ئیسلامە، ئەی عەبدوڵڵا تۆ لەسەر ئیسلامەتی دەمریتو دەست بە عوروەتول ووثقا دەگریت تامردن). {تاج/٣، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ٣٥١٧ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (ڕەزای خودای لێ بێ) لەڕەگەزی جوولەکەیە، یەکێکە لە هاوەڵە مەزنەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی کۆچی کرد لەمەککەی پیرۆزەوە بۆ مەدینەی نازدار، عەبدوڵڵا موسوڵمان بوو (بۆ چیرۆکی موسوڵمان بوونی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی، ژمارە: ١٣٣٧، بەرگی چوارەم، فەتحولباری، ژمارە: ٣٣٢٩).

لەپێشا عەبدوڵڵا زانایەکی گەورەی جوولەکە بوو، لەنەوەی پێغەمبەر یوسفی کوڕی پێغەمبەر یەعقوبە (دروودی خودایان لەسەر بێ)، کاتێ ئیسلام بوو ناوی حوصەین بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوەکەی گۆڕیو ناوی نا: عەبدوڵڵا.

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام یەکێکە لەدە هاوەڵە موژدەی بەهەشت پێ دراوەکان، کە ناسراون بە عەشەرەی موبەششەرە، دوو کوڕی خۆی کە ناویان یوسفو موحەممەد بوو، فەرموودەکانی ئەویان گێڕایەوە، دوو فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، لەسەر فەرمایشتی موقەددیمەی فەتحولباری.

عەبدوڵڵا ئامۆژگاری ئیمامی عەلی کرد: کە دوانگەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە بەجێ نەهێڵێو نەچێت بۆ عێراق، وە عەرزیکرد: (ئەم دوانگەیە بەجێ بهێڵی جارێکی تر نایبینیتەوە). وە خۆشی وابوو، کە عەلی مەدینەی بەجێ هێشت هەتا شەهیدبوو نەگەڕایەوە بۆی.

بەکۆی دەنگ: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (رەزای خودای لێ بێ) لەساڵی چلو سێی کۆچیدا، لەشاری مەدینە بەمەرگی خودا مردووە!).

کۆمەڵێ فەرموودە لە مەتحی عەبدوڵڵادا هەیە، زۆریان لەتاجول ئوصولدا هەیە، {بڕوانە: تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی سێیەم، زنجیرە: ٦١، لەژمارە: ٣٥١٦ وە هەتا ژمارە: ٣٥٢٠. چاپی چوارەم}.

## بەشی سێیەم لە لیستو ناوی ئەو هاوەڵو کەسانەی کە لەژمارە (١٥٣٦)ەوە دەست پێ دەکەن

| ژمارەی زنجیرەیی | ناوی خاوەن ژیاننامە یا بابەت | ژمارەی فەرموودەکە |
|---|---|---|
| - | یادی مەلا جەبار لە مستشفی کرکوك العسکری | ١٥٣١ |
| ١٩٤ | عبدالرحمنی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق | ١٥٣٣ |
| ١٩٥ | ابوبەکری صەدیق | ١٥٣٣ |
|  | کەرامەتێکی ئوم مالیك | ١٥٣٦ |

**١٢٩٧) باسی گەورەیی سەعدی کوڕی موعاذ** (رەزای خودای لێ بێ).(٦٢٩٥ - ٦٣٠٢)

**بَابٌ: فِي فَضَائِلِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)

١٧٠٠- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَنَازَةُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ: «اهْتَزَّ لَهَا عَرْشُ الرَّحْمَنِ». {الحديث: ٦٢٩٥ = ٦٣٠٣ فم = ف.م = فتح الملهم بِشَرْحِ صحيح الامام مسلم. تجريد البخارى المسمى بمختصر صحيح البخارى، المجلد الرابع الرقم: ١٤٩٢ = ٣٨٠٣ فتح البارى} :

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: تەرمەكەی سەعدی كوڕی موعاز لەبەردەممانا دانرابوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: تەختو بارەگای خودای میهرەبان بۆی كەوتە لەرزەو بۆی خورۆشاوە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٣٤٦٧ چ/٤ = چاپی چوارەم + تاج/١، زنجیرە: ٢٢٤، ژمارە: ١١٥٤ چ/٤} = (پرسیارو وەڵامی ناوگۆڕو سزای گۆڕ).

گێڕانەوەی تاج لەبەرگی یەكەما ژمارە: (١١٥٤) ئاوایە:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئائەم سەعدی كوڕی موعازە، كە تەختو بارەگای مەزنی خودای گەورە، بۆ مەرگی هاتە جەمو جووڵو خرۆشو دەرگاكانی ئاسمانی، بۆ پێشوازی لێی، خرانە سەر پشتو حەفتا هەزار فریشتە هاتنە دیدەنیو دیاری، لەكاتی سەرە مەرگیداو لەكاتی بەرێكردنی تەرمەكەیدا، ئائەم سەعدە كە ئەمە پلەو پایەیەتی لەلای خودا، لەگەڵ ئەوەش دا، گۆڕەو شارێكی وەها وەها درا، كە پەراسووی راستو پەراسووی چەپی تێك پەڕاند، ئاوا بەتوندی گوشی، بەڵام لەپاشا رزگاری بوو). {تاج/٣/٥٧٣ چ/٤ — ن/ش} .

١٧٠١- عَنْ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حُلَّةُ حَرِيرٍ، فَجَعَلَ أَصْحَابُهُ يَلْمُسُونَهَا، وَيَعْجَبُونَ مِنْ لِينِهَا، فَقَالَ: «أَتَعْجَبُونَ مِنْ لِينِ هَذِهِ؟ لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْهَا وَأَلْيَنُ». {الحديث: ٦٢٩٨ = ٦٣٠٦ فم. بخاري. مناقب الأنصار: ٣٨٠٢. تحفة الأشراف} :

بەرائی كوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوكەیدیری دەومەتولجەندەل، قاتێ جلی ئاورێشمینی بەدیاریی هێنا بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئێمەیش دەستمان لێ دەخشانو پێمان سەیربوو كە ئەوەندە نەرمە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەیرتان لە نەرمیو سفتی ئەم جلە دێ؟) گوتمان: بەڵێ. فەرمووی: (دەستە سڕەكانی سەعدی كوڕی موعاز لەبەهەشتا لەمە باشترو نەرمترن!).

{تاج/٣، زنجيره: ٢٩، ژماره: ٢٧٦٢ ج/٤} + {تاج/٤، زنجيره: ٦٦، ژماره: ٤٥٢٥. چاپی چوارەم = باسی سەرانە}.

## ١٢٩٨) باسی گەورەیی ئەبو طەلحەی ئەنصاریو ئوم سولەیمی هاوسەری (ڕەزای خودایان لیٚ بیٚ). (٦٢٦٩ - ٦٢٧٤)

## بَابٌ: فِي فَضَائِلِ أَبِى طَلْحَةَ الأَنْصَارِي وَأمْرَأتهُ أمِّ سُلَيْمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)

١٧٠٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): مَاتَ ابْنٌ لأَبِى طَلْحَةَ مِنْ أُمِّ سُلَيْمٍ، فَقَالَتْ لأَهْلِهَا: لاَ تُحَدِّثُوا أَبَا طَلْحَةَ بِابْنِهِ حَتَّى أَكُونَ أَنَا أُحَدِّثُهُ. قَالَ: فَجَاءَ فَقَرَّبَتْ إِلَيْهِ عَشَاءً فَأَكَلَ وَشَرِبَ، قَالَ: ثُمَّ تَصَنَّعَتْ لَهُ أَحْسَنَ مَا كَانَ تَصَنَّعُ قَبْلَ ذَلِكَ، فَوَقَعَ بِهَا، فَلَمَّا رَأَتْ أَنَّهُ قَدْ شَبِعَ وَأَصَابَ مِنْهَا قَالَتْ: يَا أَبَا طَلْحَةَ أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ قَوْمًا أَعَارُوا عَارِيَتَهُمْ أَهْلَ بَيْتٍ، فَطَلَبُوا عَارِيَتَهُمْ، أَلَهُمْ أَنْ يَمْنَعُوهُمْ؟ قَالَ: لاَ. قَالَتْ: فَاحْتَسِبِ ابْنَكَ! قَالَ: فَغَضِبَ، فَقَالَ: تَرَكْتِنِى حَتَّى تَلَطَّخْتُ ثُمَّ أَخْبَرْتِنِى بِابْنِى. فَانْطَلَقَ حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَخْبَرَهُ بِمَا كَانَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «بَارَكَ اللَّهُ لَكُمَا فِى غَابِرِ لَيْلَتِكُمَا». قَالَ: فَحَمَلَتْ، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى سَفَرٍ وَهِىَ مَعَهُ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِذَا أَتَى الْمَدِينَةَ مِنْ سَفَرٍ لاَ يَطْرُقُهَا طُرُوقًا، فَدَنَوْا مِنَ الْمَدِينَةِ، فَضَرَبَهَا الْمَخَاضُ، فَاحْتُبِسَ عَلَيْهَا أَبُو طَلْحَةَ، وَانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). قَالَ: يَقُولُ أَبُو طَلْحَةَ: إِنَّكَ لَتَعْلَمُ يَا رَبِّ إِنَّهُ يُعْجِبُنِى أَنْ أَخْرُجَ مَعَ رَسُولِكَ إِذَا خَرَجَ، وَأَدْخُلَ مَعَهُ إِذَا دَخَلَ، وَقَدِ احْتُبِسْتُ بِمَا تَرَى. قَالَ: تَقُولُ أُمُّ سُلَيْمٍ: يَا أَبَا طَلْحَةَ، مَا أَجِدُ الَّذِى كُنْتُ أَجِدُ، انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْنَا. قَالَ: وَضَرَبَهَا الْمَخَاضُ حِينَ قَدِمَا، فَوَلَدَتْ غُلاَمًا، فَقَالَتْ لِى أُمِّى: يَا أَنَسُ لاَ يُرْضِعُهُ أَحَدٌ حَتَّى تَغْدُوَ بِهِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). فَلَمَّا أَصْبَحَ احْتَمَلْتُهُ، فَانْطَلَقْتُ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). قَالَ: فَصَادَفْتُهُ وَمَعَهُ مِيسَمٌ، فَلَمَّا رَآنِى، قَالَ: «لَعَلَّ أُمَّ سُلَيْمٍ وَلَدَتْ؟». قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَوَضَعَ الْمِيسَمَ. قَالَ: وَجِئْتُ بِهِ فَوَضَعْتُهُ فِى حَجْرِهِ، وَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِعَجْوَةٍ مِنْ عَجْوَةِ الْمَدِينَةِ، فَلاَكَهَا فِى فِيهِ حَتَّى ذَابَتْ، ثُمَّ قَذَفَهَا فِى فِى الصَّبِىِّ، فَجَعَلَ الصَّبِىُّ يَتَلَمَّظُهَا، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «انْظُرُوا

إِلَى حُبِّ الأَنْصَارِ التَّمْرَ». قَالَ: فَمَسَحَ وَجْهَهُ وَسَمَّاهُ عَبْدَ اللَّهِ). {الحديث: ٦٢٧٢ = ٦٢٨٠ فم}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: برایەکی دایکیم هەبوو، کوڕی ئەبو طەلحە بوو، کە هاوسەری دایکم بوو، ئەم برایەم بە منالی مرد، دایکم بە کەسوکارەکەی فەرموو: کەس باسی مردنی کوڕەکە نەکات بۆ ئەبو طەلحەی باوکی، هەتا خۆم پێی دەڵێم.**

**فەرمووی: جا ئەبو طەلحە هاتەوە، دایکم شێوی بۆ دانا، ئەویش بە ئاسوودەیی نانو ئاوەکەی خوارد، ئەنجا ژنەکەی خۆی دەڕازێنێتەوە بۆی، زۆر بەجوانی، وەك جاری جاران، وەك بڵێی هیچ رووی نەدابێ، جا پێکەوە دروست دەبن، ژنەکەی کە تەماشا دەکا کەوا ئەبو تەلحە هەم تێری خواردو هەم ئیشی شەرعی کرد لەگەڵیا، پێی دەڵێ: ئەی ئەبو طەلحە! پێم بڵێ: ئەگەر کۆمەڵێ ئەمانەتو سپاردەیماڵێکیان لەلابێو ماڵەکە داوای سپاردەکەی خۆیان بکەنەوە، ئایا ئەو کۆمەڵە مافی ئەوەیان هەیە کە ئەو سپاردەو ئەمانەتەیان نەدەنەوە!!**

**گوتی: نەء، دایکم پێی فەرموو: دە داوای پاداش لەخودا بکە، لەسەر مردنی کوڕەکەت!**

**ئەنەس فەرمووی: ئەبو تەلحە تووڕە بوو، وەگوتی: چۆن پەندێکت پێدام، لە کۆڵم نەبوویتەوە هەتا چەپەڵ بوومو لەشم پیس بوو، ئەوجا مەرگی کوڕەکەمم پێ دەڵێیت، دوایی رۆیی بۆلای پێغەمبەرو چی روویدابوو هەمووی بۆ دەگێڕێتەوە. پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (خودا شەوی رابووردووتان بۆ پیرۆز بکا).**

**فەرمووی: هەر ئەو شەوە بەفەرمانی خودا ئوممو سولەیم سکی پڕبوو، منال دەکەوێتە سکی، تا جارێ حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەچێ بۆ سەفەرێ، ئوممو سولەیمو ئەبو طەلحەی مێردیشی لەگەڵیا دەڕۆن بۆ ئەو سەفەرە، دەستووری پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **وابوو کە لەسەفەر دەگەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، بەشەو لەناکاودا نەیدەکرد بەناو خاوو خێزاندا، کاتێ لەمەدینە نزیك دەبنەوە ئوممو**

سولەیم ژانی منالبوون دەیگرێ، ئەبو طەلحەیش ناچار بەدیاریەوە دەمێنێتەوەو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەرەو مەدینە دەچێ، فەرمووی: ئەبو طەلحە دەفەرموێ: ئەی خودایە! بۆ خۆت دەزانیت کە هەمیشە حەزدەکەم کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر دەربچێ، منیش لەگەڵیا دەربچم بۆ ئەو سەفەرە، هەروا کە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە بۆ مەدینە، حەزدەکەم منیش لەگەڵیا بگەڕێمەوە بۆ مەدینەو لێی دانەبڕێمو لێی دوانەکەوم، بەڵام وەك دەبینیت ئەوا من بەم ئیشەوە پلکاومو بەدەست ئەم ژنەی خۆمەوە گیرم خواردووە!

فەرمووی: ئوم سولەیم دەفەرموێ: ئەی ئەبو تەلحە! ئەو ژانی منالەی کەبووم نەم ماوە، بڕۆ با لەخزمەتی حەزرەتدا بڕۆینەوە، ئیتر هەمووومان ملی ڕێمان گرتو کەوتینەڕێ. فەرمووی: کە لەگەڵ گەیشتینە بەرەوە دیسان ژان گرتیەوەو کوڕێکی بوو!

ئەنەس فەرمووی: دایکم فەرمووی پێم: ئەی ئەنەس! نابێ کەس گۆشی بکاو مەمکی پێ بدات، تابەیانەکی بەدەستی خۆت هەڵی دەگریتو دەیبەیت بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ).

منیش بەیانی کۆرپە ساواکەم هەلگرتو بردم بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). فەرمووی: کەچووم وارێکەوت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەمە داخێکی بەدەستەوە بوو، وشتری زەکاتی پێ داخ دەکرد بۆ نیشانە.

کاتێ منی دی منالەکەم بەباوەشەوە بوو، فەرمووی: (رەنگبێ ئوم سولەیم مندالی بووبێت؟). گوتم: بەڵێ. فەرمووی: جا دەمە داخەکەی دانا، فەرمووی: منالەکەم برد بۆی داینا لەکۆشیا.

جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) داوای خورمای عەجوەی کرد، لە عەجوەی مەدینە، داینا لەناو دەمی خۆیداو خورما عەجوەکەی تەواو جوی، هەتا توایەوە، ئەوجا دەمی مندالەکەی دا چەقاندو ماجوومی خورماکەی تفاندە ناودەمی، مندالەکەیش یەکسەر دەستی کرد بە ملچاندنی ماجوومەکەو زمانی بۆ دەگێڕا!

ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خورما خۆشەویستی یاریدەدەرانە، بۆیە ئەم منالە کە لەئەنصارە، هەر لەئێستاوە ئاوەها دەیقۆزێتەوە!).

ئەنەس فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ پیرۆزیی دەستی هێنا بەدەمو چاویداو ناوی نا: عەبدوڵلا). {ریاض صالحین/١، زنجیرە: ٣ باسی ئارامو خۆگری، ژمارە: ٤٤}.

**روونکردنەوە:**

لە ریاض صالحیندا دەفەرموێ:

لەگێڕانەوەیەکی بوخاریدا دەفەرموێ: ئیبنو عویەینە فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری دەیگوت: بەچاوی خۆم نۆ منالی ئەم عەبدوڵلایەم دیوە، کە پێغەمبەر ناوی ناو، دەمو مەلاشووی بە ماجوومی خورمای عەجوە هەنوو، هەر نۆیان قورئان خوێن بوون.

## ١٢٩٩) باسی گەورەیی ئوبەیی کوڕی کەعب. (٦٢٩٠ - ٦٢٩٤)
## بَابٌ: فِي فَضْلِ أُبَيِّ بْنُ كَعْبٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ)

١٧٠٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَمَعَ الْقُرْآنَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَرْبَعَةٌ كُلُّهُمْ مِنَ الأَنْصَارِ: مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَبُو زَيْدٍ. قَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ لأَنَسٍ: مَنْ أَبُو زَيْدٍ؟ قَالَ: أَحَدُ عُمُومَتِي. {الحديث: ٦٢٩٠ = ٦٢٩٨ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٩٤ = ٣٨١٠، ٣٩٩٦، ٥٠٠٣، ٥٠٠٤. فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٢٤٨. ترمذي. مناقب: ٣٧٩٤}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم چوار کەسەیە هەموو قورئانیان بەتەواوی لەبەربوو، وەهەر چواریشیان لە یاریدەدەران (ئەنصار) بوون: موعازی کوڕی جەبەلو ئوبەییەی کوڕی کەعبو زەیدی کوڕی ثابیتو ئەبو زەید، قەتادە گوتی: بە ئەنەسم گوت: ئەبو زەید کێیە؟ فەرمووی: (ئامۆزایەکی من بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ٣٤٧٤. چاکێتی موعازی کوڕی جەبەل. ج/٤. ش/ت = شەیخانو تەرمەزی}.

**١٣٠٠) باسی گەورەیی ئەبو زەڕی ئەلغەفاری (ڕەزای خودای لێ بێ).(٦٣٠٩-٦٣١٢)**
**بَابٌ: فِي فَضْلِ أَبِي ذَرّ الْغِفَارِي (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)**

١٧٠٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: قَالَ أَبُو ذَرّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): خَرَجْنَا مِنْ قَوْمِنَا غِفَارٍ، وَكَانُوا يُحِلُّونَ الشَّهْرَ الْحَرَامَ، فَخَرَجْتُ أَنَا وَأَخِي أُنَيْسٌ وَأُمُّنَا، فَنَزَلْنَا عَلَى خَالٍ لَنَا، فَأَكْرَمَنَا خَالُنَا وَأَحْسَنَ إِلَيْنَا، فَحَسَدَنَا قَوْمُهُ، فَقَالُوا: إِنَّكَ إِذَا خَرَجْتَ عَنْ أَهْلِكَ خَالَفَ إِلَيْهِمْ أُنَيْسٌ، فَجَاءَ خَالُنَا فَنَثَا عَلَيْنَا الَّذِي قِيلَ لَهُ، فَقُلْتُ: لَهُ أَمَّا مَا مَضَى مِنْ مَعْرُوفِكَ فَقَدْ كَدَّرْتَهُ، وَلاَ جِمَاعَ لَكَ فِيمَا بَعْدُ، فَقَرَّبْنَا صِرْمَتَنَا فَاحْتَمَلْنَا عَلَيْهَا، وَتَغَطَّى خَالُنَا ثَوْبَهُ فَجَعَلَ يَبْكِي، فَانْطَلَقْنَا حَتَّى نَزَلْنَا بِحَضْرَةِ مَكَّةَ، فَنَافَرَ أُنَيْسٌ عَنْ صِرْمَتِنَا، وَعَنْ مِثْلِهَا، فَأَتَيَا الْكَاهِنَ، فَخَيَّرَ أُنَيْسًا، فَأَتَانَا أُنَيْسٌ بِصِرْمَتِنَا وَمِثْلِهَا مَعَهَا. قَالَ: وَقَدْ صَلَّيْتُ يَا ابْنَ أَخِي قَبْلَ أَنْ أَلْقَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِثَلاَثِ سِنِينَ. قُلْتُ: لِمَنْ؟ قَالَ: لِلَّهِ. قُلْتُ: فَأَيْنَ تَوَجَّهُ؟ قَالَ: أَتَوَجَّهُ حَيْثُ يُوَجِّهُنِي رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ، أُصَلِّي عِشَاءً حَتَّى إِذَا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ أُلْقِيتُ كَأَنِّي خِفَاءٌ حَتَّى تَعْلُونِي الشَّمْسُ، فَقَالَ لِي أُنَيْسٌ: إِنَّ لِي حَاجَةً بِمَكَّةَ فَاكْفِنِي، فَانْطَلَقَ أُنَيْسٌ حَتَّى أَتَى مَكَّةَ، فَرَاثَ عَلَيَّ، ثُمَّ جَاءَ، فَقُلْتُ: مَا صَنَعْتَ؟ قَالَ: لَقِيتُ رَجُلاً بِمَكَّةَ عَلَى دِينِكَ، يَزْعُمُ أَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَرْسَلَهُ. قُلْتُ: فَمَا يَقُولُ النَّاسُ؟ قَالَ: يَقُولُونَ: شَاعِرٌ، كَاهِنٌ، سَاحِرٌ، وَكَانَ أُنَيْسٌ أَحَدَ الشُّعَرَاءِ. قَالَ أُنَيْسٌ: لَقَدْ سَمِعْتُ قَوْلَ الْكَهَنَةِ، فَمَا هُوَ بِقَوْلِهِمْ، وَلَقَدْ وَضَعْتُ قَوْلَهُ عَلَى أَقْرَاءِ الشِّعْرِ، فَمَا يَلْتَئِمُ عَلَى لِسَانِ أَحَدٍ بَعْدِي أَنَّهُ شِعْرٌ، وَاللَّهِ إِنَّهُ لَصَادِقٌ، وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ. قَالَ: قُلْتُ: فَاكْفِنِي حَتَّى أَذْهَبَ فَأَنْظُرَ. قَالَ: فَأَتَيْتُ مَكَّةَ، فَتَضَعَّفْتُ رَجُلاً مِنْهُمْ، فَقُلْتُ: أَيْنَ هَذَا الَّذِي تَدْعُونَهُ الصَّابِئَ؟ فَأَشَارَ إِلَيَّ فَقَالَ: الصَّابِئَ، فَمَالَ عَلَيَّ أَهْلُ الْوَادِي بِكُلِّ مَدَرَةٍ وَعَظْمٍ حَتَّى خَرَرْتُ مَغْشِيًّا عَلَيَّ. قَالَ: فَارْتَفَعْتُ حِينَ ارْتَفَعْتُ كَأَنِّي نُصُبٌ أَحْمَرُ، قَالَ: فَأَتَيْتُ زَمْزَمَ فَغَسَلْتُ عَنِّي الدِّمَاءَ، وَشَرِبْتُ مِنْ مَائِهَا، وَلَقَدْ لَبِثْتُ يَا ابْنَ أَخِي ثَلاَثِينَ بَيْنَ لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ، مَا كَانَ لِي طَعَامٌ إِلاَّ مَاءُ زَمْزَمَ فَسَمِنْتُ حَتَّى تَكَسَّرَتْ عُكَنُ بَطْنِي، وَمَا وَجَدْتُ عَلَى كَبِدِي سُخْفَةَ جُوعٍ. قَالَ: فَبَيْنَا أَهْلُ مَكَّةَ فِي لَيْلَةٍ قَمْرَاءَ إِضْحِيَانَ، إِذْ ضُرِبَ عَلَى أَسْمِخَتِهِمْ فَمَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ أَحَدٌ، وَامْرَأَتَانِ مِنْهُمْ تَدْعُوَانِ إِسَافًا وَنَائِلَةَ. قَالَ: - فَأَتَتَا عَلَيَّ فِي طَوَافِهِمَا، فَقُلْتُ: أَنْكِحَا أَحَدَهُمَا الأُخْرَى، قَالَ: فَمَا تَنَاهَتَا عَنْ قَوْلِهِمَا؟ قَالَ: فَأَتَتَا عَلَيَّ، فَقُلْتُ: هَنٌ

مِثْلُ الْخَشَبَةِ، غَيْرَ أَنِّي لاَ أَكْنِي! فَانْطَلَقَتَا تُوَلْوِلاَنِ وَتَقُولاَنِ: لَوْ كَانَ هَا هُنَا أَحَدٌ مِنْ أَنْفَارِنَا، قَالَ: فَاسْتَقْبَلَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَأَبُو بَكْرٍ وَهُمَا هَابِطَانِ، قَالَ: «مَا لَكُمَا»؟ قَالَتَا: الصَّابِئُ بَيْنَ الْكَعْبَةِ وَأَسْتَارِهَا. قَالَ: «مَا قَالَ لَكُمَا»؟ قَالَتَا: إِنَّهُ قَالَ: لَنَا كَلِمَةً تَمْلأُ الْفَمَ. وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حَتَّى اسْتَلَمَ الْحَجَرَ، وَطَافَ بِالْبَيْتِ هُوَ وَصَاحِبُهُ، ثُمَّ صَلَّى، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ، قَالَ أَبُو ذَرٍّ: فَكُنْتُ أَنَا أَوَّلُ مَنْ حَيَّاهُ بِتَحِيَّةِ الإِسْلاَمِ، قَالَ: فَقُلْتُ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: «وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ»، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ أَنْتَ»؟ قَالَ: قُلْتُ: مِنْ غِفَارٍ. قَالَ: فَأَهْوَى بِيَدِهِ فَوَضَعَ أَصَابِعَهُ عَلَى جَبْهَتِهِ، فَقُلْتُ فِي نَفْسِي: كَرِهَ أَنِ انْتَمَيْتُ إِلَى غِفَارٍ، فَذَهَبْتُ آخُذُ بِيَدِهِ فَقَدَعَنِي صَاحِبُهُ وَكَانَ أَعْلَمَ بِهِ مِنِّي، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ ثُمَّ قَالَ: «مَتَى كُنْتَ هَا هُنَا»؟ قَالَ: قُلْتُ: قَدْ كُنْتُ هَا هُنَا مُنْذُ ثَلاَثِينَ بَيْنَ لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ. قَالَ: «فَمَنْ كَانَ يُطْعِمُكَ؟». قَالَ: قُلْتُ: مَا كَانَ لِي طَعَامٌ إِلاَّ مَاءُ زَمْزَمَ فَسَمِنْتُ حَتَّى تَكَسَّرَتْ عُكَنُ بَطْنِي، وَمَا أَجِدُ عَلَى كَبِدِي سُخْفَةَ جُوعٍ. قَالَ: «إِنَّهَا مُبَارَكَةٌ إِنَّهَا طَعَامُ طُعْمٍ». فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): يَا رَسُولَ اللَّهِ، ائْذَنْ لِي فِي طَعَامِهِ اللَّيْلَةَ. فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَم) وَأَبُو بَكْرٍ وَانْطَلَقْتُ مَعَهُمَا، فَفَتَحَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بَابًا، فَجَعَلَ يَقْبِضُ لَنَا مِنْ زَبِيبِ الطَّائِفِ، وَكَانَ ذَلِكَ أَوَّلَ طَعَامٍ أَكَلْتُهُ بِهَا، ثُمَّ غَبَرْتُ مَا غَبَرْتُ، ثُمَّ أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: «إِنَّهُ قَدْ وُجِّهَتْ لِي أَرْضٌ ذَاتُ نَخْلٍ، لاَ أُرَاهَا إِلاَّ يَثْرِبَ، فَهَلْ أَنْتَ مُبَلِّغٌ عَنِّي قَوْمَكَ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَنْفَعَهُمْ بِكَ، وَيَأْجُرَكَ فِيهِمْ»؟ فَأَتَيْتُ أُنَيْسًا، فَقَالَ: مَا صَنَعْتَ؟ قُلْتُ: صَنَعْتُ أَنِّي قَدْ أَسْلَمْتُ وَصَدَّقْتُ. قَالَ: مَا بِي رَغْبَةٌ عَنْ دِينِكَ، فَإِنِّي قَدْ أَسْلَمْتُ وَصَدَّقْتُ. فَأَتَيْنَا أُمَّنَا، فَقَالَتْ: مَا بِي رَغْبَةٌ عَنْ دِينِكُمَا، فَإِنِّي قَدْ أَسْلَمْتُ وَصَدَّقْتُ، فَاحْتَمَلْنَا حَتَّى أَتَيْنَا قَوْمَنَا غِفَارًا، فَأَسْلَمَ نِصْفُهُمْ، وَكَانَ يَؤُمُّهُمْ إِيمَاءُ بْنُ رَحَضَةَ الْغِفَارِيُّ وَكَانَ سَيِّدَهُمْ، وَقَالَ نِصْفُهُمْ: إِذَا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الْمَدِينَةَ أَسْلَمْنَا. فَقَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الْمَدِينَةَ، فَأَسْلَمَ نِصْفُهُمُ الْبَاقِي، وَجَاءَتْ أَسْلَمُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِخْوَتُنَا نُسْلِمُ عَلَى الَّذِي أَسْلَمُوا عَلَيْهِ، فَأَسْلَمُوا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «غِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ». {الحديث: ٦٣٠٩ = ٦٣١٧ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٠٣ = ٣٥٢٢، ٣٨٦١. تحفة الأشراف: ١١٩٤٢}:

عەبـدوڵڵای کـوڕی صـامیت (ڕەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: ئـەبو زەڕ (ڕەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: هۆزەکـەمان کـە هـۆزی غیفـار بـوو، مانگـە حەرامـەکان کـە خـودا شـەڕو شۆڕی تیا حەرام کردوون، ئـەوان شـەڕو شـۆڕیان لـەو مانگانـەدا بەحـەڵاڵ دەزانـیو ڕێزی ئەو مانگانەیان دەشکاند، جا لەبەر ئەمە منو دایکمو ئونەیسی برام لەناویان دەرچـووینو ڕۆیشـتین، چـووین بـۆلای خاڵێکمـان، لـەوێ لـەلای ئـەو ماینـەوە، خاڵەکـەمان ڕێزێکـی باشـی لێ گـرتین وە پیـاوەتی زۆری لەگـەڵ نوانـدین، بـەڵام هۆزەکەی حەسوودییان پێ بردین، بە خاڵمیان گوتبوو: کەتۆ لەماڵ نابی، ئونەیسی خوشکەزات بە ژنەکەت فێربووە!

جا خاڵمان هات بۆلامان ئەوەی کە بیستبووی لەم لایەنەوە گێڕایەوە بۆمان!

منـیش پێـیم گـوت: ئـەو چاکەو پیاوەتییـەی کـەتۆ لەگـەڵت کـردین، بەمـە لەکەدارت کرد، لەبەرئەوە لەپاش ئەم گومانە خراپەی تـۆ بەئێمـە، پێکـەوە بـوونی ئێمەو ئێـوە بەیەکـەوە زۆر ئەسـتەمە، جارۆیشـتین بـەلای وڵاخەکانمانـەوەو کـۆچو بارمان پێچایەوەو سواربووین ڕۆیشتین.

خاڵیشمان سەری خـۆی بەجلەکـەی داپۆشـیو دەسـتی کـرد بـەگریان، ڕۆیشـتین لەنزیك شاری مەککە دابەزین!! جا لەوێ ئونەیسی بـرام کـەخۆی شـاعیربوو، لەگـەڵ شاعیرێکی تردا، کە پیاوێ بوو، گرەویان لەسەرئەوە کرد: کـە کامیـان شـاعیرتر بـێ، گرەوەکە بۆئەو بێ، ئونەیس ڕانە وشـترەکەی خۆمـانی دانـا لەبارمتـەی گرەوەکـەدا، کابراکەی تریش ڕانە وشترێکی وەك ئەوەی ئێمەی دانـا، لەبارمتـەی گرەوەکـەدا کـە هەرکامیان بیبەنەوە هەردوو بڕە وشترەکان بۆ ئەوبێ!

جابۆ دادگایی چوون بۆلای پیاوێکی کاهینو دەسـتیان کـرد بەشـەڕە شـیعر، لـە ئـەنجاما کاهینەکـە بڕیاریـدا کـە ئونـەیس براوەیـە، چـونکە ئـەو شـاعیرترە. جـا ئونـەیس دوو بڕکـە وشـتری هێنایـەوە، بڕکـە وشـترەکەی خۆمـان کـەدابینابوو لـە بارمتەی گرەوەکەداو بڕکە وشتری شاعیرەکەی تـریش کـە بەقـەد بڕکـە وشـترەکەی ئێمە بوو!!

ئەبو زەڕ فەرمووی بە عەبدوڵلای کوڕی صامیت: ئەی برازای خۆم! بەسێ ساڵ بەرلەوە کە بەخزمەت پێغەمبەر بگەمو ئیسلام ببم، نوێژم دەکرد، بەشێوە نوێژێکی تایبەتی، کە جیابوو لەم نوێژەی ئێستای خۆمان.

عەبدوڵلا فەرمووی: پێم گوت: نوێژت بۆ کێ دەکرد؟ فەرمووی: بۆ خودا. عەرزیم کرد: ئەی بەرەو کوێ رووت دەکردو لەنوێژەکەدا رووت دەکردە کوێ؟

فەرمووی: بەرەو ئەوێ لە نوێژەکەما رووم دەکرد کە خودا خۆی ئاڕاستەی دەکردمو مەیلی لەسەری بوو کە رووبکەمە ئەوێ!

ئیتر بەشەو نوێژێکی دوورو درێژم دەکرد، هەتا بەرە بەرە خەو زۆری بۆ دەهێنامو لاڵو پاڵ دەکەوتم بەلادا، وەك خەرقە کۆنێکی فڕێ دراو! هەتا هەتاو زۆری بۆ دەهێنام ئەوسا خەبەرم دەبۆوە!

جا ئونەیسی برام پێی گوتم: من لە مەککە ئیشێکم هەیە، دەچم بۆ ئەوێ، تۆ لێرە بمێنەرەوە، ئەرکەکانی منیش جێبەجێ بکە، جا ئونەیس رۆیشت بۆ مەککە، درەنگ هاتەوە، کەهاتەوە پێیم گوت: چیت کرد بەچی؟ گوتی: پیاوێکم بینی لە مەککە، لەسەر ئایینەکەی تۆیە، ئەویش وەك تۆ تاك پەرستەو بەس خودا دەپەرستێو بتو شتی وا ناپەرستێ، وە بەقسەی خۆی دەڵێ: خودای پیرۆزو گەورە ئەوی رەوانە کردووە، بۆ رابەریی ئەو خەڵکە. گوتم: ئەی باشە، ئەی خەڵکەکە دەڵێن چی؟ گوتی: یەکێ دەڵێ: شاعیرە، یەکێ تر دەڵێ: شاعیر نییە کاهینە، یەکێ تر دەڵێ: نە شاعیرەو نە کاهینە ساحیرەو جادوو بازە!!

فەرمووی: ئونەیس خۆی شاعیر بوو، یەکێ بوو لەشاعیرانی سەردەمی خۆی. ئونەیس گوتی: من قسەو گوتەی کاهینم زۆر بیستووە، وە قسەی کاهینانم زۆر بەراورد کردووە، ئەم پیاوە بەهیچ جۆرێ لەکاهین ناکاو کاهین نییە، وە قسەکانیم بەپێی پێوەرو سەرواو کێشەکانی شیعر بەراورد کرد، لەشیعر ناکەن، وەکەسی تریش ناتوانێ کە بیسەلمێنێ کەئەوە شیعرە. سوێندم بەخودا ئەو پیاوە راستەکاو

راستگۆیە، وە ئەوانەی کە دەڵێن: شاعیرە یا کاهینە، یا جادووبازە ئەوانە درۆ دەکەن!!

ئەبو زەڕ فەرمووی: پێیم گوت: دەی تۆ ئەمجارە لەجێگەی من بەو ئیشەکانی منیش بکە، بامن بچم سۆراخی بکەمو بزانم چییە. فەرمووی: جاخۆم ڕۆیشتم بۆ مەککە، پیاوێکی فرە هەژارم بینی، لەبەر هەژاری گومانی ئەوەی لێ نەدەکرا کە ئازاری کەس بدات، پێیم گوت: ئەو پیاوەی کەئێوە پێی دەڵێن: (وەرگەڕاو: صابیئ) کامەیە پێم بڵێ؟

کەچی لەباتی ئەوەی پێغەمبەرم پیشان بدا، لێم بوو بە بەڵاو بە خەڵکەکەی گوت: ئەمە صابیئەو لەدەستەی موحەممەدە، ئادەی میرازی بکەن!

ئیتر خەڵکی مەککە، لەهەموو لایەکەوە پەلاماریان دامو بە بەردو گڵمتكو پارچە ئێسك بەردە بارانیان کردم، هەتا کەوتمو بوورامەوە.

فەرمووی: کاتێ هۆشم هاتەوەو هەڵسامە سەرپێ، لەو پەیکەری بتانەم دەکرد، کە لەهەندێ شوێنا دایان دەنانو ئاژەڵیان لەپالا سەردەبڕینو سووریان دەکرد بەخوێنی سەربڕاوەکان، بە بەردو ئێسقان ئاوا لەشم خەڵتانی خوێن بوو بوو!

فەرمووی: جاچووم بۆسەر بیری زەمزەمو خوێنەکەم لەخۆم شۆردو، لە ئاوەکەیم خواردەوە. ئەبو زەڕ بە عەبدوڵڵای کوڕی صامیتی فەرموو: ئەی کوڕی برام! سیی ڕۆژی ڕەبەق کە دەکاتە مانگێ، مامەوە، ئەوەی پێی بڵێیت خۆراك، بەشەوو بەڕۆژ نەمبوو، بێجگە لەئاوی زەمزەم، لەو ماوەیەدا لەباتی نانو ئاو هەر ئاوی زەمزەمم دەخواردەوە، کەچی واپێی قەڵەو بووم، چین چین لۆچی گۆشت کەوتە سکم، وە هەرگیز لەو ماوەیەدا هەستم بەبێ هێزیو زەبوونی برسێتی نەکرد.

ئەبو زەڕ فەرمووی: شەوێ سایەقەی ساماڵ بوو، مانگە شەوێکی زۆر ڕووناك بوو، کەچی خەڵکی مەککە هەموو گوێیان مۆرکرابوو، هەموو خەوتبوون، دەوری

بەيت چۆڵ بوو، كەسى لىَ نەمابوو كە تەوافى بەيت بكا، تەنيا دوو ژنيان نەبىَ، كە لەبتى ئيساف‌و لەبتى نائيلە دەپاڕانەوە!

فـەرمووى: جـا لـەكاتى تەوافەكـەيانا، لـەلاى منـەوە رەت بـوون، منـيش گـوتم: يـەكێكيان لـەوى تريـان مارەبكـەن بـەلاَم وازيـان لـە پاڕانەوەكـەيان لـەو دوو بتـە نەهێنا. فەرمووى: جارێكى تريش بەدەم تەوافەوە هەر لـەو دوو بوتـە دەپاڕانـەوەو هاتنـەوە بـۆلاى شـوێنەكەى مـن، منـيش بـەدوو ژنەكـەم گـوت: هينـى وەك تەختـە رەپ‌و رەق بـەهينى ئيسـاف‌و نائيلـە، بـە ئاشـكرا دەڵـێم نـەوەك لـەژێر لێـوەوە (مەبەسـتى ئـەبو زەڕ ئـەوەبووە: كێرێكـى رەقـى وەك بـڕەدار بـەكوزى ئيسـاف‌و نائيلە).

جـا ژنـەكان هەڵسـەڵەمينەوە دەسـتيانكرد بـە هەيـەڕۆ، هەيـەڕۆ لـەم بـێ شەرمييەو هاوار بۆ ئەم رۆژە رەشـە، ئـاى بـۆ پيـاوێكى ئـازا كـە لـەخۆمان بـێ هـەتا لەسەرمان بكاتەوە!!

فەرمووى: جا پێغەمبـەرو ئەبوبـەكر بـەرەو رووى دووژنـەكە هـاتن، لەكێوەكـە دابـەزين، يـەكێكيان فـەرمووى: ئـەوە چـيتانە بۆوادەكـەن؟ ژنـەكان گوتيـان: ئـەوە لەئايين وەرگەڕاوێكە، وا لەنێوانى كەعبەو پەردەكانيدا. فەرمووى: ئايا چى بـەئێوە گوت كـەوا شـەڵەژاون؟ دوو ژنەكـە گوتيـان: قسـەيەكى واى پـێ گوتـووين، زمـان لاڵ دەكا، پڕ بەدەمە، قسەى واناشيرين دەم پڕدەكاو زمان لاڵ دەكا كەقسـەى بۆنـەكرێ. جا پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) تەشـريفى هـات، تـەوافى بـەردە رەشـى كـردو خـۆى‌و هاوڕێكەى كە ئەبوبەكرى صـەديق بـوو، تـەوافى بـەيتيان كـرد، لـەپاش تەوافەكـەى نوێـژى كـرد، ئـەبو زەڕ فـەرمووى: كاتـێ پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسـەر بـێ) نوێژەكـەى تەواوكرد، من چووم بۆ خزمـەتى، وە سلاَوم لێكـرد، وەمـن يەكـەم كـەس بـووم كـە بەسلاَوى ئيسلام سلاَوم لە پێغەمبەر كرد، فەرمووى: گوتم: (السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَـا رَسُـولَ اللهِ: سلاَوت لىَ بێ ئەى پێغەمبەرى خودا!) ئەويش فەرمووى: (وَعليك السَّلاَم وَرَحمَـة الله: سلاَوو رەحمەتى خودا لەتۆش).

لەپاشا حـەزرەت پێـی فـەرمووم: (تـۆ کێیـتو لەچـی هـۆزو تیرەیـەکیتو چ کارەیت؟).

گوتم: من ئـەبو زەڕم لـەهۆزی غیفـارم. جا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کـەوام گوت، دەستی درێژکرد، پەنجەکانی گرت بەناو چاوانیەوەو سەری دانەواند، منیش وام هەست کرد، کە پێغەمبەر لەوە رەشبینە کەمن لەهۆزی غیفارم کە ناسراون بەدزیو جەردەییـەوە، لـەدڵی خۆمـا گـوتم: دیـارە پێـی ناخۆشـە کـەمن لـەهۆزی غیفارم، ویستم دەستی بگرم، بەڵام ئەبوبەکری هاوەڵی نەیهێشتم، دیاربوو کە ئەو باشـتر لـەحاڵی پێغەمبـەری دەزانـی. لەپاشـا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سـەری هەڵبڕیو بەمنی فەرموو: (لەکەیەوە لێرەیت؟). گوتم: ئەوە سیی شەوو سیی رۆژی تەواوە من لێرەم، فەرمووی: (ئەی کێ نانو ئاوی پێت دەدا؟). گوتم: بێجگە لەئاوی زەمزەم خـۆراکی تـرم نـەبووە، لەگـەڵ ئەوەشا وا قەڵەو بووم، چین چینو لۆ لۆ گۆشت لەسکم پەیدابووە، وە بـەهیچ جۆرێ هەستم بـەتینی برسـێتی نـەکردووە. حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئـەوە پـیرۆزە، ئـەوەی کـە دەیخواتـەوە هـەم برێتی ئاو دەکەوێ، هەم برێتی نان دەکەوێ بۆی).

ئەبوبەکر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! مۆڵـەت بفـەرموو، با نانی ئەم شەوی لەسەرمن بێ، جا هەرسێکمان: منو پێغەمبەرو ئەبوبـەکر پێکەوە چووین بۆ ماڵی ئەبوبەکر، ئەبوبەکر دەرگایەکی کـردەوە، بەمشت مێـوژی طائیفی بۆدانـاین، دەسـتمانکرد بـەخواردن لێـی، ئـەوە یەکـەم خـۆراك بـوو کـە لەمەککـە خـواردم، ئـیتر ماوەیـێ لەسـەر ئـەم بارودۆخـە لەمەککـە مامـەوە، پاشـان چـوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من لە خودای گەورەوە بـە سرووش (بە وەحی) بەرەو وڵاتێ ئاڕاستە کراوم، کە باخە خورمای زۆرە، بەزەینم کە وڵاتـی یـەثریـب بـێ، دەی ئایـا تـۆ دەتـوانی کـە لـەجیاتی مـن ئـاییني پـیرۆزی ئیسـلام بەهۆزەکـەی خـۆت رابگەیـەنیتو تـۆیش لەسـەرئەوە بـە پاداشـی باشـی خـۆت دەگەیت!).

جامنیش گەڕامەوەو چووم بۆلای ئونەیسی برام، گوتی: چیت بەچی کرد؟ گوتم: ئەوەم کرد کە موسوڵمان بوومو بڕوام بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هێنا، گوتی: منیش وا موسوڵمان بوومو باوەڕم هێنا، بەهیچ جۆرێ لاریم نییە لەم ئایینەی تۆ. جا پێکەوە چووین بۆلای دایکمانو داوامان لێکرد، کە ئەویش وەك ئێمە ئیسلام قەبووڵ بکا، ئەویش ئیسلام بوو، وەگوتی: بەهیچ جۆرێ منیش لاریم نییە لەم ئایینەی ئێوە، وامنیش موسوڵمان بوومو بڕوام کرد، جا بارمانکردو چووینەوە بۆناو هۆزەکەمان، کە ناسراوە بەهۆزی غیفار، کە بانگەوازمان لێ کردن بۆسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام، نیوەیان موسوڵمان بوون، ئاغاکەیان کەناوی ئیمائی کوڕی رەحەضەی ئەل-غیفاری بوو، ئەو بەرنوێژیی نوێژەکانی بۆیان دەکرد.

وەنیوەکەی تریشیان گوتیان: کاتێ پێغەمبەر خۆی کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوکاتە ئێمەیش موسوڵمان دەبین!

جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ مەدینەو کۆچی کرد بۆئەوێ، نیوەکەی تری هۆزی غیفاریش ئیسلام بوون، لەمەدینە هۆزی ئەسلەمیش هاتن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! برا هاوپەیمانەکانمان لەهۆزی غیفار لەسەرچی ئیسلام بوون، ئێمەش بەبێ چەندو چوون لەسەرئەوە ئیسلام دەبین. ئیتر ئەوانیش موسوڵمان بوون، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا لەهۆزی غیفار خۆش بێو هۆزی ئەسلەمیش بێوەی بکا!). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٣٥٠٧ ج/٤. گەورەیی کۆمەڵێ لەیاران}.

١٧٠٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَمَّا بَلَغَ أَبَا ذَرٍّ مَبْعَثُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِمَكَّةَ، قَالَ لأَخِيهِ أنيس: ارْكَبْ إِلَى هَذَا الْوَادِي فَاعْلَمْ لِي عِلْمَ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ يَأْتِيهِ الْخَبَرُ مِنَ السَّمَاءِ، فَاسْمَعْ مِنْ قَوْلِهِ ثُمَّ ائْتِنِي. فَانْطَلَقَ الآخَرُ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ وَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَبِي ذَرٍّ، فَقَالَ: رَأَيْتُهُ يَأْمُرُ بِمَكَارِمِ الأَخْلَاقِ وَكَلَامًا مَا هُوَ بِالشِّعْرِ. فَقَالَ: مَا شَفَيْتَنِي فِيمَا أَرَدْتُ. فَتَزَوَّدَ وَحَمَلَ شَنَّةً لَهُ فِيهَا مَاءٌ، حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، فَأَتَى الْمَسْجِدَ فَالْتَمَسَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَلاَ يَعْرِفُهُ وَكَرِهَ أَنْ يَسْأَلَ

عَنْهُ، حَتَّى أَدْرَكَهُ - يَعْنِى اللَّيْلَ — فَاضْطَجَعَ، فَرَآهُ عَلِيٌّ، فَعرَفَ أَنَّهُ غَرِيبٌ، فَلَمَّا رَآهُ تَبِعَهُ، فَلَمْ يَسْأَلْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شَىْءٍ حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ احْتَمَلَ قُرَيْبَتَهُ وَزَادَهُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَظَلَّ ذَلِكَ الْيَوْمَ وَلاَ يَرَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، حَتَّى أَمْسَى فَعَادَ إِلَى مَضْجَعِهِ، فَمَرَّ بِهِ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَقَالَ: مَا أَنَى لِلرَّجُلِ أَنْ يَعْلَمَ مَنْزِلَهُ؟ فَأَقَامَهُ فَذَهَبَ بِهِ مَعَهُ وَلاَ يَسْأَلُ وَاحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شَىْءٍ، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ الثَّالِثِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، فَأَقَامَهُ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) مَعَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: أَلاَ تُحَدِّثُنِى مَا الَّذِى أَقْدَمَكَ هَذَا الْبَلَدَ؟ قَالَ: إِنْ أَعْطَيْتَنِى عَهْدًا وَمِيثَاقًا لَتُرْشِدَنِّى فَعَلْتُ، فَفَعَلَ، فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ: فَإِنَّهُ حَقٌّ وَهُوَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَإِذَا أَصْبَحْتَ فَاتَّبِعْنِى، فَإِنِّى إِنْ رَأَيْتُ شَيْئًا أَخَافُ عَلَيْكَ قُمْتُ كَأَنِّى أُرِيقُ الْمَاءَ، فَإِنْ مَضَيْتُ فَاتَّبِعْنِى حَتَّى تَدْخُلَ مَدْخَلِى، فَفَعَلَ. فَانْطَلَقَ يَقْفُوهُ، حَتَّى دَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَدَخَلَ مَعَهُ، فَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَأَسْلَمَ مَكَانَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «ارْجِعْ إِلَى قَوْمِكَ فَأَخْبِرْهُمْ حَتَّى يَأْتِيَكَ أَمْرِى». فَقَالَ: وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لأَصْرُخَنَّ بِهَا بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ. فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ، فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. وَثَارَ الْقَوْمُ فَضَرَبُوهُ حَتَّى أَضْجَعُوهُ عَلَى الأَرْضِ، وَأَتَى الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِالْمُطَلِبِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَأَكَبَّ عَلَيْهِ، فَقَالَ: وَيْلَكُمْ أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ مِنْ غِفَارٍ، وَأَنَّ طَرِيقَ تُجَّارِكُمْ إِلَى الشَّامِ عَلَيْهِمْ؟! فَأَنْقَذَهُ مِنْهُمْ، ثُمَّ عَادَ مِنَ الْغَدِ بِمِثْلِهَا، وَثَارُوا عَلَيْهِ، فَضَرَبُوهُ، فَأَكَبَّ عَلَيْهِ الْعَبَّاسُ فَأَنْقَذَهُ). {الحديث: ٦٣١٢ = ٦٣٢٠ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٠٣ = ٣٥٢٢، ٣٨٦١ فتح البارى}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەبو زەڕ کاتێ دەبیسێت، خودا پێغەمبەری کردووە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئونەیسی برای دەڵێ: ئادەی سواربە، بچۆ بۆ ئەم دۆڵی مەککەیە، دەنگوباسی ئەم پیاوەم بۆ بزانە، کە لەمەککە پەیدابووەو خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ، گوایە لە ئاسمانەوە هەواڵو باسو خواسی بۆ دێت، گوێ لەقسەی بگرەو لەپاشا وەرەوە بۆلام، جا براکەی دەڕوات تا دەچێتە مەککە، لەوێ گوێ لەفەرمایشتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگرێو دەگەڕێتەوە

بۆلای ئەبو زەڕو پێی دەڵێ: ئەو پیاوەم دی، فەرمان دەکا بە ڕەفتاری بەرزو خووی شیرینو جۆرە قسەیێ دەکا، لە شیعرو هۆنراوە ناچێ، ئەبو زەڕیش دەڵێ: بەدەردی منت نەخوارد، ئینجا خۆی توێشوو دەکاو کوندەیێ ئاو هەڵ دەگرێو دەڕوا تا دەچێتە مەککە.

لەوێ دەچێتە مزگەوتو دەگەڕێ بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەلاّم لەبەرئەوەی خۆی نایناسێو حەزیش ناکا لەکەسی تر بپرسێ نایدۆزێتەوە، دەمێنێتەوە تاشەو دادێ، جا رادەکشێ، عەلی دەیبینێتو دەزانێ کە ئەمە غەریبەو نامۆیە پێی دەڵێ: نابەڵەدی؟ دەڵێ: بەڵێ، خەڵکی ئێرەنیم، ئیتر عەلی خوڵکی دەکاو ئەویش شوێنی دەکەوێو دەچنەوە بۆ ماڵەوە، ئەو شەوە کەسیان پرسیار لەکەسیان ناکەن کەتۆ کێیتو کێ نیتو چ کارەیتو چ کارەنیت، کە رۆژ دەبێتەوە ئەبو زەڕ کوندەو توێشووەکەی خۆی هەڵ دەگرێتو دەچێتەوە بۆ مزگەوت، ئەو رۆژەیش تا ئێوارێ دەمێنێتەوەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نابینێ، کە شەوی بەسەردا هات دەچێتەوە لەجێگەی دوێ شەوی خۆیا پاڵ دەکەوێتەوەو عەلی کوڕی ئەبو طالیب دێتەوە بۆلایو دەڵێ: ئەوە چییە، هێشتا ئەم پیاوە خانە خوێکەی خۆی نا ناسێتەوە؟ جا هەڵی دەستێنێو لەگەڵیا دەچێتەوە بۆ ماڵی عەلیو ئەو شەوەشیان کەسیان پرسیاری هیچ شتێ لەکەسیان ناکەن، رۆژی سێیەم دیسانەوە عەلی دێتەوەو هەڵی دەسێنێتەوەو دەیباتەوە، ئەوجار عەلی دەڵێ: ئەرێ پێم ناڵێیت تۆ بۆچی هاتوویتو منەی چی دەکەیت؟ ئەویش دەڵێ: ئەگەر گفتو پەیمانم بدەیتێ، کە رابەریم دەکەیت ئەوا پێت دەڵێم کە بۆچی هاتووم، ئەویش بەڵێنی ئەوەی پێ دەدات، جا ئەویش پێی دەڵێ: کە بۆچی هاتووەو عەودالّی دوای چییە، عەلی دەڵێ: ئەوەی کە ژنەوتووتە لەم بارەیەوە راستەو دروستەو ئەو پیاوە بەڕاستی فرستادەو پێغەمبەری خودایە، کەوایە بەیانی لەشوێنی منەوە وەرە، ئەگەر شتێکی وام بینی کە زیانو مەترسی هەبوو بۆ تۆ ئەوە دەوەستم لەپاڵ دیوارێکا، گوایا دەست بەئاو دەگەیەنم، تۆش دوور بەدوور چاوەڕوانم بکە، جا کە لەوجێگەیە دەستم کرد

بەڕۆیشتن دیسان شوێنم بکەوەرەوە، تامن چوومە کوێوە تۆیش لەدوامەوە وەرە ژوورەوە، ئەویش وادەکا، لەدوایەوە دەڕوا تا دەچنە لای پێغەمبەرو ئەبو زەڕ گوێ لە فەرمایشتەکانی دەگریو هەر لەوێدا ئیسلام دەبێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: (بچۆرەوە بۆ ناو هۆزەکەتو قسەیان بۆ بکەو هەواڵیان پێ بدە، هەتا فەرمانی خۆمت بۆ دێ، ئەوجا وەرەوە بۆلام. ئەبو زەڕ دەڵێ: بەو خودایەی کە گیانی من والەدەستی تەوانایی ئەودا، بانگەوازی وشەی یەکتایی خودا، لەناو جەرگەی کۆمەڵەکەیانا، بەبێ پەروا بەدەنگێکی بەرز هەڵ دەدەم. جا ئەبو زەڕ (رەزای خودای لێ بێ) دەردەچێو دەڕوا تادەچێتە مزگەوتو لەوێ بەهەموو هێزی خۆی بانگەواز هەڵ دەداو دەڵێ: {أَشْهَدُ أَنْ لا إِلـهَ إِلاَّ اللّـه وَأَنَّ مُحَمّداً رَسُولُ اللّـهِ} : شایەتی دەدەم کەهەر خودا خۆی خودای راستو دروستەو جگە لەیەزدانی پاك خودای تر نییە، ئەگەر گریمان کەسێ بڵێ خوای تر هەیە درۆیە، وەشایەتیش دەدەم کە موحەممەد پێغەمبەرو رەوانەکراوی خودایە).

ئیتر کەئەبو زەڕ وادەڵێ، هۆزی بت پەرست بۆی هەڵ دەستنو دەچنە وێزەیو تێرو پڕی دەکوتنو شل کوتی مەرگی دەکەن، تا رایدەخەنو لەگولو گۆی دەخەن!

تا عەبباس دەچێو خۆی دەدا بەسەریداو دەڵێ: خانە خراپینە! ئەدی خۆتان نازانن کە ئەمە لەهۆزی غیفارەو غیفارییە، رێگەی بازرگانی خۆشتان کەدەچن بۆ شام بەسەر ئەو هۆزەدا تێ دەپەڕێ!

جا بەم شێوەیە عەبباس ئەبو زەڕ رزگار دەکا لەدەستیان لەپاشا لەڕۆژی دواییشدا هەروا دەکاتەوەو ئەوانیش پەلاماری دەدەنەوەو دیسانەوە سەرو گوێلاکی دەکوتنەوەو جەزرەبەی دەدەنەوە، هەمدیسان عەبباس خۆی دەداتەوە بەسەریاو رزگاری دەکاتەوە لەدەستیان). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٣٥٠٧ چ/٤ = باسی گەورەیی کۆمەڵێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)} .

## ١٣٠١) باسی گەورەیی ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ).(٦٣٥٥-٦٣٥٦)
## بَابٌ: فِي فَضَائِلِ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِي (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)

١٧٠٦- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِي (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهُوَ نَازِلٌ بِالْجِعْرَانَةِ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَأَتَى رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَجُلٌ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ: أَلاَ تُنْجِزُ لِي يَا مُحَمَّدُ مَا وَعَدْتَنِي؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَبْشِرْ». فَقَالَ لَهُ الأَعْرَابِيُّ: أَكْثَرْتَ عَلَيَّ مِنْ أَبْشِرْ. فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلَى أَبِي مُوسَى وَبِلاَلٍ كَهَيْئَةِ الْغَضْبَانِ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذَا قَدْ رَدَّ الْبُشْرَى فَاقْبَلاَ أَنْتُمَا». فَقَالاَ: قَبِلْنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ. ثُمَّ دَعَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ فِيهِ وَمَجَّ فِيهِ ثُمَّ قَالَ: «اشْرَبَا مِنْهُ، وَأَفْرِغَا عَلَى وُجُوهِكُمَا وَنُحُورِكُمَا وَأَبْشِرَا». فَأَخَذَا الْقَدَحَ، فَفَعَلاَ مَا أَمَرَهُمَا بِهِ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَنَادَتْهُمَا أُمُّ سَلَمَةَ مِنْ وَرَاءِ السِّتْرِ: أَفْضِلاَ لأُمِّكُمَا مِمَّا فِي إِنَائِكُمَا، فَأَفْضَلاَ لَهَا مِنْهُ طَائِفَةً. {الحديث: ٦٣٥٥ = ٦٣٦٤ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٩٤ = ٤٣٢٨، ١٨٨، ١٩٦}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەرا بووم، لەجیعرانە دابەزیبوو، کە جیعرانە وا لەنێوانی مەککەی پیرۆزو مەدینەی نازداردا، بیلالیشی لەخزمەتا بوو، عارەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی، گوتی: ئەی موحەممەد! گفتت پێم داوە، کە لەم تالآنییە بەشم بدەیت، کوا گفتەکەت؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (موژدەبێ لەتۆ). ئەویش گوتی: زۆرت پێ گوتووم موژدەبێ لەتۆ! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەك کەسێ دلگیربێ لە قسەکەی کابرا، ڕووی کردە ئەبو مووساو بیلال‌و فەرمووی: (خۆ دیتان ئەمە موژدەی ناوێ‌و دایەوە بەسەرما، چونکە نرخی نازانێ، دەی ئێوە ئەو موژدەیە وەربگرن بۆ خۆتان). ئەوانیش گوتیان: قوربان! ئێمە قەبووڵمانە.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای جامێ ئاوی کردو هەردوو دەست‌و دەم‌و چاوی خۆی تیا شۆردو قۆمێ ئاوی هەلگرت‌و لەدەمی خۆی وەرداو تفانیەوە ناو

جامەکەو، ئەوجا بە ئێمەی فەرموو: (لێی بخۆنەوەو لێی بپرژێنن لەدەمو چاوو سینگو بەرۆکی خۆتان، وە موژدەبێ لێتان).

ئەوانیش جامەکەیان لێ وەرگرتو فەرمانەکەی پێغەمبەریان بەجێ هێنا، ئوم سەلەمەیش (رەزای خودای لێ بێ) کە هاوسەری پێغەمبەرە، لەپشتی پەردەوە، بانگی لێ کردن: لەئاوی جامەکەتان بەشی ئەم دایکی خۆشتانە بهێڵنەوە. ئەوانیش چۆڕێکیان تیادا هێشتەوە بۆی). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٣٥٢٧ ج/٤ = باسی ئەبو مووساو ئەبو عامیر}.

**روونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیەیش بەڵگەیەکی گەورەو رۆشنە لەسەر ئەم بابەتانە، وەك لە شەرحەکانا دەفەرموێ:

١- وەڵام نەدانەوەی پیاوی نەفامو پشتگوێ خستنی، مەگەر لەکاتی پێویستدا.

٢- موژدەی خۆشی پێ دان سوننەتە.

٣- بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر خۆ پیرۆزکردنو خۆ موفەڕك کردن بە شوێنەواری پیاوچاکانو شتی وا سوننەتەو دوورە لە بیدعەت، وە ئەمەیش مەرج نییە، وەك هەندێ کەس دەڵێن، تایبەت بێ، بە شوێنەوارو ئاکاری پێغەمبەرانەوە، بەڵکوو دروستە خۆ پیرۆزکردن بەشوێنەواری هەموو پیاو چاکێ بەمەرجێ پیاو چاك بێ.

### ١٣٠٢) باسی گەورەیی ئەبو مووساو ئەبو عامیری ئەشعەری (رەزای خودایان لێ بێ). (٦٣٥٥ - ٦٣٥٦)

### بَابٌ: فِي فَضَائِلِ أَبِي مُوسَى وَأَبِي عَامِرٍ الأَشْعَرِي (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا)

١٧٠٧- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا فَرَغَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ حُنَيْنٍ بَعَثَ أَبَا عَامِرٍ عَلَى جَيْشٍ إِلَى أَوْطَاسٍ، فَلَقِيَ دُرَيْدَ بْنَ الصِّمَّةِ، فَقُتِلَ دُرَيْدُ بْنَ الصِّمَّةِ، وَهَزَمَ اللَّهُ أَصْحَابَهُ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: وَبَعَثَنِي مَعَ أَبِي عَامِرٍ، قَالَ: فَرُمِيَ أَبُو

عَامِرٍ فِي رُكْبَتِهِ، رَمَاهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي جُشَمٍ بِسَهْمٍ، فَأَثْبَتَهُ فِي رُكْبَتِهِ فَانْتَهَيْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا عَمِّ مَنْ رَمَاكَ؟ فَأَشَارَ أَبُو عَامِرٍ إِلَى أَبِي مُوسَى فَقَالَ: إِنَّ ذَاكَ قَاتِلِي تَرَاهُ، ذَلِكَ الَّذِي رَمَانِي، قَالَ أَبُو مُوسَى: فَقَصَدْتُ لَهُ فَاعْتَمَدْتُهُ فَلَحِقْتُهُ، فَلَمَّا رَآنِي وَلَّى عَنِّي ذَاهِبًا فَاتَّبَعْتُهُ، وَجَعَلْتُ أَقُولُ لَهُ: أَلاَ تَسْتَحْيِي؟ أَلَسْتَ عَرَبِيًّا؟ أَلاَ تَثْبُتُ؟ فَكَفَّ، فَالْتَقَيْتُ أَنَا وَهُوَ، فَاخْتَلَفْنَا أَنَا وَهُوَ ضَرْبَتَيْنِ، فَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ فَقَتَلْتُهُ، ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى أَبِي عَامِرٍ فَقُلْتُ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ قَتَلَ صَاحِبَكَ. قَالَ: فَانْزِعْ هَذَا السَّهْمَ، فَنَزَعْتُهُ، فَنَزَا مِنْهُ الْمَاءُ، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي انْطَلِقْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَقْرِئْهُ مِنِّي السَّلاَمَ، وَقُلْ لَهُ: يَقُولُ لَكَ أَبُو عَامِرٍ: اسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: وَاسْتَعْمَلَنِي أَبُو عَامِرٍ عَلَى النَّاسِ، وَمَكَثَ يَسِيرًا، ثُمَّ إِنَّهُ مَاتَ، فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) دَخَلْتُ عَلَيْهِ، وَهُوَ فِي بَيْتٍ عَلَى سَرِيرٍ مُرْمَلٍ وَعَلَيْهِ فِرَاشٌ، وَقَدْ أَثَّرَ رِمَالُ السَّرِيرِ بِظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَجَنْبَيْهِ، فَأَخْبَرْتُهُ بِخَبَرِنَا وَخَبَرِ أَبِي عَامِرٍ، وَقُلْتُ لَهُ، قَالَ: قُلْ لَهُ يَسْتَغْفِرْ لِي. فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهُ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ أَبِي عَامِرٍ»، حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِنْ خَلْقِكَ، أَوْ مِنَ النَّاسِ». فَقُلْتُ: وَلِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَاسْتَغْفِرْ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ وَأَدْخِلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُدْخَلاً كَرِيمًا». قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: إِحْدَاهُمَا لأَبِي عَامِرٍ، وَالأُخْرَى لأَبِي مُوسَى). {الحديث: ٦٣٥٦ = ٦٣٦٥ فم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري/٤، رقم: ١٥٩٠ = ٤٣٢٣، ٢٨٨٤، ٦٣٨٣ فتح الباري}:

ئەبو بوردە فەرمووی: باوکم ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: کاتیٚ پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) لەغەزای حونەین لیٚ بۆوە، ئەبو عامیری مامەمی کرد بەسەرکردەی لەشکریٚكو ناردی بۆ دۆڵی ئەوتاس، لەویٚ بەرەنگاری دورەیدی کوڕی صیممە دەبن، وە دورەید خۆی کوژراو هاوڕیٚکانی لەسایەی خوداوە لەشەڕەکەدا دەشکیٚنو هەڵدیٚن.

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: منیش بەفەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ ئـەبو عـامیردا چـووم بـۆ ئـەم غەزایـە، لەشـەڕەکەدا کابرایـەکی بـەنی جەشەمی، تیرێکی لە ئەژنۆی ئـەبو عـامیردا، تیرەکە تێـی هەڵچەقیو لـە ئەژنۆیـدا جێگیربـوو، منـیش خـۆم گەیانـدە لای مامـەمو پـێم گـوت: مامـە کـێ ئـەم تـیرەی پێوەنـای؟ ئـەویش ئاماژەی بـۆم کـردو گـوتی: هـۆ ئـەو پیـاوە بکوژی منـە، منـیش نیشتمە سەریو گرتمەوە، کەهەستی پێم کـردو منـی بینـی رایکـرد، منـیش شـوێنی کەوتمو خۆش خۆش تانەم لێ دەداو پێیم دەگوت: ئەوە شەرم ناکەی وا رائەکەیت، دیارە عەرەب نیت بۆیـە لەکوشـتن دەترسیتو رادەکەیت، ئەگـەر مـەردی بوەسـتە بۆم، ئەویش شەرم گرتـیو وەسـتا، ئـیتر بـە شمشێر بەربووینـە یـەکتری، مـن ئـەوم کوشت بەشمشێر!!

ئەوجا گەڕامەوە بۆلای ئـەبو عـامیرو پـێم گـوت: مامـە! کـابرای تـۆی وا لێکـرد، خودا لەکۆڵی کردەوەو بەشمشێر کوشتم.

فەرمووی: ئادەی ئەمجا ئەم تیرە لە ئەژنۆم دەرکێشە، کاتێ تیرەکەم لە ئـەژنۆی دەرکێشا، لەجێی تیرەکەوە ئاوی لینجی لێ هات!

جا ئەبو عامیر فەرمووی: سڵاوم رابگەیەنـە بـە پێغەمبـەری خـودا، وە عـەرزی بکـە: ئـەبو عـامیر عـەرزی دەکـردی کـە داوای لێخۆشـبوونی لـەخودا بـۆ بکـەی. فەرمووی: ئەبو عامیر منی لەجێی خۆی کرد بەسەر لەشکرو پاش کـەمێ عـەمری حەقی بەجێ هێناو مرد (رەزای خودای لێ بێ).

کاتێ گەڕامەوە چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەماڵی خـۆی بـوو، لەسەر تەختێ بوو، رایەڵی تەختەکە بە پووشی پەلکە خورما چنرابوو، ئـەوەی کـە پێـی بلێـی رایـەخو بـەڕەو شـتی وا بەسـەریەوە نـەبوو، پەلکـە خورماکـانی رایـەڵی چـارپایەکە چـەقیبوونە پشـتو هـەردوو لاتەنیشـتی پێغەمبـەر، شـوێن شـریتی تەختەکە، وەك نـەخش نەخشابوو، جا دەنگـو باسی خۆمـانو بـاسو خواسـی ئـەبو

عامیرم بۆی گێڕایەوە، ئەوەیشم بۆیگێڕایەوە کە ئەبو عامیر داوای کردبوو لێی کەبۆی بپاڕێتەوە.

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای ئاوی کردو دەسنوێژی پێ گرتو هەردوو دەستی خۆی ئەوەندە هەڵبڕی هەتا سپیدەی هەردوو بنباخەڵی دەرکەوتن. ئەوجا فەرمووی: دەستی کرد بەنزاکردنو فەرمووی: (خودایە! خۆشبە لەبەندە بچکۆلەکەی خۆت لە ئەبو عامیر، ئەی خودایە! لەڕۆژی دوا ڕۆژدا، لەسەرووی زۆر لە دروستکراوانی خۆتەوە دایبنێ!).

منیش عەرزیمکرد: قوربان! دەبفەرموو بۆ منیش داوای لێ بووردنو لێخۆشبوون بکە، فەرمووی: (خودایە! لە گوناهی عەبدوڵلای کوڕی قەیس خۆشبەو، لەڕۆژی قیامەتا، لە پایەیەکی بەڕێزدا دایبنێ!).

ئەبو بوردە فەرمووی: نزای یەکەم کە پێغەمبەر کردی، بۆ ئەبو عامیری کرد، نزای دووەمیش کە پێغەمبەر کردی، بۆ ئەبو مووسای کرد). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٣٥٢٧ چ/٤ = باسی ئەبو مووساو ئەبو عامیری ئەشعەری}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- لەکاتی نزاکردندا دەست هەڵبڕین سوننەتە. نەوەوی دەفەرموێ: ئەوەی کە ئیمامی ئەنەس دەفەرموێ: پێغەمبەر، لەسێ شوێندا، لەکاتی نزادا دەستی هەڵبڕیوەو بەس، ئەوە ئەنەس بەس لەوسێ شوێنەدا دیوێتی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی هەڵبڕیوە، دەنا، ساخ بۆتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی نزادا لە (٣٠) شوێن زیاتردا، دەستی هەڵبڕیوە. {بڕوانە: ژمارە: ١١٥٨ لەپێشەوە ڕابورد}.

٢- لەکاتی نزاکردندا دەستنوێژ سوننەتە.

**١٣٠٣) باسی گەورەیی ئەبو هورەیرە، کە دەوسییە، واتە: لەهۆزی دەوسە (رەزای خودای لێ بێ). (٦٣٤٦ - ٦٣٥٠)**

**بابٌ: فِي فَضْلِ أَبِي هُرَيْرَةَ الدَّوْسِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)**

١٧٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أَدْعُو أُمِّي إِلَى الإِسْلاَمِ، وَهِيَ مُشْرِكَةٌ. فَدَعَوْتُهَا يَوْمًا فَأَسْمَعَتْنِي فِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَا أَكْرَهُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَأَنَا أَبْكِي، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي كُنْتُ أَدْعُو أُمِّي إِلَى الإِسْلاَمِ، فَتَأْبَى عَلَيَّ، فَدَعَوْتُهَا الْيَوْمَ، فَأَسْمَعَتْنِي فِيكَ مَا أَكْرَهُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَهْدِيَ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «اللَّهُمَّ اهْدِ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ». فَخَرَجْتُ مُسْتَبْشِرًا بِدَعْوَةِ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَلَمَّا جِئْتُ فَصِرْتُ إِلَى الْبَابِ، فَإِذَا هُوَ مُجَافٌ، فَسَمِعَتْ أُمِّي خَشْفَ قَدَمَيَّ، فَقَالَتْ: مَكَانَكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، وَسَمِعْتُ خَضْخَضَةَ الْمَاءِ، قَالَ: فَاغْتَسَلَتْ وَلَبِسَتْ دِرْعَهَا، وَعَجِلَتْ عَنْ خِمَارِهَا، فَفَتَحَتِ الْبَابَ، ثُمَّ قَالَتْ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. قَالَ: فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَأَتَيْتُهُ وَأَنَا أَبْكِي مِنَ الْفَرَحِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَبْشِرْ، قَدِ اسْتَجَابَ اللَّهُ دَعْوَتَكَ، وَهَدَى أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: خَيْرًا. قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُحَبِّبَنِي أَنَا وَأُمِّي إِلَى عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ وَيُحَبِّبَهُمْ إِلَيْنَا. قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «اللَّهُمَّ حَبِّبْ عُبَيْدَكَ هَذَا (يَعْنِي أَبَا هُرَيْرَةَ) وَأُمَّهُ إِلَى عِبَادِكَ الْمُؤْمِنِينَ، وَحَبِّبْ إِلَيْهِمُ الْمُؤْمِنِينَ»، فَمَا خُلِقَ مُؤْمِنٌ يَسْمَعُ بِي وَلاَ يَرَانِي إِلاَّ أَحَبَّنِي). {الحديث: ٦٣٤٦ = ٦٣٥٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دایکم بتپەرست بوو، دەمویست کە ئیسلامی بکەم، ملی نەدەدا، جا رۆژێ دام بەگوێیدا کە موسوڵمان ببێ، کەچی قسەی ناشیرینی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوت: منیش زۆرم پێ ناخۆش بوو، بەگریان چووم بۆ خزمەتی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیم کرد، ئەی پێغەمبەری خودا! ماوەیەکە دەمەوێ دایکم موسوڵمان بکەم، بەڵام مل نادا، ئەمڕۆ رووم لێنا کە موسوڵمان ببێ، بەڵام بەگوێی نەکردمو سەرەڕای ئەوەش قسەی

ناخۆشی بەتۆ گوت، کە زۆرم پێ ناخۆشە، جا لەخودا داوابکە کە رێگەی راستی پێ نیشان بدا، فەرمووی: ئەی خودایە! رێنموونی دایکی ئەبو هورەیرە بکە).

جا منیش بەدڵێکی خۆشەوە بەهۆی نزاکەی پێغەمبەرەوە گەڕامەوە، کە گەیشتمە بەردەرگا، روانیم دەرگاکە داخراوە، دایکم گوێی لەدەنگو خشپەی پێم بوو، فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە! لەجێی خۆت بوەستە، لەهەمان کاتا گوێم لە خوڕەو شڵپە شڵپی ئاو بوو. گوتی: تمەز ئەمە خۆی دەشۆرێ، لەپاشا بەپەلە کراسەکەی لەبەرکردو دەرگاکەی کردەوە، لەخۆشیانا لەبیری چوو بوو سەرپۆشەکەی بداتەوە بەسەر خۆیدا، ئینجا دایکم موسوڵمان بوونی خۆی رناگەیاندو فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە! {أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ: شایەتی دەدەم بەزبانو بەدەمو، بەدڵ باوەڕ دەکەم، کەهیچ خودایێ نییە یەزدانی پاك نەبێ، وە گەواهو شایەتی دەدەم بە دەمو بە زبانو بەدڵ باوەڕ دەکەم کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری ئەوە}.

ئیتر منیش بەدڵخۆشی گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر (درووەدی خودای لەسەر بێ) بەلام لەخۆشیانا دەستم کرد بەگریان، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! موژدەت لێ بێ، خودا دووعاو نزاکەی تۆی گیراکرد، دایکم لەسایەی خوداوە موسوڵمان بوو، رێی هەقی گرت.

جا پێغەمبەر (درووەدی خودای لەسەر بێ) ستایشو سوپاسی جوانی خودای کردو گەلێ قسەی باشی کرد. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بپاڕێرەوە لەخودا کەمنو دایکم، لەلای موسوڵمانانی بەندەکانی خۆی خۆشەویست بکاو ئەوانیش لەلای ئێمە خۆشەویست بکا. فەرمووی: ئەی خودایە! ئەم بەندۆکە، بەندە بچکۆلەی خۆت لەگەڵ دایکیا هەردووکیان خۆشەویست بکە لەلای موسوڵمانانی بەندەکانی خۆت، وە موسوڵمانانیش خۆشەویست بکە لەلای ئەوان!

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆیە ئەوەی موسوڵمان بێ‌و ناوی من ببیستێ، منی خۆش دەوێ، باخۆشم نەبینێ‌و هەر لەدوورەوە ناوم ببیستێ).
{تاج/٣، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٣٥٢٢ ج/٤ = باسی ئەبو هورەیرە}.

١٧٠٩- عَنِ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: أَلاَ يُعْجِبُكَ أَبو هُرَيْـرَةَ جَاءَ فَجَلَسَ إِلَى جَنْبِ حُجْرَتِي، يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُسْمِعُنِي ذَلِكَ، وَكُنْتُ أُسَبِّحُ، فَقَامَ قَبْلَ أَنْ أَقْضِيَ سُبْحَتِي، وَلَوْ أَدْرَكْتُهُ لَرَدَدْتُ عَلَيْهِ، إِنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لَمْ يَكُنْ يَسْرُدُ الْحَدِيثَ كَسَرْدِكُمْ. قَالَ: ابْنُ شِهَابٍ، وَقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: يَقُولُونَ: إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَدْ أَكْثَرَ وَاللَّـهُ الْمَوْعِـدُ، وَيَقُولُـونَ: مَـا بَـالُ الْمُهَـاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ لاَ يَتَحَدَّثُونَ مِثْلَ أَحَادِيثِهِ، وَسَأُخْبِرُكُمْ عَـنْ ذَلِـكَ: إِنَّ إِخْـوَانِي مِـنَ الأَنْصَـارِ كَـانَ يَشْغَلُهُمْ عَمَلُ أَرَضِيهِمْ، وَإِنَّ إِخْوَانِي مِنَ الْمُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالأَسْـوَاقِ، وَكُنْـتُ أَلْزَمُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلَى مِلْءِ بَطْنِـي، فَأَشْـهَدُ إِذَا غَـابُوا، وَأَحْفَـظُ إِذَا نَسُوا، وَلَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمًا: «أَيُّكُمْ يَبْسُطُ ثَوْبَـهُ فَيَأْخُذُ مِـنْ حَدِيثِي هَذَا ثُمَّ يَجْمَعُهُ إِلَى صَدْرِهِ فَإِنَّهُ لَمْ يَنْسَ شَيْئًا سَمِعَهُ»؟ فَبَسَطْتُ بُرْدَةً عَلَيَّ حَتَّى فَرَغَ مِنْ حَدِيثِهِ ثُمَّ جَمَعْتُهَا إِلَى صَدْرِي، فَمَا نَسِيتُ بَعْـدَ ذَلِـكَ الْيَـوْمِ شَيْئًا حَدَّثَنِي بِـهِ، وَلَـوْلاَ آيَتَانِ أَنْزَلَهُمَا اللَّهُ فِي كِتَابِهِ عَزَّ وَجَلَّ مَا حَدَّثْتُ شَيْئًا أَبَدًا: (إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَـا أَنْزَلْنَـا مِـنَ الْبَيِّنَـاتِ وَالْهُـدَى) إِلَـى آخِـرِ الآيَتَـيْنِ). {الحـديث: ٦٣٤٩ = ٦٣٥٨ فـم. تجريـد البخـاري/٤، رقـم: ١٤٢٧م = ٣٥٦٨، ٣٥٦٧. أبـو داود. العلـم: ٣٦٥٥. تحفـة الأشـراف: ١٦٦٩٨}:

عوروە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عائیشەی پوورم (رەزای خودای لێ بێ) پێی فەرمووم: تەماشای ئەبو هورەیرە ناکەی چەند سەیرە، هاتووە لەپاڵ هۆدەکەی منا دانیشتووەو فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە، دەنگیش هەڵ دەبڕێ، تامن گوێم لێ بێ. {ژمارە: ١٥٨٣ }.

عائیشە فەرمووی: من لەوکاتەدا نوێژی سوننەتم دەکرد، هەتا نوێژەکەمم تەواوکرد ئەو ڕۆیشتبوو، دەنا بەرپەرچم دەدایەوەو تێم دەگەیاند: کە پێغەمبەر

(درودی خودای لەسەر بێ) لەقسەکردنا وەك ئێوە بەپەلە نەبوو، نەیدەدا بەسەریەکا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وا بەشێنەیی‌و لەسەرخۆ، بە روونی‌و رەوانی فەرمایشتی دەفەرموو، ئەگەر کەسێ بیویستبایە قسەکانی بژمێرێ، بە ئاسانی دەیژماردن. {تەجرید/٤، ژمارە: ١٤٢٧}.

ئیبنو شیهاب، کە ناسراوە بەزوهری، فەرمووی: ئیبنولموسەییەب فەرمووی: ئەبو هورەیرە (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: دەڵێن: ئەبو هورەیرە فەرموودە زۆر دەگێڕێتەوە، وادەی منو وادەی ئەوان دیوانی خودابێ، کە لەوێ راستو درۆ دەردەکەوێو دەردەکەوێ کەکێ لەسەر حەقە، پێم دەڵێن: ئەی بۆ کۆچکاران‌و یاریدەدەران بەقەد تۆ حەدیث‌و فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناگێڕنەوە؟ دەی خۆم پێتان بڵێم کە ئەمە بۆ وایە، چونکە برا یاریدەدەرەکانمان خەریکی خۆش کردنی زەوی‌و زارو فەلایی بوون‌و برا کۆچکارەکانیشمان خەریکی سەوداو ئاڵو وێڵی ناوبازاڕ بوون، بەڵام من، بەنانە سکی، دەلکام بە پێغەمبەرەوەو خزمەتی ئەوم بەرنەئەدا، ئەوانیش لەوێ نەبوونایە من هەر لەخزمەتیا دەبووم، گەلێ شت هەبوو ئەوان دەستیان نەدەپەرژا لەبەری بکەن، لەبەرئەوە لەبیریان دەچۆوە، بەڵام من مەودام هەبوو، لەبەرم دەکردو بەباشی رەوانم دەکرد، سەرەڕای ئەوەیش، هۆیەکی گرنگتر هەیە: رۆژێ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کامتان دەیەوێ کە فەرموودەی من وەربگرێ‌و لەبیری نەچێتەوە، با جلەکانی دابخات‌و لەم فەرموودانەی منی تێبکاو لەپاشا کە من لێ بوومەوە لەقسەکردن، جلەکەی کۆبکاتەوەو بینێت بەسینگیەوە، ئیتر هەر فەرموودەیێ لەمن ببیستێ قەت لەبیری ناچێ).

ئەبو هورەیرە فەرمووی: جامنیش بەرماڵێکم بەسەرشانەوە بوو، رام خست هەتا لە فەرمایشتەکەی لێ بۆوە، ئینجا چمکەکانی بەرماڵەکەم کۆکردەوەو گرتم بەسینگ‌و بەرۆکمەوە، ئیتر لەورۆژە بەدواوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەرچی فەرمووبێ پێم، فەرامۆشم نەکردووەو قسەی ئەوم لەبیرنەچووە!

لەبەر ئەم دوو ئایەتەش نەبێ کە خودا لەنامەی خۆیدا ناردوونی، بېڕای بېڕای هیچ فەرموودەیەکم نەدەگێڕایەوە، ئەمەیش ئەو دوو ئایەتانەیە:

{إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ، إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ – البقرة – ٢/ ١٥٩ - ١٦٠}:

واتە: بەڕاستی ئەو زانایانە کە ئەو ئایەتو بەڵگە ڕۆشنانە دەشارنەوە، کە ئێمە نازڵمان کردوون بۆ شارەزاکردنی بەرەی ئادەم بۆ ڕێگەی ڕاست، پاش ئەوەی کەزۆر بەجوانی بەپێی پێداویستو شوێن، ڕۆشنمان کردنەوە لەتەوراتا، کە نامەی خودایە، تا ئەو خەڵکە تێ بگەن. بەڕاستی ئەم بەناو زانایانە، ئەم جۆرە مالوومو قەشە هەق حەشاردەرانە هەموویان خودای گەورە خۆی لەعنەتو نەفرەتیان لێ دەکا، وە هەروەها نەفرینکەرانی تریش لەعنەتو نەفرینیان لێ دەکەن، وەك فریشتەکانی خوداو پیاوانی سەر بەئایین، مەگەر ئەوانەیان کە پەشیمان ببنەوە لەشاردنەوەی زانستی ئایینی. وە خوو ڕەوشتو ڕەفتارو کرداری خۆیان چاك بکەن، وەشتە حەشاردراوەکەیان ئاشکرا کردو دەریان بڕی، تەنیا ئەمانەیان تەوبەو پەشیمان بوونەوەیان لێ گیرا دەکەم، چونکی من تەوبەو پەشیمانی بەندەی تەوبەکاری پەشیمانی خۆم قەبووڵ دەکەم، من لەهەموو کەسێ میهرەبانترم بۆ بەندەی خۆم. {تاج/٣، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٣٥٢١ ج/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٣٣٥٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}. گەورەیی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب.

## ١٣٠٤) باسی گەورەیی ئەبو دوجانە: سەماکی کوڕی خەرەشە (ڕەزای خودای لێ بێ). (٦٣٠٣)

## بَابٌ: فِي فَضْلِ أَبِي دُجَانَةَ سِمَالِ بْنِ خَرَشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ)

١٧١٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (صَلَّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَمَ) أَخَذَ سَيْفًا يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: «مَنْ يَأْخُذُ مِنِّي هَذَا»؟ فَبَسَطُوا أَيْدِيَهُمْ، كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ يَقُولُ: أَنَا، أَنَا.

قَالَ: «فَمَنْ يَأْخُذُهُ بِحَقِّهِ»؟ قَالَ: فَأَحْجَمَ الْقَوْمُ، فَقَالَ سِمَاكُ بْنُ خَرَشَةَ أَبُو دُجَانَةَ: أَنَا آخُذُهُ بِحَقِّهِ. قَالَ: فَأَخَذَهُ فَفَلَقَ بِهِ هَامَ الْمُشْرِكِينَ). {الحديث: ٦٣٠٣ = ٦٣١١ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەرۆژی غەزای ئوحوددا، شمشێرێکی هەڵگرتو فەرمووی: (کێ ئەمەم لێ وەردەگرێ؟).

هەموویان دەستیان بۆی درێژ کردو هەرکەسە دەیگوت: من، من، فەرمووی: (بەڵام کێ بەمەرجی ئەوە وەری دەگرێ کەهەقی خۆیی پێ ئەدا؟).

ئیتر کوڕگەل کشانەوە، بەڵام ئەبو دوجانە: سیماکی کوڕی خەرەشە، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! من وەری دەگرمو هەقی خۆیی دەدەمێ.

فەرمووی: جا ئەبو دوجانە شیرەکەی وەرگرتو کەللەی بتپەرستەکانی پێ یەکالا دەکردەوەو شەقوپەق دەکرد!. {تاج/٣، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٣٤٨٣ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو دوجانە ناوی سیماکی کوڕی خەرەشەیە، ئەنصارییە، ساعیدییە، ئامادەی جەنگی بەدربوو، لەخزمەتی پێغەمبەردا، لەڕۆژی ئوحوددا، لەگەل موصعەبی کوڕی عومەیردا، بەرگرییەکی گرنگیان لە پێغەمبەر کرد، موصعەب شەهید بوو، لەکوشتنی موسەیلەمەی کەذذابدا، لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمو وەحشی کوڕی حەربدا هاوبەشی کرد، لەغەزای ئوحوددا، لەکاتی بەرگریی لە پێغەمبەر زامی زۆری لێ کرا. کاتێ شمشێرەکەی لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وەرگرت، عەرزی کرد: قوربان حەقی خۆی چییە کەپێی بدەم؟

فەرمووی: (هەرگیز موسوڵمانی پێ نەکوژی، کە ئەو شمشێرەشت پێ بوو لەبەر بێبڕوا هەڵ نەیەیت!!).

ئەبو دوجانە (رەزای خودای لێ بێ) لەیەمامە شەهید بوو. {تاج/٣، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٣٤٨٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}. چاکێتیی سیماکی کوڕی خەرەشە.

## ١٣٠٥) باسی گەورەیی ئەبو سوفیان، کەناوی صەخری کوڕی حەربە (ڕەزای خودای لێ بێ). (٦٣٥٩)

## بابٌ: فِي فَضْلِ أَبِي سُفْيَانَ: صَخْرِ بْنِ حَرْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)

١٧١١- عَنْ أَبِى زُمَيْلٍ قَالَ: حَدَّثَنِى ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ لاَ يَنْظُرُونَ إِلَى أَبِى سُفْيَانَ وَلاَ يُقَاعِدُونَهُ، فَقَالَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا نَبِيَّ اللَّهِ ثَلاَثٌ أَعْطِنِيهِنَّ، قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: عِنْدِى أَحْسَنُ نِسَاءِ الْعَرَبِ وَأَجْمَلُهُ: أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ أَبِى سُفْيَانَ أُزَوِّجُكَهَا، قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: وَمُعَاوِيَةُ تَجْعَلُهُ كَاتِبًا بَيْنَ يَدَيْكَ. قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: وَتُؤَمِّرُنِى حَتَّى أُقَاتِلَ الْكُفَّارَ كَمَا كُنْتُ أُقَاتِلُ الْمُسْلِمِينَ. قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ أَبُو زُمَيْلٍ: وَلَوْلاَ أَنَّهُ طَلَبَ ذَلِكَ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا أَعْطَاهُ ذَلِكَ، لأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُسْئَلُ شَيْئًا، إِلاَّ قَالَ: «نَعَمْ». {الحديث: ٦٣٥٩ = ٦٣٦٨ فم}:

ئەبو زومەیل فەرمووی: ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپێشدا موسوڵمانان بەچاوێکی باش تەماشای ئەبو سوفیانی باوکی موعاوییەیان نەدەکردو لەگەڵیا دانەدەنیشتن لەبەر کردەوەی پێشووی، تا ئەبو سوفیان عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم سێ شتەم پێ خەڵات بکەو ئەو سێ تکایەم هەیە لەخزمەتتا، فەرمووی: (بەڵێ باشە).

ئەبو سوفیان فەرمووی: ئوم حەبیبەی کچم کە ئافرەتی وا جوانو نازداری تر کەم هەیە لەناو عەرەبا، کە بۆ خانەدانیش کچی ئەبو سوفیانە، دەمەوێ خۆم مارەی بکەمەوە لێتو مارە بڕینەوەکەی تازە بکەمەوە بۆت.

فەرمووی: (بەڵێ، باشە).

ئەبو سوفیان فەرمووی: موعاوییەی کوڕیشم بکە بە میرزای بەردەستی خۆت. فەرمووی: (بەڵێ باشە).

فەرمووی: (خۆشم بکە بەسەرلەشکر تا چۆن کاتی خۆی لەدژی سوپای موسوڵمانان شەڕم دەکرد ئێستایش ئاوا شەڕبکەمەوە لەدژی لەشکری کافرانو بێباوەڕان)، فەرمووی: (بەڵێ باشە).

ئەبو زومەیر فەرمووی: خۆی داوای ئەم داواکارییانەی کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەنا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوانەی لەخۆیەوە پێ نەدەدا. چونکە عادەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو دەستی نەدەنا بەرووی کەسەوە، داوای هەرشتێکیان لێ دەکرد بەپێی توانا دەیفەرموو: باشە). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٣٤٢٤} چاکێتیی ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب.

**روونکردنەوە:**

ئەبو سوفیان ناوی صەخری کوڕی حەربە، لەپێش ئیسلام بوونا، دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام‌و موسوڵمانان بوو، دایکی ئەبو سوفیان ناوی صەفییەی کچی حەربی ئەلهیلالییەیە، لە باوکەوە پووری مەیمونەی هاوسەری پێغەمبەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەر هەموو هاوەڵ‌و هاوسەرو پەیڕەوانی بێ). ئەبو سوفیان بەتەمەن دەساڵ لە پێغەمبەر گەورەتر بوو، ساڵی ئازادکردن (فەتح)ی مەککە ئیسلام بوو، لەغەزای حونەینا لەگەڵ موسوڵمانانا بوو، هەروا لەغەزای تائیفا، لەرۆژی ئوحودو لەرۆژی ئەحزابا، سەرۆکی بتپەرستەکان بوو، بەرلەوە ئەبو سوفیان ئیسلام ببێ، پێغەمبەر ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانی مارەکرد بۆ خۆی، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: ئیبنو عەبباس‌و قەیسی کوڕی حازیم‌و موعاوییەی کوڕی. لەڕۆژی غەزای طائیفا چاوێکی پێکرا، چوو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد، دەبینی چاوم لەرێگەی خوادا ئاوا پێکراوە، فەرمووی: (ئەگەر ئارەزوو دەکەیت لەخودا دەپاڕێمەوە چاوت چاك دەکاتەوە، حەزیش دەکەیت لەباتی چاوت خودا بەهەشتت پێ دەدا). فەرمووی: بەهەشت هەڵ دەبژێرم.

لەئاخرو ئۆخری تەمەنیدا کوێربوو بوو، خولامەکەی دەستی رادەکێشاو چاو ساغی دەکرد، لەسەردەمی جێنشینی پێشەوا عوثمان دا، بە دەردی خودا، لەتەمەنی هەشتاو هەشت ساڵیدا، لەشاری مەدینەی نازدار، لەساڵی (٣٠) سیی کۆچیدا، کۆچی دوایی کرد.

دەڵێن: وەك پێی دەگوترێ ئەبو سوفیان، پێشی دەگوترێ: ئەبو حەنظەلە، بەناوی کوڕێکی تریەوە کەناوی حەنظەلە بووە، گوایە لەغەزای بەدرا، بەکافری، بەدەستی ئیمامی عەلی کوژراوە. بڕوانە ئەم جێگەیانە:

١- پوختەی صەحیحی موسلیم، ژیاننامەی ئوممولموئمنین، مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر، ژمارە: (١١٧) لەپێشەوە رابورد.

٢- ئوم حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەر، کچی ئەبو سوفیان ژمارە: (٣٧٠ ).

٣- موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان، ژمارە: (١٩٧).

٤- تەجرید بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم، ژمارە: (٧) ئەبو سوفیان.

٥- تەجرید بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم، ژمارە: (٦٣) معاویە.

٦- تەجرید بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم، ژمارە: (١٥٤) مەیموونە.

٧- تەجرید بوخاری بەکوردی، بەرگی دووەم، ژمارە: (٦١٤) ئوم حەبیبە.

٨- تاج بەرگی سێیەم تەرجەمە کوردییەکەی زنجیرە: (٣٣)، ژمارە: (٣٤٢٢) موعاوییە.

٩- تاج بەرگی/٣، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٣٤٢٤. أبو سوفیان.

١٠- تاج/٢، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٠٩٤ ئوم حەبیبە کەشووی کرد بە پێغەمبەر.

## ١٣٠٦) باسی گەورەیی جولەیبیب (رەزای خودای لێ بێ). (٦٣٠٨)

## بَابٌ: فِي فَضْلِ جُلَيْبِيب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

١٧١٢- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ فِي مَغْزًى لَهُ، فَأَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَقَالَ لأَصْحَابِهِ: «هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ»؟ قَالُوا: نَعَمْ فُلاَنًا، وَفُلاَنًا، وَفُلاَنًا، ثُمَّ قَالَ: «هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ»؟ قَالُوا: نَعَمْ فُلاَنًا، وَفُلاَنًا، وَفُلاَنًا. ثُمَّ قَالَ: «هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ»؟ قَالُوا: لاَ. قَالَ: «لَكِنِّي أَفْقِدُ جُلَيْبِيبًا، فَاطْلُبُوهُ». فَطُلِبَ فِي الْقَتْلَى، فَوَجَدُوهُ إِلَى جَنْبِ سَبْعَةٍ قَدْ قَتَلَهُمْ، ثُمَّ قَتَلُوهُ، فَأَتَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: «قَتَلَ سَبْعَةً ثُمَّ قَتَلُوهُ، هَذَا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، هَذَا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ». قَالَ:

فَوَضَعَهُ عَلَى سَاعِدَيْه، لَيْسَ لَهُ إِلاَّ سَاعِدَا النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، قَالَ: فَحُفِرَ لَهُ وَوُضِعَ فِي قَبْرِهِ. وَلَمْ يَذْكُرْ غَسْلاً). {الحديث: ٦٣٠٨ = ٦٣١٦ فم}:

ئەبو بەرزە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەیەکێ لە غەزاواتەکانی خۆیدا بوو، خودا ماڵی تالآنی زۆری بەسەردا ڕژاندو، تالآنییەکی مفتی بۆ ڕەخسان، فەرمووی بە هاوەڵانی: (ئایا هیچ کەستان لێ کەم بۆتەوە؟) عەرزیان کرد: بەڵێ، فیسارو ئەو فیسارو ئەو فیساری تریش دیارنین.

هەمدیسان فەرموویەوە: (ئایا کەسی ترماوە کەدیار نەبێ؟) گوتیان: ئا، ئەوسێ کەسەیش دیارنین، هەمدیسان فەرموویەوە: (دەی ئیتر کەسی تر ماوە کە بزربێ؟).

گوتیان: نەخەیر، ئیتر کەس نەماوە کەدیار نەبێ. فەرمووی: (با، ماوە، جولەیبیب لەبەرچاوم دیارنییە، ئادەی بچن بۆی بگەڕێن!). کاتێ بۆیگەڕان لەناو کوژراوەکاندا بوو، دۆزییانەوە لەتەنیشتی حەوت کوژراوەوە بوو.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو لەدیاری ڕاوەستاو فەرمووی: (حەوتی لەدوژمن کوشکتووە ئەوسا کوشتوویانە، ئەمە لەمنەو من لەوم، ئەمە لەمنەو من لەوم). فەرمووی: ئیتر هەتا گۆڕیان بۆ هەڵکەندو نایانە ناو گۆڕەکەیەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو باڵی خۆی بۆڕاخستو لاشەکەیی لەباوەشی خۆیدا لەسەر بازووەکانی دانا، لەو ماوەیەدا جگە لەباسکەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچ تەختو رایەخێکی تری لەژێردا نەبوو! ئەبو بەرزە باسی ئەوەی نەکرد: کە ئایا تەرمەکەیان شۆرد یانا). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٣٤٨٤ ج/٤ = چاپی چوارەم} چاکێتی جولەیبیب.

**ڕوونکردنەوە:**

جولەیبیب هاوەڵێکی نازداری پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی ژنی بۆ بخوازێ، پیاوێکی ئەنصاری کچێکی هەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خوازبێنی کچەکەی لەباوكو دایکی کرد بۆ جولەیبیب، بەڵام ژنو مێردەکەی

ئەوەیان پێ ناخۆش بوو، چونکە جولەیبیب کەمێ کورتو کەمێ قەڵەمی نارێك بوو، کاتێ کچەکەیان بەمەی زانی، ئەم ئایەتەی خوێند کە دەفەرموێ:
{وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ - الأحزاب/ ٣٦}:

کە کورتەی مەبەستەکەی ئەمەیە: (بڕیاری خوداو پێغەمبەری خودا لەسەر سەرو لەسەرچاوە، بۆ موسوڵمانان، چ پیاوبێ، چ ژن، نابێ قەت لەبڕیارو فەرمانی خوداو پێغەمبەر دەربچن). ئەوجا کچەکە گوتی: من بەوە رازیم کە پێغەمبەر پێی رازییە بۆم. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای باشی بۆ ئەو کچەکرد، فەرمووی:
(أَللّهُمَّ اصْبُبْ عَلَيْهَا الخَيْرَ صَبّاً وَلاَ تَجْعَلْ عَيْشَهَا كَدّاً: خودایە! وەك شەستە باران خێر بڕێژە بەسەر ئەم کچەدا، بەدووری بگرە لە گوزەرانی دەستکورتیو هەژاری).
جا ئەم کچە شووی کرد بە جولەیبیب، کە جولەیبیب شەهید بوو، لەناو ژنە ئەنصارییە بێوەژنەکانا، لەم کچەیان خۆش گوزەرانتر تیانەبوو).

**١٣٠٧) باسی گەورەیی حەسسانی کوڕی ثابیت** (رەزای خودای لێ بێ). (٦٣٣٤ - ٦٣٤٥)
**بَابٌ: فِي فَضْلِ حَسَّانِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ)**

١٧١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ): أَنَّ عُمَرَ مَرَّ بِحَسَّانَ وَهُوَ يُنْشِدُ الشِّعْرَ فِي الْمَسْجِدِ، فَلَحَظَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أُنْشِدُ وَفِيهِ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَى أَبِي هُرَيْرَةَ فَقَالَ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ أَسَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «أَجِبْ عَنِّي، اللَّهُمَّ أَيِّدْهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ»؟ قَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ). {الحديث: ٦٣٣٤ = ٦٣٤٢ فم. تجريد البخاري/١، رقم: ٢٧٧ = ٤٥٣، ٣٢١٢، ٦١٥٢. فتح الباري. أبو داود. أدب: ٥٠١٣. نسائي. مساجد: ٧١٥. تحفة الأشراف: ١٣١٤٠، ١٥١٥٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەسسانی کوڕی ثابیتی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینەی نازدار، هۆنراوی دەخوێندەوە، عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خودای لێ بێ) لەلایەوە رەت بوو،

بەگۆشەی چاو خێسەیەکی لێ کردو لێی مۆڕ بۆوە، حەسسانیش فەرمووی: من کارێ نابەجام نەکردووە، تاتۆ بێزاریم لێ دەربڕی، ئالەم شوێنی حازریەدا هۆنراوەم تیادا خوێندۆتەوەو، لەوکاتەدا پیاوێ لەتۆ باشتریش لەوێ بووە، کە پێغەمبەر بوو (درودی خودای لەسەر بێ) وە کارەکەی منی لەلا پەسەند بوو، ئەوجا حەسسان رووی کردە منو فەرمووی: توخوا ئەی ئەبو هورەیرە! ئایا تۆ بۆخۆت لە پێغەمبەرت نەبیستووە کە بەمن بفەرموێ: (ئەی حەسسان! لەجیاتیی من، تۆ بەشیعر وەرامو بەرپەرچی تانەو تەشەرو رەخنەی بێبڕواکان بدەرەوە، خودایە! بەگیانی پاك، کە جوبرائیلە پشتیوانی حەسسان بکە)؟ واتە: بەهۆی جوبرائیلەوە یاریدەی حەسسان بدە، لەدانانی شیعردا، بۆ لەسەرکردنەوەی پێغەمبەری خودا. ئایا ئەی ئەبو هورەیرە! تۆ ئەمەت لە پێغەمبەر بیستووە یانا؟ ئەبو هورەیرە فەرمووی: منیش گوتم: خودا ئاگادارە کەچۆن دەڵێی، ئەی حەسسان وایەو، قسەکەت راستو دروستە). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٣٤٩٥ چ/٤}. چاکێتی حەسسانی کوڕی ثابیت.

**روونکردنەوە:**

حەسسانی کوڕی ثابیت، هاوەڵێکی ناسراوی پێغەمبەرە، شاعیرێکی جوان بوو، ناسراوە بە شاعیری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەژمارە (١٧١٦دا، لەدواوە چامەیەکی جوانی تۆمارکراوە، حەسسان ئەنصارییە، خەزرەجییە، دایکی ناوی فورەیعە، بە ئیسلاما گەیشتووە، موسوڵمان بووە، لەگەڵ ژنانا پەیمانی دا بە پێغەمبەر.

حەسسان بەم سێ بەهرەیە باو دەدرێ بەسەر شاعیرانا:

١- لەسەردەمی نەزانیدا، شاعیری ئەنصارەکان بوو.

٢- لەسەردەمی ئیسلاما شاعیری پێغەمبەر بوو.

٣- شاعیری سەراسەری یەمەن بوو لەسەردەمی ئیسلاما.

هەندێ دەڵێن: حەسسان ترسنۆك بووە. وەزۆر نوکتەی لەم لایەنەوە لێ دەگێڕنەوە. هەمیشە بەشیعر بەرگریی لە پێغەمبەرو لە ئیسلامو لە موسوڵمانان دەکرد.

حەسسان سەدو بیست ساڵ ژیاوە، شەستی لەسەردەمی نەزانیداو، شەستی لەسەردەمی ئیسلامدا، لەسەردەمی ئیمامی عەلیدا، لەساڵی پەنجای کۆچیدا، لەتەمەنی سەدو بیست ساڵیدا، بەدەردی خودا مردووە. راجیایی هەیە لەساڵی مردنیو لەکۆی ساڵی تەمەنی، بەڵام جەماوەری زانایان دەڵێن: سەدو بیست ساڵ ژیاوە، شەستی لەنەزانیو شەستی لە ئیسلاما.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە شیعری باشو سروودی دینی لەشەرعا پەسەندە.

١٧١٤- عَنْ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ لِحَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ: «اهْجُهُمْ، أَوْ هَاجِهِمْ وَجِبْرِيلُ مَعَكَ». {الحديث: ٦٣٣٧ = ٦٣٤٥ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢٩٨ = ٣٢١٣، ٤١٢٣، ٤١٢٤، ٦١٥٣} :

بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە حەسسانی کوڕی ثابیتی دەفەرموو: (ئەی حەسسان! بەشیعر دەستەی بێباوەڕان شڕو وڕبکەو بەتانەو تەشەر دایان شۆرە، لەمکارە پیرۆزەدا، کەلە بەرژەوەندی ئیسلامەو لەزیانی بێباوەڕانە، جوبرائیل بەفەرمانی خودا لەگەڵتایەو پشتت دەگرێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٣٤٩٦ ج/٤}. چاکێتی حەسسانی کوڕی ثابیت.

١٧١٥- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) وَعِنْدَهَا حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ يُنْشِدُهَا شِعْرًا، يُشَبِّبُ بِأَبْيَاتٍ لَهُ، فَقَالَ:

حَصَانٌ رَزَانٌ مَا تُزَنُّ بِرِيبَةٍ وَتُصْبِحُ غَرْثَى مِنْ لُحُومِ الْغَوَافِلِ

فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ: لَكِنَّكَ لَسْتَ كَذَلِكَ. قَالَ مَسْرُوقٌ: فَقُلْتُ لَهَا: لِمَ تَأْذَنِينَ لَهُ يَدْخُلُ عَلَيْكِ؟ وَقَدْ قَالَ اللَّهُ: (وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ)، فَقَالَتْ: فَأَيُّ عَذَابٍ أَشَدُّ مِنَ الْعَمَى؟ فَقَالَتْ: إِنَّهُ كَانَ يُنَافِحُ أَوْ يُهَاجِي عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ).

{الحديث: ٦٣٤١ = ٦٣٤٩ فم. بخاري. مغازي: ٤١٤٦، ٤٧٥٥، ٤٧٥٦ فتح الباري} :

**مەسرووق** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **فەرموویی: چووم بۆ خزمەتی عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **حەسسانی کوڕی ثابیتی لەلابوو، پارچەیێ شیعری لە وەسپو مەدحی عائیشەدا دانابوو، دەیخوێندەوە بۆی، فەرموویی: (طویل):**

**حَصَانٌ رَزَانٌ مَا تُزَنُّ بِرِيبَةٍ**
**وَتُصْبِحُ غَرْثَى مِنْ لُحُومِ الْغَوَافِلِ**

**واتە:**

**پاکیزەو سەلار، لەگومان دوورە**
**بێ ڕازو غەیبەت، ژنێ ڕوو سوورە!**

**وەکوو تریش واتە: ئافرەتێکی داوێنپاکو سەلارو سەنگینەو گومانی خراپەی لێ ناکرێو ناوی کەسیش بەخراپە نابات بەتایبەت ناوی ژنی بێ ئاگای بێ تاوان.**

**عائیشەیش پێی فەرموو: بەڵام تۆ خۆت وانیت! ناوی ژنی بێ ئاگای بێ تاوان بەخراپە دەبەیت!**

**مەسرووق فەرموویی: منیش بە عائیشەم گوت: کەوایە بۆ ڕێگەی حەسسان دەدەیت کەبێت بۆلات؟ وەلحاڵ خودا بۆخۆی سەبارەت بەو کۆمەڵە کە هەڵاتە گەورەکەیان بۆ تۆ هەڵبەست، دەفەرموێ:**

{وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ – ٢٤/١١} . **واتە: وەبۆ هەریەکێ لەو درۆزنانە بەشی خۆی هەیە لە گوناهو تاوانباریو تۆڵەی تاوان، بەتایبەتی بۆ ئەوکەسەیان کە کێشی تاوانەکەی هاویتە سەرشانی خۆیو سەرۆکایەتی درۆ بڵاوکردنەوەکەی گرتبووە ئەستۆی خۆی، ئەوە سزاو ئازارێکی گەلێ گەورەی بۆ هەیە.**

**عائیشە لەوەڵاما فەرموویی: جاچی سزایە هەیە کە لەکوێریی سەختتربێ؟ ئەوەتانێ خودا لەم پایزی تەمەنەدا، باری پیریو کوێرییو دوو دەست گۆجیی لێناوە، ئەمە لەلایێ، لەلایەکی تریشەوە ئەم پیاوە لەکاتی خۆیدا لەسەر پێغەمبەری دەکردەوە. یا فەرموویی: لەجیاتیی پێغەمبەر (درووودو صەلاتو سەلامو**

بەرەكاتی خودای لەسەر بێ) وەڵامی تانەو هەجوی بێ بڕوایانی دەدایەوە، كە قسەی ناشیرینیان بە پێغەمبەرو بە ئیسلام دەدا). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٣٤٩٧ ج/٤} . چاكێتی حەسسانی كوڕی ثابیت.

**ڕوونكردنەوە:**

مەسرووقی كوڕی ئەجدەع تابیعییە، لەپیاوانی (ع)ە، بەپێی پەڕاوی (تهذیب التهذیب لابن حجر العسقلانی). واتە: لەپیاوان (رجال)ی شەش پەڕاوە ناودارەكانی سوننەتە كە بریتین لە:

١- صەحیحی بوخاری.
٢- صەحیحی موسلیم.
٣- سنن أبي داود.
٤- سنن الترمذی.
٥- سنن النسائی.
٦- سنن ابن ماجه. واتە: مەسرووق ئەم شەش كتێبە ناودارە فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئەوەیش ئەوپەڕی سەروەرییە لەبابەتی زانستی فەرموودەدا.

مەسرووق پیاوێكی سۆفیلكە (عابد) بوو، نازناوی ئەبو عائیشەی فەقیە بوو، ریوایەت و گێڕانەوەی لەزۆرینەی سەحابە گەورەكانەوە هەیە، وەك: ئەبو بەكرو عومەرو عوثمان و عەلی و موعاذی كوڕی جەبەل و خەبابی كوڕی ئەرەتت و ئیبنو مەسعوودو عائیشەو أم رۆمانی دایكی عائیشەو كەسانی تریش.

فەقێ و شاگردی زۆریشی بووە، كە فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوە، مەسرووق پیاوێكی زانست خوازبوو، خەڵكی دەستە دەستە فێری سوننەت دەكرد، ساڵێ مەسرووق چوو بۆ حەج، لەناو سەجدەدا نەبێ لەو ماوەیەدا نەخەوت، هەر خەریكی ذیكرو شەونوێژ بوو، ژنەكەی مەسرووق دەیفەرموو: (مەسرووق ئەوەندە لەنوێژی سوننەتدا دەوەستا قاچەكانی ئاوسا بوون!) .

مەسرووق لەپشتی ئەبوبەکرەوە نوێژی بەکۆمەڵی کردووە، بە خزمەت عومەرو عەلی گەیشتووە، گێڕانەوەی لە عوثمانەوە نییە. لەتەمەنی (٦٣) شەستو سێ ساڵیدا، لەساڵی (٦٣)ی کۆچیدا بەدەردی خودا مردووەو ئەمری حەقی بەجێهێناوە.

لەشەڕی قادسیەدا، دەستێکی مەسرووق ئیفلیج بوو، بەم بۆنەوە مەسرووق دەیفەرموو: (حەزناکەم کە دەستم وای لێ نەهاتایە، چونکە ئەگەر دەستم ساخ بوایە، دوور نەبوو کە لەم شەڕو شۆڕی ئاژاوە گەلی ناو موسوڵمانانا بەشداریم بکردایە!).

مەسرووق یەکێك بوو لەخوا پەرستە ناودارەکانی کووفەی سەردەمی خۆی. لەبابەت دێڕە هەڵبەستێکەوە، پرسیار لە مەسرووق کرا، وەڵامی نەدایەوەو فەرمووی: (حەزناکەم لەرۆژی دوا رۆژدا، لەناو تۆماری کردەوەکانما، باسی شیعری تیابێ!!).

زیاد مەسرووقی کرد بە کارمەندی سەر (السِّلْسِلَةِ) لەوێ لەتەمەنی شەستو سێ ساڵیدا، لەساڵی کۆچی شەستو سێدا مردووە (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەو سەروەری لی بێ). ئامین.

١٧١٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «اهْجُوا قُرَيْشًا فَإِنَّهُ أَشَدُّ عَلَيْهَا مِنْ رَشْقٍ بِالنَّبْلِ»، فَأَرْسَلَ إِلَى ابْنِ رَوَاحَةَ فَقَالَ: «اهْجُهُمْ». فَهَجَاهُمْ، فَلَمْ يُرْضِ، فَأَرْسَلَ إِلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ، قَالَ حَسَّانُ: قَدْ آنَ لَكُمْ أَنْ تُرْسِلُوا إِلَى هَذَا الأَسَدِ الضَّارِبِ بِذَنَبِهِ، ثُمَّ أَدْلَعَ لِسَانَهُ فَجَعَلَ يُحَرِّكُهُ، فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لأَفْرِيَنَّهُمْ بِلِسَانِي فَرْيَ الأَدِيمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تَعْجَلْ، فَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ أَعْلَمُ قُرَيْشٍ بِأَنْسَابِهَا، وَإِنَّ لِي فِيهِمْ نَسَبًا حَتَّى يُلَخِّصَ لَكَ نَسَبِي». فَأَتَاهُ حَسَّانُ، ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ لَخَّصَ لِي نَسَبَكَ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لأَسُلَّنَّكَ مِنْهُمْ كَمَا تُسَلُّ الشَّعَرَةُ مِنَ الْعَجِينِ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ لِحَسَّانَ: «إِنَّ رُوحَ الْقُدُسِ لاَ يَزَالُ يُؤَيِّدُكَ مَا

نَافَحْتَ عَنِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ». وَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «هَجَاهُمْ حَسَّانُ فَشَفَى وَاشْتَفَى». قَالَ حَسَّانُ:

هَجَوْتَ مُحَمَّدًا فَأَجَبْتُ عَنْهُ وَعِنْدَ اللَّهِ فِي ذَاكَ الْجَزَاءُ
هَجَوْتَ مُحَمَّدًا بَرًّا تَقِيًّا رَسُولَ اللَّهِ شِيمَتُهُ الْوَفَاءُ
فَإِنَّ أَبِي وَوَالِدَهُ وَعِرْضِي لِعِرْضِ مُحَمَّدٍ مِنْكُمْ وِقَاءُ
ثَكِلْتُ بُنَيَّتِي إِنْ لَمْ تَرَوْهَا تُثِيرُ النَّقْعَ مِنْ كَنَفَيْ كَدَاءِ
يُبَارِينَ الأَعِنَّةَ مُصْعِدَاتٍ عَلَى أَكْتَافِهَا الأَسَلُ الظِّمَاءُ
تَظَلُّ جِيَادُنَا مُتَمَطِّرَاتٍ تُلَطِّمُهُنَّ بِالْخُمُرِ النِّسَاءُ
فَإِنْ أَعْرَضْتُمُو عَنَّا اعْتَمَرْنَا وَكَانَ الْفَتْحُ وَانْكَشَفَ الْغِطَاءُ
وَإِلاَّ فَاصْبِرُوا لِضِرَابِ يَوْمٍ يُعِزُّ اللَّهُ فِيهِ مَنْ يَشَاءُ
وَقَالَ: اللَّهُ قَدْ أَرْسَلْتُ عَبْدًا يَقُولُ الْحَقَّ لَيْسَ بِهِ خَفَاءُ
وَقَالَ: اللَّهُ قَدْ يَسَّرْتُ جُنْدًا هُمُ الأَنْصَارُ عُرْضَتُهَا اللِّقَاءُ
لَنَا فِي كُلِّ يَوْمٍ مِنْ مَعَدٍّ سِبَابٌ أَوْ قِتَالٌ أَوْ هِجَاءُ
فَمَنْ يَهْجُو رَسُولَ اللَّهِ مِنْكُمْ وَيَمْدَحُهُ وَيَنْصُرُهُ سَوَاءُ
وَجِبْرِيلٌ رَسُولُ اللَّهِ فِينَا وَرُوحُ الْقُدْسِ لَيْسَ لَهُ كِفَاءُ

{الحديث: ٦٣٤٥ = ٦٣٥٣ فم}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەجوی قوڕەیش بکەن، چونکە لەتیرەباران چاکتر کاریان لێ دەکا، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە، کەشاعیر بوو، هەتا خوسپ (هەجو)یان بکاو فەرمووی پێی: (هەجویان بکە).

ئەویش هەجوی کردن، بەڵام بەدڵیان نەبوو، ئەنجا ناردی بۆلای کەعبی کوڕی مالیك، ئەویش هەروا، لەپاشدا ناردی بەشوێن حەسساندا، کەهاتە خزمەتی گوتی: ئاخریی ناردتان بەشوێن شێرە گەورەدا!

ئینجا زمانی دەرکێشاو دەستی کرد بەزمان بزوانو بادان، فەرمووی: بەوکەسە کەتۆی کردووە بە پێغەمبەری راستو دروست، وەك کەوڵەشڕ، بەشیعرو هەڵبەست شڕو ووڕیان دەکەم.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هێواش، پەلەمەکە، هەتا ئەبوبەکر رشتەی رەسەنی منت بۆ دیاری نەکا دەست پێ مەکە، چونکە بنەچەی خۆشم لەوانە. ئەبو بەکریش لەهەمووکەس باشتر رەگەزو رەچەڵەکی قورەیش دەناسێت).

لەپاشدا حەسسان چووە خزمەتی پێغەمبەرو عەرزیکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبوبەکر بەجوانیو رێکوپێکی رشتەی رەسەنی تۆی بۆ دیاریو دەستنیشان کردم، بەوخودایە کەتۆی کردووە بە پێغەمبەری راستو دروست وەك چۆن تەڵەموو، سفتو ساخو پاك لەهەویر دەردەکێشرێ، ئاوا تۆیان لێ جیادەکەمەوە.

جا حەزرەت (درووودو سلاووو رەحمەتو بەرەکەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێ) فەرمووی: (دەسا بزانە، تاتۆ لەسەر خوداو پێغەمبەری خودا بکەیتەوە، هەمیشە جوبرائیل دەست دەگرێ بەپشتتو خودای گەورەو سەروەر پشتیوانتەبێ.

حەسسان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (بەحری وافیر):

هَجَوْتَ مُحَمَّدًا فَأَجَبْتُ عَنْهُ

وَعِنْدَ اللَّهِ فِي ذَاكَ الْجَزَاءُ

هَجَوْتَ مُحَمَّدًا بَرًّا تَقِيًّا

رَسُولَ اللَّهِ شِيمَتُهُ الْوَفَاءُ

فَإِنَّ أَبِي وَوَالِدَهُ وَعِرْضِي

لِعِرْضِ مُحَمَّدٍ مِنْكُمْ وِقَاءُ

ثَكِلْتُ بُنَيَّتِي إِنْ لَمْ تَرَوْهَا

تُثِيرُ النَّقْعَ مِنْ كَنَفَيْ كَدَاءِ

يُبَارِينَ الأَعِنَّةَ مُصْعِدَاتٍ
عَلَى أَكْتَافِهَا الأَسَلُ الظِّمَاءُ
تَظَلُّ جِيَادُنَا مُتَمَطِّرَاتٍ
تُلَطِّمُهُنَّ بِالْخُمُرِ النِّسَاءُ
فَإِنْ أَعْرَضْتُمُو عَنَّا اعْتَمَرْنَا
وَكَانَ الْفَتْحُ وَانْكَشَفَ الْغِطَاءُ
وَإِلاَّ فَاصْبِرُوا لِضِرَابِ يَوْمٍ
يُعِزُّ اللَّهُ فِيهِ مَنْ يَشَاءُ
وَقَالَ: اللَّهُ قَدْ أَرْسَلْتُ عَبْدًا
يَقُولُ الْحَقَّ لَيْسَ بِهِ خَفَاءُ
وَقَالَ: اللَّهُ قَدْ يَسَّرْتُ جُنْدًا
هُمُ الأَنْصَارُ عُرْضَتُهَا اللِّقَاءُ
لَنَا فِي كُلِّ يَوْمٍ مِنْ مَعَدٍّ
سِبَابٌ أَوْ قِتَالٌ أَوْ هِجَاءُ
فَمَنْ يَهْجُو رَسُولَ اللَّهِ مِنْكُمْ
وَيَمْدَحُهُ وَيَنْصُرُهُ سَوَاءُ
وَجِبْرِيلٌ رَسُولُ اللَّهِ فِينَا
وَرُوحُ الْقُدْسِ لَيْسَ لَهُ كِفَاءُ

واته:

زەمی موحەممەد دەکەی، ئەمن دەدەم وەڵامی
پاداش لەبۆ من هەیەو، تۆڵەش بۆ تۆی نەفامی
زەمی موحەممەد دەکەی، بەمانگەشەو وەڕینە!
پێغەمبەری خودایە، زۆر بەوەفاو بەدینە
من خۆم و کەسوکارم، نامووس و حاڵ و ماڵم
شووورای ناموسی ئەوین، خۆم و ماڵ و مناڵم!

یـــەک یـــەک لەکۆســـتی رۆڵـــەم، دابنیشـــم بـــۆ شـــیوەن
گـــەر هەڵمـــەتی شـــێرانە، لەهـــەر چـــارلاوە نەبـــەن
رۆژی روونـــاکی ئێـــوە، وەک شـــەوە زەنـــگ لێ نەکـــەن
لـــەخوێنی ئێـــوەی دوژمـــن، شـــیرو تیریـــان ئـــاو نـــەدەن
وڵاخ و رەخشـــی ئێمـــە، کـــە بەرەســـەن، رەســـەنن!
بەهێرشـــی بـــێ وچـــان، تۆڵـــەتان لێ دەســـەنن!
بارانـــاوی ئارەقیـــان، بـــەس لـــەکاتی ووچـــانا
ژنـــان بـــەناز دەیســـڕن، بەســـەر پۆشـــی خۆیانـــا
گـــەر ئێـــوە شـــەڕ فـــرۆش نـــین، ئێمـــە بـــۆ عـــەمرە هـــاتووین
بـــۆ ئێـــوەش دەردەکـــەوێ، ئـــەو حەقـــەی پێـــی راهـــاتووین
دەنـــا خۆتـــان رابگـــرن، بـــۆ رمبـــەی شـــیرو تیرمـــان
بەفـــەرمانی خوداوەنـــد، ســـەردەکەوێ لەشـــکرمان
خـــودا بۆخـــۆی دەفـــەرموێ: ناردوومـــە بەنـــدەیێ بـــاش
هـــەق بێـــژەو لەگەڵیـــەتی، ســـوپایێ لـــەپێش و پـــاش
وەک شـــێری نـــەڕ لەمەیـــدان، سەرســـنگیان داکوتـــاوە
تانـــەو تەشـــەری ئێـــوە، بەشـــیر دەدەنـــە دواوە
ئێـــوە لەبـــەر بـــێ وێڵـــی و، بـــێ نرخـــی و بـــێ دینیتـــان
یەکســـانە لامـــان زەم و، رەف و ثـــەنـــا خوانیتـــان!
چـــونکە رابـــەری ئێمـــە، گیـــانی پـــاک پشـــتی دەگـــرێ
ئـــیتر کـــێ یـــە رادەی بـــێ؟ بـــێ بەرابـــەر بـــەو بگـــرێ!

بە پەخشانیش واتە:

تۆ رەفو خوسپو هەجوی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکەی من لەجیاتی ئەو زاتە وەڵامت بدەمەوە، بەهیواو تەمای پاداشی باش لەلای خودای گەورە، دیارە کەتۆش بە تۆڵەی سەختی خۆت دەگەی، موحەممەد زەم هەڵناگرێ، چونکە ئەو پیاوێکی زۆر زۆر باشە، خێرخواو خوا ناسو راستو راستاڵە، ئەو پێغەمبەرو فروستادەی خودایە، مەردو جەوانمەردو بە ئەمەكو بەوەفایە، لەبەرئەوە من خۆمو هۆزمو کەسو کارمو سەرو حاڵو ماڵو منداڵو ناموسم هەموو دەکەم

بەقوربانی موحەممەدی نازدارو خۆشەویستو، دەبین بەقەڵاو پەرژینو سوپەر بۆ ئابڕوو نامووسو شەرەفی موحەممەد!

وە یەکە یەکە لەشینی کوڕو کچەکانما دابنیشمو بەرودوا شیوەنیان بۆ بگێڕم ئەگەر نەیانبینم وەك بەچکە شێر لەهەر چوارلاوە بەسواریو بە پیادەیی، هەڵمەتی شێرانە نەبەنە سەرتانو دانەی کەدا، کەدانەی سەرووی مەککەیە لەتەپو تۆزی هێرشی بێسامانیانا نوقم نەکەنو رۆژی رووناکتان لێ نەکەن بەشەوی تاریكو نوتەكو لەخوێنی دوشمنانی موحەممەد، شیرو تیرو رمەکانیان ئاو نەدەنو ئاو پاشو ئاو دانەوەیان نەکەن!

ئەسپو وڵاخەکانمان، کە بەرەسەن رەسەنن، هەمیشە لەهێرشو هەڵمەتو شاڵاودان بۆسەر ئێوە، لەبەرئەوە ئارەقیان وشك نابێتەوە، مەگەر ئەوەندە کە ژنەکانمان، لەکاتی پشوودانو وچان گرتندا، بەسەرپۆشو چارشێوەکانی خۆیان، نەك بە پەڕۆ شڕو شتی وا، زۆر بەقەدرو رێزەوە وشکیان بکەنەوەو سەرلەنوێ رنەكو قاشاویان بکەنو رەونەقیان پێ هەڵبهێننەوەو ئامادەیان بکەنەوە بۆ هەڵمەتێکی نوێ، جا ئەگەر ئێوە لەکەڵی شەیتان دێنە خوارەوە، ئەوا ئێمە شەڕ فرۆشو شەڕ خوازنین، ئیتر خۆشیو ئاشتی دەکەوێتەوەو ئاسایش باڵ دەکێشێ بەسەر وڵاتاو هەقو ناهەقی دەردەکەوێ بۆ هەردوولا.

ئەگینا ئەوا خۆتان بگرن بۆ گورزو گۆپاڵمان، بۆ شەڕە نێزەو شەڕە شیرو تیرمان، لەو رۆژەدا کەخودا بەخواستی خۆی خۆشەویستانی خۆی سەردەخاو سەریان بەرزدەکاتەوەو کەللەی دوژمن لەبەرپێیانا، گۆیێنی پێ دەکەن.

خوداوەندی گەورەو مەزن دەفەرموێ: من لەشکرێکم لەبەندە باشەکانی خۆم سازکردووەو کردوومن بەیارو یاوەرو یاریدەدەر بۆ بەندەیەکی باشی خۆم، کە رەفتاری ئەو بەندەیەم وایە هەمیشە کردوویەتی بەپیشە راستگۆو راستو راستاڵەو هەق گۆیەو لەڕاستی لاری نییەو لەڕاستی حەق سەری پێوە نییە!

لەشکرەکەشی هەموودەم لەسەرپێنو ئامادەنو لەسوپای کوفرو ناهەقی کۆناکەنو شەوو رۆژ خەبات دەگێڕنو لەمەیدانی نەبەردو لە کۆڕی شەڕدا، وەك

شێری نەڕ لەمەیدانا، نرکەو نەڕە نەڕیان دێ‌و سینگیان وەك سنجووق‌و سنگ داکوتاوە!

ئەو پێغەمبەرە نازدارە هەموو رۆژێ، لەنەفام‌و دەست درێژکەرەکانی قوڕەیشەوە، کەنەوەی مەعەددی کوڕی عەدنانن، تووشی شەڕە جنێوو شەڕو شۆڕو هەراو قسەی ناشیرین دەبێ، وەلێ ئێوە ئەی میللەتی بێ بڕوایی! ئەی دەستەی نەفامان‌و نەزانان! خۆتان چین‌و شەڕو رەف‌و جمێنتان چییە، ئێوە لەبەر بێ نرخی‌و بێ وێڵی‌و سووك‌و تڕۆیی خۆتان، لەلامان چون یەکە: چ خوسپی پێغەمبەر بکەن‌و چ مەدحی بکەن‌و چ لەسەری بکەنەوەو چ لەسەری نەکەنەوە، هەمووی یەکسانە بۆ ئەوو نەسوودو نەزیانی پێ ناگەیەنێ، چونکە ئەو خودای لەگەڵەو جوبرائیل، کە گیانی پاکە، پەیتا پەیتا موژدەی سەرکەوتنی بۆ دەهێنێ، کە شتی وا هەرگیزاو هەرگیز هاوتای نییە.

عائیشە فەرمووی: جا بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەزمانی شیرینی خۆی، فەرمووی: (حەسسان شڕو ووڕی کردن‌و داخی دڵی خۆی‌و داخی دڵی موسوڵمانانی پێ رشتن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٣٥٠٠ چ/٤}. چاکێتی حەسسانی کوڕی ثابیت.

## ١٣٠٨) باسی گەورەیی جەریری کوڕی عەبدوڵڵای ئەلبەجەلی (رەزای خودای لێ بێ). (٦٣١٣ - ٦٣١٧)

## بَابٌ: فِي فَضْلِ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)

١٧١٧- عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلاَ رَآنِي إِلاَّ تَبَسَّمَ فِي وَجْهِي). {الحديث: ٦٣١٤ = ٦٣٢٢ فم. بخاري. جهاد: ٣٠٣٥، ٣٨٢٢، ٦٠٨٩. ترمذي. مناقب: ٣٨٢٠. ابن ماجة. المقدمة: ١٥٩. تحفة الأشراف: ٣٢٢٤}:

جەریری کوڕی عەبدوڵڵای ئەلبەجەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەوساتەوە کە ئیسلام بووم، هەر وەختێ بم ویستایە کەبچم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوای نەدەخستم‌و یەکسەر مۆڵەتی دەدام‌و دەچوومە خزمەتی، هەر کاتێکیش

کـە بەخزمـەتی دەگەیشـتم بەروویـەکی گەشـەوە، بـەدەمی پـڕ لەزەردەخەنـەوە پێشوازیی لێ دەکردم).

١٧١٨- عَنْ جَرِيرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَا جَرِيرُ أَلاَ تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الْخَلَصَةِ»؟ بَيْتٍ لِخَثْعَمَ كَانَ يُدْعَى كَعْبَةَ الْيَمَانِيَةِ، قَالَ: فَنَفَرْتُ إِلَيه فِي خَمْسِينَ وَمِائَةِ فَارِسٍ، وَكُنْتُ لاَ أَثْبُتُ عَلَى الْخَيْلِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَضَرَبَ بِيَدِهِ فِي صَدْرِي فَقَالَ: «اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ، وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا». قَالَ: فَانْطَلَقَ فَحَرَّقَهَا بِالنَّارِ، ثُمَّ بَعَثَ جَرِيرٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً يُبَشِّرُهُ، يُكْنَى أَبَا أَرْطَاةَ مِنَّا، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَهُ: مَا جِئْتُكَ حَتَّى تَرَكْنَاهَا كَأَنَّهَا جَمَلٌ أَجْرَبُ. فَبَرَّكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى خَيْلِ أَحْمَسَ وَرِجَالِهَا خَمْسَ مَرَّاتٍ). {الحديث: ٦٣١٦ = ٦٣٢٣ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٢٣٧ = ٣٠٢٠، ٣٠٣٦، ٣٠٧٦، ٣٨٢٣، ٤٣٥٥، ٤٣٥٦، ٤٣٥٨، ٦٠٩٠، ٦٣٣٣. أبو داود. جهاد: ٢٧٧٢. تحفة الأشراف: ٣٢٢٥}:

جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (ئەی جەریر! ئادەی بڕۆ بوتخانەی زولخەلەصەم لەکۆڵ بکەرەوە).

فەرمووی: زولخەلەصە بوتخانەی هۆزی خەسعەم بوو، پێیان دەگوت: کەعبەی یەمانی، منیش خۆم بەسەر ماینو ئەسپەوە بۆنەدەگیرا، ئەوەم عەرزی حەزرەت کرد کەمن حالّم وایە، دەستی مالّی بەسینگماو فەرمووی:

«اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا»: خودایە! راگیراوی بفەرموو، وەبیکە بەرەهبەرو رێگەی راستی پێ نیشان بدە).

جەریر فەرمووی: جا چووینە وێرەی بوتخانەکەو بەئاگر سووتاندمان!

پیاوێکمان تیابوو پێیان دەگوت: ئەبو ئەرطەئە ئەومان نارد، مزگێنی بدا بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەچێتە خزمەتی عەرزی دەکا: قوربان! کەمن هاتم بوتخانەکە سووتابوو رەشهەلگەڕابوو، دەتگوت وشتری گەڕەو قەترانی رەشی پیاکراوە! (نوخشەبێ لە بتخانەکانی سەدەی ئێمەیش!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێنج جار نزای پیتو فەڕو پیرۆزی دەکا بۆ هۆزی ئەحمەس، کە هۆزەکەی جەریر بوو، بۆ پیاویانو بۆ سوارەیانو بۆ پیادەیانو بۆ ڕەوگیانو پێنج جار دەفەرموێ: خودایە! پیتو فەڕو پیرۆزی بخەرە هۆزی ئەحمەسەوە بە پیادەو سوارەو ماینو ئەسپو ڕەوگیانەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ٣٥٣٤ ج/٤}. چاکێتی جەریری کوڕی عەبدوڵڵا.

## ١٣٠٩) باسی گەورەیی کۆمەڵەی ئەصحابی شەجەرە (ڕەزای خودایان لێ بێ). (٦٣٥٤)
## باب: فَضْلُ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم)

١٧١٩- عَنْ أُمِّ مُبَشِّرٍ: أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ عِنْدَ حَفْصَةَ: «لاَ يَدْخُلُ النَّارَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ أَحَدٌ الَّذِينَ بَايَعُوا تَحْتَهَا». قَالَتْ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَانْتَهَرَهَا، فَقَالَتْ حَفْصَةُ: (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا)، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «قَدْ قَالَ اللَّهُ تعالى: (ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا)». {الحديث: ٦٣٥٤ = ٦٣٦٣ فم}:

ئوم موبەششیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای حەفصەی هاوسەری بوو، گوێم لە حەزرەت بوو، فەرمووی: (خودا یاربێ کەس لە کۆمەڵەی درەختەکە، کەناودارن بە ئەصحابی شەجەرە، کە لەژێر ئەو درەختەدا، لەکاتی ڕێکەوتن (صلح)ی حودەیبییەدا، پەیمانی خۆشنوودییان لەگەڵ پێغەمبەردا بەست، کەناودارە بە بەیعەتی ریضوان، خودا یاربێ کە کەس لەو کۆمەڵەیە ناچنە ناو ئاگری دۆزەخ!).

حەفصەیش (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: با، ئەی پێغەمبەری خودا! لێیان دەچێتە دۆزەخ!!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵشاخا بە حەفصەداو سەر کۆنەیکرد لەسەر ئەو قسەیە، حەفصەیش عەرزیکرد: من مەبەستم بەر پەرچی فەرمایشتەکەی تۆ نییە، دەمەوێ لەم ئایەتە تێ بگەم، ئەی لەسەرچی بنەمایێ ئەم ئایەتە لە قورئانا دەفەرموێ: {وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا – ١٩/٧١ - مەریەم}:

واته: کەستان نییە کە نەچێتە دۆزەخ، ئەوە کارێکی پێویستی بڕیاردراوە لە خودای پەروەردگاری تۆوە).

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی ئەوە نییە دوا بەدوای ئەوە یەزدانی پاك دەفەرموێ: {ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا – مريم – ١٩/٧٢}.

واتە: پاشان تەقوا کاران رزگار دەکەین و ستەمکارەکان لەدۆزەخا دەستەو ئەژنۆ دەهێڵینەوە). {تاج/٤، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٣٩٨٧ سوورەتی مەریەم + تاج/٤، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٤١٠٣ + تاج/٤، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٤٢٠٧ + تاج/٤، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٤٦٢٠ ج/٤}. بۆ ژیاننامەی ئوم موبەششیر بڕوانە: دوای ژمارە: (١٧٢٠).

## ١٣١٠) باسی گەورەیی کەسێ ئامادەی جەنگی بەدر بووبێ. (٦٣٥١ - ٦٣٥٣)
## فضلِ من شهد بدراً = بابٌ: مَنْ شَهِدَ بدراً

١٧٢٠- عَنْ عَلِيٍّ كرم الله وجهه قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَا وَالزُّبَيْرَ وَالْمِقْدَادَ، فَقَالَ: «ائْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً مَعَهَا كِتَابٌ فَخُذُوهُ مِنْهَا». فَانْطَلَقْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا، فَإِذَا نَحْنُ بِالْمَرْأَةِ فَقُلْنَا: أَخْرِجِي الْكِتَابَ، فَقَالَتْ: مَا مَعِي كِتَابٌ. فَقُلْنَا: لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ أَوْ لَتُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ، فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا، فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَإِذَا فِيهِ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى نَاسٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَا حَاطِبُ مَا هَذَا»؟ قَالَ: لاَ تَعْجَلْ عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مُلْصَقًا فِي قُرَيْشٍ (قَالَ سُفْيَانُ: كَانَ حَلِيفًا لَهُمْ، وَلَمْ يَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهَا) وَكَانَ مِمَّنْ كَانَ مَعَكَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ لَهُمْ قَرَابَاتٌ يَحْمُونَ بِهَا أَهْلِيهِمْ، فَأَحْبَبْتُ إِذْ فَاتَنِي ذَلِكَ مِنَ النَّسَبِ فِيهِمْ، أَنْ أَتَّخِذَ فِيهِمْ يَدًا يَحْمُونَ بِهَا قَرَابَتِي، وَلَمْ أَفْعَلْهُ كُفْرًا وَلاَ ارْتِدَادًا عَنْ دِينِي، وَلاَ رِضًا بِالْكُفْرِ بَعْدَ الإِسْلاَمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): صَدَقَ، فَقَالَ عُمَرُ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ. فَقَالَ: «إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ»، فَأَنْزَلَ

اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ). وَجَعَلَهَا — يعني الآيَة - إِسْحَاقُ فِي رِوَايَتِهِ مِنْ تِلاَوَةِ سُفْيَانَ). {الحديث: ٦٣٥١ = ٦٣٦٠ فم. تجريد البخاري/ رقم: ١٧٠٤ = ٤٨٩٠، ٣٠٠٧، ٣٠٨١، ٣٩٨٣، ٤٢٧٤، ٦٢٥٩، ٦٩٣٩. أبو داود. جهاد: ٢٦٥٠. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٣٠٥. تحفة الأشراف: ١٠٢٢٧} :

عەلی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: کاتێ بێبڕواکانی مەککە، پەیمانەکەی حودەیبییەیان شکان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاریدا، کە شاری مەککە بگرێو رزگاری بکا، وە فەرمانیدا بە موسوڵمانەکان کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ، حاطەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە، لەژێرەوە بەدزییەوە کاغەزێ دەنووسێ بۆ هەندێ لە دانیشتوانی مەککە، کە ئاگاتان لەخۆتان بێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم رۆژانەدا دێتە سەرتانو دەدا بەسەرتانا، وە بەدزییەوە بەژنێکی مەککەییدا دەینێرێ بۆیان، ژنەکە ناوی سارە دەبێ، جا حەزرەتی جوبرائیل (سلاوی خودای لێ بێ) دێ بۆلای پێغەمبەرو وەئەم هەواڵەی پێ دەدا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) منو زوبەیری کوڕی عەوامو میقدادی کوڕی ئەسوەدی نارد بەشوێنی ئەو ژنەداو فەرمووی: (بڕۆن هەتا دەگەنە باخچەی خاخ، لەوێدا ئافرەتێکی کەژاوە نشینی لێیە، کاغەزێکی پێیە، لێی بستێنن، ئەگەر کاغەزەکەی پێ نەدان بیکوژن، جا بەغار رۆیشتنو ماینەکانمان تاودا، هەتا چووینە باخچەکە، کە سەیرمانکرد وا ژنەکە لەوێیە، وە داوای کاغەزەکەما لێکرد حاشای لێ کردو گوتی: کاغەزم پێ نییە.

جا گوتمان: یا کاغەزەکەمان دەدەیتێ، یا دەبێ خۆت رووتو قووت بکەیتەوە، یا دەتکوژین. ئەوجا ژنەکە کاغەزەکەی لەناو دوو توێی لۆی پەلکەکانی دەرهێنا، ئەوجا ژنەکەو نامەکەمان برد بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە. کە نامەکەمان خوێندەوە، ئەمەی تیا نووسرا بوو: لە حاطەبی کوڕی ئەبو بەلتەعەوە، بۆ فیسارەکەو ئەو فیسارەکە، کەناوی چەن کەسێ بوون لە ناموسوڵمانەکانی مەککە، وە هەواڵی هەندێ لەکاروباری پێغەمبەری بۆ نووسیبوون، کە دەیەوێ بچێ بۆسەریان، جا پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) حاطەبی بانگ کردو پێی فەرموو:

(ئەی حاطەب! ئەمە چییە؟ ئەم کاغەزەت بۆ نووسیوە؟). ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پەلەم لێ مەکە، هەتا کارەکەتان بۆ روون بکەمەوە، بەخودا ئەوەتی موسوڵمان بووم، نەلەدین هەڵگەڕاومەتەوەو، نە ناپاکیو منافقیم کردووە، بەڵام من بابایەکی بەڕانی بووم لەناو هۆزی قورەیشا بووم، لەخۆیان نەبوومو ژنو منداڵەکانم لەناو ئەواندا بەجێ ماون، ئەم هەموو کۆچکەرانەی تر کە لەگەڵ تۆدان، هەموو کەسوکارو خزمو خوێشیان لە مەککە هەیە، کە ئاگاداری ماڵو منداڵەکانیان دەکەن لەوێ، تەنیا من نەبێ، لەبەرئەوەی کە بەخزمایەتی هیچم بۆ ناکرێ، ویستم بەم شێوەیە دەستیاوێکیان لەگەل بکەم، هەتا بەرابەر بەوە، ئەوانیش ئاگاداری خزمەکانم بکەن، ئەگینا نە لەبەر بێ بڕواییو نە لەبەر هەڵگەڕانەوە لە ئایینی خۆم ئەمەم نەکردووە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (قسەی راستی بۆ کردن!).

عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە ناپاکە، مونافیقە، لێم گەڕێ با لەملی بدەم؟

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەمە لەیارانی بەدرە، لەو موسوڵمانە خوا پێداوانەیە، کە لەشەڕگەی بەدرا بەشدارییان کردووە، کەواتە چۆنی دەکوژیت؟ تۆ چووزانیت کە خودای گەورە چی بڕیارداوە، لەبارەی ئەهلی بەدرەوە، چونکە خودای باڵا دەستو خاوەن شکۆ، روویکردۆتە یارانی بەدرو پێی فەرموون: بە ئارەزووی خۆتان، چی دەکەن بیکەن، من هەر لەئێستاوە لێتان خۆش بووم، لەبەرئەوەی کە بەشداریی ئەم جەنگە پیرۆزەتان کردووە).

جا سەبارەت بەم رووداوە ئەم ئایەتە دابەزی:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ - المتحنة — ١/٦٠}. واتە:

ئەی گەلی ئیسلام! ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! هەرگیزاو هەرگیز ناموسوڵمانو بێباوەڕان، کە بەسروشت هەم دوژمنی منو هەم دوژمنی ئێوەن، مەگرن بەدۆستی خۆتان). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٤١٦٣ سوورەتی مومتەحینە}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەم چەند شتە:

یەکەم:

١ - گوناهو تاوان، هەتا جاسووسی کردن بەسەر پێغەمبەرو لەشکری ئیسلامەوە، ئەگەر بەتەئویل بێ، بکەرەکەی پێی کافرنابێ.

٢ - مەهانەو عوزرێ ئەقڵ بیگرێ، واباشە قەبووڵ بکرێ (ادْرَ أو الحُدُودَ بالشُّبُهَاتِ).

٣ - پەلە لە حوکمو بڕیاردان نەکرێ، ڕێگەی گومانبار (متَّهم) بدرێ، هەتا بەتەواوی قسەی خۆی بکاو بەرگری لەخۆی بکا، ئەگەر بەرگرییەکەی ڕاست بوو، بڕوای پێ بکرێت، وە بەپێی توانا چاوپۆشی لەهەڵەی بکرێ، وە دادوەر تابۆی دەکرێ، ئەگەر بەڵگەو شایەت نەبوو لایەنی گومانبار بگرێ.

٤ - واباشە حەددی شەرعی، بەپێی توانا تەئویل بکرێو لەبەر شوبهەو شتی وا جێبەجێ نەکرێ، مەبەست لێی چاو ترساندن بێ نەوەك تۆڵەی کەسیو شتی وا.

٥ - ئەم تەخویلەی لەم فەرموودەدا هەیە، کە ئەهلی بەدر بەکەیفی خۆیان چی دەکەن بیکەن، واتای وانییە:

أ- ئەگەر تاوانێ بکەن شایانی داری حەددبێ، داری حەدیان لێ نادرێ، شتی وانییە، بەڵکوو لەکاتی وادا، بڕیاری شەرعیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، بۆ نموونە: ئەگەر دزی بکەن دەستیان بەپێی شەرع دەبڕرێ.

ب- مەبەست ئەوەیە لەقیامەتا سزانادرێنو بەس.

ج- مەبەست ڕێزگرتنە لە ئەهلی بەدر، هەتا خەڵکی تر ڕێزیان بگرن، دەنا مەبەست ئەوە نییە کە بەکەیفی خۆیان گوناهو تاوان تێ گوشن بەبێ لێپرسینەوە، وە جۆرە سەرمەشقێکە لەسەر ئەم بابەتە: {إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ}.

دووەم: ئوم موبەششیر ناوی: ئوم موبەششیری کچی بەڕائی کوڕی مەعروورە، ئەنصارییە، ژنی زەیدی کوڕی حاریشەیە، یەکێکە لەژنە گەورە هاوەڵەکانی پێغەمبەر، جابیری کوڕی عەبدوڵلا چەند فەرموودەیەکی لێ دەگێڕێتەوە، کە

یەکێکیان فەرموودەی ژمارە: (٦٣٥٤)ی صەحیحی موسلیمە، کە لەم پوختەی صەحیحی موسلیمەدا، ژمارەکەی (١٧١٩)یە. کۆمەڵێ فەرموودەی لە موسلیمو لە نەسائیو کتێبەکانی تری فەرموودەدا هەیە.

٦ - ئیمامی موسلیم ئەم فەرموودەیە لەچەند کەسێکەوە دەگێڕێتەوە، کە یەکێ لە مامۆستاکانی موسلیم، ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە، جا موسلیم دەفەرموێ: ئیسحاق فەرمووی: خوێندنەوەی ئایەتەکە لە کۆتایی فەرموودەکەوە لە تیلاوەتی سوفیانی مامۆستامە.

## ١٣١١) باسی گەورەیی هۆزی قوڕەیشو یاریدەدەران (أنصار)ی پێغەمبەرو کەسانی تریش (٦٣٨٥ - ٦٤٠٠)

## بَابٌ: فِي فَضْلِ قُرَيْشٍ وَالأَنْصَارِ وَغَيْرِهِمْ

١٧٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «قُرَيْشٌ وَالأَنْصَارُ وَمُزَيْنَةُ وَجُهَيْنَةُ وَأَسْلَمُ وَغِفَارُ وَأَشْجَعُ مَوَالِيَّ، لَيْسَ لَهُمْ مَوْلًى دُونَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ». {الحديث: ٦٣٨٦ = ٦٣٩٨ فم. تجريد البخاری/٤، رقم: ١٣٩٢ = ٣٥٠٤، ٣٥١٢ فتح الباری}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هۆزی قوڕەیشو کۆمەڵەی ئەنصارەکانمو هۆزی موزەینەو هۆزی جوهەینەو هۆزی ئەسلەمو هۆزی غیفارو هۆزی ئەشجەع، ئەمانە دۆستو یارو یاوەری منن، بێجگە لە خوداو لە پێغەمبەری خودا، خاوەنو یارو یاریدەدەری تریان نییە). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٣٥٤٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}. پایەی هۆزەکانی غیفارو.......

**ڕوونکردنەوە:**

هۆزانی موزەینەو جوهەینەو ئەسلەمو غیفارو ئەشجەع، لەپێش هاتنی ئیسلاما، لەچاو هۆزە بەهێزەکانی تری عەرەبەکانا ئەو نموودەیان نەبوو، بەڵام

لەبەرئەوەی لە قەبوڵی ئیسلاما لەپێشەوە بوون خودا نموودو نگینو ڕێزدارییەکەی بەخشی بەوان!

## ١٣١٢) باسی بەڕێزیی ژنانی هۆزی قورەیش. (٦٤٠٣ - ٦٤٠٨)

## بابٌ: فِي فضائِلِ نِسَاءِ قريش

١٧٢٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «نِسَاءُ قُرَيْشٍ خَيْرُ نِسَاءٍ رَكِبْنَ الإِبِلَ، أَحْنَاهُ عَلَى طِفْلٍ، وَأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذَاتِ يَدِهِ». قَالَ: يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَى إِثْرِ ذَلِكَ: وَلَمْ تَرْكَبْ مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ بَعِيرًا قَطُّ).
{الحديث: ٦٤٠٥ = ٦٤١٧ فم. تجريد البخاری/ ٤، رقم: ١٣٦٦ = ٣٤٣٤ فكتح البارى. تحفة الأشراف: ٣٣٣٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (ئافرەتی باشی قورەیش باشترینی ئافرەتانێکن کە سواری وشتر بوون، واتە: باشترینی ئافرەتانی عەرەبن، کە ناسراون بە سواریی وشترەوە، چونکە زۆر دڵسۆزو میهرەبانن بۆ منالی ساواو، زۆر بەجوانی پەروەردەی دەکەن، هەروەك زۆر باشیش دڵیان بەماڵی مێرد دەسووتیٚ! واتە: ماڵکەرو ماڵپەروەرن).

ئەبو هورەیرە دوا بەدوای گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە، بۆئەوەی مەریەمی کچی عیمران بەر بڕیاری ئەم فەرموودەیە نەکەویٚ، چونکە ئەو باشترە، دەیفەرموو: (قەت قەت مەریەمی کچی عیمران سواری وشتر نەبووە، تا لەفەرموودەکە ئەوە وەربگیریٚ کە ژنانی قورەیش لەویش باشترین!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٢}. باسی ژنی پەسەند.

## ١٣١٣) باسی گەورەیی ئەنصار (ڕەزای خودایان لێ بێ). (٦٣٦٢ - ٦٣٨٤)

## بابٌ: فِي فضائِلِ الأنصارِ (رَضِيَ اللهُ عنهُم)

١٧٢٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: فِينَا نَزَلَتْ: (إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ مِنْكُمْ أَنْ تَفْشَلاَ وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا): بَنُو سَلِمَةَ وَبَنُو حَارِثَةَ، وَمَا نُحِبُّ أَنَّهَا لَمْ تَنْزِلْ

لِقَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: (وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا ). {الحديث: ٦٣٦٢ = ٦٣٧٢ فم. بخاری. مغازی: ٤٠٥١، ٤٥٥٨. تحفة الأشراف: ٢٥٣٤}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: هۆی هاتنی ئەم ئایەتە ئێمە بووین‌و ئەم ئایەتە لەشانی ئێمەدا دابەزیوە کە دەفەرموێ:
{إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلاَ وَاللّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ - آل عمران – ٣/١٢٢}:

واتە: خودای گەورە خۆی زانابوو، بەقسەی دەم‌و نیازی دڵتان، لەوکاتەدا، کە لەغەزای ئوحوددا، دوو تاقم لەئێوە ویستیان پشتی لەشکری موسوڵمانان چۆڵکەن‌و ئەوانیش وەك سەرۆکی ناپاکەکان: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی‌و هۆزەکەی بگەڕێنەوە بۆ مەدینەو خۆیان بدۆڕێنن، بەڵام خودای میهرەبان بەسۆزو میهرەبانی خۆی پاراستنی لە جێبەجێ کردنی ئەو خەیاڵە ناهەموارەو لەو بیرە بەدە لایانیداو پشتی سوپای ئیسلامیان چۆڵ نەکرد، لەبەرئەوە خودا پاراستنی چونکە خودا خۆی دۆستی ئەو دوو تاقمەیەو خۆشی دەوێن، دەی با باوەڕداران هەمیشە پشت بەخودا ببەستن).

جابیر دەیفەرموو: ئەو دوو تاقمەیە ئێمە بووین: تاقمەی بەنی سەلەمەو تاقمەی بەنی حاریسە، وە ئێمە بەش بەحاڵی خۆمان هاتنی ئەم ئایەتەمان زۆر پێ خۆشە، گەرچی لەسەرەتای ئایەتەکەوە سەرکۆنەی ئەم دوو تاقمەی واتیادا، بەڵام لە کۆتایەکەیدا گەورەترین خەڵاتی واتیادا بۆ ئەم دوو تاقمە، چونکە خودا لەبارەیانەوە دەفەرموێ: (وَاللّهُ وَلِيُّهُمَا: خودا خۆی خاوەن‌و دۆستی ئەو دوو تاقمەیەو خۆشی دەوێن). {تاج/٤، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٧٧٤}.

١٧٢٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلأَنْصَارِ، وَلأَبْنَاءِ الأَنْصَارِ، وَأَبْنَاءِ أَبْنَاءِ الأَنْصَارِ». {الحديث: ٦٣٦٣ = ٦٣٧٣ فم. تجريد البخاری/٤، رقم: ١٧٠٨ = ٤٩٠٦ فتح البناری. ترمذی. مناقب: ٣٩٠٢ م. تحفة الأشراف: ٣٦٨٦}:

زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (خودایە! خۆشبە لە یاریدەدەران (ئەنصار)و، لە منالانی یاریدەدەرانو، لە منالانی منالانی یاریدەدەران!).

١٧٢٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَأَى صِبْيَانًا وَنِسَاءً مُقْبِلِينَ مِنْ عُرْسٍ، فَقَامَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مُمْثِلاً، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، اللَّهُمَّ أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ». يَعْنِي الأَنْصَارَ). {الحديث: ٦٣٦٥ = ٦٣٧٦ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٤٨٤ = ٣٧٨٥، ٥١٨٠}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆمەڵێ منالو ژنی یاریدەدەرانی (ئەنصاری) بینی، لەشاییو زەماوەند دەگەڕانەوە، رێك هەڵسایە سەرپێو راست راوەستاو سێجار لەسەریەك فەرمووی: (خودای گەورە ئاگادارەو ئاگای لێیەتی، ئێوە ئەی دەستەی یاریدەدەران لە خۆشەویستترین کەسانن لەلای من!). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٣٤٥١}. باسی پاکژیو گەورەیی یاریدەدەران.

١٧٢٥ب- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، قَالَ: فَخَلاَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّكُمْ لأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ». ثَلاَثَ مَرَّاتٍ). {الحديث: ٦٣٦٦ = ٦٣٧٧ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٤٨٥ = ٣٧٨٦، ٥٢٣٤، ٦٦٤٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنێك لەپاریدەدەران (واتە: لەئەنصار هاتە خزمەتی حەزرەت درودی خوای لەسەربێ)) قسەو گفتوگۆی لەگەڵا کرد، قسەی نهێنی خۆی هەبوو، عەرزی حەزرەتی کرد، لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەوکەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە خودای گەورەیە، ئێوە ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! خۆشەویستترین کەسن لەلای من). سێجار وای فەرموو. {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٣٤٥٢ ج/٤}.

١٧٢٦- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَغْفَرَ لِلأَنْصَارِ، قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: «وَلِذَرَارِيِّ الأَنْصَارِ، وَلِمَوَالِي الأَنْصَارِ». لاَ أَشُكُّ فِيهِ). {الحديث: ٦٣٦٤ = ٦٣٧٥ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پاڕایەوە لەخوداو داوای لێخۆشبوون‌و لێبووردنی کرد بۆ یاریدەدەران، فەرمووشی: (خودایە! لە یاریدەدەران‌و لە نەوەو وەچەی یاریدەدەران‌و لەوەچەی وەچەی یاریدەدەران‌و لە ئازادکراوو دەست‌و پێوەندیشیان خۆشبە). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٣٤٥٧ ج/٤}. باسی پاکژی‌و گەورەیی یاریدەدەران.

١٧٢٧- عَنْ أَنَسِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الأَنْصَارَ كَرِشِي وَعَيْبَتِي، وَإِنَّ النَّاسَ سَيَكْثُرُونَ، وَيَقِلُّونَ، فَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ وَاعْفُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ». {الحديث: ٦٣٦٧ = ٦٣٧٩ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٤٩٠ = ٣٧٩٩، ٣٨٠١}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕاستیدا یاریدەدەران (واتە: ئەنصار) جەرگ‌و هەناوی من‌و بوخچەی ڕازو نیازو جێی باوەڕی منن، ئەوان زۆر بەجوانی ئەرکی سەرشانی خۆیان بەپیاوانە بەجێ هێناوە، ماوەتەوە ئەوە کەهەقیان بۆ بکرێتەوەو تۆڵەی چاکەیان بدرێتەوە!

بزانن تادێ خەڵکی تر زۆردەبن، بەڵام یاریدەدەران بەرە بەرە کەم دەبنەوە، چونکە لەهەر چوارلاوە خەڵك دێن‌و ئیسلام دەبن، بەڵام یاریدەدەران چینێکی تایبەتین، کە یەکێکیان لێ مرد، یەکێکی تر نایەتە جێی، جا ئەگەر کەسێ لەئێوە بوو بەسەرەوکاری کارێ، وە دەیتوانی کە زیان یا سوود بەخەڵك بگەیەنێ، ئەوە باچاکەی چاکی یاریدەدەران وەربگرێ‌و چاوپۆشی لەخراپیان بکا). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٣٤٦١}. باسی پاکژی‌و گەورەیی یاریدەدەران.

## ١٣١٤) باسی باشترینی ماڵەكانی یاریدەدەران. (٦٣٦٢ - ٦٣٨٤)
## بَابٌ: فِي خَيْرِ دُورِ الْأَنْصَارِ

١٧٢٨- عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ، يَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «خَيْرُ دُورِ الأَنْصَارِ بَنُو النَّجَّارِ، ثُمَّ بَنُو عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ بَنُو الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، ثُمَّ بَنُو سَاعِدَةَ، وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ». قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أُتَّهَمُ أَنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟! لَوْ كُنْتُ كَاذِبًا لَبَدَأْتُ بِقَوْمِي بَنِي سَاعِدَةَ، وَبَلَغَ ذَلِكَ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، فَوَجَدَ فِي نَفْسِهِ، وَقَالَ: خُلِّفْنَا فَكُنَّا آخِرَ الأَرْبَعِ، أَسْرِجُوا لِي حِمَارِي آتِي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). فَكَلَّمَهُ ابْنُ أَخِيهِ سَهْلٌ، فَقَالَ: أَتَذْهَبُ لِتَرُدَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَعْلَمُ، أَوَلَيْسَ حَسْبُكَ أَنْ تَكُونَ رَابِعَ أَرْبَعٍ؟ فَرَجَعَ وَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. وَأَمَرَ بِحِمَارِهِ فَحُلَّ عَنْهُ. {الحديث: ٦٣٧٢ = ٦٣٨٤ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٤٨٧ = ٣٧٩١ + تجريد/٢، رقم: ٧١٣ = ١٤٨١ فتح الباري}:

ئەبو ئوسەیدی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شایەتی دەدەم كە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشترین هۆزو بنەماڵەی یاریدەدەران هۆزو بنەماڵەی بەنی نەجارن، ئەوجا هۆزو بنەماڵەی بەنی عەبدی ئەشهەل، ئەوجا هۆزو بنەماڵەی بەنی حاریثی كوڕی خەزرەج، ئەوجا بنەماڵەی بەنی ساعیدە، وە گەڕەك‌و تیرەو بنەماڵەكانی یاریدەدەران هەموویان خێردارو خاسن!).

ئەبو سەلەمە كە ئەم فەرموودەیە لەئەبو ئوسەیدی ئەنصارییەوە دەگێڕێتەوە فەرمووی: ئەبو ئوسەید فەرمووی: گومانی ئەوە بەمن دەبرێ، كە خوانەخواستە درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە بكەم؟ ئەگەر من شتی وام بكردایە، هۆزەكەی خۆم كە بنەماڵەی بەنی ساعیدەن ئەوانم دەكرد بەیەكەم‌و دەمخستنە پێشەوە.

كاتێ ئەم پلە دانانە لەلایەن پێغەمبەرەوە بۆ بنەماڵەكانی ئەنصار دانراو، ئەم هەواڵە گەیشتەوە، بە سەعدی كوڕی عوبادە، كە لەبنەماڵەی بەنی ساعیدەیە، كە لەپلەی چوارەمدا بوون، لەمە دلگران بوو، وە گوتی: ئێمە دواخراوین، دواترینی

ئەم چوار بنەماڵەین، ئادەی گوێ درێژەکەمم بۆزینکەن، دەچم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

سەهلی برازای قسەی لەگەڵدا کرد، گوتی: دەچی چی دەکەی؟ گوایە بەرپەرچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەدەیتەوە، دیارە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخۆیەوە شت نالێ، بەسرووشی خودایی شت دەڵێ، کەواتە ئەو باشتر لە کارەکە دەزانێ، ئەوەت بەس بێ کەچوارەمی چوار بنەماڵەکەیت؟

سەعدیش گەڕایەوەو فەرمووی: (خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باشتری لێ دەزانن!).

جا فەرمانی کرد زینەکەیان لە گوێ درێژەکە گرتەوە. {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٣١٦٨ ج/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٣٤٥٩ ج/٤}. باسی پاکژیو گەورەیی یاریدەدەران.

## ١٣١٥) بەجوانی رەفتارکردن لەگەڵ یاریدەدەران
## بَابٌ: فِي حُسْنِ صُحْبَةِ الْأَنْصَارِ

١٧٢٩- عَنْ أَنسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ فِي سَفَرٍ، فَكَانَ يَخْدُمُنِي، فَقُلْتُ لَهُ: لاَ تَفْعَلْ. فَقَالَ: إِنِّي قَدْ رَأَيْتُ الأَنْصَارَ تَصْنَعُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَيْئًا آلَيْتُ أَنْ لاَ أَصْحَبَ أَحَدًا مِنْهُمْ إِلاَّ خَدَمْتُهُ. (وَزَادَفِي رِوَايَة): وَكَانَ جَرِيرٌ أَكْبَرَ مِنْ أَنَسٍ). {الحديث: ٦٣٧٥ = ٦٣٨٧ فم. بخاري. جهاد: ٢٨٨٨. تحفة الأشراف: ٣٢٠٨. تجريد البخاري/٣، رقم: ١١٨٩ = ٢٨٨٩ فتح الباري}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە سەفەرێکا لەگەڵ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیدا بووم، لەڕێگە، لەو سەفەرەدا خزمەتی دەکردم، منیش پێم گوت: شتی وا مەکە، خزمەتم مەکە. فەرمووی: لەڕاستیدا من خۆم بەچاوی خۆم دیومە کە ئەنصار، کە ناسراون بە یاریدەدەرانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەندە بە دڵسۆزیو بەدڵو بەداو خزمەتی پێغەمبەریان دەکرد، جا منیش

سوێندم خواردووە، کە هەرکاتێ لەگەڵ کەسێ لە یاریدەدەراندابم، ئەو چاکەیەی بدەمەوەو منیش خزمەتی ئەو بکەم.

لە گێڕانەوەیەکا ئەمەی زیاترە: جەریر بەتەمەن لە ئەنەس گەورەتر بوو!).

**١٣١٦) باسی گەورەیی ئەشعەرییەکان (ڕەزای خودایان لێ بێ). (٦٣٥٧ - ٦٣٥٨)**

**بَابٌ: فِي فَضْلِ الْأَشْعَرِيِّينَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم)**

١٧٣٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنِّي لأَعْرِفُ أَصْوَاتَ رُفْقَةِ الأَشْعَرِيِّينَ بِالْقُرْآنِ حِينَ يَدْخُلُونَ بِاللَّيْلِ، وَأَعْرِفُ مَنَازِلَهُمْ مِنْ أَصْوَاتِهِمْ بِالْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ، وَإِنْ كُنْتُ لَمْ أَرَ مَنَازِلَهُمْ حِينَ نَزَلُوا بِالنَّهَارِ، وَمِنْهُمْ حَكِيمٌ إِذَا لَقِيَ الْخَيْلَ)، - أَوْ قَالَ: الْعَدُوَّ – «قَالَ لَهُمْ إِنَّ أَصْحَابِي يَأْمُرُونَكُمْ أَنْ تَنْظُرُوهُمْ». {الحديث: ٦٣٥٧ = ٦٣٦٦ فـم. تجريد البخاری/٤، رقم: ١٥٧٧ = ٤٢٣٢. تحفة الأشراف: ٩٠٥٥}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من دەنگی کاروانی هاوڕێیانی ئەشعەرییەکان دەناسمەوە، لەشەودا کە دەڕۆنەوە بۆ ماڵ، لەپاش تەواوکردنی ئیش‌و کارەکەیان، بەهۆی خوێندنی قورئانەوە دەیان ناسمەوە، گەرچی بەڕۆژیش ماڵەکانیانم نەدیوەو نازانم لەکوێ دادەنیشن، حەکیم یەکێکە لەوان، پیاوی دانای وایان تیادایە کاتێ دەگا بەسوار گەل)، یا فەرمووی: (کاتێ دەگا بە لەشکری دوژمن، بەبێ پەروا پێیان دەڵێ: هاوڕێکانم فەرمانتان پێ دەکەن کە چاوەڕوانیان بکەن). واتە: دەڵێ بە هاوڕێیانی خۆی: ئەی دەستە سوار! با پێکەوە بڕۆین بۆسەر دوژمن. یا دەڵێ بە لەشکری دوژمن: ئەی سوپای دوژمن! ئەگەر ئێوە ئازان‌و مەردن‌و ترسنۆك‌و کوونی نین، مەڕۆن‌و رامەکەن هەتا کۆمەڵەی منیش دێن، ئەوسا بۆتان دەردەکەوێ کەکێ ئازایە). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٣٥٢٩}. باسی ئەبو موساو ئەبو عامیری ئەشعەری.

١٧٣١- عَنْ أَبِى مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ الأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِى الْغَزْوِ، أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ بِالْمَدِينَةِ جَمَعُوا مَا كَانَ عِنْدَهُمْ فِى ثَوْبٍ وَاحِدٍ ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُمْ فِى إِنَاءٍ وَاحِدٍ بِالسَّوِيَّةِ، فَهُمْ مِنِّى وَأَنَا مِنْهُمْ».
{الحديث: ٦٣٥٨ = ٦٣٦٧ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٠٧٦ = ٢٤٨٦}:

ئەبو مووساى ئەشعەرى (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووى: (ئەشعەرييەكان كە هۆزى ئەبو مووساى ئەشعەرين، كە جێگەى دانيشتنيان يەمەنە، مەردايیەكيان واتيادا، ئەگەر لەغەزادا توێشوو خۆراكيان هاتە كزى، ياخود لەناو شارو ئاواييدا، نان‌و خۆراكى خێزانەكانيان هاتە كەمى، دێن ئەوەى كەماوە لەلايان، هەمووى لەيەك دەفرا، يا لەيەك جێگەدا كۆدەكەنەوە، ئەوجا بەقاپێ، بە حاجەتێ لەبەينى خۆيانا، بەپێى سەر، وەك يەك بەيەكسان بەشى دەكەن ئەوان لە من‌و من لەوانم!). {تاج/٣، زنجيرە: ٦٣، ژمارە: ٣٥٣٠}.

**روونكردنەوە:**

راڤەكاران دەفەرموون:

١- قورئان خوێندن لەشەودا، بەدەنگى بەرز سوننەتەو خێرێكى گەورەيە، بەمەرجێ نەبێ بەئازار بۆ كەسێ، وەك خەو لەخەوتوو بزڕێنێ، ياسەر لەنوێژكەر بشێوێنێ، يا شتى ترى وا، وە بۆ مەرايى‌و ريا بازيش نەبێ.

٢- بۆئەوەى لە تێكەڵكردنى خۆراكەكان لە بارودۆخى ئاوادا بەباشى حاڵى ببين، ئەم نموونەيە دەكەين بە پێوەرو بەسەر مەشق:

أ- ئەحمەد پێنج سەرخێزانى هەيەو پێنج كيلۆ ئارديشى هەيە.

ب- موحەممەد سێ سەر خێزانى هەيە، بەڵام بيست كيلۆ ئاردى هەيە.

ج- مەحموود دووسەر خێزانى هەيە، بەڵام چل كيلۆ ئاردى هەيە. ئاردەكان لەشوێنێكا كۆدەكەينەوە دەكاتە:

٥ + ٢٠ + ٤٠ = ٦٥ شەست‌و پێنج كيلۆ ئارد.

ئەوجا خێزانەكانيش كۆدەكەينەوە دەكاتە:

ئەحمەد (٦) موحەممەد (٤) مەحموود (٣) دەكاتە:

٦ + ٤ + ٣ = ١٣ سیازدە كەس. ئەوسا ئاوا ئاردەكە دابەش دەكەین بەسەر ژمارەی كەسەكانا:

٦٥ ÷ ١٣ كەس = هەر سەرێ پێنج كیلۆی دەكەوێ.

دەبینین: خێزانی ئەحمەد لەهەموویان كەمتریان بوو ئێستە لەهەموویان زیاتریان بەركەوتووە (٣٠) كیلۆیان بەركەوتووە. خێزانی موحەممەد وەك خۆیان ماون (٢٠) كیلۆیان بەركەوتووە. خێزانی مەحموود لەهەموویان زیاتریان بوو، ئێستە لەهەموویان كەمتریان بەردەكەوێ (١٥) كیلۆیان بەردەكەوێ!!

٣- مەبەست لەم دابەشكردنە، ئەو دابەشكردنە نییە، كە بەپێی فیقە، مەرجی تایبەتی خۆی هەیە، هەتا سەر نەكێشێ بۆ سوودو ریباو حەرامی، بەڵكوو مەبەست ئەوەیە هەركەسێماڵەكەی خۆی رەوا دەبینێ بۆ ئەوانی ترو گەردنیان ئازاد دەكا ئەگەر زیادەیە چوو بەلای یەكێكیانەوە.

**١٣١٧) نزاو پاڕانەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ هۆزی غیفارو بۆ هۆزی ئەسلەم.** (٦٣٦٢ - ٦٣٨٤)

**بَابٌ: دُعَاءُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِغِفَارٍ وَأَسْلَمَ**

١٧٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «أَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ، وَغِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، أَمَا إِنِّي لَمْ أَقُلْهَا، وَلَكِنْ قَالَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ».
{الحديث: ٦٣٨٠ = ٦٣٩٢ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٣٩٧ = ٣٥١٣ فتح الباري} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هۆزی ئەسلەم لەگەڵ خودادا ئاشتن، خودا خۆش و سەلامەتو بێوەییانكات، هۆزی غیفاریش خودا هەتا سەر لێیان خۆش بێ، ئەدی بزانن من ئەم قسەیە لەخۆمەوە ناكەم، بەڵام خودای گەورەو سەروەر خۆی وا دەفەرموێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٣٥٤٤ ج/٤} . پایەی هۆزەكانی غیفارو ئەسلەمو ئەشجەعو جوهەینەو موزەینە.

**١٧٣٣- عَنْ خُفَافِ بْنِ إِيمَاءٍ الْغِفَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي صَلاَةٍ: «اللَّهُمَّ الْعَنْ بَنِي لِحْيَانَ وَرِعْلاً وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ، عَصَوُا اللَّهَ وَرَسُولَهُ، غِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ». {الحديث: ٦٣٨١ = ٦٣٩٣ فم}:**

**خوفافی کوڕی ئەیمائی ئەلغیفاری** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لە قونووتی نوێژی بەیانیدا، کە لەروکوع هەڵدەسایەوە دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ الْعَنْ بَنِي لِحْيَانَ وَرِعْلاً وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ، عَصَوُا اللَّهَ وَرَسُولَهُ، غِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ»:**

**خودایە! نەفرەت بکە لەهۆزی بەنی لەحیانو لەهۆزی ریعلو لەهۆزی زەکوانو لەهۆزی عوصەییە، کە لەخوداو پێغەمبەری خودا یاخی بوونو، نامەردییان لە موسوڵمانەکان کردو، لەرووداوی بیری مەعوونەدا، حەفتا کەسیان لە یارانی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **شەهیدکرد، کەپێیان دەگوتن قورراء، واتە: قورئان خوێنەکان). {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ١٠٢، ژمارە: ٤٦٤٤ چ/٤}.**

**پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەپاش ئەم نەفرەتو نزای شەڕە لەمانە، لە قونووتا، نزای خێریشی بۆ ئەم دوو هۆزەی تر دەکرد، لەناو هەمان قونووتداو دەیفەرموو: (هۆزی غیفار خودا لێیان خۆش بێ، هۆزی ئەسلەمیش خودا خۆشو سەلامەتو بێوەییانکات!). {تاج/١، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٦٢ + تاج/٤، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٧٧٥ چ/٤}. سوورەتی ئالی عیمران.**

## ڕوونکردنەوە:

**خوفافی کوڕی ئەیمائی ئەل — غیفاری (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) خۆیو باوکی هاوەڵی پێغەمبەر بوون، ئەیمائی کوڕی ڕەحەضەی باوکی خوفاف ئاغای هۆزی غیفار بوو، بەرنوێژی بۆیان دەکرد، لە موسوڵمانە پێشینەکانە. خوفافیش بەرنوێژی بۆ هۆزی غیفار دەکرد خەتیبیشیان بوو، ئامادەی ڕێکەوتنی حودەیبییە**

بوو، له غەیقە دادەنیشت زۆر هاموشۆی مەدینەی دەکرد، بەغەوی دەفەرموێ: لەسەردەمی عومەردا مردووە.

## ١٣١٨) باسی گەورەیی موزەینەو جوهەینەو غیفار. (٦٣٨٥ - ٦٤٠٠)
## بابٌ: فِي فَضْلِ مُزَيْنَةَ وَجُهَيْنَةَ وَغِفَارٍ

١٧٣٤- عَنْ أَبِى بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: إِنَّمَا بَايَعَكَ سُرَّاقُ الْحَجِيجِ مِنْ أَسْلَمَ وَغِفَارَ وَمُزَيْنَةَ - وَأَحْسِبُ جُهَيْنَةَ — (مُحَمَّدٌ الَّذِى شَكَّ). فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ أَسْلَمُ وَغِفَارُ وَمُزَيْنَةُ (وَأَحْسِبُ جُهَيْنَةَ) خَيْرًا مِنْ بَنِى تَمِيمٍ، وَبَنِى عَامِرٍ، وَأَسَدٍ وَغَطَفَانَ، أَخَابُوا وَخَسِرُوا»؟! فَقَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَوَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنَّهُمْ لأَخْيَرُ مِنْهُمْ».
{الحديث: ٦٣٩١ = ٦٤٠٣ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٣٩٨ = ٣٥١٥، ٣٥١٦، ٦٦٣٥. ترمذى. مناقب: ٣٩٥٢. تحفة الأشراف: ١١٦٨٠}:

ئەبوبەکرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەقرەعی کوڕی حابیس کە پیاوێکی ناوداری هۆزی بەنی تەمیم بوو، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی گوت: جاکێ پەیمانی بەتۆ داوە؟ مەگەر ئەو دزو جەردەو چەتانەی کە حاجیان رووت دەکەنەوە، کە لەهۆزی ئەسلەمو غیفارو موزەینەو جوهەینەن) بۆ جوهەینە باش لێم روون نییە، بەڵام وابزانم ئەقرەع ناوی هۆزی جوهەینەیشی هێنا.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی پێم بڵێ: ئەگەر ئەسلەمو غیفارو موزەینە) وا بزانم فەرمووشی: جوهەینە، لەلای خودای گەورە، چاترین لەهۆزی بەنی تەمیمو بەنی عامیرو ئەسەدو غەطەفان، ئایە ئەمانە مایە پووچو زیانەومەند دەرناچن؟).

ئەقرەع گوتی: با، مایە پووچ دەردەچن. خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەسا بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە خودای گەورەو فریارەسە، ئەوانە لەمانە باشترن لەلای خودای گەورە، چونکە زووتر لەوان ئیسلامبوون!).
{تاج/٣، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٣٥٤٧ چ/٤}. هۆزەکانی غیفارو ئەسلەم.

**روونكردنەوە:**

١- ئەقرەعی كوڕی حابیس (رەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئایینی پیرۆزیی ئیسلام، ئەقرەع ناوبژیوان (حەكەم) بوو، كێشە كۆمەڵایەتییەكانی بۆ مەردوم چارەسەر دەكرد، لە موئەللەفە قولوبەكان بوو، ئامادەی ئازادكردنی مەككەو غەزای حونەین‌و غەزای طاییف بوو لەگەڵ لەشكری پێغەمبەردا، لەسەرەتاوە رەخنەی زۆری لە بڕیارەكانی ئیسلام دەگرت، بەڵام لەپاشا موسوڵمانێكی جوانی لێ دەرچوو. دەڵێن: ئەقرەع بەر لەئیسلام بوونی مەجووسی بووە، واتە: ئاگر پەرست بووە، ئەقرەعی كوڕی حابیس خۆی‌و دە كوڕی لەجەنگی یەرمووكدا شەهید بوون، (رەزای خودایان لێ بێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٥٢٠} . خەڵاتكردنی نۆ موسوڵمان.

### ١٣١٩) وەسپی جوانی هۆزی طەی. (٦٣٨٥ - ٦٤٠٠)

### بَابٌ: مَاذُكِرَ فِي طَيِّئٍ

١٧٣٥- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ لِي: إِنَّ أَوَّلَ صَدَقَةٍ بَيَّضَتْ وَجْهَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَوُجُوهَ أَصْحَابِهِ، صَدَقَةُ طَيِّئٍ جِئْتَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

عەدی كوڕی حاتەم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چوومە خزمەتی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) پێی فەرمووم: یەكەم صەدەقەیێ كە رووی پێغەمبەرو یارانی پێغەمبەری گەشانەوە، صەدەقەكەی هۆزی طەی بوو كەتۆ خۆت هێنات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٣٥٥٣ ج/٤} . پایەی بەنی تەمیم‌و دەوس‌و تەیی.

### ١٣٢٠) نزای خێر بۆ هۆزی دەوس. (٦٣٨٥ - ٦٤٠٠)

### بَابٌ: ما ذكر في دَوْسٍ

١٧٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ الطُّفَيْلُ وَأَصْحَابُهُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ دَوْسًا قَدْ كَفَرَتْ وَأَبَتْ، فَادْعُ اللَّهَ عَلَيْهَا. فَقِيلَ: هَلَكَتْ دَوْسٌ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْسًا وَائْتِ بِهِمْ». {الحديث: ٦٣٩٧ = ٦٤٠٩ فم. بخاري. مناقب: ٤٣٩٢، ٦٣٩٧} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: طوفەیلی کوڕی عەمری ئەل-دەوسیو برادەرەکانی (خودایان لێ رازی بێ) هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتیان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەڕاستی هۆزی دەوس خودا ناناسنو مل نادەنو لەکێش دەرچوون! کەواتە نزای خراپیان لێ بکە، کەخودا بیان فەوتێنێ، خەڵکەکەیش گوتیان: تازە هۆزی دەوس فەوتان، چونکە ئێستا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای شەڕیان لێ دەکا، دیارە نزاکەیشی گیرایە!

کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەجیاتی ئەوەی کە نزای خراپیان لێبکا، نزای باشی بۆیانکردو فەرمووی: (ئەی خودایە! ڕێنمایی هۆزی دەوس بکەو کەمەنکێشایان بکە بۆ قەبووڵی ئیسلام). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٣٥٥١ چ/٤}.

پایەی بەنی تەمیمو دەوسو....

**ڕوونکردنەوە:**

نزاکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گیرابوو، حەبیبی کوڕی عەمری دەوسی، خۆیو باوکی حوکمداری سەر هۆزی دەوس بوون، دەڵێن: حەبیب سێ سەد ساڵ ژیاوە، حەبیب دەیگوت: من دەزانم کە ئەم بوونەوەرو دروستکراوانە، دروستکەرێکیان هەیە، بەڵام نازانم کێیە؟ جا کاتێ بیستی کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتووە، خۆیو پەنجاو حەوت کەس لەپیاو ماقووڵانی هۆزەکەی هاتن بۆ خزمەتی، ئیتر ئەوان موسوڵمان بوونو هۆزی دەوسیش موسوڵمان بوون!

## ١٣٢١) باسی گەورەیی هۆزی بەنی تەمیم
## بابٌ: فَضْلُ بَنِي تَمِيمٍ

١٧٣٧- عَنْ أَبِي زُرْعَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): لاَ أَزَالُ أُحِبُّ بَنِي تَمِيمٍ مِنْ ثَلاَثٍ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّالِ». قَالَ: وَجَاءَتْ صَدَقَاتُهُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «هَذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِنَا». قَالَ: وَكَانَتْ سَبِيَّةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ عَائِشَةَ،

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَعْتِقِيهَا فَإِنَّهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ». {الحديث: ٦٣٩٨ = ٦٤١٠ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٠٩٠ = ٢٥٤٣، ٤٣٦٦. فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٤٨٨٩}:

ئەبو زورعە فەرمووی: ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوەتی ئەم سێ وەسپو مەدحە جوانەی بەنی تەمیم، لەدەمی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەگوێی خۆم بیستووە ئیتر لەوساوە هۆزی بەنی تەمیمم خۆش دەوێ. لێیم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئازاترینو خۆگرترینی ئۆمەتم، لەئاستی جەجاڵ، هۆزی بەنی تەمیمن!). کاتێ زەکاتەکانیشیان هات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە زەکاتی خزمانی ئێمەیە).

ژنێکی دیلی بەتاڵان گیراوی کۆیلەی بەنی تەمیمی کەنیزەکی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی عائیشە! ئەم کارەکەرەت ئازادبکە، چونکە ئەمە لەنەوەی ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٣٥٥٠}. پایەی بەنی تەمیمو دەوس....

**روونکردنەوە:**

هۆی فەرمانکردن بە ئازادکردنی ئەم کەنیزەکە ئەوە بووە، چونکە عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) ئاه (نەزر)ی کردبوو، کە یەکێ لەوەچەو نەوەی حەزرەتی پێغەمبەر ئیسماعیل (سلاوی خودای لەسەر بێ) ئازادبکا، کە باپیرەی عەرەبەکان بووە.

## ١٣٢٢) بەستنی پەیمانی برایەتی لەنێوان یارانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ). (٦٤٠٩ - ٦٤١٢)

## بَابٌ: فِي الْمُؤَخَاةِ بَيْنَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٧٣٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) آخَى بَيْنَ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ وَبَيْنَ أَبِي طَلْحَةَ. {الحديث: ٦٤٠٩ = ٦٤٢١ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست لەنێوانی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراحو ئەبو طەلحەدا. {تاج/٣، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٣٥٠٤ چ/٤}.

١٧٣٩- عَنْ عَاصِمٌ الأَحْوَلُ قَالَ: قِيلَ لأنَسِ بْنِ مَالِكٍ: بَلَغَكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ». فَقَالَ أَنَسٌ: قَدْ حَالَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بَيْنَ قُرَيْشٍ وَالأَنْصَارِ فِي دَارِهِ. {الحديث: ٦٤١٠ = ٦٤٢٢ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٠١٠ = ٢٢٩٤، ٦٠٨٤، ٧٣٤٠}:

عاصیمی ئەحوەل فەرمووی: عەرزی ئەنەسی کوڕی مالیك کرا: ئایا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر گەیشتووە بەتۆ کە دەفەرموێ: (پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نییە) ؟ فەرمووی: لەماڵی منا لەمەدینە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی دۆستایەتیو دەستە برایەتی بەست لەنێوانی کۆچکارانا، کە بەشێوەی گشتی لەهۆزی قورەیش بوونو، لەنێوانی یاریدەدەران (ئەنصار)دا، کە لەخەڵکی مەدینە بوون). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٣٥٠٥ چ/٤} + {بڕوانە: ژمارە: ١٧٤٠ لەدواوە}. پەیمانی برایەتی لەنێوانی.......

**ڕوونکردنەوە:**

وەك لە پەڕاوەکانی ڕاڤەکاندا باسکراوە، دوو جۆرە پەیمان بەستن هەیە:

یەکەم: پەیمانبەستن لەسەر شێوەی سەردەمی نەفامیو نەزانی، کە پەیمانەکە دەبوو بەهۆی کەڵەپوور گرتن لەیەکتریو یاریدەدەری یەکتری لەسەر حەقو ناحەق، پەیمان بەم واتەیە لە ئیسلاما نەماوەو نییە.

دووەم: پەیمانبەستن لەسەرئەوە کە دوو لایەن هاوکاریو پشتگیری یەکتری بکەن، لەسنووری پەیڕەوی حەقا، بۆ پاراستنی مافی ڕەوای هەردوولا، ئەم جۆرەیان هەتا ڕۆژی دوایی دەمێنێ.

١٧٤٠- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ، وَأَيُّمَا حِلْفٍ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ لَمْ يَزِدْهُ الإِسْلاَمُ إِلاَّ شِدَّةً». {الحديث: ٦٤١٢ = ٦٤٢٤ فم}:

جوبەیری کوڕی موطعیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویێت: (پەیمان بەستن لەسەر شتی ناڕەوا، وەك ئەمە لەسەر هەق‌و ناهەق لەسەر هاوپەیمانی خۆت بکەیتەوە، شتی وا ناڕەوا لە ئیسلامدا نییە، بەلام ئەو پەیمانە ڕەوایانەشی کە لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلامدا باوبوون، ئیسلام زیاتر پتەویان دەکات!). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٣٥٠٦ ج/٤}. پێغەمبەر پەیمانی برایەتی لەنێوانی یاریدەدەران‌و کۆچکاراندا دەبەستێ.

**١٣٢٣) فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): من نیشانەی ئاسوودەیی‌و ئەمن‌و ئاسایشم بۆ هاوەڵ‌و یارانی خۆم‌و هاوەڵانیشم نیشانەی ئەمن‌و ئاسایشن بۆ گەلی ئیسلامی من. (٦٤١٣)**

**بَابٌ: قَوْلُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَا أَمَنَةٌ لأَصْحَابِي وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لأُمَّتِي**

١٧٤١- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: صَلَّيْنَا الْمَغْرِبَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ثُمَّ قُلْنَا: لَوْ جَلَسْنَا حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَهُ الْعِشَاءَ. قَالَ: فَجَلَسْنَا، فَخَرَجَ عَلَيْنَا فَقَالَ: «مَا زِلْتُمْ هَا هُنَا؟». قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّيْنَا مَعَكَ الْمَغْرِبَ ثُمَّ قُلْنَا نَجْلِسُ حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَكَ الْعِشَاءَ. قَالَ: «أَحْسَنْتُمْ أَوْ أَصَبْتُمْ». قَالَ: فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، وَكَانَ كَثِيرًا مِمَّا يَرْفَعُ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: «النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ، وَأَنَا أَمَنَةٌ لأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ، وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ». {الحديث: ٦٤١٣ = ٦٤٢٥ فم}:

ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: نوێژی شێوانمان لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، جاگوتمان: دادەنیشین تا نوێژی خەوتنانیش بەکۆمەڵ لەپشت پێغەمبەرەوە دەکەین. فەرمووی: جا دانیشتین، کە هاتەوە بۆلامان بۆ کردنی بەرنوێژیی نوێژی خەوتنان.

فەرمووی: (هێشتا هەر لێرە ماون). عەرزیمانکرد: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا! لەدڵی خۆمانا گوتمان: بۆچی بڕۆینەوە، یەکجاری دادەنیشین تا نوێژی خەوتنانیش دەکەین لەخزمەتی تۆدا. فەرمووی: (ئافەرین باشتان کردووە). یا فەرمووی: (چاکتان کردووە، پێکاوتانە).

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان و تەماشای ئاسمانی کردو گەڵێ جار وای دەکرد، ئەوسا فەرمووی: (ئەستێرەکان نەمان، ئەوجا ئەو هەڕەشەیەی لە ئاسمان کراوە دێتەدی و جیهان خاپوور دەبێ و قیامەت هەڵدەستێ، منیش نیشانەی ئەمن و ئاسایشم بۆ هاوەڵ و یارانی خۆم، هەتا خۆم مابم دوور دەبن لە ئاژاوەو دوو بەرەکی و شەڕی ناوخۆ، بەڵام کەمن نەمام و مردم، ئەوسا ئەو هەڕەشەو گوڕەشەیەی کە لەیاران و هاوەڵانم کراوە، دێتەجێ و ئاژاوەو دوو بەرەکی و جیاجیایی و پاشگەزبوونەوە سەرهەڵدەدەن لەناویانا، وە لەڕاستیدا ئەمانەیش لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموویان روویاندا، بەڵام سوپاس بۆ خودا، لەسایەی خوداوە، بەپێی بەڵێنی قورئانی پیرۆز: {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ - الحجر – ٩/١٥}. واتە:

ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوار، هەرخۆشمان دەیپارێزین). سوپاس بۆ خودا بەپێی ئەم بەڵێنە پیرۆزە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەسەر بەرزی پایەدارە.

هاوەڵان و یارانیشم نیشانەی ئاسوودەیی و ئاسایش و ئارامین بۆ ئۆمەتم، جا کەهاوەڵانم نەمان و گشتیان مردن، ئەوجا ئەو هەڕەشەیەی لە ئۆمەتم کراوە دێتەدی و شوێنی هەواو هەوەس دەکەون و تووشی دەردی سەریی زۆر دەبن!). {تاج/٣، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٢٢٦، ٣٢٢٤}. باسی گەورەیی و پاکژی یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەتێکڕایی.

**١٣٢٤) باسی کەسانێ کە پێغەمبەریان دیبێ، یا هاوەڵانی پێغەمبەریان دیبێ، یا کەسێکی دیبێ، کە ئەو پێغەمبەری دیبێ (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەری خوداو ڕەزای خودا لە هاوەڵانو یارانو پەیڕەوانی هەتا هەتایە)** . (٦٤١٤ - ٦٤٢٥)

**بَابٌ: فِيمَنْ رَأَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوْ رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوْ رَأَى مَنْ رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**

١٧٤٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يُبْعَثُ مِنْهُمُ الْبَعْثُ فَيَقُولُونَ: انْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ فِيكُمْ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَيُوجَدُ الرَّجُلُ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ، ثُمَّ يُبْعَثُ الْبَعْثُ الثَّانِي، فَيَقُولُونَ: هَلْ فِيهِمْ مَنْ رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ، ثُمَّ يُبْعَثُ الْبَعْثُ الثَّالِثُ، فَيُقَالُ: انْظُرُوا هَلْ تَرَوْنَ فِيهِمْ مَنْ رَأَى مَنْ رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ ثُمَّ يَكُونُ الْبَعْثُ الرَّابِعُ فَيُقَالُ: انْظُرُوا هَلْ تَرَوْنَ فِيهِمْ أَحَدًا رَأَى مَنْ رَأَى أَحَدًا رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَيُوجَدُ الرَّجُلُ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ». {الحديث: ٦٤١٥ = ٦٤٢٧ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١١٩٣ = ٢٨٩٧، ٣٥٩٤، ٣٦٤٩}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەردەمێ دادێ، کۆمەڵێ خەڵك، بە فەرمانی فەرمانڕەوای موسوڵمانان دەڕۆن بۆ غەزا، دەچن بۆ جەنگ، بۆ پەخشی نووری ئیسلام، دەڵێن: تەماشابکەن، ئایا کەستان تیادا هەیە، کە لەهاوەڵانی پێغەمبەر بێ؟ دەڵێن: بەڵێ، تاقە یەك پیاو هەیە. ئیتر خودا لەو غەزایەدا بە پیرۆزیو بەرەکەتی ئەو تاقە هاوەڵەی پێغەمبەرەوە زاڵیان دەکاو سەردەکەونو ئەو شوێنە ڕزگار دەکەن.

لەپاشا سەردەمێ تر دادێ، عەشاماتێ تر دەچن بۆ غەزا، دەڵێن: ئایا کەسێ هەیە لەناویانا، کە هاوەڵانی پێغەمبەری دیبێ؟ دەڵێن: بەڵێ، یەك کەس هەیە، جا بەهۆی پیرۆزیو بەرەکەتی ئەو تاقە تابیعییەوە، خودا ئەوانیش زاڵ دەکاو سەریان دەخاو، ئەو وڵاتەیش ئازاد دەکەن!

لەپاشا سەردەمی سێیەم دادێ، کەسانێ تر لە موسولمانان دەڕۆن بۆ غەزا، دەڵێن: سەرنج بدەن، بڕوانن کەسیان واتیادا، کە کەسێکی دیبێ، ئەو کەسێکی وای دیبێ، کە ئەو کەسە هاوەڵی پێغەمبەری دیبێ؟ (واتە: ئەو کەسە تابیعی تابیعی دیبێ!) دەڵێن: بەڵێ هەیە، جا بە بەرەکەتی ئەو تابیعی تابیعییەوە، خودا لەو غەزایەدا سەریان دەخا. لەپاشا سەردەمی چوارەم دادێ، دەڵێن: ئادەی تەماشا بکەن ئایا کەسێکیان تیا دەبینن، کە ئەو کەسێکی دیبێ، کە ئەو کەسێکی دیبێ، کە ئەو هاوەڵانی پێغەمبەری دیبێ؟ دەڵێن: بەڵێ، یەك پیاو لەم جۆرە کەسە هەیە، ئیتر خودا بە بەرەکەتی ئەو پیاوەوە ئەو شوێنەیان بۆ ئازاد دەکا). {تاج/٣، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٢٢٤ ج/٤}. باسی گەورەیی‌و پاکژی یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە تێکڕایی.

### ١٣٢٥) باشترین چین چینی هاوەڵانی پێغەمبەرە، ئەنجا چینی دوا ئەوان، لەدوا ئەوانیش چینی دوا ئەوان. (٦٤١٤ - ٦٤٢٥)

### بَابٌ: خَيْرُ الْقُرُونِ قَرْنُ الصَّحَابَةِ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ

١٧٤٣- عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ». (قَالَ عِمْرَانُ: فَلاَ أَدْرِي أَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بَعْدَ قَرْنِهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً). «ثُمَّ يَكُونُ بَعْدَهُمْ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلاَ يُتَّمَنُونَ، وَيَنْذُرُونَ وَلاَ يُوفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ». {الحديث: ٦٤٢٢ = ٦٤٣٤ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١١١٨ = ٢٦٥٢، ٣٦٥١، ٣٦٥٠، ٦٤٢٨، ٦٦٩٥، ٦٤٢٩، ٦٦٥٨. نسائي. أيْمان ونُذُور: ٣٨١٨. تحفة: ١٠٨٢٧}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشترینی چینی ئیوە چینی هاوچەرخی خۆمە، کەچینی هاوەڵانە، کە ناسراون بەچینی سەحابەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). ئەوجا چینی دوای ئەوان کە چینی دووەمی موسولمانانن، کە ناودارن بە تابیعین، کە بەکوردی پەیڕەوان‌و

شوێنکەوتوانیشیان پێ دەگوترێ. ئەوجا چینی دوای ئەوان، کەپێیان دەگوترێ: چینی ئەتباعی ئەتباع کە چینی سێیەمی موسوڵمانانن. ئەوجا چینی دوای ئەوان، کەچینی چوارەمی موسوڵمانن (عیمران فەرمووی: باش نازانم کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپاش چینی خۆی دوو چینی تری فەرموو، یاسێ چین).

حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئیتر لەپاش ئەم چینانە، کەسانێ واپەیدا دەبن، کۆناکەنەوە لە شایەتیو سوێند خواردن، هێشتا کەسێ داوای شایەتی لێیان نەکردووە، ئەوان لەخۆیانەوە، پێش ئەوە لە حاڵەکە حاڵی ببن شایەتیی دەدەن! گزیو ناپاکی لە سپاردەو شتی وا دەکەنو بەڕاستی ناپاکو گزیکار خۆیاننو، ئاهو نەزر دەکەنو جێبەجێی ناکەن، بەرە بەرە قەڵەویی لەناویانا پەرە دەستێنێ!).
{تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٢٤٨٠ + تاج/٣، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٢٢١. چاپی چوارەم).
باسی گەورەییو پاکژی یارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەتێکڕایی.

## ١٣٢٦) مەردوم رێك وەك كان وان، چۆن كان لەبنەڕەتدا چاكو خراپی هەیە، ئەوانیش هەروا. (٦٤٠١ - ٦٤٠٢)

## بَابٌ: تَجِدُونَ النَّاسَ مَعَادِنَ

١٧٤٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «تَجِدُونَ النَّاسَ مَعَادِنَ، فَخِيَارُهُمْ فِى الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِى الإِسْلاَمِ إِذَا فَقُهُوا، وَتَجِدُونَ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ فِى هَذَا الأَمْرِ أَكْرَهُهُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ فِيهِ، وَتَجِدُونَ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ ذَا الْوَجْهَيْنِ: الَّذِى يَأْتِى هَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ». {الحديث: ٦٤٠١ = ٦٤١٣ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٣٤٥ = ٣٣٥٣، ٣٣٧٤، ٣٣٨٣، ٣٤٩٠، ٤٦٨٩ فتح الباري}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەبینن ئەو خەڵکە، لەبنەڕەتدا، رێك وەك كان وان، چاكو خراپیان هەیە، دەی بزانن ئەو بنەماڵەو كەسانەیان كە لەسەردەمی نەفامیدا باش بوون، هەر ئەوانەشیان لەسەردەمی ئیسلامەتیدا باشن، بەمەرجێ كە شارەزای ئایین ببنو بەجوانی رەفتاری پێ بكەن، هەروا دەبینن باشترین كەسێ بۆ ئەم كاروبارە، ئەو

کەسانەن کە لەپێشا ئەم کارو بارەیان زۆر پێ ناخۆشە، بەڵام کە قەبوولی دەکەن دەبن بە باشترین دۆستو یارمەتیدەر بۆی!

هەروا دەبینن بەدترینو گەندەڵ ترینی ئەو خەڵکە، ئەوانەن کەدوو روون: کە لەلای لایێ قسەیێ دەکاو لەلای لایەکەی تر قسەیەکی تر دەکاو، بەپێی سوودو قازانجی خۆی زمان دەگۆڕێ!). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٥٩، ژمارە: ١٥٤٠ + تاج/٤، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٣٩٢٧ چ/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٣٥٣٩}.

**روونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە لە ریاضدا ئاوا کراوە بەکوردی، وەرگەڕانی ئەوێ دەکەین بەڕاقەو روونکردنەوە:

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سەرنج دەدەن: ئەم خەڵکە وەك کانو کانزا وان، هەرکەسەیان لەبنەڕەتدا، رەگەزی دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەکی خانەدان، یان بە بنەچەو رەسەن دەچێتەوە سەر بەرە بابێکی نارەسەن، وە بەشێوەی گشتی، کردارو رەفتاریان، لەحاڵی ژیانیانا، بەپێی رەسەنیو نارەسەنی بنجو بنەوانیانە، جا بۆیە ئەوانەی کە لەسەردەمی نەفامیدا رەسەنو بنەچە باش بوون، ئێستایش لەسەردەمی ئیسلامەتیدا دیسان خۆشیان رەسەنو رەفتار باش دەردەچن، وەك دەڵێن: گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە، بەمەرجی ئەوە کە شارەزای ئایینی پیرۆزی ئیسلام بنو ببن بەزاناو مامۆستا لە شەریعەتدا، وە هەروەها سەرنج دەدەن کە باشترین کەس بۆ ئەم کارە، کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، یا سەرکردەییو فەرمانڕەواییە، ئەو کەسانەن کە لەپێشدا حەزیان لێی نەبووەو بگرە زۆریش رقیان لێی بووە، تا کاتێ دەکەونە ناوی، یا پۆستی کارمەندییو فەرمانڕەوایی وەردەگرن دەبنە باشترین دۆستو لایەنگیری (وەك ئیمامی عومەر، لەپێشدا دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوو، کە ئیسلام بوو، گەورەترین دۆستی بوو) هەروەها سەرنج دەدەن کە بەدترین کەس بۆ ئەم کارە ئادەمیزادی دوو رووە، کە

لەلای ئێوە قسەیەك دەكاو، لەلای ئەوان قسەیەكی تر دەكاو بەپێی بەرژەوەندی خۆیان گفتوگۆ دەگەن!). {بڕوانە: ژمارە: ١٧٧٢ لەدواوە دێت لەم پەڕاوە پیرۆزەدا}.

**١٣٢٧) فەرمایشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): لەپاش سەد ساڵی تر، كەسێ نامێنێ لەوانەی كە ئێستا زیندوونو وان لەسەر رووی زەوی.** (٦٤٢٦ - ٦٤٣٣)

**بَابُ: قَوْلُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لا تَأْتِي مِائَةُ سَنَةٍ وَعَلَى الأَرْضِ نَفْسٌ مَنْفُوسَةٌ مِمَّنْ هُوَ عَلَيْهَا**

١٧٤٥- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ لَيْلَةٍ صَلاَةَ الْعِشَاءِ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ: «أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ فَإِنَّ عَلَى رَأْسِ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ». قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَوَهَلَ النَّاسُ فِي مَقَالَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تِلْكَ فِيمَا يَتَحَدَّثُونَ مِنْ هَذِهِ الأَحَادِيثِ عَنْ مِائَةِ سَنَةٍ، وَإِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ. أَحَدٌ يُرِيدُ بِذَلِكَ أَنْ يَنْخَرِمَ ذَلِكَ الْقَرْنُ». {الحديث: ٦٤٢٦ = ٦٤٣٨ فم}:

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێكیان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەئاخری ڕۆژانی ژیانیدا، نوێژی خەوتنانی بە كۆمەڵ بۆ كردین، كە سڵاوی نوێژەكەی دایەوە هەڵسایەوە فەرمووی: (خۆ ئەم شەوەتان دەبینن!؟ دەی لەپاش ئەم شەوەوە هەتا سەد ساڵی تر، كەس نامێنێ، لەوانەی كە ئێستا وان لەبەندی ژیاناو، لەپاش سەد ساڵی تر ئەم چینەی ئێستا هەموو تەواو دەبنو گشتیان دەمرن!).

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: خەڵكەكە لە حاڵیبوون لەم فەرمایشتەی پێغەمبەردا، بەهەڵەدا چوونو بە پێچەوانەوە تێگەیشتبوونو هەندێ وا حاڵی بوو بوون كە پێغەمبەر فەرموویەتی كە لەپاش سەد ساڵی تر قیامەت هەڵ دەستێ، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەبەستی ئەوە بوو كە حاڵییان بكا،

كە تەمەن كورتە، خۆشی بكوژێ تەمەنی هیچ كەسێ لەوانەی كەئێستا لەدایك بوون، لەسەد ساڵی تر تێپەڕ ناكات!!).

**روونكردنەوە:**

١- بڕوانە: ژمارە (١٣٥٩) تەجریدی بوخاری = ژمارە (٣٤٠٢) فەتحولباری (دەنگوباسی خدری زیندە، كە ئایا زیندووە، یا مردووە؟).

٢- بڕوانە: تاجول ئوصوول بەرگی چوارەم زنجیرە: ١ سوورەتی كەهف، ژمارە: ٣٩٧٣، ٣٩٧٤، ٣٩٧٥، ٣٩٧٦ دەنگوباسی خدری زیندە + تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، لاپەڕە: ٥٨٦، ژمارە: ٥٥٥٨. نیشانەی داهاتنی قیامەت.

٣- مێژوو نووسان دەفەرموون دواهەمین كەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە مردووە ئەبو طوفەیل بووە، كەسەد ساڵ لەپاش ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر مردووە. لەمردنی خدری زیندەیشدا جیاوازیی بیروڕا هەیە، كەئایا بەر بڕیاری ئەم فەرموودەیە كەوتووەو ئەویش مردووە یانا؟

**١٣٢٨) پێشگیریی لەجنێودان بە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و باسی ئەوە كە چینی ئەوان باشترو چاكترن لە چینەكانی پاش خۆیان.**

(٦٤٣٤ - ٦٤٣٦)

**بَابٌ: النَّهْيِ عَنْ سَبِّ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَفَضْلُهُمْ عَلَى مَنْ بَعْدَهُمْ**

١٧٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ». {الحديث: ٦٤٣٥ = ٦٤٤٧ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٤٥٥ = ٣٦٧٣ فتح الباري. أبو داود. السنة: ٤٦٥٨. ترمذي. مناقب: ٣٨٦١. تحفة الأشراف: ٤٠٠١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شتێ هەبوو لەنێوانی خالیدی كوڕی وەلیدو ئەوڕەحمانی كوڕی عەوفدا، خالید جنێوی بە ئەوڕەحماندا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جمێن بەهیچ كەسێ لە هاوڕێو هاوەڵانی من مەدەن،

سوێندم بەخودا گریمان یەکێ لەئێوەی موسوڵمانانی پاش چینی ئەوان، بەقەد کێوی ئوحودیش زێڕ ببەخشێتەوە هێشتا ناگات بەمشتێکی ئەوان، بەڵکوو ناگات بەنیوە مشتیشیان). {تاج/٣، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٣٢٣٢ چاپی چوارەم}. جنێو پێدان بەیارانی پێغەمبەر.

**ڕوونکردنەوە:**

لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەدا، لە تەجریدی بوخاریدا بەکوردی، دەفەرموێ: (مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە: کە جنێودان بە سەحابەی پێغەمبەر، تاوانێکی گەڵێ گەورەیە، ئەو کەسەی جنێوەکە دەدا، چ خۆشی هاوەڵی پێغەمبەر بێ، چ لەچینەکانی دوا ئەوان بێ جیاوازیی نییە).

**١٣٢٩) باسی گەورەیی ئووەیسی قەرەنی، کە لەچینی دووەمی موسوڵمانانە، کە ناودارن بە تابیعین (پەیڕەوان). (٦٤٣٧ - ٦٤٣٩)**

**بابٌ: ذِكْرُ أُوَيْسٍ الْقَرَنِي مِنَ التَّابِعِينَ وَفَضْلُهُ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ)**

١٧٤٧- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «إِنَّ خَيْرَ التَّابِعِينَ رَجُلٌ يُقَالَ: لَهُ أُوَيْسٌ، وَلَهُ وَالِدَةٌ، وَكَانَ بِهِ بَيَاضٌ، فَمُرُوهُ فَلْيَسْتَغْفِرْ لَكُمْ». {الحديث: ٦٤٣٨ = ٦٤٥١ فم}:

عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (باشترینی چینی دووەمی موسوڵمانان (التابعين: پەیڕەوان: شوێنکەوتووان) پیاوێکە ناوی ئووەیسە، دایکێکی هەیە، وەیس زۆر باشە بۆی، لەپێشا بەڵەك دەبێ، لەپاشا چاك دەبێتەوە، داوای لێ بکەن با لەخودا بۆتان بپاڕێتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٣٥٣٥ چاپی چوارەم} باشترینی چینی دووەمی موسوڵمانان.

١٧٤٨- عَنْ أُسَيْرِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) إِذَا أَتَى عَلَيْهِ أَمْدَادُ أَهْلِ الْيَمَنِ سَأَلَهُمْ: أَفِيكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ حَتَّى أَتَى عَلَى أُوَيْسٍ، فَقَالَ: أَنْتَ

أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ قَالَ: نَعمْ. قَالَ: مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَكَانَ بِكَ بَرَصٌ فَبَرَأْتَ مِنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ دِرْهَمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: لَكَ وَالِدَةٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «يَأْتِي عَلَيْكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ مَعَ أَمْدَادِ أَهْلِ الْيَمَنِ، مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ، كَانَ بِهِ بَرَصٌ فَبَرَأَ مِنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ دِرْهَمٍ، لَهُ وَالِدَةٌ هُوَ بِهَا بَرٌّ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لَكَ فَافْعَلْ». فَاسْتَغْفِرْ لِي، فَاسْتَغْفَرَ لَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: الْكُوفَةَ، قَالَ: أَلاَ أَكْتُبُ لَكَ إِلَى عَامِلِهَا. قَالَ: أَكُونُ فِي غَبْرَاءِ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيَّ. قَالَ: فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ حَجَّ رَجُلٌ مِنْ أَشْرَافِهِمْ فَوَافَقَ عُمَرَ، فَسَأَلَهُ عَنْ أُوَيْسٍ قَالَ: تَرَكْتُهُ رَثَّ الْبَيْتِ قَلِيلَ الْمَتَاعِ. قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «يَأْتِي عَلَيْكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ مَعَ أَمْدَادِ أَهْلِ الْيَمَنِ مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ، كَانَ بِهِ بَرَصٌ فَبَرَأَ مِنْهُ، إِلاَّ مَوْضِعَ دِرْهَمٍ، لَهُ وَالِدَةٌ هُوَ بِهَا بَرٌّ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لَكَ فَافْعَلْ». فَأَتَى أُوَيْسًا فَقَالَ: اسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: أَنْتَ أَحْدَثُ عَهْدًا بِسَفَرٍ صَالِحٍ فَاسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: اسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: أَنْتَ أَحْدَثُ عَهْدًا بِسَفَرٍ صَالِحٍ فَاسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: لَقِيتَ عُمَرَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَاسْتَغْفَرَ لَهُ، فَفَطِنَ لَهُ النَّاسُ فَانْطَلَقَ عَلَى وَجْهِهِ، قَالَ أُسَيْرٌ: وَكَسَوْتُهُ بُرْدَةً، فَكَانَ كُلَّمَا رَآهُ إِنْسَانٌ قَالَ: مِنْ أَيْنَ لأُوَيْسٍ هَذِهِ الْبُرْدَةُ؟ {الحديث: ٦٤٣٩ = ٦٤٥٢ فم}:

ئوسەیری کوڕی جابیر فەرمووی: جاران کە لەشکری کۆمەکیی یەمەن بۆ عومەر دەهات، بۆ یارمەتی سوپای ئیسلام، لەبەرەکانی خەبات‌و تێکۆشاندا، عومەر لێیانی دەپرسی: ئەرێ ئووەیسی کوڕی عامیرتان واتیادا؟ هەتا بە پرسیار ئووەیسی دەدۆزییەوە، پێی فەرموو: تۆ ئووەیسی کوڕی عامیری؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەوم، فەرمووی: لەخێڵی قەرەنی کە دەچنەوە سەر هۆزی بەرەبابی موراد؟ فەرمووی: بەڵێ. فەرمووی: لەمەوبەر بەڵەك بووی، بەڵام ئێستا چاکبوویتەتەوەو تەنیا بەقەد جێ درەمێکی ماوە؟ فەرمووی: بەڵێ وایە. فەرمووی: دایکت هێشتا ماوە؟ فەرمووی: بەڵێ.

عومـەر فـەرمووی: ژنـەوتم لـە پێغەمبـەری خـودا دەیفـەرموو: (لـەناو ئـەو لەشـکرانەدا کـە لەیەمەنـەوە دێـن، بـۆ کۆمـەکیو یاریـدەتان، لەبـەرەکانی جەنگدا، پیاوێ دێ، ناوی ئووەیسی کوڕی عـامیرە، لـەهۆزی قەرەنـە، کەدەچنەوە سـەر عێڵی مـوراد، لەپیشـدا هـەنێ بەڵـەك دەبـێ، لەپاشـدا چـاك دەبێتـەوە، بەقـەد شـوێنی درەمێکی نەبێ، دایکێکی هەیە زۆر بۆی باشـە، ئـەو ئووەیسـە ئەوەنـدە نـازی هەیـە لەلای خـودا، ئەگـەر سـوێند بخوا لـەخودا کـە دەبـێ ئـەو ئیشـەی بۆبکا، خـودا دڵـی ناشکێنێو سوێندەکەی ناخاتو داواکەی جێبەجێ دەکا، ئەی عومەر! یا ئەی کەسێ کە ئەم حاڵەی ئووەیس دەزانێ، ئەگەر بۆت دەلوێو دەست دەدا بۆت: با ئـەو پیـاوە کەناوی ئووەیسە بۆت بپاڕێتەوەو داوای لێبوردنت لەخودا بۆبکا، چونکە هەمیشـە دووعاو نزاو پاڕانەوەی ئەو گیرایەو رەتنابێتەوە!).

عومـەر فـەرمووی: دەی کەواتـە ئـەی ئـووەیس! بـۆم بپـاڕێرەوە! ئـەویش بـۆی پاڕایەوە. عومـەر پێـی دەڵێ: بەتـەمای کوێیـتو دەتـەوێ لـەکوێ نیشـتەجێ بیـت؟ دەڵێ: لەکووفە. دەفەرموێ: دەبا نامەیەکت بۆ بنووسم بۆ کاربەدەسـتی سـەر شـاری کووفە، کە ئاگای لێت بێو یارمەتیت بدا؟ دەفەرموێ: حەزناکەم ناوم بکەوێتـە نـاو ناوانەوە، حەزدەکەم خۆم لەمەردومە رەشـوو رووتەکە جیانەکەمـەوەو نـاو ئـەوانم پێ خۆشە. فەرمووی: لەساڵی ئاییندەدا، پیاوێکی خانەدانی کووفەیی هات بۆ حەج، عومـەر هـەواڵی ئووەیسـی قـەرەنی لێ پرسـی، گـوتی: کـەمن هـاتم ئـووەیس مـاڵێکی پەڕپوتو کەمێ شتومەکی هەبوو، عومەریش فەرموودەکەی پێغەمبـەری گێڕایـەوە بۆی کە لەپێشەوە باسکرا، کە پیاوێ لەم رەنگە لە یەمەنەوە دێت، داوای نزای باشی لێ بکەن، جا پیاوەکە کە لەحەج دەگەڕێتەوە بۆ کووفە، دەچێتە لای وەیـس، دەڵێ: بۆم بپاڕێرەوە. دەڵێ: تۆ تازە لەسەفەری خێر گەڕاویتەوە تۆ بۆ من بپاڕێرەوە!

دەڵێتەوە: دەتۆ بۆم بپاڕێرەوە. وەیسیش دەڵێ: ئاخر تۆ تازە لە رێبواریی بـاش، لەسەفەری حەج گەڕاویتەوە، هەق وایە تۆ بۆ مـن بپاڕێیتـەوە. لەپاشـا وەیـس پێـی

دەڵێ: دیارە عومەرت دیوەو ئەو ئەم تەگبیرەی بۆ کردووی؟ دەڵێ: بەڵێ وایە، جابۆی دەپاڕێتەوە.

ئیتر خەڵكو مەردومەکە پێی دەزانن و پیاو باشییەکەی ئاشکرا دەبێ و نزا خوازان و خاوەن مرازو نیازەکان سەری تێ دەکەن و داوای نزاو پاڕانەوەی لێ دەکەن، ئیتر ئەویش سەری خۆی هەڵ دەگرێ و دەڕواو خۆی ون دەکا.

ئوسەیر فەرمووی: من عابایەکم پێ بەخشی، کە لەبەریکرد، خەڵکەکە سەریان سوڕماو گوتیان: ئووەیس بەو پەڕپووتییە، ئەم عابە چاکەی لەکوێ بوو؟. {تاج/٣، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٣٥٣٧. چاپی چوارەم} . باشترینی چینی دووەمی موسوڵمانان (تابیعین).

**ڕوونکردنەوە:**

بەهرەی زۆر لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ، وەك:

١- چەند موعجیزەیەکی گەورەی پێغەمبەر ی واتیادا، چۆنی فەرمووە، وا هاتۆتە دی، وەك ناوی ئووەیس و ...تاد.

٢- پیاو چاکان خۆشەویستانی خودان، نزایان لەلای خودا گیرایە، زۆرینەی کات حاڵ و نهێنی بەینی خۆیان و بەیمنی خوای خۆیان دەشارنەوەو ئاشکرای ناکەن، وا باش و چاکە چاکتر داوای نزای باش لەباش بکا، چونکە عومەر لەبەرئەوەی هاوەڵی پێغەمبەرە لە ئووەیس باشترە کە لەپەیڕەوانە (لە تابیعینە).

٣- ئووەیس (کە لەناو کوردەواری خۆماندا، ناسراوە بە وەیسی قەرەنی) بەسەردەمی پێغەمبەردا گەیشتووە، بەڵام لەبەر خزمەتکردنی دایکی نەچووە بۆ دێنی پێغەمبەرو بەخزمەتی نەگەیشتووە لەبەرئەوە دانانرێ بە صەحابە، بەڵام نازناوی (سَيِّدُ التَّابِعِين: گەورەی پەیڕەوان)ە. ناوی تەواوی ئاوایە:

(ئووەیسی کوڕی عامیری ئەلقەرەنی ئەلموڕادی ئاغای پەیڕەوان). لە (تهذیب التهذیب)ی عەسقەلانیدا دەفەرموێ: (تەرجەمەی ژیانی بەدرێژی وا لە (المیزان)و (لسان المیزان)و (کتابي في الصحابة)دا. ئووەیس دووعاو نزای گیرابوو، ئیمامی

عومەرو ئیمامی عەلی دەچوون بۆ سەردانی، ئووەیسیش لە عومەرو عەلییەوە گێڕانەوەی هەیە، لەچەندین غەزادا بەشداری کردووە، هەتا لەجەنگی صەفیندا، لەڕیزی سوپای عەلیدا لەریزی پیادەکانا شەهیدکرا. لە فەرموودەی پێغەمبەردا ئاماژە بەوەکراوە:

أ- کە بەهۆی تکاکاری وەیسەوە، زیاتر لە ژمارەی هۆزی بەنی تەمیم دەچنە بەهەشت، لەنەتەوەی ئیسلام.

ب- (کەسانێ دەبن لە موسوڵمانان لەبەر رووتو قووتی بۆیان ناکرێ کەبچن بۆ مزگەوت، لەگەڵ ئەوەیشا بڕواکەی قەدەغەی لێ دەکا کەبچێ سواڵ بکا، یەکێ لەوانە وەیسی قەرەنییە).

٤- سوونەتە کەسێ لەسەفەری خێر بگەڕێتەوە، وەك سەفەری حەجو عەمرەو خوێندنو غەزاو کەسابەتی حەلاڵو بەجێهێنانی سیلەی رەحم داوای نزای باشی لێ بکرێ.

## ١٣٣٠) باسی چاکێتیی میصرو باشێتی خەڵکی میصر. (٦٤٤٠ - ٦٤٤١)
## بابٌ: فِي ذِكْرِ مِصْرَ وَأَهْلِهَا

١٧٤٩- عَنْ أَبِى ذَرّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّكُمْ سَتَفْتَحُونَ مِصْرَ، وَهِيَ أَرْضٌ يُسَمَّى فِيهَا الْقِيرَاطُ فَإِذَا فَتَحْتُمُوهَا فَأَحْسِنُوا إِلَى أَهْلِهَا، فَإِنَّ لَهُمْ ذِمَّةً وَرَحِمًا». أَوْ قَالَ: (ذِمَّةً وَصِهْرًا) فَإِذَا رَأَيْتَ رَجُلَيْنِ يَخْتَصِمَانِ فِيهَا فِى مَوْضِعِ لَبِنَةٍ فَاخْرُجْ مِنْهَا». قَالَ: فَرَأَيْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ شُرَحْبِيلَ بْنِ حَسَنَةَ وَأَخَاهُ رَبِيعَةَ يَخْتَصِمَانِ فِى مَوْضِعِ لَبِنَةٍ، فَخَرَجْتُ مِنْهَا). {الحديث: ٦٤٤٠ = ٦٤٥٣ فم}:

ئەبو زەڕی غەفاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێوە بەزوویی وڵاتی میصر دەگرنو ئازاد (فەتح)ی دەکەن، لەوخاکە پارەیەکی لێیە ناوی قیراطە، خەڵکەکەی بەزۆری سەوداو مامەڵە بەو دراوە دەکەن، هەرکاتێ ئەوێتان رزگارکردو فەتحتانکرد، ئامۆژگاریو راسپێریی من بۆ ئێوە ئەوەیە: کە زۆر زۆر باش بن بۆ خەڵکەکەیو ئێوەیش لەناو خۆتاندا ئامۆژگاری

خێری یەکتری بکەن کە باشبن بۆیان، چونکە خەڵکی میصر، سەرەڕای ئەوەی کە ئەهلی زییمەنو پەیماندارنو، لەبەرئەوەی کە خاوەن نامە بوونو بەئاشتی ئازاد کراون، خاترو ڕێزو قەدری تایبەتی خۆیان هەیە، سەرەڕای ئەم پلەو پایە باشەیش خزمیشمانن، چونکە دایکە هاجەرە لەوانە، کە دایکی حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە (دروودی خودا لەخۆیانو لەنەوەو خانەوادەیان بێ!).

یا فەرمووی: (چونکە ئەوان سەرەڕای ئەوەی کە خاوەنی پەیمانو ئەمانن خەزوورانیشمانن، چونکە ماریەی قیبطییە کە دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەرە لەوانە (دروودی خودا لەخۆیو نەوەو هاوسەرانی بێ).

جا هەرکاتێ لەوێ دوو پیاوت چاوپێکەوت، کە لەسەر جێگە خشتێ هەراو کێشەیان بوو، تۆ لەوێ مەمێنە).

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوڕەحمانی کوڕی شورەحبیلی کوڕی حەسەنەو ڕەبیعەی برایم بینی، لەسەر شوێنی جێ خشتێ هەرایان بوو، ئیتر منیش لەوێ نەمام). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٣٥٨١ ج/٤} + {بڕوانە: ژمارە: ١٦٠٩، لەزنجیرە: ١٢٤٩ لەم پەڕاوە پیرۆزە کە لەپێشەوە رابورد} + {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٢٨}.

## ١٣٣١) باسی باشیتی وڵاتی عومانو چاکیتیی خەڵکەکەی. (٦٤٤٢)
## بابٌ: فِي ذِكْرِ عُمَانَ

١٧٥٠- عَنْ أَبِى بَرْزَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَجُلاً إِلَى حَىّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ، فَسَبُّوهُ وَضَرَبُوهُ، فَجَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لَوْ أَنَّ أَهْلَ عُمَانَ أَتَيْتَ مَا سَبُّوكَ وَلاَ ضَرَبُوكَ». {الحديث: ٦٤٤٢ = ٦٤٥٥ فم}:

ئـەبو بـەرزەی ئەسلەمی (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی نـارد بـۆ نـاو خێڵێ لـە خێڵانـی عـەرەب، لـەوێ لێـی دەدەن‌و جنێـوی پـێ دەدەن، ئەویش گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەرو حاڵەکەی گێڕایەوە بۆی!

فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئـاخر ئەگـەر بچوویتایە بۆنـاو خـەڵکی عومـان، نەجنێویان پێ دەدایت‌و نە لێیان دەدایت!). {تاج/٣، زنجیرە: ٧١، ژمـارە: ٣٥٧١ چ/٤}

گەورەیی یەمەن‌و عومان.

**ڕوونکردنەوە:**

عومـان (بـەبۆری عـەین‌و بـە میمـی سـووك) وڵاتێکـی ناسـراوە لـە یەمـەن، دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو، پایتەختەکەی مەسقەط بوو.

ئەبو بەرزەی ئەسلەمی (رەزای خودای لێ بێ) لە موسوڵمانە پێشینەکانە، لەگـەڵ سـوپای ئیسلاما ئامادەی رزگارکردنی شاری مەککە بووە کە ناسراوە لەمێژوودا بـە (فـەتحی مەککـە: ئـازادکردنی مەککـە: رزگـارکردنی مەککـە) لـەوەدوایش هـەتا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەجیهان دەردەچێ، هەر لەخزمەتیدا خەبات دەگێڕێ‌و غەزا دەکا، چـوار فـەرموودەی لـە بوخاریـدا هەیـە، لەشەسـت‌و چـواری کۆچـیدا، لەمـەرو، یـا لەبەصرە، یا لەبیابانی سەجستان دەمرێ. {بڕوانـە: تەجریـدی بوخـاری بـەکوردی، بەرگی/١، ژمارە: ٣٢٠ = ٥٤٧ فەتح الباری}.

## ١٣٣٢) باسی گەورەیی وڵاتی عەجەم (فَضْلُ فارس). (٦٤٤٤ - ٦٤٤٥)

## بَابٌ: مَاذُكِرَ فِي فارسَ

١٧٥١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، إِذْ نَزَلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْجُمُعَةِ، فَلَمَّا قَرَأَ: (وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ)، قَالَ رَجُلٌ: مَنْ هَؤُلاَءِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَلَمْ يُرَاجِعْهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، حَتَّى سَأَلَهُ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، قَالَ: وَفِينَا سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ، قَالَ: فَوَضَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ، ثُمَّ قَالَ: «لَوْ كَانَ الإِيمَانُ عِنْدَ الثُّرَيَّا لَنَالَهُ رِجَالٌ مِنْ هَؤُلاَءِ».

{الحديث: ٦٤٤٥ = ٦٤٥٨ فـم. تجريـد البخـاري بـالكوردي/٤، رقـم: ١٧٠٦ = ٤٨٩٧، ٤٨٩٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٣١٠. تحفة الأشراف: ١٢٩١٧}:

ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووین، لەوکاتەدا سوورەتی جوموعە هاتە خوارەوە بۆی، کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ — ٦٢/٢}.

واتە: هەروا ئەم رەهبەرە نازدارە، بەهۆی نامەی پیرۆزیی خوداییو بەهۆی فەرمووده بەرزەکانی خۆیەوە، گەلێ گەلو کەسانی تریش لە موسوڵمانان، فێری یاسانامەی خوداو خێرو بێری هەردوو جیهان دەکا، کە هێشتا ئەمانە وان لەژێر پەردەی غەیبەوەو، جارێ پەیڕەوی ئەمانەیان نەکردووە، بەڵام بەزوویی ئەوانیش وەك ئەمانە، ئەم رێگە هەقو راستو دروستە دەگرنو وەك ئەمان موسوڵمان دەبن).

کاتێ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە، پیاوێ عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانە کێن، کە ئەم رێگەی هەقی ئێمەیە بەزوویی دەگرن؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی نەدایەوە، تا پیاوەکە دوو جار، یا سێجار، هەمان پرسیاری لێ دووبارە کردەوە. فەرمووی: لەوکاتەدا سەلمانی فارسی لەناو کۆڕی دانیشتنەکەماندا بوو،، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی خستە سەر رانی سەلمانو فەرمووی: (ئەگەر گریمان ئیمانو ئیسلامەتی لەسەر ئەستێرەی کۆیش بێ، پیاوانێ لەمانە، خۆیانی دەگەیەننێ!!). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٣٥٧٣، ٣٥٧٢، ٣٥٧٤، ٣٥٧٥}. گەورەیی وڵاتی عەجەم (فضل فارس).

**روونکردنەوە:**

دانەری تاجول ئوصول لە شەرحەکەیدا، لە راڤەی وشەی (فەضلی فارس)دا، دەفەرموێ:

(مەبەست ئەو گەلانەیە کە عەرەب نینو خەڵکی ئەو وڵاتانەن کە لەکۆندا لەناو عەرەبەکاندا بە وڵاتی فارس ناوبانگی دەرکردووە، کە بەمانە دەگوترێ عەجەم، کە بریتین لە دانیشتوانی ئەو ناوچانە کە خۆرهەڵاتنو دەکەونە

خۆرهـــەڵاتی کەنـــداوەوە، وەك ئێـــران و کرمـــان و سیســـتان و ئـــەودیو چـــەم (ماوەرائەنەهرەین) و خۆراسان، کە ئەم ناوچانە، ئەو شوێن و ناوچە پیرۆزانەن کە پیاوانی فەرموودەزانی وایان تیا هەڵکەوتووە، کە بوون بە بەردی بناغەی عولومی حەدیث (زانستەکانی فەرموودە) وەکوو ئەم پێشەوا ناودارو بەرێزانە: بوخاری و ئەبو داوودو تەرمەزی و نەسائی و بەیهەقی و دارە قوطنی و موسلیم (رەزای خودایان لێ بێ).

ئیمامی موسلیم (خودای لێ رازی بێ) ئەگەرچی لەبنەڕەتدا عەرەبە، چونکە لە عەرەبی هۆزی قوشەیرە، بەلام ئەویش پەروەردەی ئەو خاکەیەو، لەناو ئەو ئەستێرە گەشانەدا رەسکاوەو ژیاوە). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٣٥٧٥ چاپی چوارەم}.

### ١٣٣٣) بتمانە بەخەڵك ناکرێ مەگەر چۆنها. (٦٤٤٦)
### باب: النَّاسُ كَإِبِلٍ مائَةٍ لا تَجِدُ فيها راحِلَةً

١٧٥٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «تَجِدُونَ النَّاسَ كَإِبِلٍ مِائَةٍ لاَ يَجِدُ الرَّجُلُ فِيهَا رَاحِلَةً». {الحديث: ٦٤٤٦ = ٦٤٥٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢٠٢١ = ٦٤٩٨ فتح الباري}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر، کە ناسراوە بە ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئێوە دەبینن کە ئەو خەڵکە، بۆ باشی و خراپی، وەك وشتری باری وان، پیاو لەسەدیانا، تاقە وڵاخێکی سواری باشی دەسگیر نابێ). {تاج/٥، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٤٩٠٦ — ش/ت — چاپی چوارەم}. خۆپاراستن لەقاری خودا.

**روونکردنەوە:**

وڵاخی بەرزە کەباری بێ، بەکەڵکی سواری نایێ، چونکە لەژێر بارا، رەوتی لێ تێك دەچێ و کەشخەییەکەی نامێنێ، بۆیە کە بە ئەسپی ژێر عەرەبانە دەگوترێ: بارگیر.

لەتەجریدی بوخاریدا ئەم فەرموودەیە ئاوا کراوە بەکوردی:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەو خەڵکە بێ متمانەن، متمانەیان پێ ناکرێ، مەگەر چۆنەها، هەروەك چۆن لەسەد وشتردا، وشترێکی رەسەنت دەست ناکەوێ کە دەست بدا بۆ سواری ئاوا لەسەد مرۆڤیشدا مرۆڤێکی نەجیبت دەست ناکەوێ).

### ١٣٣٤) باسی هەڵاتبازەکەو خوێنمژەکەی هۆزی سەقیف. (٦٤٤٣)

### بَابٌ: مَاذُكِرَ فِي كَذَّابِ ثَقِيفٍ وَمُبِيرِهَا

١٧٥٣- عَنْ أَبِي نَوْفَلٍ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَلَى عَقَبَةِ الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَجَعَلَتْ قُرَيْشٌ تَمُرُّ عَلَيْهِ وَالنَّاسُ، حَتَّى مَرَّ عَلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، فَوَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا، أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا، أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا أَمَا وَاللَّهِ إِنْ كُنْتَ مَا عَلِمْتُ صَوَّامًا قَوَّامًا وَصُولاً لِلرَّحِمِ، أَمَا وَاللَّهِ لأُمَّةٌ أَنْتَ أَشَرُّهَا لأُمَّةٌ خَيْرٌ. ثُمَّ نَفَذَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، فَبَلَغَ الْحَجَّاجَ مَوْقِفُ عَبْدِ اللَّهِ وَقَوْلُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَأُنْزِلَ عَنْ جِذْعِهِ، فَأُلْقِيَ فِي قُبُورِ الْيَهُودِ، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى أُمِّهِ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصديق (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم)، فَأَبَتْ أَنْ تَأْتِيَهُ، فَأَعَادَ عَلَيْهَا الرَّسُولَ: لَتَأْتِيَنِّي، أَوْ لأَبْعَثَنَّ إِلَيْكِ مَنْ يَسْحَبُكِ بِقُرُونِكِ، قَالَ: فَأَبَتْ، وَقَالَتْ: وَاللَّهِ لاَ آتِيكَ حَتَّى تَبْعَثَ إِلَيَّ مَنْ يَسْحَبُنِي بِقُرُونِي. قَالَ: فَقَالَ: أَرُونِي سِبْتَيَّ. فَأَخَذَ نَعْلَيْهِ ثُمَّ انْطَلَقَ يَتَوَذَّفُ حَتَّى دَخَلَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: كَيْفَ رَأَيْتِنِي صَنَعْتُ بِعَدُوِّ اللَّهِ؟ قَالَتْ، رَأَيْتُكَ أَفْسَدْتَ عَلَيْهِ دُنْيَاهُ، وَأَفْسَدَ عَلَيْكَ آخِرَتَكَ، بَلَغَنِي أَنَّكَ تَقُولُ لَهُ: يَا ابْنَ ذَاتِ النِّطَاقَيْنِ! أَنَا وَاللَّهِ ذَاتُ النِّطَاقَيْنِ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكُنْتُ أَرْفَعُ بِهِ طَعَامَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَطَعَامَ أَبِي بَكْرٍ مِنَ الدَّوَابِّ، وَأَمَّا الآخَرُ فَنِطَاقُ الْمَرْأَةِ الَّتِي لاَ تَسْتَغْنِي عَنْهُ، أَمَا إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدَّثَنَا « أَنَّ فِي ثَقِيفٍ كَذَّابًا وَمُبِيرًا ». فَأَمَّا الْكَذَّابُ فَرَأَيْنَاهُ وَأَمَّا الْمُبِيرُ فَلاَ إِخَالُكَ إِلاَّ إِيَّاهُ، قَالَ: فَقَامَ عَنْهَا وَلَمْ يُرَاجِعْهَا. {الحديث: ٦٤٤٣ = ٦٤٥٦ فم}:

ئەبو نەوفەل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لاشەی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرم دی، لە هەورازەکەی مەدینە بەدارا کرابوو، واتە: لەو هەورازە کەوا لەمەککە، بەڵام ناوی هەورازی مەدینەیە، چونکە لەسەر ئەو ڕێگەیەیە کە لەمەککەوە دەچێ بۆ مەدینە، لاشەکەی لەوێدا لەسێدارە درابوو، لەپاش ئەوەی لەشەڕێکی قورسا کوژرابوو، حەجاج سەرەو خوار هەڵیواسیبوو بە کۆڵەکەیەکا، هەر پیاوانی قوڕەیش‌و خەڵکانی تربوون، بەلایا بەخامۆشی ڕەت دەبوون، لەترسی حەججاج نەیاندەوێرا قسەبکەن، بەڵام کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گەیشتە لای، لەدیاری ڕاوەستاو سێجار فەرمووی: (السَّلَامُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيبٍ: سڵاو لەتۆ ئەی باوکی خوبەیب!

ئەوجا سێ جاریش فەرمووی: ئەدیی بەخودا، گەلێ پێتم گوت کە داکەوەو شتی وامەکە، سەری خۆت دامەنێ. ئەنجا فەرمووی: ئەدیی بەخودا، بەپێی ئاگالێبوونی من، تۆ ڕۆژوو گرێکی زۆر باش بوویو ڕۆژووی سوننەتت زۆر دەگرتو، شەو نوێژکەرێکی زۆر چاك‌و خزم دۆستێکی فرەخاس بووی، ئەدی بەزاتێ کەزاتی خودایە، گەل‌و نەتەوەیێ، کە پیاو خاسی وەك تۆ ئایەخەکەی بێ، بەڕاستی گەلی چاکە).

ئینجا ئیبنو عومەر تێ پەڕیو ڕۆیشت، کاتێ کە ئەم هەڵوێست‌و فەرمایشتانەی ئیبنو عومەر گەیشتەوە بە حەججاج ناردی لاشەکەیان لەقەدی دار خورماکە داگرت‌و لەناو کۆنە گۆڕستانی جوولەکەکانا برکیاندا، لەپاشا حەججاج ناردی بەشوێن ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیقا، کە دایکی عەبدوڵڵای شەهیدکراو بوو، ناردی بەدوایا کەبچێ بۆلای، بەڵام ئەسماء ڕازی نەبوو کەبچێ بۆلای، حەججاجیش گزیرەکەی ناردەوە بۆسەری: کەوا یا بەپێی خۆت دێیت بۆلام، یا کەسێکی وا دەنێرم کە هەتا ئێرە بە پەلك کێشت بکا!

فەرمووی: دیسان ئەسماء مەردانە، گوێی پێ نەداو گوتی: بەخودا تا نەنێری بە پرچەکانم بەکێشم بکەن نایێم بۆلات!

فەرمووی: جا حەججاج گوتی: کوا پێڵاوەکانم لەکوێیە؟ سۆلەکانی کردە پێی‌و بەکەش‌و فشێکەوە بە پرتاو چوو بۆلای ئەسماء، کە گەیشتە لای پێی گوت: خۆدیت کەچیم لەو دوژمنی خودایە کرد؟!

ئەسماء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوەی کەمن دەیبینم ئەمەیە: کە راستە تۆ ئەم جیهانەت لە عەبدوڵڵای کوڕم تێکدا بەڵام ئەویش ئەو جیهانی لەتۆ تێکدا. ئەی حەججاج! وەك بیستوومەتەوە گوایە تۆ بەتانەو تەشەرەوە، بۆ تەڵفیسی بە عەبدوڵڵای کوڕم دەڵێی: کوڕەکەی ژنە دوو پشتێن! بەڵێ بەخودا راستە وایە، کەمن دوو پشتێنم هەبوو، بە یەکێکیان نان‌و ئاوو خواردەمەنی پێغەمبەر‌و ئەبوبەکرم پێ هەڵ دەبەست لەلاقەدی وڵاخ‌و ئەوی تریشیان وەك هەموو ئافرەتێ بۆ کارو فرمان دەمبەستە پشتم). {بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی/٤، ژمارە: ١٥١٧ تا کۆتایی} .

ئەسماء ئەوجا فەرمووی: جائەم دوو پشتێنییە هیچ عەیب‌و عارو شوورەییەکی تیادا نییە، بەڵکوو جێگەو مایەی شانازییە، بەڵام بزانە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ خۆی پێمانی فەرموو: (کە لەناو هۆزی بەنی ثەقیفا هەم پێغەمبەرە درۆزنەیێ پەیدادەبێ، هەم زیانە خرۆیەکی خوێن مژی لێ پەیدا دەبێ. ئەوەبوو پێغەمبەرە درۆزنەکەمان بەچاوی خۆمان دی، کە موختاری کوڕی ئەبو عوبەیدی ئەقەفی بوو، وەمن بەش بەحاڵی خۆم وادەزانم کە زیانە خورۆو خوێن ڕێژەکەیش توویت، ئەی حەججاج!

فەرمووی: ئیتر حەججاج بەسەر شۆڕی‌و لووت شکاوی ملی خۆی شکاندو لەلای ئەسماء هەستاو هەڵی تۆڕاندو وەڵامی پێ نەدرایەوە). {بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩ ج/٤} + {ژمارە: ١١٨٨ لەم پەڕاوە کە لەپێشەوە رابورد ژیاننامەی حەججاج} + {بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ١٢٥ چاپی/١، فەرموودەی ژمارە: ١٨٣٣ = ٥٥١٥ فەتحولباری، ژیاننامەی سەعیدی کوڕی جوبەیر} .

# پێڕستی سەرە باسەکان

## ٥١- نامەی گەورەیی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودای گەورە لە یارانو هاوەڵانی بێ) ٣١١